تصوير أبو عبد الرحمن الكردي
د. عەبدولحسێن زەرینکوب
دوو سەدە
بێدەنگی
پرۆفیسۆر د. موحسین محەمەد حسێن پێشەکی بۆ نووسیوە
وەرگێڕانی
موسای محەمەددەرەش
ڕێباز مستەفا
هەوارگەی کتێب
hawargaykteb

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

● دوو سەدە بێدەنگی

● نووسینی: عەبدولحوسەین زەرین کوب

● وەرگێڕانی: ڕێباز مستەفا – موسا محەمەد خدر

● نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال ڕواندزی

● پیتچنین: فەرهاد – پرشنگ

● بەرگ: هۆگر سدیق

● ژمارەی سپاردن: ٢٩٩

● نرخ: ٥٥٠٠

● چاپی یەکەم ٢٠٠٧

● تیراژ: ١٠٠٠

● چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (٣٦٨)



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێڕست

## دکتۆر عەبدولحوسەین زەڕین کوب

(توێژەر و ئەدیب و مێژوونووس، ئیسلامناس و ئێرانناسی هاوچەرخ). لە سەرەتایی سالّی ١٩٢٢ی زایینی لە شاری ( بروجەرد ) کە دەکەوێتە هەرێمی لورستان چاوی بە دونیا هەڵێناوە. قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی لەو شارە تەواوکردووە، دوای تەواو کردنی قۆناغی ناوەندی دەبێتە مامۆستا لە قوتابخانەکانی بروجەرد، سالّی ١٩٤٤ بەشداری تاقیکردنەوەی کۆلێژی مافی زانکۆی تاران دەکات و بە پلەی یەکەم دەردەچێت، بەڵام لە بەشی ئەدەبیات درێژە بە خوێندن دەدات و سالّی١٩٤٨ بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی تاران وەرگرتووە ، دواتریش بۆ وەدەستهێنانی بڕوانامەی بەرزتر لە خوێندنی باڵا سەرقاڵی دکتۆرای ئەدەبیات دەبێت، سەرئەنجام لە سالّی١٩٥٥، بڕوانامەی دکتۆرای بەدەست هێنا .

دکتۆر زەڕین کوب لە سالّی ١٩٦٢ بە دواوە هاوکات لە زانکۆکانی تاران و زانکۆکانی: هیند، پاکستان، ئۆکسفۆرد، سۆربۆن، پرینسیتۆن، کالیفۆرنیا، خەریکی وانە گوتنەوە بووە. ئاشنای زمانەکانی عەرەبی، ئینگلیزی، فەرەنسی، هەروەها لەسەردەمی شەڕی جیهانی دووەمدا فێری زمانی ئیتالّی و ئەڵمانی بسووە، وێڕای ئەو چالاکیانە، بایەخی بە زانستی کۆمەڵناسی و باس و لێکۆڵینەوەی زمان و رەخنەی ئەدەبی و مێژوویی داوە و بەرهەم و شاکاری گرانبەهای لەو بوارانەدا نووسیوون و بڵاویکردونەتەوە. دکتۆر زەڕین کوب لە سالاّنی دواییدا زیاترین کاتی خۆی بۆخوێندنەوە و توێژینەوە و وانە گوتنەوەی بابەتی عیرفانی، ئایینی و مێژوویی تەرخانکردووە. لەگەڵ زۆر لە کەسایەتی زانستی جیهانی وئێرانی وەکو: (تۆرخان گەنجهای، هانری ماسە، مینۆرسکی، گۆستاوڤون گرۆنەباوم، هارۆلد بیلی، فلیپ حەتی، برناردلۆیس ، محەمەدعەلی جەمالزادە، بوزورگ عەلەوی ...) ئاشنایەتی و هاریکاری هەبووە. لە ماوەی پەنجا سالّی تەمەنیدا دەیان کتێب و سەدان وتاری نووسیوون.

لەوانە: ( تاریخ مردم ایران پیش از اسلام)، ( تاریخ مردم ایران بعد از اسلام)، (روزگـاران) کە باسی مێژووی ئێران لە سەرەتاوە تاکو دامرکانی پاشایەتی پەهلەوی دەکات، کتێبـی (پلـە پلە تا ملا قات خدا)، ( شعلە گور)، ( از کوچە رندان)، (بحر در کوزە)، (بـا کـاروان حلـە)، (پیر گنجە در جستجوی نا کجا اباد)، (سـرنی)، **دوقـرن سـکوت**، (دوو سـەدە بێـدەنگی)... سەبارەت بەم کتێبە ماندووبوونێکی یەکجار زۆری کێشاوە و سەرچاوەی زۆری بەکارهێناوە، بۆ جاری یەکەم لە١٩٥١ لە ژێر چاپ دەردەچێت، بەڵام بەماوەیێکی کورت وخێرا لە بازاڕ نامێنێ و دانەر ڕەزامەندی و مۆڵەتی چاپی دووەم نادات. دیارە بۆ تێهەڵچوونەوەی چاپی دووەم ماوەی پێنج ساڵ سەرقاڵ دەبێت، لەو بارەیەوە نووسیویەتی: بۆ چاوپێداخشاندنی چـاپی دووەم بەباشـم نەزانی وەکو هەمان جاری یەکەم بلاوی بکەمـەوە، کـێ هەیـە دوای چـەندین سـاڵ کتێبێکـی نووسیبێ و لەدوای پێداچوونەوە، زیادو کەمی تیایدا بەرچاونەکەوێ. دیارە نووسەر لەسەر ئـەو نووسینەی زۆر کەوتۆتە بەر شالاو و هێرشکردنەسەر. هەروەکو دکتۆر زەڕیـن کـوب خـۆی لـە وتاری ((حکایت همچنان باقی))دا نووسیویەتی و دەڵێ: لەسەر هەندێك لـە نووسـینەکانم، زۆر ئازاردراوم..بەلام ئەی دوو سەدە بێدەنگی لەبیرتە لەسەر تۆ لە هەمووان زیاتر ئـازار درام، لـە بیرتە؟ دیارە چارەنووسی تۆ هەمیشە وابووە کە دوژمنانت ڕێگەت پێ بگرن و بەبەدگومانییەوە لێتبڕوانن.

عەبدولکەریمی سروش بیرمەندی ئێرانی لەوبارەیەوە نووسـیویەتی: مـن بەدرێـژایی تەمـەنم کەسێکم بە پڕزانی و خاکەڕایی زەڕین کوب نەبینیوە.

سەرەنجام دوای تەمەنێك کاری زانستی بە هۆی تووشبوونی بـە نەخۆشـییەکانی دڵ، چـاو، پڕۆستات، ساڵی ١٩٩٩ کۆچی دوایی کرد.

# بێدەنگ کردنی ئەوانیتر

پێشەکی: پ.د. موحسین محەمەد حوسێن

بێدەنگ کردنی ئەوانیتر، لەلایەن خاوەن هێزی دەسەڵات سەپاوەوە، نەهەرتەنیابۆ دووسەدە، بەڵکو ئەگەر دەرەتانی هەبێ بۆ هەتا هەتایە بەڕێوە دەچێ. جا ئەمە بەهەر هۆکارێکەوە بێ، یاخود بەهۆی ئەوەی کە ئەوانیتر لاوازبن و ئیرادەیان تێکشکاوبێت و جگە لە بێدەنگیی شتێکی دیکەیان نەبێت. ئەم بێدەنگ کردنە، و ئەم سەرکوتکردنە کاتێك دێتە ئاراوە کە دوو لای نا بەرامبەر و ناهاو سەنگ لەهێزدا لە ئارادا بن. جا ئەم هێزە هەرچۆنێك بێت و ئەم دەسەڵات سەپاوییەش لەسەرینی هەر هۆکارێکەوە، چ هۆکاری نەتەوەیی، ئایینی یاخود مەزهەبییەوە بێ. دەسەڵات سەپێن هەر بەنەریتی خۆی، خۆی لەنێو فەرمانڕەوایی خۆیدا دەشارێتەوە، یان بە پاساوێك لە پاساوەکان باڵا دەستی دەسەڵاتی خۆی پاساو دەداتەوە، یاخود هەوڵ دەدا بیانوویەك بۆ خۆی بدۆزێتەوە کە قەناعەت بە خۆشی و بەکۆمەڵەکەشی بکا، کۆمەڵەیەك کە قازانج و بەهرەیەك لەو هەل ومەرجەدا دەچنێتەوە.

بەڕوانینی من دامەزرێنەری هەر باوەڕێك[1]، بەتایبەتی باوەڕی ئایینی، هەر ئەوەندە ماڵئاوایی لەژیان کرد، ئەوا شوێنکەوتووانی بەسەر گروپ و تاقم دا دابەش دەبن. بە تایبەتی ئەگەر ئەو باوەڕە هەوڵی کۆکردنەوە و لێکگرێدانی کاروبارە روحییەکان و مادییەکان (کاروباری دینی و دنیایی) پێکەوە بدات. هەر گروپێك لەو گروپانە بەرژەوەندی خۆی لە (کۆمەڵە دەقێکی دیاریکراو)دا دەبینێ، ئایینی ئیسلامیش لەمە بەدەر نەبوو. کە پێغەمبەر ((د. خ)) ماڵئاوایی لەژیان کرد، یارانی ئەو لێك بڵاوبوون و، بۆ چەند دەستە و تاقمێك دابەش بوون. وە لەدەمی خۆشیدا پێغەمبەر (د. خ) پەی بەخەڵکەکەی و شوێنکەوتووانی خۆی برد بوو، و پێشبینی بەوەکردبوو کە لە پاش خۆی چییان بەسەر دێ و چ روودەدا. وە ئەم فەرموودەیەش هی ئەوە کە دەڵێ: ((جوولەکەکان بۆ حەفتاو یەك دەستە دابەش بوون، بەڵام یەکێکیان دەچێتە بەهەشتەوە و حەفتایان دەچنە دۆزەخەوە، وە دیانەکان بۆ حەفتا و دوو دەستە دابەش بوون، حەفتاو یەك دەستەیان دەچنە ناو دۆزەخەوە و یەکێکیان دەچێتەبەهەشتەوە، سوێند بەوە کە گیانی محەمەدی

---

(١) باوەڕ: عقیدة

به دەستە، ئومەتەکەی من بۆ حەفتا و سێ دەستە دابەش دەبێ، یەکێکیان دەچێتە بەهەشتەوە، حەفتا و دوویان دەچنە ناوەدۆزەخەوە[2] وە ئەو تاکە دەستەیەی کە دەچێتە بەهەشتەوە هەر ئەو دەستە زرگاربووە. من واگومان دەکەم کە دەستەی گەلی ئیسلامی بۆ ژمارەیەکی زۆرتر لەم ژمارەیە (حەفتا و سێ دەستە) دابەش بوون.

نالێکیی[3] لە سەرەتادا لەنێوان خەلیفەکاندا سەری هەڵدا. نالێکیی یەکەم لەسەر ئەوە بوو کەکێ جێگای پێغەمبەر (د. خ) دەگرێتەوە. هەڵبژاردنەکەی عومەری کوڕی خەتاب (س) هەڵبژاردنێکی سەر کەوتوو بوو کاتێك بڕیاری دا کە بەرپرسیارێتی سەرکردایەتی مسوڵمانان بخرێتەوە سەرشانی هاوەڵی پێغەمبەر لەکاتی کۆچکردن دا، ئەوان کە پێکەوە لە ئەشکەوتەکەدا خۆیان شاردبۆوە. ((**أذ هما في الغار أذ يقول لصاحبه لاتحزن ان الله مَعَنا**)) ئیتر ئەوە بوو ئەبوبەکر هەڵبژێردرا و ئەو یەکەمین پیاوی پێگەیشتوو بووکە ریزەکانی بت پەرستانی بەجێ هێشت، و چوە ناو رێزی بانگەوازی ئیسلامەوە. لەسەردەمی خەلافەتی ئەم پیاوەدا — ئیتر کە بو بوو بە پیرێکی بە ساڵاندا چوو — یەکەمین جوڵانەوەی ترسناکی چەواشە دژ بە هەل و مەرجی نوێ روویدا، یان ئەوەی کە بە (جوڵانەوەی هەڵگەڕانەوە) ناوبرا، ئەو پیاوە توانی ئەوجوڵانەوەیە دابمرکێنێتەوە. پاش ئەمە خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی خەتاب کوژرا، و بەگیانی تولە ستاندنەوەیەکی نالێك بەگیانی شەریعەت تۆڵە لە بکوژەکە کرایەوە. هەروەها ((فیتنەی گەورە)) روویدا کەخەلیفەی سێیەم عوسمانی کوڕی عەفان تێییدابووە قوربانی. ئەوەبوو کە بە کۆمەڵە دەستێکی ئیسلامی کوژرا کە لەناو ریزی بکوژەکاندا کوڕانی هەندێك لە سەحابییەکانی تێدا بوو کە لە پێشەوەی هەموویان خەلیفەی یەکەم (ئەبو بەکر)بوو. پاش ئەوە شەڕی ناوخۆ لە بەینی خەلیفەی چوارەم (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)(س) و نەیارەکان و کێبەرکێکارانی لەسەر دەسەڵات سەری هەڵدا، هەر لەو کاتەدا سێ دەستە لەسەر فەرمانڕەوایی هاتنەکایەوە کە هەرکامیان رەوایی خۆی بۆ (خەلافەتی مسوڵمانان) رادەگەیانند. ئەم دەستانەش دەستەی خەلیفەی شەرعی (عەلی)وە کوڕانی زوبێر، وە بنەماڵەی ئەبی سوفیان کوڕی حەرب کە خۆی لەمعاویەدا دەنواند بوون، ئەوە بوو کە لە دواجاردا توانی سیفەتی شەرعیەت بە بەرحوکمی خۆیدا بکا کاتێك کە دامەزراندنی دەوڵەتی ئومەوی راگەیاند کە

---

(٢) حديث رواه بن ماجد عن عوف بن مالك في الجامع الصحيح رقم الحديث ١٠٨٣ و رواه أصحاب السنن الأربعة عن أبي هريرة.

(٣) نالێکی : خلاف.

ئەمەش پاش تیرۆکردنی خەلیفە عەلی کوڕی ئەبو تالیب بە دەستی ((خەواریج))ەکان هات، وە حەسەنی کوڕی دەستی لە خەلافەت بۆ معاویە هەڵگرت، ومعاویەش ئـەوەبوو لەسـاڵی ٤١ ی کۆچی بـەجۆرێکی ئاشـتییانە چـوە نـاو کوفـە ((ناوەنـدی عەلەوییـەکانی عێـراق)) و ئینجـا حەسەنیش خۆی و ئەوانەیش کە لەگەڵیدا بوون کوفەیان بـەجێ هێـشت و چـوون بـۆ مەدینـە.
ئەلێرە بە – شێوەیەکی کاتی - ململانێ لەنێوان دەسـتە ئیـسلامییە چـەکدارەکاندا کۆتـایی هات. لە دەمێك دا کە فتوحاتی ئیسلامی گەیشتبووە لوتکەی خۆی، وەنزیکی ئـەوەبێوە کـە بەرهەمەکانی بچنێتەوە. وە بەکردەوەش چنییانەوە بـەڵام کۆمەڵـە پێـشێلکارییەك روویانـدا و هەر لەمیانی ئەو فتوحاتانە پاساودرانەوە و تێپەڕکران. فەتح کاران نەیانتوانی ڕێنوێنییـەکانی خەلیفەی یەکەم  کە پێشکەش بە فەتح کارانی کردبوو، جێبەجێ بکەن، ئەوان وایان لێهـاتوبوو کە بە جۆرێك مامەڵەی دانیشتوانی ئەو وڵاتانە کە فـەتحیان کردبـوو، بکـەن کـە لەگـەڵ ئـەو بەهایانە نەدەگونجا کە خۆیان جاڕیان دابوو. بەتایبەتیش کە خەڵکی ئەو وڵاتانە زمـانی فـەتح کارانیان نەدەزانی، بەتایبـەتی لـەووڵاتی فـارس و کوردسـتان و ئـەرمینیا، پاشـان بـاکووری ئەفریقا، نەیاندەزانی مەرامی ئەوان چییە.

خەلیل عەبدولکەریم لەکتێبەکەی دا (الـصحابة و المجتمـع) لەبەشـی (المستوی الحضاری – الأدراکي) – دارسینا للنشر القاهرە. ١٩٩٨السفر الثالث ص  ٢٨٤ – پرسیار دەکـا و دەڵـێ: جیاوازی چییە لەنێوان غەزوی مسوڵمانان و هەر غەزویـەکی تـردا؟ غـەزوکار لەهـەر کـات و شوێنێکدا پەردەپۆشی بۆ غەزو کردنی خۆی دەدۆزێتەوە. جارێك بەناوی ئەوەی کولتوری خـۆی بڵاودەکاتەوە، جارێك بەناونیـشانی بڵاوکردنـەوەی زمـانی نەتـەوەیی خـۆی، یـان ڕاگەیانـدنی ئایینەکەی ، یان بەشارستانی کردنی میللەتانی دواکەوتوو، وەبـەم شـێوەیە، بـەنواڕینی ئێمـە ئیسلام ناتونێ تەحەمولی غەزوکردنێکی داگیرکاری بـۆ نیـشتمانەکانی تـر بکـا، تاڵانکـارانی زەوتکار و بەکۆیلەکردنی پیاوان و ژنان کە ئەو سەحابییانە پێی هەستاون، تەنانەت ئەگـەر لـە بابەتی ئەبوبەکر، عومەر، ئەباعوبێدە، سەعد کـوڕی مالـك و ابـی وەقـاس و خالیـدی کـوڕی وەلیدیش بن.... چونکە هیچ دەقێك (نە لە قورئان و نە لە سـوننە)دا نییـە کـە پـێ دانـان و چوونە نێو ووڵاتانی دیکە حەڵاڵ بکا، و و ئەوکردەوانە بکـا کـە لەووڵاتانـدا ئـەنجامیان داوە و دەرهەقی خەڵکەکەی کردوویانە- ئەو کردەوانە کە من – وەکو موسڵمانێك کـە پەیوەسـتە بـە ئیـسلامێتی خـۆی و شـانازی پێـوە دەکـا – هەسـت بـە شـەرمەزاری و سەرشۆڕیی دەکـەم لەبەرامبەریاندا و خەریکە تووشی سەر ئاوسـانم دەکـا لەکاتێکـدا کـە گـوێ بیـست دەبم یـان

دەخوێنمەوە کە کەسێك داکۆکی لێدەکا و ستایشی دەکاو وای دادەنێ کە لە خاڵە پرشنگدارەکانی مێژووی ئیسلامە.

ئەم نووسەرە هەروەها وەسفی سیماو هەڵسوکەوت و مەنتیق و جۆری چەکەکانی سەرکردەکانی فەتح کاران دەکا، و تابلۆیەك لەمبارەیەوە دەکێشێ کە لە بارەی حاڵ و چۆنییەتی ئەو غەزوکارانەوە کە سەرزەوینی شارستانێتیەکانی پێشوویان بەزاندوە دێتە ئاخاوتن و وێنایان دەکا. کاتێك سەرکردە رۆستەم پرسیار لە نێردراوی سەرکردە سەعد بن ئەبی وەقاس، لە بارەی رەفتاری توندو زبر و ئەوهۆکارانەی لێدەکا؟ ئەونێردراوە سەرسام دەبێ و وەڵام دەداتەوە: ئێمە نامانەوێ لەسەر جوانییەکانی ئێوە دابنیشین. خەلیل عەبدولکەریم دەڵێ: ئەگەر نێردراوی سەرکردە سەعد راستی بکردبایە دەیگوت: لەبەر ئەوەی ئێمە لەم جوانییانەی نێوەبێبەش بووین، ئەوا هەست بە کینەیەکی شاراوە دەکەین بەرامبەری. بەڵام لەبارەی ئەوەی کە ئەوان حەز ناکەن لەسەر ئەو جوانییانە دابنیشن، ئەوا مێژوو، سەلماندی، کاتێك ئەوان بوون بە شارستانی واتە عەرەبە موسڵمانەکان – بوونە خاوەن ژیار و بوون بە فەرمانڕەوا، سامان و ماڵ هاتە بەردەستیان بەو جوانییە سەرمەست و شەیدا بوون و سەوسەداسەری بوون و لە ئەڤینی ئەو جوانییەدا زێدەڕۆیشیان کرد، و بگرە زۆر دەس بڵاویشیان تا پلەیەکی پەستی و گەوجێتی تێدا کرد. کاتێك رۆستەم پرسیاری کرد کە هۆکار و پاڵنەری دەرچوونتان لەووڵاتی وشك و برینگی خۆتان چیە؟ نێردراوی سەعد بەهەموو ئازایەتییەکی کەلەسەر هەق بێ و بێ تۆسقاڵێك شەرم کردن وەڵامی دایەوە: ((بۆئەوەی ئەو کەسەی کە حەزدەکا لە پەرستنی کەسانەوە بیهێنینە دەرەوە بۆ پەرستنی خوا، وە لە بەرتەسکی دنیاوە بۆ بەرفراوانییەکەی، وە لە زوڵمی ئایینەکانەوە بۆ دادپەروەری ئیسلام)) ئەمەش ئەونەفسانەیەیە کە ئێستاش توێژەران و باسیاران تەنانەت لە نێو زانکۆکان و تێزە ئەکادیمییەکاندا دوبارەی دەکەنەوە. ئەمە جگە لەووتاربێژانی مزگەوتەکان و نوسەرانی رۆژنامەکان. خەلیل عبدالکریم المصدرالسالف. ص. ٢٧٥))

ئەوانە لەناکاو هاتن، کەس بانگهێشتی نەکردبوون، دانیشتوانی ئەو ووڵاتانە بەهەموو هێزی خۆیانەوە بەرووی ئەو فەتح کارانەوە راوەستان و، شەڕ و شۆڕی زۆر توندتیژ لەنێوان هەردوو لادا رووی دا، بەناوبانگ ترینی ئەوشەڕانە شەڕی (قادسیە) بوو کە لەنێوان سوپای ساسانی فارسی و سوپای مسوڵمانانداا روویدا، کە سەرکەوتن لەوشەڕەدا یاوەری لایەنی دووەم بوو کە پاش کەوتنەوەی قوربانی زۆر، قوربانیانی یەکجار گەورە بە دەست هات. یەکێك لە توێژەران دەڵێ: فەتح کاران خەڵکێکی نەناسراو بوون، ئەوان لەناکاو پەیدا بوون، و وایان لێهات

لەنێوان هەردوو شارستانێتی فارس و رۆمە بیزنتییەکان هاوئاهەنگ دەبوون. ئەو بیابان نشینە نەخوێندەوارانە، و رەوەندە گۆشە نشینانە بەخێرایی فێری خوێندەواری بوون و رۆشنبیربوون. پاشان کولتوری خۆیان – ئەو کولتورەی کە بەرەبەرە لە فتوحاتی وولاتی چینەوە درێژدەبۆوە تا دەگاتە چیاکانی پرانس لە ئیسپانیا[4] (ئەندەلوس)– بلاوکردەوە.

ئەوانە خۆیان لەهەل و مەرجێکی نوێدا کە لەوهەل و مەرجە ئالۆزتر بوو کە لەسەرەتای ژیانی دەوارنشینی خۆیاندا خوویان پێوەگرتبوو، ئالۆزتر دەبینی، ئەوان خۆیان لەنێو کۆمەڵە میللەتێکی دێرین و خاوەن شارستانێتی و زمان و سیستەمێکی کارگێری و کۆمەڵایەتی دا بینییەوە کە خاوەنی مێژوویەك بوو لە دەوڵەتی ناوەندیدا هەر لەبەرەبەیانی مێژووەوە. ئەلێرە فەتح کاران رووبەرووی یەکەمین کێشەی گەورە بوونەوە، ئەوان لە دارایی دورگەکەی خۆیان لە کولتور شتێکیان پێنەبوو جگە لە قورئانی پیرۆز) و هەندێك شیعر و زانستەکانی رەچەڵەکناسی و شتی لەم تەرزوبابەتە، ئەمەش توێشوویەکی تەواو نەبوو لە بەرامبەر هەموو ئەو گۆڕانانەی کە لە ژینگەی دەوارنشینی ئەوان جیابوو بەهەموو جۆرو بابەتەکانییەوە. بەتایبەتی قورئانی پیرۆز کۆمەڵێك رێکخستن و ئەحکامی گشتی تێدا بوو بەلام بێ ووردەکاریی، هەروەکو کە (د. سید محمود القمنی لە – الفاشیون و الوطن – دا باسی دەکا (المرکز المصري لبعوث الحضارة . مصر ١٩٩٩ ص٤٤)

عەرەبە مسوڵمانەکان وردەوردە لەو وولاتانە بنەجێ بوون. ئەوان دەبوون بەخاوەنی زەوی وزار، و خانوویان تێدا ئاوادەکرد بەلام لە روانینی ئیسلام بۆ خەڵکی غەیرە عەرەب، جیاواز بوو. ئەوان پێویستیەکیان لە پیادەکردنی ئەو ئایەتە پیرۆزەدا نەدەدی: ((أنا خلقناکم من ذکر و أنثیو جعلناکم شعوباً وقبائل لتعارفوا ان أکرمکم عندالله أتقاکم)) بابەتی ئەم (( التعارف)) ەی نێوان میللەتان و هۆزەکان، بەلای فەتح کارەوە بابەتێکی خۆشەویست نەبوو.. وەلێروانینی ئەوان بۆیان لێڕوانینێکی نزم و سوکایەتی بوو بۆ کەسانی غەیری خۆیان، بەمانای بۆ خەڵکی وولاتەکە. وە لەمبارەیەوە نموونە ئەوەندە زۆرە کە لە ژماردن نایە. ئەم لێڕوانینە نا شایستەیە چ بە مرۆڤ و چ بە ئیسلام، هۆکاری سەرهەڵدانی زاراوەی ئازار بەخشی ((مەوالی)) بوو.

کەچی ئەم زاراوەیە گۆڕانکاری بە سەرداهاتووە، وە بەڵگەگەلێکی زۆری ئایینی و دنیایی بەخشیوە، بەلام روونترین مانای بریتییە لە ((مرۆڤی موسڵمانی غەیرە عەرەب)) وە لە واقعیدا

---

(٤) هنري لوسيل مقدم كتاب (أضواء عربية على أروربا في قرون الوسطى. ترجمة عادل العوا. بيروت- ١٩٨٣ – ص ٦)

ئەم وەسف کردنە لە سەردەمی پێغەمبەردا سەری هەڵدا، وە زاراوەیەکی دەربڕی کە گوزارشت لە واقعێك دەکا کە دیارەدەی (مەوالی) بوونی هەیە: (الولاء لمن أعتق). بەڵام فەتح کاران هەروابەلێڕوانینێکەوە سەیری ئەو (مەوالی) یا نەیان دەکرد کە زۆر حاڵەتی نایەکسانی و زۆرداری و دەست درێژی تێدابوو وەهەروەکو ئەوەی ئیدی ئەوان بووبن بەخاوەنی گیانی ئەوان.

بەڵام ئەوان، واتە خەڵکی وولاّتی فەتح کراو، هەروا بەئارامی دانەنیشتن، بەڵکو پاش ئارام گرتنێکی کەم، بەرهەڵستی ئەوان دەستی پێکرد، ئەویش نەك دژی ئایینی نوێ کە خۆیان چوونەتە سەری، وە قەناعەتیان پێ کردبوو، بەڵکو دژی تێگەیشتنی بەرتەسك بۆ ئاین و بۆ فتوحات. وە فەتح کارانیش — پاش ئەوە کە لە وولاّتانی فەتح کراودا لەنیشتمانی کەسانی تردا، سەقامگیربوون، بەدووا کۆمەڵە دەقێکی ئامادەوە بوون کەبیان کات بەسەروەر، نەك بەمامۆستاو رابەر بۆ رێنوێنی کردنی ئایینی نوێ. لێڕوانینی خۆ بەباڵازانینی عەرەب لەم ئاینەوە سەرچاوەی نەگرتبوو، بەڵکو لەبەرژەوەندییەکانیانەوە سەرچاوەی گرتبوو بەو پێودانگەی کە ئەوان غەزوکار یان سەروەر بوون، چونکە بەڕوانینی ئەوان، ئەوا ماقووڵ نییە کە ئەوان — کە سەرکەتوون — لەگەڵ ژێرکەوتووانـدا یەکسان بن. وەتوانیشیان هەندێك لە ئایەتەکان بەجۆرێك تەفسیر بکەن و، هەێندێك فەرموودەش دابنێن کە پاساوی هەڵوێستەکەیان بداتەوە.

**((أهل الذمة))**

بریتین لە رۆڵەکانی وولاّتانی فەتح کراو لە دیانەکان و یەهود و مەجوسییەکان. د... تاد. ئەوانەی کە لەسەر ئایینی خۆیان، مانەوە و رازی نەبوون کە بچنە ناوئایینی موسڵمانانەوە واتا ئەوان چوونە ژێر داڵدەو زیمەتەوە لەبەرامبەر باجێك دا کە دەیاندا، وەجزیەش دیارترینی ئەو باجانە بوو. وەبەپێیی ئەم دەقە قورئانی یە تەسلیم دەکرا ((حتى يعطوا الجزية عن يد وهم صاغرون)) (سورة التوبة: الأية ٢٩) بەمانای ئەوان جزیە دەدەن و ملیان کەچ کردووە. وە مامەڵەکردنیان وێڕا بە هەموو جۆرەکانی سوکایەتی بەڕێوە چوو. بەتایبەتی لەماوەی حوکمی ئەمەویدا. ئەبو یوسف دەگێڕێتەوە کە خەلیفەی پاك و خۆپارێزی ئەمەوی عومەری کوری عەبدولعەزیز بۆ یەکێك لەکارمەندەکانی خۆی نوسیوە: أما بعد فلاتدعن صليبا ظاهراً الاكسر و محق، و لايركبن يهودي أونصراني علي سرج و ليركب علي الكاف) هەروەها ئەو جل و بەرگی لە بەریشیان دەکرد لە و جل و بەرگە جیا کرایەوە کە موسوڵمان لەبەری دەکرد. وە زانایانی ئایینی ئەم رێ و شوێنە پیادەکراویان رەت نەکردەوە و بەگژیدا نەچوونەوە و فەتوای راستیتی یان بۆ دەکرد. ئەبو حەنیفە نعمان و هاوەڵەکانی گوتیان: ((ينبغي أن لايترك أحد من أهل

الذمة بتشبه في لباسه ولافي ركوبه و لافي هينته بالمسلمين)) (كتاب الخراج. المطبعة السلفيه القاهره. ١٢٤٦هـ. ص ١٥١ — ١٥٢ وه ئەلماوردی — ٤٥٠ ك مردوه ئەو مەرجانەی پوختە کردوه کە دەبێ ئەهلی زیمە لەخەڵکی ترجیا بکاتەوە: یەکەم: جلێك لەبەر بکەن کە جیایان بکاتەوە. دووەم: خانووەکانیان نابێ لەخانووی موسڵمانان بەرزتر بێتەوە. سێیەم: نابێ لێدانی ناقوسەکان و خوێندنەوەی کتێبەکانیان ببیسترێ، هەروەها قسەکانیان لەبارەی عوزێر و مەسیحەوە ببیسترێ. چوارەم: نابێ کاتێ خواردنەوەی مەی دەربکەون، هەروەها نابێ خاچ و بەرازەکانیان دەربکەون. پێنجەم: ناشتنی تەرمەکانیان بشارنەوە و شیوەن و گریانی خۆیان دەرنەخەن. شەشەم: نابێ سوارانی ئەسپ بن، بەڵکو دەبێ تەنیا سواری ئێستر و گوێ درێژ بن. (الاحكام السلطانية و الولايات الدينية. بغداد. دارالحرية ١٩٨٩ص. ٢٢٩).

ئەلفرێد ڤون کریمر (Alfred von kremer) وای دەبینێ دانیشتوانە دێرینەکانی کە موسڵمان نەبوون تا رادەیەکی زۆر لەمافەکانیان بێبەش بوون (الحضارة الاسلامية و مدي تاثرها بالمؤثرات الأجنبية. تعريب د. مصطفي طه بدر القاهرة ١٩٤٧ ص ٦٩) بەڵام تریتون ( A. s. Tritton) دەڵێ: ئەهلی زیمە لەسەرەتای فتوحاتەکاندا — باجێکی گونجاویان دەدا کە برەکەی دیاری کراو بوو، بەڵام وردەوردە زیادی کرد تاوای لێهات ئەوەندەقورس بوو کە بە تێپەڕینی رۆژگار باری سەرشانیان قورس بکا. (كتابة أهل الذمة في الآسلام. ترجمة حسن حبشي . القاهرة ١٩٤٩.ص ٢٥٤ — ٢٥٥) بەتایبەتی لەسەردەمی خەلیفە عەبدول مەلیکی کوڕی مەڕوان دا.

وەبارودۆخی ئەوان لەسەردەمی عەبارسیدا بەرەو باشتر نەچوو وەگوشاری ئابووری کۆمەڵایەتی زیاتر بوو لەسەریان، وە خەلیفەکان سیاسەتێکی ستەمکارانەیان بەرامبەریان پەیڕەودەکردبە تایبەتی لەسەردەمی متەوەکیل دا.

بەرهەڵستی فەرمانڕەوایانی عەرەب بەشێوازو رەنگی جۆرەبەجۆر دەستی پێکرد.ئەوەبوو — بەتایبەتی مەوالی یەکان داوایا دەکرد کە لەمافەکاندا یەکسان بن ئەمەش بە پێی بنەمای ئایەتەکان و حەدیسەکان. پاشان بەرهەڵستی چەکدارانەیان دەستی پێکرد جا چ بەشێوەی بەشداربوونیان لە جوڵانەوە یاخییەکان و راپەڕینەکان یاخود خۆیان بەو جوڵانەوانە هەڵدەستان، یان بەهەوڵ دانیان بۆ لادانی بەنی ئومەییەدا خۆی دەنواند. وەلەم کارەیاندا سەرکەوتووبوون، ئەمەش کاتێك بوو کە سەرزەوینی دووردەستی وڵاتەکانی خۆیان کردە بنکەیەك بۆ دەعوەی عەباسی، و پاشان بەشداری چالاکانەیان لە راگەیاندنی دامەزرانی دەوڵەتی عەباسیدا، کە لە ماوەی گەشانەوەیدا مۆرکی خۆیانیان لێدابوو. وەکاتێك خەلیفەکان دەستیان کرد بە

لاوازکردنیان، بەم کارەش دەوڵەتەکەی خۆیان لاوازکرد کە بە پلەیەکی بنەڕەتی بەمێشك و بازووی پیاوانی فارس بنیات نرابوو. جا چ ئەو ڕۆڵە بێ کە ئەبوموسلیمی خوارسانی گێڕای، یان وەزیر، ئال محەمەد (ئەبو سەلەمەی خەلال و ڕۆڵی بنیاتنەرو مەترسیدا بەرمەکییەکان، و وەزیری دوو سەرۆکایەتی... ناد تا وای لێهات فارسەکانبوون بەوەزیر لە دەوڵەت و زانا و تەفسیرکاری قورئان و کۆکەرەوەی حەدیس، وەنووسەری مێژوو و جوگرافیا، وە فەلسەفە و زمانەوانی و گەورە شاعیرانی عەرەبی. وە ڕۆڵی بەرزی ڕۆشنبیری ئەوانشتێکی ناسراوبوو تاوای لێهات زۆربەی زانایان لە عەجەم بوون. وەبەپێیی ووتەی عەلامە ئیبن خلدون حەزرەمی تونسی لە (المقدمة)دا دەڵێ: (پیاوانی زانست زۆربەیان عەجەمن)[٥]. وە بەم شێوەیە: (ئەمەی کە لە واقیعەکەدا کارێکی سەیرو نامۆ بوو ئەمەبوو کە پیاوانی زانست لە میللەتی ئیسلامدا زۆربەیان عەجەمن. و لە ناو عەرەبدا پیاوی زانست نە لە زانستە شەرعیەکاندا و نە لە زانستە عەقڵییەکاندا تەنیا زۆر بەدەگمەن نەبێ.. بوونیان نەبوو، هۆکاری ئەمەش ئەوەبوو کە ئەم میللەتە هەر لە سەرەتادا زانست و پیشەسازی لە نێودا نەبوو ئەمەش بە پێداویستی حاڵی (هۆکاری) بنەماکانی دەبەنگی و (بەداوەت) بوو، و ئەحکامی شەریعەتیش کە بریتییە لە فەرمانەکان و قەدەغەکراوەکانی خواوەند، پیاوان دەماودەم (لەبەریان دەکرد) دەیانگواستەوە، و ئەوەی دەیانزانی و فێری بوون لە قورئان و سوننەوە یان لە خاوەنی شەرع و هاوەڵانییەوە بوو، و میللەتی ئیسلام ئەوساکە عەرەب و، کاری فێرکردن و نووسین و دانانیان نەدەزانی و هەروەها بەرەو فێربوونیشی هان نەدەدران و نە پێویستیشیان پێ هەبوو). ط دار الكتاب اللبناني للطباعة والنشر بيروت. ص ٤٧-٤٨ . پاشان لە چەند دێڕێکی تردا ئیبن خلدون دەڵێ: (پیشەسازییەکان بەرهەمی (شار)ن، عەرەبیش دوورترین کەی بوون لێی و جا بۆیە زانستەکان وایانلێهات بوون بەزانستگەلی شارستانیانە پاشان بڵاوبووەوە.

شارستانییان ئەوساکە عەجەم یاخود بەپێی ماناکەی ئەوانەی کە مەوالی یان خەڵکی شارستانی بوون، ئەوانەی کە پاشکۆی شارستانێتی عەجەم بوون یاخود بەردەستی ئەوان بوون لە کاروباری پیشەسازییەکان و پیشەکاندا، چونکە ئەوان لەو بوارەدا بەتوانابوون، هەر لە شارستانێتی خاوەن ریشەی ئەوانەوە لەسەردەمی دەوڵەتی فارسەکانەوە. خاوەنی (النمو) سیبویه وە (الفارسی)یش لە دوای ئەو، (الزجاج)یش لە دوای ئەوان، کە هەمووشیان

---

(٥) وشەی (عەجەم) لەسەردەمی سەرهەڵدان و لە پاش سەرهەڵدانی ئیسلامی بەهەرکەسێك دەگوترا کە عەرەب نەبوایە.

بەرەچەڵەك عەجەمن، بەزمانی عەرەبی پەروەردە بوون، و کردیانە قانون و هونەر بۆ ئەوانەی لە پاش خۆیانەوە دێن. هەروەها کۆکەرەوانی فەرموودەکان (خەویس) کە بۆ خەڵکی ئیسلامیان لەبەر دەکرد، زۆربەیان عەجەم بوون، یاخود هەر بەزمان و پەروەردە بەهۆی بەردەوامبوونی هونەر لە عێراقدا ببوون بەعەجەم: (ئەو رۆژگارو سەردەمە دانیشتوانی عێراق مەوالی بوون).

ئیبن خەلدون زیاتر لەسەری دەڕوا و دەڵێ: ئەوسا زانایانی (اصول الفقـه) هـەروەك زانـراوە هەموویان عەجەم بوون و هەروەها پیاوانی (علـم الكـلام) و پیـاوانی (تەفسیرکاران) و تـەنیا عەجەمەکانیش بوون کە زانستیان لەبەردەکرد و دەیـان نووسـییەوە و ئـەو قـسەیەی محمـد (د.خ) راستە کە دەڵێ: (لو تعلق العلم باكناف (اجنحة) السماء لناله قـوم مـن اهـل الفـارس) المقدمة ص ١٠٥٠، مانای ئەگەر زانست لە بن باڵی ئاسمانیش بوایـە خـەڵکانی فـارس خۆیـان دەگەیاندێ).

بەڵام لە بارەی زانستە عەقڵییەکانەوە. ئەوا لە نێـو میللـەتی عەرەبـدا وەدەرنەکـەوت تـا ئەوکاتەی کە پیاوانی زانست و دانـەران سـەریان هەڵـدا. زانـست وەکـو پیـشەسازی لـە نێـو عەجەمدا بوو و (عەرەب) پشتیان تێکردبوو، و وازیان لەوە هێنابوو کە فێری بین و تـەنیا ئـەو عەرەبانە خـەریکی بـوون کـە عەجـەم بـوون و بووبوونـە عـەرەب. لەمـەدا هـەروەکو حـاڵی پیشەسازییەکان وابوو هەروەکو لە پێشیاندا باسمان کرد. ئێـستاکەش لـە وڵاتـانی ئیـسلامدا، مادام شارستانێتی لە نێو عەجەم دایە، واتە لە وڵاتانی ئەوان لە عێراق و خوراسـان و ئـەودیو روبارەوە، هەر ئاوایە و وەکو پێشان ماوەتەوە) ص. ١٠٥٠ .

وە لە قۆناغی داهاتوودا، یان وێرا بەو قۆناغانە، عەجەم کۆمەڵە دەوڵـەتێکی خۆیـان یـان لەسەرەتادا میرنشینەکانی خۆیان لەسەرخاکی خۆیان لە ئێـران[٦] پێکـەوەنا. ئـەم کتێبـە کـە لەبەردەستی خوێنەران دایـە، بـە کۆشـی برایـان {رێبـاز مـستەفا – موسـا محمـد خـدر} وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی، لەبارەی گـەلانی دیکـەوە نـادوێ، بـەڵکو دانەرەکـەی کـە مامۆستای دکتۆر پرۆفیسۆری کۆچکردوو (عبدالحسين زەریـن کـوب) بـە لایـەوە گرنگـە کـە دەربارەی وڵاتی سەرفرازی خۆی، قسەبکا، ئەمەش بە تەواوی مافی خۆیەتی. ئێمەی کوردیش، بەشێوەیەك لەشێوەکان لەبارەی وڵاتی خۆشەویستمانەوە دەدوێین، لەبارەی مێـژووی دێـرینی،

---

(٦) ووتەی ئێران لە (ناریان) وە وەرگیراوە و بەمانای پاکژبووان، یان نەجیبان دێ. د- طـه ندا فصول من تاريخ الحچاره الاسلاميه. داراالنهچه العربيه. بيروت ١٩٧٦ — ص ١٠

بلاوبوونەوەی ئایینەکان لە وولاتی ئێمەدا زەردەشتی، مەسیحی، مانەوی، مەزدەکی و پاشان ئیسلام، هەروەها چۆن فتوحاتەکان سەرکەوتن و کوردستان بوو بە پاژێك لە جیهانی ئیسلامی.

ئێران، لەمێژووی دوورودرێژی خۆیدا، هەر وەکو زۆرێك لە نیشتیمانەکانی دیکە، رووبەرووی زۆر داگیرکاری بۆتەوە، بەلام هەموو جارێك بەسەربلندی لەومەینەتییانە هاتۆتە دەرەوە، و پاشان گۆڕاوە بۆ دەولەتێکی داگیرکەر، و نیشتیمانی ئەوانیتری داگیردەکرد، ئەوەبوو وولاتی ئەغریق و میسر و یەمەن و وولاتی هیندی داگیر کرد ... تاد.

دەربارەی فتوحاتی عەرەبی ئیسلامی، ئەوا ئەو وولاتانە خۆیان مسولمانانیان بۆ وولاتی خۆیان بانگهێشت نەکردبوو، بەلکو رووبەروویان وەستانەوە و بەگژیاندا چوونەوە و شەرو شۆڕی توندتیژیان لەگەلیاندا کرد، دیارترینی ئەو شەڕانە شەڕی بەناوبانگی قادسیە بوو کە لەسەرخاکی عیراق روویدا و تێیدا مسولمانەکان بەسەر فارسەکاندا زال بوون. لەسەرەتادا فەتح کاران هێزەکانیان دەگەیشتە هەر وولاتێك، بەر لەسەپاندنی جزیە بەسەر دانیشتوانی ئەو وولاتانەدا، مەرجەکانی خۆیان بەسەردا دەسەپاندن.جا ئەوەبوو دانیشتوانی ئەو وولاتانە دەبوایە یەکێك لەو سێ مەرجانە هەلبژێرن: یان ئیسلام قبول بکەن، یان شەڕبکەن، یان جزیە بدەن. مێژوو نوسی گەورە ((الطبری)) دەلێ: کاتێك کە عەرەب گەیشتنە مەداین (ئەوسا پایتەختی ساسانیەکان بوو لەهەرێمی عیراق) کە کۆشك و هەیوانی کیسرای لێ بوو، وە گەیشتنە کۆشکی سپی، کە لەوێدا بەرگریکاران خۆیان قایم کردبوو، داوایان لێکردن کە بچنە سەر ئایینی ئیسلام، ((فأن أسلمتم فلکم مالنا و علیکم ما علینا! و أن أبیتم فالجزیة، و أن أبیتم مناجزتکم نقاتلنکم حتي يحكم الله بيننا و بينكم)) واتا ئەگەر مسولمان بوون ئەوا چ مافیك بۆ ئیمە هەیە بۆ ئیوەش هەیە و ئەرکیکیش کە دەکەویتەسەر ئیمە دەکەویتە سەر ئێوەش. وە ئەگەر رازی نین ئەوا جزیە دەدەن وەئەگەر رەتی بکەنەوە جزیە بدەن.، ئەوا شەڕتان لەگەلدا دەکەین تا خوا حوکمی خۆی لەنێوان ئێمە و ئێوەدا دەدا. یەکیك لەوانە وەلام دەداتەوە و دەلێ: ((لاحاجة لنا في الاسلام و لا القتال، و لكن ندفع الجزية)) واتا پێویستیمان نە بەئیسلام هەیە و نە پێویستیمان بەشەڕیش هەیە. بەلام جزیە دەدەین. پاش ئەوە عەرەب ئیدی دەستیان کرد بە فەتح کردنی وولاتان یەك بەدوای ئەوی دیکەدا. وە ئەوان بەردەوام بوون لە راونانی ((یەزدگورد)) ئاخرین پاشای ئەوان کە تا دوا هەناسەی لە بەرهەلستی کردنی مسولماناندا بەردەوام بوو تا ئەوەبوو لە سالی ٣١ کۆچیدا (٦٥١ زانینی) لە سەردەمی خەلیفەی سێیەمی راشیدی (عوسمان) دا، پاش ئەوەی کە بیست سال پاشایەتی کرد، کوژرا، ئەو، بەپێی گێڕانەوەی ئەو مێژوونوسە کە بەڕەچەلەك فارسە، شازدە سالی لەبەربەرەکانی عەرەب دا بەسەر

برد، ئەو دەڵێ کە یەزدگورد تەنیا ماوەی چوار ساڵ لە خۆشیدا پاشایەتی کرد، وەشازدە ساڵ لەکوێرەوەری دا کە لەبەربەرەکانی عەرەب دا ژیانی بەسەر برد و ژیانیان پێ تاڵ کرد.[٧].

پاش سەرکەوتنی فتوحاتی عەرەبی، وەجێگیربوونیان لەو هەرێمە فەتح کراوانە، وەکۆتایی هاتنی شەڕوشۆڕی نێوخۆیی نێوان عەرەبە مسوڵمانەکان خۆیان، وە گواستنەوەی حوکم بۆ بنەماڵەی بەنی ئومەییە کوڕانی ئەبو سوفیان ((دوژمنی سەرسەختی پێغیەمبەر)) ئەم ئومەوییانە بەڕاستیان نەدەزانی یەکسانی لەنێوان فەتح کاران و فەتح کراوان دا ((خەڵکی ئەو وڵاتانە)) جێبەجێ بکرێ. وە ئەوان بانگەوازی یەکسانییان بە جۆرێك تەنازول کردن و زیانێك بۆ خۆیان دادەنا. چونکە تاکرەوی کردنیان لەسەر دەسەڵات کۆمەڵێك دەسکەوت و خاسیەتی بۆ ئەوان تێدا بوو. دەمارگیریی ئەو ئومەوییانە بەرامبەر بەرەگەزی عەرەبی، یان بۆ بەشێکی، دەمارگیرییەکی زۆرتوند رەوانە بوو، ئەمە شتێکی ناسراوبوو بەلای ئەوانەوە و شتێکی زرووبێ بەرهەم بوو بۆ مەوالی. داوای یەکسانی لەلایەن ئەوانەوە ئومەوییەکانی هان دەدا کە ئەوان بکوژن و زۆرداریيان لێ بکەن. وە کاتێك زمانی یەکێ لە شاعیرەکانی ئەوان هاتە گۆ (کە بڕیار وابوو بێدەنگ نەبێت) و شیعرێکی بەعەرەبی هۆنیبۆوە، غەزەبی خەلیفەی ئومەوی هشام کوری عەبدول مەلیکی مەڕوانی بۆ خۆی راکێشا. ئەو شاعیرە (ئیسماعیل کوڕی یەسار) رۆژێك چووەلای خەلیفە کە لەوکاتەدا لەسەر ئەستێرکی کۆشکەکەی لە رەسافەی شام دانیشتبوو، شاعیر دەستی کرد بە گوتنی شیعری شانازی هەڵدان بەسەر عەجەم دا، خەلیفەش وای گومان دەکرد کە قەسیدەکە لە ستایشی ئەودا دەڵێ:

يا ربع رامة بالعلياء من ريم هل ترجعن اذا ماحييت سليمى

ثم يقول:

| | |
|---|---|
| أصلي كريم و مجدي لايقاس به | ولي لسان كحد السيف مسموم |
| أحمي به مجد أقوام ذوي حسب | من كل قرم بتاج الملك معموم |
| من مثل كسري و شا بور الجنود معا | والهرمزان لفخر او لتعظيم |

هشام تووڕە بوو و لە حاڵی خۆی دەرپەڕی و جنێوی بە شاعیردا، و پێی گوت: شانازی بەچی یەوە دەکەی هەی کەرە کێوی؟ بەچی ستایشی خۆت و قەومە (کەرەکێوی) یەکەت دەکەی؟ پاشان فەرمانیدا بیخەنە ناو ئەو ئەستێرکەکەوە کە لەبەر دەمی بوو.

شاعیرانی تری فارس هەن کە ئەوانیش کەوتونەتە بەر غەزەبی حاکمەکانەوە. ئەوەتا

---

(٧) تأريخ الرسل والملوك - ٤٨

((ابوالمهيار الديلمي)) له قەسیدەیەكدا كە بە ((أعجبت بي))[٨] ناسراوە گۆرانی بۆ سەرفرازیی میللەتەكەی خۆی دەڵێ:-

أعجبت بي بين نادي قومها ذات حسن فمضت تسال بي
سرها مل علمت من خلقي فا ارادت علمها ماحسبى
لاتخالي نسبا يخفضني انا من بر ضيك عندالنسب
قومي أستولوا علي الدهر فتي و مشوا فوق رووس الحقب
عمموا بالشمس هاما تهموا وبنوا ابيا تهم بالشهب
و ابي كسري علي ايوانه اين في الناس اب مثل ابي
قد قبست المجد عن خيراب و قبست الدين عن خير نبى
فضممت الفخر من أطرافه سؤدد الفرس و دين العرب.

لەراستیدا ئەگەر قەسیدەی ئەو شاعیرە فارسانە كۆبكەینەوە كە تێدا گۆرانی بۆ سەرفرازییەكانی خۆیان دەڵێن و شانازی بە پێشینانی خۆیانەوە دەكەن، ئەوا چەند بەرگێك كتێب كۆ دەبێتەوە، هەروەكو كە بەكردەوە كۆكراوەتەوە. ئەم قەسیدانە سینەی رەگەزپەرستانی عەرەبی پڕ لە كینە و بوغز كردوە. وە ئینجا دێن ((تۆمەتی)) شعوبیەت)) و رق بوونەوە لەعەرەب یان تۆمەتی زەندەقە و لەدین وەرگەڕانیان بەسەردا دەدەن.

فارسەكان – هەروەها مەوالی بەشێوەیەكی گشتی – ئازار و دەردێكی توندیان لە بەرنجامی، ئەو رەوانینە سوكایەتی ئامێزە چێشت، كە هەرخۆی سوكایەتی بۆ ئەوشتانە تێدایە كە ئیسلام بانگەوازی بۆ دەكا. وە وای لێهات ئەو كەسەی كە داوای یەكسانی دەكرد بە دەرچوو لە ((قانون)) و رەگەزپەرستەكان دادەنرا، گەرچی تەنیا داوای جێبەجێ كردنی ئەو ئایەتەجوانەی دەكرد:

((و جعلناكم شعوبا و قبائل لتعارفوا، ان أكرمكم عندالله أتقاكم)) ئومەوییەكان و هاوشێوەكانیان ویستیان ئایەتەكە بەم شێوەیە بێ: ((ان اكرمكم عندالله اعرقكم عروبة)) وليس أتقاكم)).

---

(٨) گۆرانی بێژ و میوزیك كاری ناوداری میسر (محەمەد عەبدولوەهاب) لە بۆنەیەكی دیپلوماسی نێوان میسر و ئێران دا لەسەردەمی شای ئێران و مەلیك فاروق دا، كە پەیوەندی ژن و ژنخوازیی لەنێوان ئەو دووپاشایەتیەدا هەبوو، ئەمەی بەگۆرانی گوت.

هەر بۆیە ئەوانەی کە بانگەوازیان بۆ ((مساواة)) دەکرد بە (أهل التسویة)) ناودەبران و ((خەوارج)) ەکانیش دیارترین دەستەی ئەو بانگەوازکارانە بوون.

ئەگەرچی دەوڵەتی عەشیرەتی ئومەییە توانی مەوالی دابمرکێنێتەوە و بە بێگاروسوخرە و دانی باجەکان شەکەتیان بکا، بەڵام ئەو دامرکاندن و بێبەش کردنە لە مافەکانی یەکسان بوون، وە بەرەنجامی ئەمانەش لە ئازار و رەنج و خۆخواردنەوە، تەقینەوەیەکی لەناویاندا بەرپاکرد، و حاڵەتی تووڕەیی لە سەردەمی دەوڵەتی داهاتوودا، بۆ ماوەی پتر لەدووسەدەی خایاند، لەبەرئەوە شتێکی چاوەڕوانکراو بوو کە بچنە پاڵ – یان سەرکردایەتی – جوڵانەوەی نارەزایی بکەن، جوڵانەوە گەلێك بۆ گوزارشت کردن لەخودی خۆیان، وە داکۆکیکردن لەمافەکانی خۆیان، وە بۆ دانانی سنورێك بۆ بێدەنگ کردنیان و کپ کردنەوەی دەنگەکانیان. هەر بۆیەکارێکی سەیر نییە کە فارس سوتەمەنی ئەوشۆڕشانە بن کە مەرامیان گەیشتن بەدەسەڵات بوو. بۆیە شۆڕشی – موختار – بۆ نموونە – کە داوای مافی عەلەوییەکانی – شالی بەیت – کرد بە شێوەیەکی گەوهەری پشتی بە بازووی مەوالییەکان بەستبوو. ئەو سەرکردە عەرەبە – واتە ختار – بۆ ئەوەی سەرکەوتنی شۆڕشەکەی زامن بکا، کۆمەڵێك ئیمتیازاتی بە موالییەکان بەخشیبوو کە لێی بێبەش کرابوون، وەوای لێکردن هەست بەوە بکەن کە ئەوان لەگەڵ عەرەبەکاندا یەکسان بوون. ئەوکاتە بیرۆکەی (( مساواة)) حاکمەکانی هاروقوشقی دەکرد. ئەوەتا دەبینینی ((شبث بن ربعي)) لە ئاخاوتنیدا کە ئاراستەی موختاری کردوە تووڕەیی سەختی دەردەبڕێ و دەڵێ: (عمدت الي موالینا وهم فیئ[9] افاءه الله علینا و مع بلادهم جمیعا، و قد جعلتهم شرکاء لنا في فیئنا) – الطبری – ٤) ٥١٨. (تۆ لەگەڵ مەوالییەکانی ئێمەدا بووی بەیەك ئەوانە دەسکەوتی ئێمەن خوا ئەوان و هەموو وولاتەکانی ئەوانی بەدەستکەوت داوە بەئێمە، تۆ لەو دەسکەوتانەدا کردووتن بەهاوبەش لەگەڵمان) بانگەوازی موختار بۆ یەکسان بوونی هەردوو رەگەز – عەرەب و غەیرە عەرەبی – هانی ئەریستوکراتیی عەرەبی[10] لە کوفە دا و و پاڵی پێوە نان کە شەڕی موختار بکەن. چونکە بەڕوانینی ئەوان مانای وا بوو کە مەوالی لەگەڵ ئەواندا "یەکسان" بن، وە لە رێگەی ئەو (فیئ) ەوە کە بەریان دەکەوت ئاستی مادی ئەوان بەرز دەبۆوە، پاشان لەگەڵیدا ئاستی مەعنەویش، ئەمەش ئەوەبو کە عەرەب قبوڵی نەکرد یان قبوڵی ناکات، چونکە بەروانینی ئەوان مەترسی لەسەر نفوزی ئەوان هەیە. لێرەدا دەقێکی راشکاوی - الطبري –

---

(٩) الفي: دەسکەوتی جەنگ

(١٠) سوودمەندان لەزەوی و سامانی نیشتیمانی کە سانی تر پاش فتوحات کە پاش دابەش کردنی بەسەر حاکمەکان و سەرکردەکان و سەربازەکان دێت.

دەهێنینەوە، ئەو والی یە کە عبدالله کوڕی سەحابی زوبێر کوڕی عەوام دیاری کردوە بۆ کۆکردنـەوەی شوێنکەوتووانی خۆی و هانیان دەدا کە شـەڕی موختـار بکـەن و پێیـان دەڵـێ: (أيهاالنـاس ان مـن أعجب العجب عجزكم عـن عـصبة قليـل عـددها! خبيـث دينهـا![11] أخرجـوا اليـهم، أمنعـوامنهم حريمكم، وقاتلوهم عن مصركم ((دياركم)) و أمنعوا منهم فيئكم، والاخـولله ليـشاركنكم في فيـئكم من لاحق له فيه! ولله لقد بلغني أن فيهم خمسمانترجل، عليهم أميرمنهم، وأنما ذهاب (خسارة) عزكم و سلطانكم، وتغير دينكم! حين يكثرون. (الطبري ٤/٤٥٤) ئەم دەقە جەخت لەوە دەكاتەوە کـە هـیچ ناڵێکی (خلاف) یان جیاوازییەك نییە لە نێوان ئەریستوکرا تییەتی کوڕانی زوبێر و نـەوەکانی ئـەبو سوفیان و نەوەکانی عەباس.

لەراستیدا والی خەلیفە عەبدولای کوڕی سەحابی زوبیر بن عەوام، کە یەکێکـە لـە دەکەسـەکانی مژدە پێدراو بە بەهەشت، لەگەڵ کۆمەڵەکەی خۆیدا راستگۆ بـوو. چـونکە (علـوج)[12] ی عەجـەم، ئەمانە ماقووڵ نییە لە مافەکانیاندا لەگەڵ عەرەبە موسڵمانەکاندا یەکسان بن . لە بەر ئەوە حـاکمی کوفە زوبیری هانای بۆ نەیارە ئومەوییەکەی خۆی (المهلب بن أبي صـغرة) برد، پاش ئەوە کە هەسـتی شکۆمەندیی عەرەبیانەی دژ بەمەوالی تێدا هێنایەخرۆشان. ئەوان دەیانگوت: ان نساءو نـا و أبناءنـا و حرمنا، غلبنا عليهم عبيدنا! و مواالينا (الطبري ٤/٥٥٩) ئەم قسە ناودارە کاریگەرییەکی چـاکی لە دەروونی ئومەوییەکان کرد. (مهلب) بە سوپاکەیەوە، وەدەرکەوت و پاڵی دایە سوپاکەی (مصعب بن زبیر) لە بەسرە. وە لە دواجاردا سوپاکەی (مصعب بن زبـیر) لە بەسرە. وە لە دواجاردا ئەم سـوپا عەرەبییانە توانییان شۆڕشی مـەوالی لـە عـیراق دا بـە سـەرکردایەتی موختـار لـە نێوبـەرن. ئـەم سەرکردەیەش موختار – کە لە هۆزی (ثقیف) ی عەرەبی تایف بوو، روانینێکی جیـاوازی بەرامبـەر مەوالی لە روانینی باقی سەرکردەکانی دیکـەی عـەرەب لـە لانـەبوو ئەگـەر بهاتبایـە سـەرکەوتنی بەدەست هێنابا. وەکاتێك حەجاج کوڕی یوسف سەقەفی – کە بە ناوبانگ ترین پیاو و والی دەوڵـەتی ئومەوی و خوێن ڕێژترین کە سیان بوو – بەوالی عیراق دیاری کرا، بەدەست خەلکی موالی عیراقەوە تەنگەتاو بوو، ئەوەبوو بەڵاوماڵ و وێرانیی بەسەرهێنان، وەکۆمەڵەکەی تارومـار کـردن تـا جـارێکی دیکە کۆنەبنەوە و بەهێز نەبنەوە زمان حاڵی حەجاج بە دەست ئەوانەوە دەیگوت:

---

(١١) ئەمە سەرەڕای ئەوە کە هاتبوونە ناو ئیسلامیشەوە.

(١٢) علوج: ئەم زاراوەیە وەسفێك بوو کە غەزوکاران بەسەر خەڵکی وولاتانی فەتح کراویان دابڕی – تەنانەت دوای ئەوەش کە هاتبوونە ناو ئیسلامەوە.

((أنتم علاج و عجم، و قراكم أولى بكم)) جا ئەوە بوو گێڕانیانەوە بۆ گوندەکانی خۆیان، دەدەستیان کرد بەزەوی کێڵان، بۆ ئەوەی ببنە سەرچاوەی دانی باجەکان بە شەرعی و نا شەرعییەوە. وە دینار و درهەم بۆ حاکمە سەرکەتووەکان بهێنین.

دەوڵەتی بەنی ئومەییە، پاش ئەوەی بە هەردوو لقەکەیەوە ((لقی بەنی سوفیان و لقی مەروان کوڕی حەکەم) کە ماوەی نۆ دەیە (٤١ – ١٣٢ کۆچی، ٦٦١ – ٧٤٩ز) حوکمی کرد، لێك هەڵوەشاو: و لە جێگەی ئەودا بنەماڵەیەکی دیکەی عەرەبی لە حوکمی موسڵمانان جیگەی گرتەوە کە بنەماڵەی عەباسیەکان بوون کە رەچەڵەکی بۆ سەر عەباس مامی پێغەمبەر (ص) دەچێتەوە. لە دامەزراندنی ئەم دەوڵەتەدا کە سایەتی گەورەی فارس رۆڵیان تێدا گێڕا، و بگرە لەسەرشانی ئەوان دامەزرا، هەروەکو لە پێیشان باسمان کرد. لەوانە ئەبو سەلەمەی خەلال کە عەباسی سەفاح و ئەبا جەعفەری مەنسور (ئەم دوانە یەکەمین خەلیفەی عەباسی بوون) لای خۆی پەنا دا کاتێك کە بەرەوکوفە هەڵاتن دوای ئەوەی کە براکەیان ئیبراهیم ئیمام بەدەستی مەروان کوری محمد دوایین خەلیفەی ئومەوی کە بە (مروان الحمار) ناسرابو، کوژرا، هەروەها دەستی کرد بەکاری بانگەشەکردن بۆ بنەماڵەی ئال عەباس. پاشان بانگەشەکەی خۆی – بە پێی هەندێك ریوایەت – بۆ کوڕانی عەلی کوڕی ئەبو تالیب – گۆڕی، وە سێ کەسی لە پیاوماقوڵانی ئەوان نارد، کە بۆ خەلافەت کاندیدی کردبوون، بەڵام کوڕانی عەلی حەماسەتێکیان بۆ بیرۆکەکە پیشان نەدا، و بانگەوازەکەیان بەساردییەوە وەرگرت و گرنگییەکی جیدیان پێ نەدا ئەوەبوو کاتێك بانگەشە بۆ ئالی عەباسی سەرکەوت و بەیعەت درا بە بەعەباسی سەفاح بۆ خەلافەت، هەواڵی پێگەیشت کە (تەشیوع)) ی بۆ ئالی عەلی هەیە، کوشتی. وە ئەو کوشتنەش خراپەکارییەکی کاریگەر بوو بۆ سەر رەگەزی فارسی. بەڵام سەفاح توانی کە هەڵوێستەکە رێك وپێك بکاتەوە و بە حیکمەتەوە چارەسەری وەزعەکە بکات و لەگەڵ ئەبوموسلیمی خوراسانی دا رێك بکەوێ. ئەوەبو موسلیمی خوا راسانی لەگەورەترین کە سایەتییە فارسەکان بوو کە دەوڵەتی نوێ متمانەی لەسەر دەکرد. ئەو بەنهێنی بانگەوازی رێك دە خست تا ئەوکاتەی کاروباری بەنی ئومەییە لەسەردەمی دوایین پاشایاندا رووی لە شێواوی کرد ئینجا بانگەواز خۆی دەرخست و ئاشکرا کرا. ئەبو موسلیم کۆمەڵێکی گەورەی لە خەڵکی خو راسان کۆکردەوە، و بەرەو شەڕی والی ئومەوی (نصر بن سیار) ئاراستەی کردن و توانی هێزەکانیان تێك بشکێنێ، پاشان رووی کردە عیراق کە لەوێ سەفاح نیشتەجێ ببوو، لەساڵی ١٣٢ی کۆچی – ٧٤٩ی زایینی بە یعەتی بۆ خەلافەت دایە و دەوڵەتی ئومەوی کۆتایی پێ هات و دەوڵەتێکی دیکە لەسەر کەلاوەکانی ئەو دامەزرا. مەنسور خەلیفەی دووەمی عەباسی، برای سەفاح، هەزاران حسابی بۆ ئازایەتی و نفوزی سەرکردەی خوراسانی کرد، و توانی بیخاتە نێو تەڵەوە و بەشێوازێکی دوور لە

جوامێری توانی بیکوژێ. بەڵام سیاسەت و بەرژەوەندی دەوڵەت ساوا گوێی بە چەمکەکانی پیاوەتی و لێکدانەوەی مێژوو نەدا، واهەیە کە کارێکی نامەنتیقی دەگۆڕێ بۆ کارێکی مەنتیقی، و دەگۆڕێ بۆ واقعێکی قبوڵ کراو یان بە پێچەوانەوە بە پێی جیاوازییەکانی بەرژەوەندەکانی نۆرینەکانی لایەنەکان و کە سانی تایبەتمەندیی لەمێژوودا.

رەگەزی فارسی روو بە بەهێزبوون بوو، رۆڵی بنچینەیی بەرمەکییەکان کەپێگەی فارسەکانی دەنواند گەیشتە لوتکەی خۆی لەنێو دەوڵەتی بەنی عەباس دا لەبواری دامەزندنی پەیکەری کارگێڕی و دارایی دەوڵەت هەر لەسەرەتای دامەزراندنیدا. فەزڵ کوڕی یەحیا کوڕی خالیدی بەرمەکی، خەزیرەران دایکی خەلیفە هارون رەشید شیری دابوویە. هەروەها دایکی فەزڵ شیری دابوو بە رەشید کە بوو بە پێنجەمین خەلیفەی عەباسی.

ئەمەش مانای وایە تێکەڵاوییەکی خێزانیی لەنێوان ئەریستوکراتیەتی ئێرانی و عەباسیدا هەبوو، تا ئەوەبوو کە جەعفەری کوڕی یەحیا(عەباسە) ی کچی خەلیفە و خوشکی رەشیدی هێنا.

بەڵام نفوزی بێ هاوتای بەرمەکییان درێژەی نەکێشا، رەشید دەستی کرد بە کوشتنیان و لە جوڵانەوەیەکی دا کە بە مەینەتیی بەرمەکییان ناوی دەرکرد، قەڵاچۆکران[١٣] ئەم مەینەتییە پاکسازی حساب بوو لەنێوان رەگەزپەرستاندا، وە سەرەتایەك بوو بۆ سەردەمێك کە دەوڵەت تێیدا لاواز دەبوو وە ئەم مەینەتییە – بۆ شاییەکی گەورەی لەزوربەی بەرێوەبەرایەتیەکانی دەوڵەت دا بەجێ هێشت. لەمبارەیەوە (الحشیاری) دەڵێ:

کاتێك رۆڵی بەرمەکییەکان کۆتایی پێهات! کاروباری دەوڵەت تێك و پێك چوو (کتاب الوزراء والکتاب مطبعة مصطفي الباب حلبی. القاهره ١٩٣٨ ص ٢٥٨). هەوەرها رەشید لە بارەی فەرمانانەی خۆیەوە دەرهەقی بەرمەکیەکان دابووی پەشیمان بۆوە، تەنانەت بۆیان گریابوو (ابوفرج الاصقهانی – الاغاني ١٧/ ١٥٣). کاتێك کە لە گرتووخانەدا بەندکرابوو، لەو حاڵەدا رەشید قسەی نەستەقی خۆی دەکاو دەڵێ: ((مات و الله يحي، ومات الجود و الكرم، والله لوكان حيا لفرجت عنه. رقال: أضربوا ياسر السياف، فأني لا أقدر أنظر الي قاتل جعفر (المسعودي: مروج الذهب: ١٢٥/٤) هەروەکو ئەوەی رەشید بکوژی راستەقینەی جەعفەر نەبووبێ.

ئەو – مەینەتییە – ئەڵقەیەك بوو لە زنجیرەیەك پاکتا و کاری پیاوانی هەڵکەوتەو بلیمەتی فارس، بەپێی نەریتێك بەرێوە دەچوون کە دەقەی ئاوابوو: (أن سوء الظن من حسن الفطن). هەروەها

(١٣) انظر کتاب ( د. هولو جودت فرج): البرامكة: سلبياتهم و أيجابياتهم. داراالفكر اللبناني للطباعة و النشر بيروت ١٩٩٠

بەپێی وەسیەتی (أبراهیم الامام) برای سەفاح و مەنسور — بۆ سەرکردەکانی کە ئەو فەرماندانەی گومانیان لێ دەکرێ بیانکوژن.

پاش رەشید، مل ملانێ لە نێوان هەردوو رەگەزەکەدا — لەبەر هۆکاری جۆربەجۆر — پتر تین و تاوی ستاند، وەئەمەش لەسەر پەیوەندی نێوان دووکورەکەی ئەمین و مەئمون کە دایکیان جیا بوو رەنگی دایەوە. لەمەش دا سەرکەوتن یاوەری مەئمون بوو کە دایك و ژنەکەشی فارس بوون، وە ئەمین (کوری زبێدە) ساڵی ۱۹۸ کوچی — ۸۱۳ زانینی) کوژرا. سەرکەوتنی مەئمون لە بەرژەوەندی رەگەزی فارسی بوو. ئەوەبوو مەئمون خەلاتی سەرکردەی سوپاکەی خۆی - تاهیری کوری حسین- ی بە خەلات و پاداشتێکی دەست بلاوانە دایەوە و کردی بەوالی بەسەر ویلایەتی رۆژهەلاتەوە. ئەم ویلایەتە سەرەتای دامەزراندنی ویلایەتی تاهیری بوو، ئەم ئەمارەتە یەکەمین قەوارەی فارسی بوو کە لە ناو ئیسلام دا سەری هەڵ دا. بەدامەزرانی ئەم قەوارەیە رەگەزی فارسی وای لێهات کە لە ژینگەی عەرەبی جیا بێتەوە و لە ژینگەی ئە سلی خۆیدا جێگیر ببێ و لەو واقیعی حاڵەی دەوڵەتی عەباسی سەربەخۆ ببێ. هەروەها ئەمە وەکو کۆتایی هاتنێکی (سەردەمی بێدەنگ بوون) بوو کە ماوەی دووسەدە زەمەن درێژەی کێشا. وە رۆژێك دێت کە ئیتر بێدەنگی کوردیش- سەرتاپای کورد کۆتایی دێت، رۆژگارێك کە زۆر درێژەی کێشا.

❊ ❊ ❊

کارێکی سوودبەخش دەبێ کە کۆتایی ئاخاوتنمان بەوگوتەیە بهێنین: فارسەکان خاوەنی دەست و بازوو گەلێکی سپی بوون کە بۆ ناوگشت مەیدانەکانی شارستانێتی ئیسلامی درێژ ببۆوە. رۆڵی ئەوان لە توێژینەوەی هەموو زانستەکاندا وەدەرکەوت: چ لەسەر ئاستی زانستەکانی ئایین یان زانستەکانی زمانی عەرەبی و ئادابی عەرەبی، سەرەرای رۆڵی ئەوان لە دیراسە کردنی زانستە سروشتییەکان و بیرکارییەکان، هەروەها لە زانستەکانی مێژوو جوگرافیا و ئاداب و سیاسەت و بەرێوەبردنی دەوڵەت داوە لە زانستەکانی ئایین دا ئەوان پێشەنگ بوون. ابن عبد ربە لەکتێبەکەی دا (العقد الفريد) کە لە زمانی (أبن أبي ليلي)وە دیگێرێتەوە دەڵێ: عیسای کوری موسا کە دەمارپەرستیی توندی بۆ عەرەب هەبوو لێی پرسیم:

- من كان فقيه البصرة

أجبت:

- الحسن بن الحسن و محمد بن سيرين.

فسأل: فما هما؟ فقلت موليان.

قال: فمان كان فقيه مكة؟ قلت:

- عطاء بن رياح و مجاهد بن جبر و سعيد بن جبر وسليمان بن يسار. قال: فما هؤلاء؟

قلت: موالي. أبى

ثم سأل: فمن همم فقهاء المدينة؟

قلت: زيد بن أسلم و محمد بن المكدد و نافع بن نجيح. قال: فما هؤلاء؟ قلت: موالى. فتغير لونه.

ثم سأل: فمن أفقه أهل القباء؟

قلت: ربيعة و بن أبي الزناد.

قال: فما كانا؟ قلت: من موالي

فأريد وجهه. ثم قال: فمن كان فقيه اليمن؟ قلت: : طاووس و أبنه و وهب بن منبه. قال فما هؤلاء؟ قلت: من موالي.

فانتفخت أوداجه (له تورەیی و رق دا دەمارەکانی هەڵ ئاواسان)

وأ نتصب قاعداً.

ثم قال: فمن كان فقيه الخراسان؟ قلت: عطاء بن عبدالله اخراساني. قال: فما كان هؤلاء؟

قلت: موالي. فازداد وجهه تربدا، و أسوداداً حتي خفته.

ثم قال: فمن كان فقيه الشام؟

قلت: مكحول. قال فما كان مكحول هذا؟

قلت: موالي.

فازداد تغيظاً و ضيقاً ثم قال: فمن كان فقيه الجزيرة؟

قلت: ميمون بن مهران. قال: فما كان؟

قلت: موالي. فتنفس الصعداء. ثم سأل:

فمن كان فقيه الكوفه؟

فوالله لولا خوفي منه لقلت: الحكم بن عينه، و عمار بن أبى سليمان. و لكن رأيت فيه الشر. فقلت:

أبراهيم والشعبى. قال: فما كانا؟

قلت: عربيان. فصاح: الله أكبر. و سكن جأشه (العقد الفريد) طبعة القاهرة ١٩٤٢. ٤١٥/٣).

# چەند سەرنجێکی پێویست بۆ چاپی کوردی

دوو ساڵ خەریکی وەرگێڕانی (دوو سەدە بێدەنگی) بووین تاکو سەرەنجام توانیمان ئەم کتێبە ناوازەیەی نووسەر و بیرمەندی گەورەی ئێرانی (دکتۆر عەبدولحوسەینی زەڕینکوب) بخەینە بەردەستی خوێنەری کورد و قوژبنێکی کتێبخانەی گەلەکەمانی پێپڕبکەینەوە. دڵنیاین کە ئەم کتێبە بایەخێکی زۆری هەیە بۆ کتێبخانەی کوردی بەتایبەت بۆ ئەوانەی کە لە بواری مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستی کورد و ناوچەکەش بە گشتی کاردەکەن. هەست بە بەختەوەریەکی زۆر دەکەین کە بەم وەرگێڕانە توانیبێتمان ئەرکێکی نەتەوەیی سەرشانمان ئەنجام دابێ و خزمەتێکمان بە رەوتی نووسین و پێشکەوتنی رۆشنبیریی گەلەکەمان کردبێ، خۆزگەش دەخوازین هەموو ئەوانەی کە شارەزاییان لە زمانی خۆمان و زمانە بیانییەکاندا هەیە هەوڵ و تواناکانیان زیاتر بخەنەگەڕ بۆ ئەوەی ئەو کتێب و نووسینانەی کە کتێبخانەی کوردی پێویستی پێیان هەیە جا لە هەر زمانێك بێ، بخەنە نێو کتێبخانە هەژارەکەمانەوە.

پێمان وایە کاتی ئەوە هاتووە بواری وەرگێڕان فراوانتر بکرێ و هەوڵ بدرێ کتێبە کوردییەکانیش وەربگێڕدرێنە سەر زمانەکانی تر.

ئەم بەرهەمەی بەردەست دەبوا زۆر زووتر بکرایەتە کوردی چونکە زۆربەی هەرە زۆری ئەو زوڵم و مەینەتەی کە بە درێژایی ئەو دوو سەدەیە لە گەلانی ئێران کراوە، بەشی هەرە زۆری بەر گەلی کورد کەوتوە و بە شێوەیەکی بێلایەنانە لە دوو توێی ئەم کتێبەدا خراوەتەبەر دیدەی خوێنەر. بەپێی بەڵگە مێژووییەکان وڵاتی کوردان ئەودەمی و ئێستاش ناوەندی ململانێ و تەراتێنی داگیرکەران و دوژمنانی خوجێی بووە، بەتایبەت لە سەرەتای پەلامارەکانی ئەو دوو سەدەیەی کە ئەم کتێبەی لەسەر نووسراوە.

ئاشکرایە زۆربەی خوێنەران خوویان بەوە گرتووە کە گرنگی هەرکتێبێك لە پێشەکیەکەی دابخوێننەوە، لایەنێکی گرنگی نووسینی پێشەکیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە خوێنەر رشتتر دەبێ لە خوێندنەوەی بابەتەکەو باشترکاتی خۆی بۆ تەرخان دەکات. بۆیە بە پێویستی دەزانین زۆر سوپاسی بەڕێز پرۆفیسۆر دکتۆر (موحسین محەمەد حسێن) بکەین کە وێڕای ئەوەی پێشەکیەکی بەپێزی بۆ ئەم کتێبە نووسیوە هاریندەریشمان بووە لە وەگێڕانی کتێبەکە.

هەر لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین کە ئێمە چاپی سێزدەی دەقە فارسییەکەمان وەرگێڕاوە، بێگومان ئەم کتێبە لە ئێراندا بایەخێکی زۆری پێدراوە و بەدەیان وتار و نووسین و کۆڕو وسمینار و هەڵسەنگاندنی لەسەر نووسراون و ئەنجام دراون و تا ئەوەندەی ئێمە ئاگاداربین سێزدە جاران لە چاپ دراوەتەوە کە لە ماوەی ئەو هەموو چاپانەدا وەك نووسەر خۆی دەڵێ زۆر پێداچوونەوە و کەمکردن و زۆرکردنی تیادا ئەنجام داوە، هەر بۆ نموونە بۆ ئەم چاپەی دوایی نووسەر پێنج ساڵی تەمەنی خۆی بۆ تەرخانکردووە و جارێکی تر لە نوێوە گیانی وەبەردا کردووەتەوە. نووسیوەیەتی و دەڵێ زۆربەی خوێنەران لە چاپەکانی پێشتر سەرنج و تێبینی باشیان خستە بەرچاوم و زۆر کەم و کوڕی و ناتەواویان نیشاندام کە دەبوا ئەمانە لەم چاپەدا راست بکەمەوە.

هەروەها چەندین پرسیاری بێ بەرسڤ لای خوێنەران دروست بوو بوون کە من بۆ ئەو پرسیارانە وەڵامێکم پێشان نەدابوو، بۆ نموونە هۆی شکستی ساسانییەکان چی بوو؟ ئەمە چۆن رووداوێك بوو کە بیابانشینانی پێپەتی چارەنووسی ئەو وڵاتە گەورەو پڕشکۆیە بگرنە دەست؟! ئیتر ئەمە و چەندین پرسیاری تر کە نووسەر لەم دوا چاپەمەنیدا بێ وەڵامی نەهێشتوونەتەوە.

خوێنەری هێژا، لەوەرگێڕانی ئەم کتێبەدا هەوڵمان داوە مەبەست و ناوەڕۆکی کتێبەکە بگەیەنینە خوێنەری کورد و تاتوانیومانە خۆمان لە وەرگێڕانی وشە بەوشە پاراستوە بێ ئەوەی لە مەبەستی نووسەر دووربکەوینەوە. بۆ ئاسانکاریش هەوڵمان داوە پێناسەی هەندێ لە زاراوە و ناساندنی هەندێ لە کەسایەتی کە ناویان هاتووە بخەینە سەرکتێبەکە، هەروەها ساڵی مردنی زۆر لە کەسە ناسراوەکانمان نووسیوە.. وەك ئاشکرایە نووسەر زیاتر ساڵی کۆچی بۆ رووداوەکان بەکارهێناوە، ئێمە بە پێویستمان زانی ساڵی زایینی لە تەك ساڵە کۆچییەکەدا بنووسین.

لەگەڵ ئەو هەموو وردەکاری و ماندووبوونەیش کە لە ماوەی دوو ساڵی وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا کردوومانە دیسان دڵنیاین کە وەرگێڕانەکەمان بێ کەم و کوڕی نابێ، چونکە بە هۆی پابەندبوونمان بەهەندێ دەربڕین و خۆپاراستنمان لە هەندێکی تر ئەرکەکەمان هێندەی تر گران بوو بوو. بۆیە داواکارین لە خوێنەری هێژا کە لە راستکردنەوە و نیشاندانی هەر هەڵە و کێماسیەکدا کە ئێمە بە سەرماندا تێپەڕیبێ یارمەتیمان بدات.

وەرگێڕەکان

## رۆژە ئارامەکان

لەو رۆژگارانەی کە سام و شکۆی دەوڵەتی ساسانی، سەرداران و ئیمپراتۆرانی رۆمی لەو دیو دەروازەکانی قوستنتەنییەدا خستبووە نێو ترس و دڵەڕاوکێوە، عارەبەکانیش وەکو سەرجەم خەڵکانی تری ((ئەنیران)) رووی نیازیان لە دەرباری شاهانەی ئێران بوو، و لە بەردەم بارەگای کیسرادا نیازمەندانەو داماوانە دەکەوتن و داوای چارەسەری و رایی کردنی کار و پێویستییەکانی خۆیان دەکرد. ئەوان پێشتریش هەر بەرفەرمان و چاو لە دەستی دەرگای فەرمانڕەوا و سەردارانی ئێران بوون. بەر لە ئەسکەندەر (٣٣٠-٣٢٣پ. ز) (بیابانی عارەب) بەشێك بوو لەو سەر زەویانەی کە هی داریوشی (٥٢١-٤٨٦ پ. ز) پادشای ئێران بوون، لەوە بەدواوەش سەران و گەورەکانی هۆز، لە دەرگای پادشای ئێراندا لە ریزی خزمەتکاران و بەر فەرمانان دەژمێردران. لەو سەردەمەی کە هێشتا (شاپوور ذوالاکتاف ٣٠٩-٣٧٩ ز) لە دایك نەبوو بوو، هەندێك لەوانە بە مەبەستی تالان و برۆ هاتبوونە بەحرێن و لێواری دەریای فارس، بەڵام وەك لە مێژوودا باسکراوە کاتێك کە شاپوور لە دایك بوو، ئەوانی بێدەنگ و ئاقڵ کرد. لە دەرباری یەزدگوردی یەکەمدا( ٣٩٩-٤٢١ز)، سەرۆك و گەورە گەورەکانی (حیرە) لە ریزی دەستنیشاندەو بەر فەرمانانی ئێران دەژمێردران. هەروەها لە رۆژگاری خەسرەوی یەکەم نەوشێرواندایش (٥٣١-٥٧٩ز)، عارەبەکانی ناوچەی (هاماوەران)یش وەکو عارەبەکانی حیرە، باجبەدر و دەستنیشاندەی ئێران بوون. بیابانە لماوی و وشك و برینگەکانی (نەجد) و (تهامە) ئیدی ئەوەندە بایەخیان نەبوو کە حکوومەت و سوپای ئێران بۆ خۆیان رابکێشن. چونکە لەو بیابانە وشك و ترسناکەدا هیچ نیشانەیەك لە کشتوکاڵ و بازاڕ و شت و مەك بەدی نەدەکرا جگە لە کۆمەڵێك عارەبی رووت و برسی کە وەك غولام و دێوو دریخ لە هەموو جێیەکدا لە سەر چۆڕە ئاوێك و مستە خاکێکی سەوز لەگەڵ یەکتردا لە شەڕ و شۆڕ دابوون، لە مرۆڤبوونیش لەوێ کەس شوێنەوارێکی بەدی نەدەکرد. جگە لەو بیابانە ترسناك و وشك و برینگ و بێگیا و سەوزاییە، کە ئەوەی نەدەهێنا خۆی پێوە ماندوو بکەیت و زەحمەت و ئەرکی پاراستنی بگریتە ئەستۆ، هەرچییەکی تری خاکی عارەبەکان کە بەهایەکی هەبوا ئەگەر هی وڵاتی رۆم نەبایە ئەوا لە ژێر دەستی ئێران دابوو، و عارەبەکان کە لەو دەڤەرەدا دەژیان، دەرباری پاشایەتی مەدائینیان، بە رووگەی نیاز و مرادی خۆ دەزانی. بۆمان گێڕدراوەتەوە کە شاعیرانی عارەبیش، کەسانی وەکو (ئەعشی) دەهاتنە دەرباری

خوسرەو و لە پای ستایش و پیاهەڵدانی شاهەنشاهی ئێران، ماڵ و دارایی و خێر و بێر و شانازیان وە دەست دەهێنا[1].

لە وان رۆژاندا، قەت ئەوە بە بیری هیچ کەس دانەدەهات کە رۆژێك بێ، تەخت و تاج و موڵك نزرگەی شاهانە، بکەوێتە دەستی عارەبە بێ ناونیشانەکان و کەسانێك کە شانازیان بە بەندایەتی و بەرفەرمانبوونی خۆیان بۆ ئێرانییەکان دەکرد، رۆژێك تەخت و تاجی شاهانە و موڵك و شکۆمەندی خوسرەوانی وەکو پاریچەیەکی بێ نرخ و بێ بەها بەکەیف و ماشای خۆیان تەفرو تونا بکەن. بەڵام دروست لەو رۆژگارانەدا، کە لاوازیی مەعنەوی و رۆحانی، هێزی رواڵەتی و جەستەیی دەوڵەتی ساسانی لە ناوەوە دەخوارد و دایدەوەشاند، هێزێکی مەعنەوی گەورە و شکۆدار لە نیو لمستانە وشك و ترسناکەکانی بیابانی عارەب دەرکەوت، و هێواش هێواش چەکەرەی کرد و پەرەی سەند، تاسەرەنجام شکۆ و دەسەڵاتی ئەو کەسانەی لە هەمبەر رۆمدا مەیدانیان دەخواست و بە هێزی بازوو و توانای خۆیان سەرکەوتنیان وەدەست دێنا، کەوتە دەستی عارەبان.

## بیابان نشینان

دوورگەی وشك و برینگ و بێ ئاو و سەوزایی عارەب، بەو ئاو و هەوا گەرم و سووتێنەرەی کە لە هەندێ ناوچەی شاخاوی کە تیایدا هەڵکەوتووە بترازێ هەمووی بەو شێوەیە، بەڕاستی بۆ ژیان و نیشتەجێبوونی مرۆڤ شوێنێکی لە بار نەبوو. بۆیە لە دێر زەمانەوە بگرە رۆشنبیری و شارستانێتی لەو ناوچەیە پێشکەوتن و دەرکەوتنی بە خۆوە نەبینیوە و لە هەندێ ناوچەی بچووك کە ئاو و سەوزاییان تیا بوو، یاخود کەوتبوونە سەر رێگای بازرکانی بترازێ لە سەرانسەری ئەو بیابانە فراوان و کاکی بە کاکییە، ژیانی شارنشینی لە هیچ شوێنێکدا کەشەو رەونەقێکی بە خۆوە نەگرتبوو.

جگە لە ناوچە شاخاوییەکانی باشوور کە لە یەمەنەوە تا عومان درێژدەبووەوە، لە لێوارەکانی بیابان، دەوروبەری شام و نێوان دووزێش لە کۆنەوە هەندێ شاری بچووك هەبوون کە عارەبی تێدا دەژیان. شارەکانی وەك (مەککە) و (یثریب) و (طائف) و (دومەالجندل)یش شاری بازرکانی بوون و کەوتبوونە سەر رێی بازرگانی. لەوە بترازێ هەموو ئەو سەر زەمینە پان و پۆڕە جگە لە لمستانی داغ و بیابانی فراوان شتێکی تری لێنەبوو. ئەگەر جارێکیش کانییەکی بچووك لە شوێنێك

---

[1]- ابن قتیبة : ب١، الشعرای، ل ٢١٤. نقد ادبی، ل ٣٧٥.

دەرکەوتبایە و سەوزاییەك دروست بووبا ئەوا عارەبی بیاباننشین بە وشتر و ڕەشماڵەکانی خۆی لە وێدا دایاندەکوتا. ژیانی ئەو ماڵ بەکۆڵە بیابانگەڕانە هەڵبەتە بە تالان و ڕێگری و بەسەر خەڵکیدادانەوە گرێ درابوو و لە سەرانسەری بیاباندا، یاسایەك جگە لە یاسای زەبر و زەنگ و شمشێر بوونی نەبوو. عارەبەکان کە لە دێر زەمانەوە لەو شوێنەدا دەژیان، بە ناچاری کەسانێکی دڕندە و چاوچنۆك و ماڵپەرستیان لێدەردەچوو. مێشکی ئەوان لە چاوچنۆکی و سوودخوازی بترازێ هیچ شتێکی تری تێدا جێنەدەبوودرە. لەوەی کە لە بەرچاو و هەستپێکراوە بترازێ عەقڵیان بە هیچ شتی تر نەدەکەیشت. لە بواری ڕەوشتییەوە، ئەوەی کە زۆر خۆیان پێهەڵدەدایەوە پیاوەتی بوو ئەویش شتێك نەبوو جگە لە خۆپەرستی و کینە و دڕدۆنگی. ئەو ئازایەتی و سەربەستبوونەی کە لە چیرۆك و داستانەکان دراوەتە پاڵ ئەوان، هەر ئەوە بوو کە لە تالان و تۆڵەخوازییەکانیاندا ئەنجامیان دەدا، تەنها ژن و شەراب و کوشتار بوو، کە لە ژیانی خۆیاندا سەر قاڵی بوون و بۆی مرد بوون. لەوە زیاتر هیچ ئاگایان لە دنیا نەبوو. هەرگیز نەیاندەتوانی داب و نەریتی ژیانی شاری پەسەند بکەن. لەو تالان و بڕۆ و بەسەر دادانانەی کە زۆر جار دەیانکردە سەر شارەکانی دەوروبەریان لە هەموو جێیەکدا وێرانی و چەپەڵکاریان لە دوای خۆیەجێ دەهێشت. لە هۆڤیگەری و دڕندەییدا تا باسیان بکەی هەرکەمە، وەك (ئیبن خەلدون) مردووە لە ساڵی (٨٠٨ك / ١٤٠٥ز)، دەڵێ:- بەردیان لە ژێر کۆشکان دەهێنایە دەر تاکو بیخەنە ژێر مەنجەڵ یا کاریتەیان لە بنمیچی خانوو دەردەهێنا تا بیکەنە چەلاکی ڕەشماڵەکانیان[٢]. ئەو فەرمانڕەواییانەی بیابان کە فڕیان بەسەر فەرهەنگ و شارستانیەتەوە نەبوو لە سەردەمێکدا کە شارستانیەتە گەورەکانی جیهانی کۆن ئەو پەڕی شکۆ و مەزنایەتیان هەبوو، ئەگەر لە کوشتن و تالان و جەردەیی زیاتر کارێکیان هەبوو، ئەوا بریتی بوو لە پاراستنی ڕێگا بازرگانییەکان و ڕێنوێنی کاروانە بازرگانییەکان، بۆیە هەرچەندە دەست بە سەرداگرتنی ئەو بیابانە وشك و برینگ و بێ گیا و سەوزاییانە ئەوەندەی نەدەهێنا کە دەوڵەتە دێرینە گەورەکانی وەکو میسر و بابل و ئێران و ڕۆم چاویان تێبڕن، بەڵام بۆ پاراستنی گیانی کاروانە بازرگانییەکان لە دێرزەمانەوە، ئەو وڵاتگیرە دێرینانە، فەرمانڕەوایانی بیابانیان بەکرێ دەگرتن و دەیانخستنە خزمەتی خۆیانەوە. لە سەرچاوە مێژوویییەکاندا باسکراوە کە ئەو کاتەی (کەمبوجیە ٥٢٩-٥٢٢پ.ز)ی پادشای هەخامەنشی لەشکری کردە سەر میسر، عارەبەکانی ناچارکرد کە لە بیاباندا ئاو بۆ سەربازەکانی فەراهەم

---

٢- ابن خلدون : مقدمە، ب١، چاپ پارس، ل ٢٧٠.

بکەن[٣] و لە هەندێ لەو شەڕانەشدا کە ئێرانیەکان لەگەڵ یۆنانییەکان کردوویانە عارەبەکان بەشێك بوونە لە سوپای ئێران[٤].

بەمشێوەیە لە ڕۆژگارانی کۆندا عارەب هیچ بایەخ و بەهایەکی نەبوو. نە شارێکی هەبوو نەشارستانیەتێك، ئەو ژینگەیەی کە تێیدا دەژیا، پێویستی بە هیچ سیستەم و کەشەسەندنێك نەدەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر لە گۆشەو کەنارەکانی ئەو بیابانە فراوانەدا شارێك و ئاوەدانییەك هەبوا، ئەوا لەبەرەکەتی شارستانێتی و ڕاهێنانی ڕۆم یا ئێرانەوە بوو. وەك ئەوەی کە ئەو ململانێ و مرخێش مرخێشە بەردەوامەی کە هەمیشە لە نێوان ئێران و ڕۆمدا هەبووە، دەوڵەتەکانی غەسان و حیرەی هێنایەدی، غەسان کە لەکەناری بیابانی شام بوو و دەوڵەتی ڕۆم لە هەمبەر ئێراندا ڕاستیکردبوونەوە، حکوومەتی ئێرانیش دەوڵەتی حیرەی لە کەناری بیابانی عێراقدا دروست کردبوو تاکو لەو سنوورەدا هەم ڕێ لە (پێککگەیشتن)ی ڕاستەوخۆی نێوان دوو دەوڵەت بگرێ و هەم لە جەنگی دژی ڕۆمیش یارمەتیدەری ئێران بێت.

بەڵام دەسەڵات و ئۆتۆریتەی ئێران بەسەر عارەبدا هەر تایبەت نەبوو بە ئەمارەتی حیرە. لە هەموو هۆز و تیرەکان، گەورە و میرە عارەبەکان ڕوویان لە دەرباری پادشاکانی ساسانی بوو، جگە لەوانە یەمەنیش لەسەردەمی نەوشیروانەدا دەستنیشاندەی ئێران بوو. خوێندنەوە و سەرنجدان لە مێژووی حیرە و یەمەن ئەوە نیشان دەدات کە ئێرانییەکان لەو ڕۆژگارەدا، عارەبیان بە هیچ دانەدەنان و لە هیچ ڕووێکەوە گرنگیان پێنەدەدان و بیریان لێنەدەکردنەوە.

## حـــیــــرە

وەك لە کتێبەکاندا دەرکەوتووە، لە سەرەتاکانی سەدەی سێیەمی پاش زایین، هەندێ لە تیرەکانی عارەب سوودیان، لەماوەی دوایی هاتنی سەردەمی ئەشکانی وەرگرت و بەرەو خاکی دەوروبەری فورات کشان و دەستیان بەسەر بەشێکی ئێراق داگرت. لەو عارەبانە هەندێکیان هەر بەردەوام بوون لەسەر ژیانی بیابان نشینی، بەڵام هەندێکی تر دەستیان دایە کاری کشتوکاڵی. دوای ئەوە وردە وردە گوند و قەڵایان بنیاتنان و شار و ئاوەدانیان دروست کردن. گرینگترینی ئەو شارانە، بریتی بوو لە حیرە کە لە شوێنێکی نزیکی شوێنی ئێستای شاری کوفەو لە لێواری

---

٣-Herodotvs- III

4- herodous-VII.

بیاباندا هەڵکەوتبوو. ئەو شارە، وەك لەناوەکەیدا دیارە[5]، بریتی بووە لە قەڵایەك و ئۆردووگایەك کە عارەبی تیادا نیشتەجێبوون، بەڵام هێواش هێواش گۆڕاوە و بۆتە شار. لە ئەفسانەکاندا مێژووی بنیاتنانی ئەو شارەیان بۆ (بوختونەسر) گێڕاوەتەوە و هەڵبەتە راستی ئەو بۆ چوونە جێی گومانە. ئەوەندە هەیە کە ئاو و هەوای ئازادی بیابان و ئاو و جۆگە و جۆبارەکانی فورات بۆ ئاودانی ئەو ناوچەیە لە بار بووە. فراوانی کشتوکاڵ و دارخورما و ئاوی زۆر و سەوزایی ئەو ناوچەیە توانیویە کە فەرمانڕەوایانی بیابان بەرەو ژیانی شارستانی رابکێشی. ئەو عارەبانەی کە لەو دەڤەرەدا نیشتەجێبوون بە هۆی دراوسێیەتیان لەگەڵ ئێراندا بەهرەیەکیان لە فەرهەنگ و شارستانێتی پێبڕابوو. لەنزیك حیرە چەندین کۆشکی وەك (کۆشکی خورنەق) و (کۆشکی سپی) و (کوشکی ئیبن بەجیلە) دروستکرابوون، کە سیمایەکی گەش و جوانیان بەو شارە دەبەخشی. عارەبەکانی ئەو ناوچەیە هەندێکیان لەسەر ئایینی مەسیحی بوون و بەشێکیشیان ئایینی زەردەشتییان پەسەند کردبوو. هەروەها لە نێوانیان کەسانێکیش هەبوون کە ئاشنایەتیان لەگەڵ نووسیندا هەبوو و بۆی هەیە کە نووسین لەوێوە بۆ شوێنەکانی تری عارەبستان چووبێ.

مێژووی فەرمانڕوایانی حیرە، بەتەواوی روون نییە. ئەوەندە هەیە کە ئەو میرانە لە عارەبی (بەنی لەخم) بوونە و بە هۆی نزیکیان بەرفەرمانی پادشاکانی ساسانی بوون. هۆی ئەو بایەخ و پشتیوانییەی کە فەرمانڕەوایانی ساسانی لە میرەکانی حیرەیان دەکرد ئەوە بوو کە دەیانویست بە هۆی ئەوانەوە ئەو عارەبانە یەکخەن کە لە سنوور و کەوشەنی ئێراندا نیشتەجێبوون و بە یارمەتی ئەوان رێ لە دەستدرێژی و رێگری ئەو بیابانییە چەتەگەرانە بۆ سەر سنووری ئێران بگرن. بۆیە پادشاکانی ساسانی بەڕشتی پشتیوانیان لەو میرانە دەکرد و هەوڵیان دەدا بەهێز بن و بە فەرمانی خۆیان لەو پلەو پۆستانەیاندا دادەنان. ناوی ئەو ئەمیرە عارەبانە لە مێژووە دێرینەکانی ئێراندا تۆمارکرابوو و (حەمزە ئەسفەهانی) پێرستێکی لەناو و ماوەی تەمەنی ئەوان و ناو هێنانی ئەو پادشا ساسانیەی کە هاودەمی ئەوانە بووە، گێڕاوتەوە[6]. ئەو پێرستە ئەگەرچی تەواو و بێ کێماسی نییە، بەڵام بەهەرحاڵ سەرەنجراکێش و گرنگە. رێکخستنی یەك لە دوای یەك و ژمارەی میرەکانی ئەو زنجیرەیە، بەزۆری نادروست و نارۆشنە. هاوشێوەیی و وێکچوونی ناوی ئەوانە یەکێکە لەو هۆیانەی کە دیرۆکنووسانی سەبارەت بە دیرۆکی میرانی ئەو بنەماڵەیە خستۆتە

---

٥- حیرە لەواژەی سوریانی ( Heria) بەمانای دێرو زیارەتگا حەردم کە پاشان بە شوێنی سوپای عارەبەکانی جیرانی ئێران دەگوترا دوای بۆتە شارێکی کەناری سنووری و بنکەی سوپا.

٦- سنی ملوك والارض : تاریخ (پیمابران و شاهان)، ل ٧٦، ٦٣.

هەڵەوە. هەرچۆنی بیگری، میرە گەورەکانی ئەو ناوچەیە لە سەردەمی ساسانیدا لە بنەماڵەی بەنی لەخم پتر بوونە و هەمووشیان لە ژێر فەرمانی پادشای ئێراندا بوونە.

باسکردنی مێژووی حیرە و میرەکانی بنەماڵەی لەخم لێرەدا بە پێویست نابینم، بە تایبەت کە مێژووە بەردەستەکانیش زانیارییێکی ورد و دروستیان پێ نییە، بەڵام ئەکەل ئەوەشدا ئاماژەیەکی کورت بە ئەمارەتی ئەو بنەماڵەیە تا رادەیەك رەوشی شارستانێتی و حوکمڕانی عارەبەکانی ئەو دەوروبەرەمان دەخاتە بەرچاو. بۆ ئەم کتێبە ئەوەندە بەسە و شیکردنەوەی ئەو بەدواداچوونانەی کە لێکۆڵەران سەبارەت بە مێژووی ئەو زنجیرە ئەنجامیان داوە، بۆ ئەو کارەی ئێمە دەست نادات.

## بەنی لەخم

ئەوەی لە سەرچاوە مێژوویی و گێڕانەوە پشتاوپشتەکانی عارەبەکانەوە دەردەکەوێ، ئەوەیە کە یەکەمین میری حیرەی بنەماڵەی لەخم ناوی (عەمروبن عودەی) بووە. بەڵام ناوونیشانی و سەربردەی بە دروستی دیار نییە و لەگەڵ ئەو ئەفسانانەی کە عارەبەکان لە بارەی (جوزیمەی ئەبریش) هەیانە، تێکەڵ بووە. گوایە ئەو جوزیمەیە پێشتر لە ناوچەی حیرەدا پادشایەتییێکی هەبووە و حوکمی گێڕاوە، زۆر باس و گێڕانەوە سەبارەت بە شکۆ و مەزنێتی ناوبراو کراون کە ناتوانین باوەڕ بە هیچ کامیان بکەین، یەکێك لەو ئەفسانانەی کە سەبارەت بەوە کوتراون ئەوەیە کە گوایە کوڕە لاوێك لە بەنی لەخم بەناوی (عودەی) لە کوڕی ئەودا ساقی بووە کە (رەقاش)ی خوشکی جوزیمە حەزی لێ کردووە. عودەی ئەو توانایەی نەبووە داوای خوشکی پادشا بکات، بەڵام رەقاش رێگایەکی بۆ دۆزیوەتەوە، لە کۆڕی مەی خواردنەوەدا زۆر شەڕابی داوەتە جوزیمە و مەستی کردووە، ئینجا داوای کردووە کە رەقاشی بداتێ، جوزیمە لە کاتی مەستیدا داواکەی عودەی پەسەند کردووە کە هاتۆتەوە هۆش پەشیمان بۆتەوە، بەڵام تازە کار لە کار ترازا بوو. عودەی کوڕێکی بووە ناویان ناوە (عەمرو) جاکە جوزیمە، وەك لە ئەفسانە و چیرۆکەکانی عارەباندا باس کراوە، بەپیلانی (زبا) کوژرا، عەمروی کوڕی عودەی کە خوشکەزای جوزیمە بوو هەستا بە بۆ تۆڵەسەندنەوەی خاڵی (زبا)ی کوشت و حیرەی کردە بارەگای ئەمارەتی خۆی. بەمشێوەیە میرنشینی حیرە بووە هی بنەماڵەی لەخم. دەڵێن عەمرو، هاوسەردەمی (شاپووری یەکەم) مردووە لە ساڵی (٢٧٢ ز) و چەند پادشایەکی تر بووە کە دوای شاپوور بۆ ماوەیەکی کەم فەرمانڕەوایەتیان کردووە.

دوای عەمرو، کوڕەکەی کە ناوی (ئەمرو ئەلقیس) بووە لە جێی ئەودا دانیشتووە. سەبارەت بەماوەی ئەمارەتی ناوبراو ئەو باس و مێژووانەی هەن زیادەڕۆییان تێدایە و ئەو ماوەیان لەسەد ساڵێش زیاتر نووسیوە. بەڵام بەپێی مەزەندە پێدەچێ کە نزیکەی چل ساڵ فەرمانڕەوایەتی حیرەی کردبێ. ئەو تابلۆیەی کە لە سەر گۆڕەکەی ئەودا دۆزراوەتەوەو بەخەتی (نەبەتی) و زمانی کۆنی عارەبی نووسراوە، باس لە پەیوەندی ئەو لەگەڵ پادشاکانی ئێران دەکات. وەك لە مێژوودا باسکراوە، ئەو لەلایەن پادشاکانی ئێرانەوە بەسەر زۆربەی هۆزەکانی عارەب لە خەڵکی عێراق و جەزیرە و حیجازدا فەرمانڕەوایی کردووە. چاخی میرایەتی ئەو هاوکات بوو لەگەڵ قۆناغی پادشایەتی (بەهرامی سێیەم٣) و (نێرسی ٢٨٣-٣٠١ز) و(هورمزی کوڕی نێرسی١ ٣٠ز) و (شاپووری ذوالاکتاف ٣١٠-٢٧٩).

دوای ئەویش چەند کەسێکی تر حوکمرانییان کردووە کە لە ناوێك زیاتر هیچیان لە دوا بەجێ نەماوە، تا ئەوکاتەی نۆرە گەیشتۆتە (نوعمانی کوڕی ئەمرولقەیس) کە پێی گوتراوە نوعمانی یەك چاو. نووسراوە، کە ئەو نوعمانە کابرایەکی توند و بە توانا بووە. بەڵام سەختگر و کینە لە دڵ بووە. گوایە (یەزد گوردی یەکەم) خۆشی ویستوە و متمانەی پێکردووە. دروستکردنی کۆشکی (خورنەق)یش کە لە نزیك حیرە بوو، بۆ ئەو دەگەڕێننەوە. دەڵێن کاتێ دروستکردنی ئەو کۆشکە ئەفسانە ئامێزە تەواو بووە وەستاکەی، کە ناوی (سەنمار) بووە، کوشتووە، سەبارەت بە ناکامی ئەویش ئەوە دەگێڕنەوە کە لە نێو فەرمانڕواییەکەیدا بێ سەرو بەری و ناپایەداری و پشێوی سەری هەڵدایەوە ئەویش جلوبەرگی دەروێشانی پۆشی و تەرکی وڵاتی کرد و سەری خۆی هەڵگرت و چووە بیابان. لێکۆڵەران ئەو چیرۆکە بە ئەفسانە دەزانن. وا مەزەندە دەکرێ لەبەر ئەوەی ڕەفتاری نوعمان ڕەنگە بەپەیڕەوی کردن لە سیاسەتی یەزد گورد دەرحەق بە عیساییەکان، ڕەفتارێکی نەرم و گونجاوبووبێ، بۆیە ئەو چیرۆکەیان بۆ دروستکردووە تاعیلاقەو پەیوەندی ئەو لەگەڵ ئۆلدارە زاهد و گەڕۆکە عیساییەکان بخەنە ڕوو. بەڵێ دوای ئەو نۆرەی مونزری کوڕی نوعمان هات. ئەمەیان هەمان ئەو میرە حیرەییە کە لە چیرۆکەکاندا دەڵێن یەزد گورد پەروەردە و فێرکردنی بەهرامی کوڕی خۆی بەو سپاردووە. تەنانەت گوایە ئەگەر هەوڵ و زرنگایەتی مونزر نەبووایە مەزن و سەرانی ئێران، دوای یەزدگورد ڕازی نەدەبوون (بەهرام) (٤٢٠ — ٤٣٨ز) لەسەر تەختی پاشایەتی دابنێن. بەم جۆرە، ئەو هاتنە نێوو خۆ تێهەڵقورتاندنەی لە هەڵبژاردنی بەهرامی گور بۆ بوون بە پادشای ئێران، توانا و کاریگەریی ئەو نیشان دەدا. لەوجەنگەیشدا کە ماوەیەك دواتر لە نێوان بەهرامی گور و ڕۆمییەکاندا ڕوویدا، مونزر خزمەتگەلێکی شایستەی ئەنجام داوە.

چەند کەسێکی تر لە میرەکانی بنەماڵەی لەخم لە حیرەدا فەرمانڕەوایی یان کردووە. تانۆرە گەیشتۆتە سەر (مونزری کوڕی مائوسەماو) کە لە هەموو فەرمانڕەواکانی دیکەی حیرە ناودار تر و چالاکتر بوو. ئەو لە سەردەمی پاشایەتی (قوباد) (٤٨٧ — ٤٩٨ز) ژیاوە و لە رۆژگاری ئەودا بوو کە زەنگییەکان دەستیان بەسەر یەمەندا گرتووە. هەروەها لەو سەردەمە بوو کە ڕووداوی سەرهەڵدانی مەزدەك روویدا و پشێوی و نا ئارامییەکی تەواو باڵی خۆی بەسەر وڵاتدا کێشا، قوباد وەك لە مێژووەکاندا باسکراوە، چۆتە سەر ئایینی مەزدەك، بەڵام مونزریش وەك ئەو بەشە لە میر و سەردارانی ئێران کە دژی قوباد و مەزدەك رابوون، ئایینی مەزدەکی پەسەند نەکرد. لەم کاتەدا میرەکانی (کیندە) کە لە دێر زەمانەوە لەگەڵ بەنی لەخم ناکۆك بوون، ئەو هەلەیان قۆزتەوە و کە بینیان شای ئێران بە هۆی ئەو دژایەتیکردنەی کە مونزر سەبارەت بە مەزدەك لە بەرامبەر ئەودا کردوویە، لێی رەنجاوە خۆیان لە قوباد نزیك کردەوە. قوبادیش (حارسی کیندی) کردە فەرمانڕەوای حیرە و مونزری لەوێ وەدەرنا، بەڵام کاتێ کە نوشیروان گەیشتە سەر تەختی پاشایەتی کەوتە هەوڵی ئەوەی ئەو گرفت و کێماسی و پشێویانە قەرەبوو بکاتەوە کە بە هۆی ئاژاوەی مەزدەکەوە روویاندا بوو، جارێکی تر مونزری بۆ میرنشینایەتی حیرە گەڕاندەوە. بەڵام گەڕاندنەوەی ئەو بۆ فەمانڕەوایی نەیتوانی پلە و پایە و شکۆی ئەو بگێڕێتەوە. دوای ئەو کوڕەکەی، عەمروی کوڕی مونزر بووە فەرمانڕەوای حیرە، کە ئەو بەناوی دایکییەوە واتە عەمروی کوڕی هیند ناوبراوە. دەڵێن ئەو میرێکی خۆپەرەست و بەدخوو بووە، ئەو خۆپەرەستییەی بۆتە هۆی ئەوەی بەدەستی عەمروی کوڕی کەلسوم بکوژێ. باسی پێگەیشتنی ئەو عەمروی کوڕی کەلسوم زۆر ترش و خوێکراوە و ئەو کێڕانەوانە بێگومان لە ئەفسانە بەدەر نین. دوای ئەویش براکانی کە ناویان (قابووس ) و (مونزر) بوون هەریەکەیان بۆ ماوەیەکی کورت لە سەر تەختی میرنشینی دانیشتوون، تانۆرە گەیشتۆتە نوعمانی کوڕی مونزر کە بە ئەبو قابووس ناودەبرا. دەڵێن کە ئەو لەگەڵ هۆرمزی چوارەم (تورك زادە ٥٧٩-٥٩٠ز) و (خوسرەوی پەروێز٥٩٠-٦٣١ز)دا لە یەك رۆژگاردا ژیاوە و بەرفەرمانێتی ئەوانی کردووە. لە سەردەمی ئەودا بەلاسایکردنەوەی دەرباری ساسانی، خۆنواندن و شکۆی میرنشینی لە نێومیرەکانی حیرەشدا دروست بوو. سەبارەت بە دەستپێکی میرنشینایەتی ئەوەوە نووسراوە، کاتێ باوکی واتە مونزر کۆچی دوای کرد، شای ئێران هورمزی چوارەم خۆی لە دانانی ئەو وەك میری حیرە گنخاند. سەرەنجام بەهاوکاری عودەی کوڕی زەید کە خۆشی دەویست و لە دەرباری پادشایەتیدا کاری نووسەری دەکرد، پۆستی میرنشینی حیرەی پێبەخشی، بەڵام کاتێ کە گەیشتە ئەو پۆستە کەوتە

رازاندنەوە و شکۆداری و بەلاسایکردنەوەی دەرباری پادشایەتی دەرگای خۆی بەرووی ئەوانە بۆ بەخێرهاتنیان کردەوە. وردە وردە دەسەلات و نفووزی دووزمان و پیلانگێری و ماستاوچییەکانی دەربار ئەوەندە پەرەی سەند کە لە هەوەنتەوە دلی لە عودەی کوری زەید، نووسەر و شاعیر، کرمێ بوو ولیی کەوتە گومان و ئەگەرچی بە هۆی ئەوەوە گەیشتبووە سەر تەختی میرنیشنی کەچی گرتی و لەناوی برد، بەلام ماوەیەك دواتر کورەکەی عودەی کە ناوی زەید بوو، پیلانێکی دارشت تا تۆلەی خوێنی باوکی خۆی لە نوعمان بکاتەوە، لە سەرچاوە مێژووییەکاندا ئەو چیرۆکەیان بەم جۆرە گێراوەتەوە کە زەید دۆستایەتی لەگەلّ نوعمان دروست کردو دواتر داوای لێ کرد کە ئەو بێنێتە لای پەروێز تاکو پلەی عودەی باوکی بدەنەوە. نوعمان داخوازییەکەی ئەوی پەسەند کردو داوای لە خوسرەو پەروێز کرد کە زەید لە شوێنی عودەی باوکی وەربگرێ و بیکاتە نووسەر و وەرگێری زمانی عارەبی لە دەرباری خۆیدا. زەید رۆیشت و لە دەرباری پەروێزدا مایەوە و چاودێری دەرفەتێکی دەکرد کە تۆلەی خوێنی باوکی خۆی لە نوعمان بسێنێتەوە، خوسرەو ویستی بۆ یەکێ لە نزیکەکانی خۆی ژنێك بخوازێ. زەید ئەو هەلەی لە باربینی و لە خوشك یا کچە مامەکانی نوعمان ناوی کچێکی هێناو زۆری پێدا هەلّدا. بەلام نوعمان رازی نە دەبوو کە ئەو کچە بنێرێتە دەربارو زەید ئەوەی دەزانی کە ئەمە دەبێتە مایەی توورەبوونی خوسرەو و نیکبەتی بۆ نوعمان. هەر کە خوسرەو لەو وەلامە نەرێنییەی نوعمان سەبارەت بە خوازبێنییەکە ئاگادار بوودوە زۆر توورەبوو. بەلام ماوەیەك توورەبوونەکەی خۆی شاردەوەو دواتر بۆ بارەگای خۆی بانگی کرد تا سزای توندی بدات. هەر کە گەیشت، فەرمانی دا زیندانی بکەن و بە قاچی فیلەوە بەستیانەوەدو بە پێی گوتەیەکی تر زیندانیان کرد تا لە وێدا مرد. دوای ئەوە میرنیشینی حیرە بەردەوام نەبوو و لە ماوەیەکی کورتدا تێك چوو. خوسرە و و جێنیشنەکانی لەوە بە دواوە ئیدی لە بنەمالّەی لەخم کەسێکیان لە میرنیشینی حیرە دا نەدەناو لەلایەن خۆیانەوە میر و حوکمرانیان بۆ دەنارد. تا ئەو کاتەی (خالید کوری وەلید) بەپالپشتی لەشکری موسلّمانان ئەویێ گرت و بە وەرگرتنی (جزیە) لەگەلّ خەلّکی ئەوێدا پەیمانی ئاشتی مۆر کرد.

جگە لە حیرە و کیندە، هەرجێیەیەکی تری ولاتی عارەبان کە بە کەلّك ئەوە هاتبا مرۆڤ بتوانێ تێدا بژی، لە ژێر دەسەلات و ئوتوریتەی ئێراندا بە دەرنەبوو. لە نێوانیاندا دەبێ ناوی ولاتی یەمەن بێنین.

## هاماوەران

سەر زەمینی یەمەن کە بەیەکێك لە خۆشبەختترین و پڕمایەترین ناوچەکانی عارەبەستان دەژمێردرێ، هەر لەدێر زەمانەوە مایەی سەرنج و تێبینی جیهانگردکان بووە. لە چیرۆکە پالەوانییەکانی ئێمەدا ئەو ناوچە بە دەشتی هاماوەران ناوبراوە. خونیا بوونی کاووس بە سودابەی کچی پادشای هاماوەران زۆر گرفتاری و ناکامی و ئەفسانەی جیهانگیری بۆ ئەو پادشایە بەدواوە بووە کە لە (شاهنامەی فردەوسی) دا لە میانەی چیرۆکێکی جوان و دلگیری هەمیشە زیندوو دا خراوتەوە روو. وەك لە شاهنامەدا دەرکەوتووە کاتێك کاووس لە مازندەران دەرباز بوو، چووە نیمروز و ماوەیەك لەوێ مایەوە. زۆری پێنەچوو کە لە ئاژاوە و یاخیبوون و سەرکەشی عارەبان ئاگادار بووەوە.

بۆیە کەشتی و گەمییێکی زۆری فەراهەم کردن و لەرێی دەریاوە بەرەو هاماوەران کەوتەرێ. جەنگێکی خوێناوی ڕوویدا و سەرەنجام کاووس بەسەر ئەواندا سەرکەوت. پاشای هاماوەران داوای لێبوردنی خواست و قبولێ کرد کە باج بدات، پادشای ناوبراو کچێکی هەبوو بەناوی (سودابە) کە کاووس عاشقی بوو، لە هەندێ کتێبی تردا لە جیاتی سودابە، ناوی (سەعدی) هاتووە کە ناوێکی عارەبیە. کاووس سودابەی لە پاشای هاماوەران داخوازکرد. پاشا نەیدەویست، بەڵام لە ترسی کاووس ناچار بوو رازی ببێ. هەفتەیەك دوای زەماوەندی ئەم دوانە، فەرمانڕەوای هاماوەران میوانداری کاووسی کرد لەگەڵ ناودار و فەرماندەکانی تردا و خستییە زیندان. سودابەش ئەو نامەردییەی باوکی قبوڵ نەکرد و چوونە زیندان لەگەڵ هاوسەردکەی خۆی پێ باشتر بوو لە مانەوە لە ماڵی باوکی. لە ئێران ئاژاوە وڵاتی گرتەوە و جارێکی تر ئەفراسیاب هەلی وەرگرت و کەوتە تاڵان و برۆ.

سەرەنجام رۆستەم سوپایەکی گەورەی پێکهێناو لە رێی دەریاوە چووە هاماوەران و لە بەربەرستان و میسریش بۆ یارمەتیدانی هاماوەران لەشکر کۆبووەوە، جەنگێکی گران رووویدا، پادشای میسر و بەربەرستان لەو جەنگەدا تێکشکان و کەوتنە دەستی ڕۆستەم. فەرمانڕەوای هاماوەران کە شکستی خۆی بە مسۆگەری دەبینی، کەسێکی بۆلای ڕۆستەم نارد و داوای بەناو لێبوردنی لێخواست، و کاووس و فەرماندە سەربازیەکانی تری ئێرانی رادەستی ڕۆستەم کردنەوە. کە کاووس لە بەندێ رزگاری بوو فەرمانڕەوای هاماوەرانی پێ بەخشی و لەکوناهی خۆش بوو، ئینجا سودابەی خستە کەژاوەی زێڕین و لەگەڵ خۆیدا بردیەوە بۆ ئێران.لەم چیرۆکەدا وا پێدەچێ کە ناوی (حیمیەریان) گۆرا بێ و بوویێتە هاماوەران، هەندێ لە لێکۆڵەران، چیرۆکی سەیری

گرفتاربوونی کاووسیان لە هاماوەران و کەشتە سەربازییەکەی ڕۆستەمیان بە یادگاری جەنگەکانی خوسرەو ئەنۆشیروان لە حەبەشە زانیوە کە لە (خوداینامە)کاندا شێوەیەکی ئەفسانەی بە خۆوە گرتووە[٧].

بەلام ئەو مەزەندەو ئاماژە زۆرانەی کە لە سەرچاوە مێژوویی و چیرۆکەکانی ئێراندا هەن ئەوەنیشان دەدەن کە زۆر پێشتر لە ڕۆژگاری خوسرەو ئەنۆشیروانیش ئێرانییەکان کەش و کوش و پەیوەندیان لەگەڵ خەڵکی هاماوەران و وڵاتانی تری عارەبەکاندا هەبووە. لە سەردەمی پادشایەتی هەخامەنشی، ئێرانییەکان فەرمانڕەواییان بەسەر یەمەن و ناوچە باکوورییەکانی عارەبەستان و سۆماڵ و حەبەشەدا هەبووە، لە بەردەنووسی نەقشی ڕۆستەمدا دارای گەورەی پادشای هەخامەنشی ناوی عارەبەستان و حیرە و عەدەن، هەروەها حەبەشەش لە ریزی ئەو وڵاتانە دەژمێردرێ کە بەرفەرمان و باجدەری ئەون ٨.

لە سەردەمی لەشکر کێشییەکانی کەمبوجییە و دارای گەورە بە نێو سەر زەوییەکانی عارەبنیشندا ئەوانەی کە دەکەوتنە سەر ڕێی سوپای ئێران یا لە ڕوویەکەوە دەیانتوانی خۆیان بکەنە جێی سەرنجی پادشای ئێران، فەرمانیان لە پادشاکانی هەخامەنشییەوە وەردەگرت.

## پادشاکانی حیمیەر

لەو میانەدا وڵاتی یەمەن کە خاوەنی سەرچاوەی سروشتی زیاتر بوو، لە دێرزەمانەوە لە بەشەکانی تری عارەبستان ئاوەدانتر و ڕازاوەتر بووە، بۆیە یۆنانییەکان بە عارەبستانی خۆشبەخت ناویان دەهێنا[٩]، هەروەها چونکە لە لێواری دەریای هیند و دەریای سوور هەڵکەوتووە لە کۆنەوە بۆ بازرگانێتی نێوان جیهانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات بە شوێنێکی گونجاو ژمێردراوە، لەو ڕووەشەوە مایەی سەرنجی جیهانگیرانی ئێرانی و ڕۆمی بووە. مێژووی هیچ میللەتێك بەئەندازەی مێژووی عارەبستان ئاڵۆز و شەپرێو نییە، لەو میانەشدا مێژووی یەمەن لە هەمووان زیاتر ئاڵۆز و تێکەڵ و پێکەڵە. بە شێوەیەك مێژوونا‌سەکان نەیانتوانیوە ئەو باس و گێڕانەوانەی سەبارەت بەو وڵاتە کوترا‌ون باوەڕ بکەن و بەڕاستی بزانن. زور جار خەیاڵپڵاوی و زیادەڕۆیی لەو باس و نووسینانەدا توانیویانە شکستێك بەسەرکەوتن و ناکامی بە بەختەوەری بنوێنن و بیخەنە بەرچاو.

---

٧- نۆلدکە، حماسە ایران، ل ٣٠.

8-Herzfeld.17.

٩- Arabia felix

ئەو ئەفسانە و چیرۆکانەی کە لە سەرچاوە عارەبییەکاندا سەبارەت بە میر و پادشا هاماوەران (حیمیەر)یەکان نووسراون، باس لە پەیوەندی ئەوان بە مێژوو و شارستانیەتێکی ئێرانی دەکەن، ئەو گێڕانەوانە ڕەنگە وەك گوتمان لە ئەفسانە زیاتر شتێك نەبن، بەهەرحاڵ هەندێ خاڵ و ئاماژەیان لێهەڵدەچێندرێ. نووسیویانە کە کەسێك بەناوی (شەمەر یەرعەش) کە پاشایەکی حیمیەری بووە، هەموو ئێران دەگرێ[10]، تەنانەت لە رووباری (جەیحون) تێدەپەڕێ و دەست بەسەر سوغد و سەمەرقەند دا دادەگرێ.

وتراوە کە ناوی سەمەرقەند لە (شەمەر یەرعەش) وەرگیراوە[11]. لە بارەی پادشایەکی تر بە ناوی (ملك یکرب) نووسیویانە کە میللەتەکەی خۆی بە هەموو گۆشە و کەنارەکانی جیهان پەرش و بڵاوکردووە و بردوونی بۆ هەرێمی سیستان و خۆراسان[12] لە وڵاتی ئێران، سەیرتر ئەوەیە کە دەربارەی هەندێ لەو پادشایانە گوتویانە گوایە هاتوونەتە سەر ئایینی ئاگرپەرستی![13] ئەوە خۆی تارادەیەکی زۆر گەواهی بوونی پەیوەندی و تێکەڵی نێوان ئێرانییەکان لەگەڵ سەرزەمینی هاماوەران دەدات.

بەمشێوەیە عارەبستانی خۆشبەخت لە کۆنەوە، بەر لە ساسانییەکان پەیوەندی بە ئێرانەوە هەبووە و ئەوەی کە لە مێژوو و ئەفسانەکاندا ناوی ئەوان لەگەڵ ناوی ئێران گرێ دراوە شتێکی رێکەوت نییە.

## رکابەرییە بازرگانییەکان

لە کۆتاییەکانی دەسەڵاتی ساسانییەکاندا کە شەڕەکانی ئێران و رۆم کەیشتبوونە ترۆپکی توندبوون و ناکۆکییە ئایینییەکان لە وڵاتی یەمەندا بوارییان دابە رۆمییەکان و زەنگییەکان کەدەست لە چارەنووسی خەڵکی هاماوەران وەربدەن، لە هەموو کاتێك زیاتر پەیوەندی نێوان ئێرانییەکان و وڵاتی هاماوەران روون و ئاشکرابوو، بەو شێوەی کە لە باس و سەرچاوەکاندا دەردەکەوێ زەنگییەکان (ڕەشپێستەکان) لە زۆر کۆنەوە بەچاوی تەماو تاسەوە دەیانڕوانییە عارەبستان کە ڕووبەڕووی وڵاتی ئەوان بوو. تەنانەت زۆر پێشتر چەندین جار لەشکریان کردۆتە

---

١٠- طبری، ل ٩١٠. اخباالطوال، ١١ چاپ مصر، ل ٢٨.

١١- یاقوت، مجلد الثالث، ص١٣٣. چاپ لایپزیك.

١٢- یعقوبی، تاریخ یعقوبی، ج١، چاپ نجف، ل١٥٦.

١٣- دینوری، اخبارالطوال، ل٦٣.

سەری و چۆنکە ئەو لەشکرکێشیانە بەردەوام دووبارەدەبوونەوە سەرەنجام نەك هەر بۆ سەر خەڵکی یەمەن بەڵکو بۆ سەر عارەبەکانی حیرەش کە لەژێر فەرمانی ئێرانییەکان بوون بووە مایەی مەترسییەکی گەورە.

ئەو مەترسییە خەڵکی یەمەنی ناچار کرد کە بۆ نەهێشتنی شەڕ فرۆشی و بەڵای ئەوان، داوای یارمەتی لەخوسرە و ئەنۆشێروان بکەن[14]، بەڵام ئەوەی ئێرانییەکانی والێکرد خۆ لەو پرسە هەڵقورتێنن، جگە لە ڕەوشی ترسناکی حیرە کە بە پرسێکی سەربازی دەژمێردرا مەسەلەی رکابەرییەتی بازرگانی بوو لەگەڵ رۆمییەکان. لەو دەمانەدا پادشا و بازرگانەکانی هاماوەران کاروباریان ڕووی لەسستی و پشێوی کردبوو و گلۆڵەیان لە لێژی بوو، رۆمییەکان بە هۆی پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لە رۆژهەڵات، دەسەڵات و ئوتوریتەی خۆیان لە ئاسیادا بڵاو و جێگر دەکرد، بازرگانەکانیان کاڵا و شتومەکی هیندیان لەیەمەنەوە بۆ حەبەشە و ئینجا بۆ میسر دەبرد. عارەبەکان لەوە دڵگران و نیگەران بوون، بۆیە هەوڵیان دەدا کۆسپ و ئاستەنگێ بخەنە سەر ڕێی بازرگانێتی حەبەشی و ڕۆمییەکان.

ئەوپرسە بووە هۆی ئەوەی کە عارەبەکان کلێسای زەنگییەکان لە یەمەندا بوروژێنن و ئەوان لە دژی خۆ هانبدەن، چیرۆکی ئەبرەهەو هاوەڵانی فیل لەوەوە سەری هەڵدا. بەڵام ئێرانییەکان کە لەدێر زەمانەوە لەکاری بازرگانیش وەك کاری سیاسەت لەگەڵ رۆمییەکاندا کێشە و رکابەری یان هەبوو کەوتنە هەوڵی ئەوەی کە کێشە و ئاستەنگ لەسەر ڕێی بازرگانییەتی ئەواندا قووت بکەنەوە، بەمشێوەیە هێزێکی سەربازی ئەوان لەو بەشەی عارەبستان کە کەوتبووە لێواری کەنداوی فارسی جێگیربوو.

(یوستین قەیسەری ڕۆم نێردراوێکی بۆ لای بەنی حیمیەر نارد کە ئێرانییەکان لەلای خۆیان دەربکەن، هەروەها پەیامیان بۆ حەبەشییەکانیش نارد کە یارمەتی بازرگانانی ڕۆم بدەن).

(یوستینیان)یش لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی خۆیدا ئەو کارەی کرد. بەڵام ئەو پەیمانە دۆستانەیەی کە کرێی دابوو درێژەی نەکێشا، عارەبەکان جارێکی تر دیسان کەوتنەوە دژایەتیکردنی کاروانەکانی ڕۆم[15] لە سەرەتای سەدەی شەشەم، زەنگییەکانی حەبەشە دەستیان بەسەر وڵاتی هاماوەران داگرت، چونکە ئەو وڵاتە لەو سەردەمەدا وەك باسمانکرد پردی بازرگانی نێوان هیندستان

14- Encyclopedie de LIslam، vol I p. 74.

١٥- العرب قبل الاسلام، ل ١٢٨.

و ولاّتانی لێواری دەریای مدیتەرانە بوو، و خەڵکی هاماوەران کە ئەوکاتە ئەو بازرگانییە یان لەدەست دابوو، لە ژێرەوە لەگەڵ ڕۆمییەکان و زەنگییەکاندا کێشمەکێشیان هەبوو.

ئەو سامان و خێر و بێر و شکۆمەندییە سەر سوڕهێنەرەی کە لە ئەفسانەکاندا دراوەتە پاڵ پادشاکانی حیمیەری لەو بازرگانی و سەودایەوە فەراهەم دەبوو.

ئەمانە بەهارات و عاج و زێڕ و یاقوت و یەشەب و کالاّکانی تری هیندیان لەگەڵ کالاّکانی وەك عود و بۆن و بەرامە و شتی لەو جۆرە کە لە یەمەن بە دەست دەهات، دەبرد بۆ شام و فەلەستین و ئێراق و ناوچەکانی دیکەی ڕۆم و کالاّ و شتومەکی تایبەتی ولاّتی فینیقیان دەهێنایەوە.

بازرگانانی ڕۆمیش کە مژول و سەرقاڵی بازرگانییەتی کالاّ کانی هیند بوون ناچاربوون کە لەو بوارەدا داوای هاوکاری و یارمەتی بکەن.

لەو ڕێکەوت و ڕۆژگارەدا وەك (تیوفانس) گێراویەتییەوە، خەڵکی هاماوەران دژی بازرگانە ڕۆمییەکان کە لەسەر ئایینی مەسیحی بوون و بە کالاّ و شتومەکی هیندییەوە لە یەمەندا تێدەپەڕین، ڕاستبوونەوە و ژمارەییەکیان لەو بازرگانانە کوشت.

ئەو ڕووداوە پرۆسەی مامەڵە و بازرگانی ڕاگرت و ئەو کارە بۆ حەبەشییەکانیش کە ئەوانیش لەسەر ئایینی مەسیحی بوون و قازانجێکی زۆریان لەو بازرکانییە پێدەبڕا گران کەوتەوە.

لەبەر ئەوەبوو بۆ کردنەوەی ڕێگای بازرکانی، سوپایەکیان کۆکردەوە و لەژێر فەرماندەیی (هەداد) پادشادا چوونە هاماوەران.

دوای شەڕێك پادشای هاماوەرانیان کە ناوی (ذمیانوس) یا (ذوننەواس) بوو کوشت، و لەگەڵ قەیسەر (یوستینیان)دا پەیمانیان تازە کردەوە.

سەرچاوەکان نووسیویانە کە ماوەیەك دواتر حەبەشییەکان لە یەمەن گەڕانەوە، بەلاّم چونکە جارێکی تر ڕێی بازرگانی گیرایەوە پادشای حەبەشە لەشکرێکی گەورەی بۆ یەمەن نارد، ئەمجارە سەرداری حەبەشی بە هاوکاری (ئوسقوفێکی) مەسیحی کە لەگەڵیدا بوو هەوڵیدا ئایینی مەسیحی لە یەمەندا بردو پێبداو بلاّو بکاتەوە، بەلاّم فەرمانڕەوایەتی ئەو درێژەی نەکێشا، چونکە سەرهەڵدانی خەڵك پادشای زەنگییەکانی لە یەمەن نائومێد کرد و ناچارکرا کە لەگەڵ حیمیەرییەکاندا ئاشتی بکات[١٦].

بەمپێیە دەست بەسەرداگرتنی یەمەن لەلایەن حەبەشە پاڵنەری بازرکانی و ئابووری هەبووە، بەلاّم پرسی ئایینیشی لەو بیاڤەدا بەهانەیەکی باش و لەبار بوو.

---

١٦- Sharpe, Vol.II,349.

## هەوەڵانی ئوخدود*

لەو بارەیەوە وا نووسراوە کە [(ذوننەواس)ی (٥٢٥) پێش زایین] پادشای هاماوەران لەبەر ئەو رق و کینەیەی کە دژی زەنگییەکان هەیبوو، چووە سەر ئایینی (موسا)یی، سەرچاوەکان نووسیویانە کە ناوبراو ((لەسەردەمی فەیروز یەزد گورد دا ژیاوە و کەوتۆتە ژێر کاریگەریی وتە خۆشەکانی زانایانی موسایی و ئایینی ئەوانی پەسەندکردووە، دواتر موساییەکان هانیاندا کە بچێتە (نەجران) و ئەوێش مەسیحییەکانی لێبوون...، (ذوننەواس) چاڵێکی هەڵکەند و ئاگرێکی گەورەی تێداکردەوە و هەرکەسێك وازی لە مەسیحییەت نەهێنا و ئایینی موسایی پەسەند نەکرد فرێی دایە نێو ئەو چاڵە و ذوننەواس بۆ خوشی لەگەڵ دەست و پێوەندەکانی خۆی لەوێ دانیشتبوو، و بیست هەزار پیاو لەنێو ئەو ئاگرەدا سووتان و هەموو ئینجیلەکانیشی خستە نێو ئاگرەکە و سووتاندنی، پیاوێکی مەسیحی، ئینجیلێکی نیوە سووتاوی هەڵگرت و بەرەو لای قەیسەر رۆیشت و پێیگوت کە ذوننەواس چی کردووە...! و (قەیسەر) گوتی رێگای نێوان وڵاتی من و یەمەن دوورە، بەڵام نێوان یەمەن و حەبەشە نزیکە و نامەیەکی بۆ پادشای حەبەشە نووسی و دایە دەستی کابرای ناوبراو، ئەویش چووە ئەوێ و پادشای حەبەشە کە ئەو هەواڵەی بیست دڵی زۆر پڕبوو، گریا و نزیکەی حەفتا هەزار سەربازی ئامادەکرد و لەگەڵ فەرماندە ناودارەکان و فەرماندیەك بەناوی (ئەریات) بۆ یەمەنی ناردن، ذوالنواس شکاو خوی فرێ دایە ناو دەریا و کەس نەیبینییەوە[17]، دیارە ئەو گێڕانەوەیە خاڵی نییە لە ئەفسانە، بەڵام ئەوەی کە لێرەدا زۆر روونە ئەوەیە کە ئیمپراتۆرەکانی بیزانس بە بیانوی داکۆکییکردن لە مەسیحییەکان لەو سەردەمەدا یارمەتی حەبەشەکانیان دەدا دژی خەڵکی هاماوەران، و ئەوەش وای لە پادشاکانی ساسانی کرد کە هەمیشە دوژمن و ناکۆکی ئیمپراتۆرەکانی ڕۆم بوون، لەو ڕووداوانەدا هەستن بە یارمەتیدانی خەڵکی زۆر لێکراو، داگیرکردنی یەمەن لە لایەن حەبەشە بۆ خەڵکی ئەوێ گران تەواو بوو، زوڵم و ستەم و بێدادییەکی زۆر دەرهەق بە خەڵکەکە ئەنجام درا، زەنگییەکان رەفتاری دڕندانەیان دژی خەڵکی هاماودران پەیڕەو کرد، ژنانیان هەتك دەکردن و کوشتارێکی بێ ئەندازەیان نایەوە،[18] (ذوجەدەن) ناوێك هاتە شوێنی ذونواس و هەوڵی بەرگری کردنی دا، بەڵام

---

* ئوخدود چاڵ و قەڵشێکی درێژ کە لەزەویدا کرابێ (خەندەك)

١٧- مؤلف مجهول : مجمل التواريخ والقصص، ل ٧٠، ١٦٩.

١٨- فارسنامه : ابن بلخی، ل ٩٥.چاپ کمبریج.

هیچی پێنەکراو بەناچاری خوی فرێدایە ناو دەریا[19]، زەنگییەکان دەستیان بەسەر یەمەن دا گرت، بەڵام ماوەیەك دواتر ناکۆکییان کەوتە ناو و وەك لە سەرچاوەکاندا باسکراوە (ئەریات) ماوەیەك فەرمانڕەوایی کرد، ئینجا ئەبرەهە ناوێك لەدژی ڕاپەڕی، زەنگییەکان بوونە دوو گروپ، گروپێك لەگەڵ ئەبرەهە کەوتن و گروپێکیش لەگەڵ ئەریات دا مانەوە[20].

شەڕو ڕووبەڕووبوونەوەیەکی توند کەوتە نێوان هەردوو گروپەکە. ئەبرەهە بە ئەریاتی گوت شەر لە نێوان ئێمەدایە بۆچی خەڵکی بەکوشتن بدەین؟ وا باشترە ئێمە هەردووکمان بۆ یەکتر بێینە مەیدان و یەکێکمان سەردەکەوین! وایانکرد و ئەریات کوژرا، زەنگییەکان کە لەیەمەن بوون هەموویان لە دەوری ئەبرەهەدا گرد بوونەوە، کاتێ کە (نەجاشی) لەو ڕووداوە ئاگادار بۆوە زۆر تووڕەو هەراسان بوو، سوێندی خوارد کە خاکی سەرزەمینی ئەبرەهە پایەماڵ بکات و بیخاتە ژێر پێیەکانی خۆیەوە و خوێنی بڕێژێ، ئاگری لە نێو چاوان بەربدا. ئەبرەهە مووی نێوچاوانی خۆی بڕین ئەو موانە و هەنبانێك لە خاکی وڵاتی یەمەن و شووشەیەك لە خوێنی خۆی بۆ نەجاشی نارد و پەیامێکی بۆ نارد کە من بەندەیەکم لە بەندەکانی تۆو، ئەریاتیش بەندەیەك بوو لەبەندەکانی تۆ، بۆ بەجێگەیاندنی فەرمانی تۆ ڕووبەڕووی یەکتر بووینەوە، ئێستا ئەوەی تۆفەرمان بدەیت هەر ئەو ڕاستە.

هەروەها زۆر دیاری و خەڵاتی بۆ ناردن و نامەیەکی بۆ نووسی کە بیستومە پادشا سوێندی بە مەسیح خواردووە کە مووی نێو چاوانی من بسووتێنێ و خوێنم بڕێژێ، خاکی وڵاتی من بخاتە ژێر پێیەوە، ئێستا وا من موی نێو چاوانی خۆم بۆ ناردی تا پادشا بیانسوتێنێ و خوێنی خۆم لە نێو شووشەیەك بۆناردووی تاکو بیڕێژی و هەنبانێك خاك و خۆڵی ئەم سەر زەمینەم بۆ ناردووی کە بیخەیتە ژێر پێتەوە و سوێندی خوت بەئەنجام بگەیەنیت و ڕق و تووڕەییت بەسەر من وەلابنێی و لە شوێنی خۆمدا بمێنمەوە، کە نەجاشی ئەو نامەیەی خوێندەوە ڕای ئەوی پەسەند کردو لێی خۆش بوو.

## هاوەڵانی فیل

لەو کاتەی کە زەنگییەکان بە فەرماندەیی ئەریات دەستیان بەسەر یەمەندا گرت تا ئەو دەمەی کە سوپای ئێران بەفەرماندەیی ڤەهرەز ئەوانی لەوێ دەرکردو تەفر و تونای کردن، وەك

---

١٩- اصفهانی : سنی ملوك، ل٨٩.

٢٠- ابن هاسم : سیره ابن هشام، ج١ ل، ٣٩.

(هەمزە) و هەندێك لە مێژوونووسانی دیکە گێراویانەتەوە ماوەی حەفتا و دوو ساڵی پێچوو، سەردتای دەست بەسەرداگرتنی یەمەن لەلایەن ئەوانەوە لە ڕۆژگاری قوبادی کوڕی فەیرۆز پادشای ساسانی بوو، دەڵێن کە ئەریات بیست ساڵ فەرمانڕەوایی کردووە و ئەبرەهەش بیست و سێ ساڵ، دوای ئەبرەهە (یەکسومە)ی کوڕی حەڤدە ساڵ و دوایی (یەکسوم)یش کوڕەکەی تری ئەبرەهە کە ناوی (مەسروق) بوو دوازدە ساڵ فەرمانڕەوایی کرد[٢١].

لە بارەی ئەبرەهەوە نووسیویانە کە هەوڵی بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی دەدا، دەڵێن پەرستگایەکی لە (سەنعا) دروست کردووە بەناوی (قلیس)، ئەو کەنیسەیە لە هیچ جێیەکی دیکە نموونەی نەبووە، ئینجا کەوتە هەوڵی ئەوەی حەجکردنی کەعبە لە عارەبەکان قەدەغە بکات و ڕووگەی ئەوان لە کەعبەوە بگوڕێ بۆ (قلیس) و لەو بارەیەوە نامەی بۆ (نەجاش)ی نارد و داوای فەرمانی ئەوی کرد کە عارەبەکان لە مەبەستی ئەبرەهە ئاگاداربوونەوە، نیگەران بوون و یەکێکیان چووە (سەنعا و قلیس)ی پیس کرد کە ئەبرەهە لەوە ئاگاداربووەوە تووڕەبوو و بڕیاری وێرانکردنی کەعبەی داو بەفیل و لەشکرێکەوە ڕێی مەککەی گرتە پێش٢٢، چیرۆکی هاوەڵانی فیل بە ئاماژە لە قورئاندا هاتووە و ئەو ساڵەیان لە مێژووی عارەبدا بە (ساڵی فیل) ناوزەد کردووە، وتویانە ئەو بۆچوونە جێی قسە لەسەرکردنە کە پەیامبەری ئیسلام لەو ساڵەدا لەدایك بووە، بەڵام ئەبرەهە سوودی لەو لەشکرکێشییە وەرنەگرت و لەمەککەدا مرد یا لە گەڕانەوە بۆ یەمەن سەری تیاچوو. ئایا لەشکرکێشی زەنگییەکان بۆ سەر مەککە تەنها بە هۆی ناکۆکییەکی ئایینی و بۆ تۆڵەکردنەوە لە پیسکردنی کەنیسەی قەلیس بووە؟، ئەو گریمانەیە بەدوور دەزانرێ! بەهەرحاڵ ڕەنگە بتوانین بڵێین کە داگیرکردنی یەمەن لەلایەن زەنگییەکانەوە ڕێی بازرگانیی هیند بۆ دەریا ناوەڕاستی کە بە حیجازدا تێدەپەڕێ، بەست بێ و، عارەبەکانی حیجاز کە لەو نێوەدا زیانێکی زۆریان پێدەگەیشت، لە دژی زەنگییەکان ڕادەپەڕین و کێشەو ئاستەنگیان بۆ

---

٢١- ئەوەی مێژوونوسە موسڵمانەکان لەبارەی زەنگییەکان و (( اصحاب الفیل )) هێناویانە بە ئاشکرا جگە لە چیرۆك و گێردراوەی ناو خەڵکە ڕەشۆکییەکە سەرچاوەیەکی تری نەبووە، ناکوکییەکی زۆریش لە بارەی ڕیزبەندی ڕێکەوتی ئەمیرەکان و ماوەیان هەیە، کە لەوگێڕانەوەدا سەرچاوەی گرتووە. لەم بارەیەوە جگەلە گێڕانەوەی پڕوکوپ مێژوونووسی ڕۆمی چەند بەردنوسی تریش هەن کەتوێژینەوەی مێژووی یەمەن و حەبەشی یەکان گرنگە بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ Ryckmans.L,Inst. Monarch. Enarab. Merid. Av. L,Islam. هەروەها Beeston.Notes. on the. Murighaninseription .Bsosxvi.

٢٢- ابن هشام: سیرة ابن هشام، ج١، ل ٥٤.

دروستکردبن، ئەو داگیرکردنەی حەبەشە نەك هەر زیانی بە بازرگانیی ڕۆم نەگەیاندوە بەڵکو کاری بازرگانانی ڕۆمی ئاسانتر کردووە، بەڵام بۆ بازرگانانی ئێرانیش وەك عارەبەکان زیانی هەبووە و وەخۆکەوتن و خوتێهەڵقورتاندنی میر و پادشاکانی (حیرە) و پادشاکانی ئێرانیش لەو کارەدا بەر لەهەر شتێکی تر لەڕووی بازرگانی و ئابوورییەوە بووە. لە بارەی ماوەی فەرمانڕەوایی زەنگییەکان لەیەمەن، وەك (هەمزە) جەختی کردووتەوە ڕای جیاواز هەیەو هەبووە، مێژوونووسەکان هاودەنگ نین لەو بارەیەوە خاڵێکیش هەیە کە دەبێ لێرەدا باسی بکرێ، لە دایکبوونی پێغەمبەر کە هاوکاتی ساڵی فیل بووە، نزیکەی ساڵی ٥٧٠/ی ز دانراوە.٢٣ لەشکرکێشی ئێرانییەکانیش بۆ سەر یەمەن لە ساڵەکانی ٥٧٠ تا٥٧٦ زانراوە، ئەگەر ئەو سەردارەی حەبەشە کە فیل و لەشکری بۆسەر مەککە بردووە، ئەبرەهە بێ، بۆ بیست و نۆ ساڵی فەرمانڕەواییکردنی یەکسوم و مەسروق ئێدی کاتێك نامێنێتەوە، بۆیە دەبێ ئەوەی کە بۆ وێرا کردنی کەعبە لە یەمەنەوە لەشکری بۆ سەر حیجاز برد، مەسروق بووبێ یا ئەوەی کە کور ی ئەبرەهەش هەر بەناوی باوکیانەوە لە چیرۆکەکانی عارەباندا ناودێر کرابن، ئەگەر نەتوانین ئەو ڕیمانەیە پەسەند بکەین ئەوا دەبێ لە ڕاستی ئەو گێرانەیەوەیەی هەمزەی ئەسفەهانی و ئیبن ئەس ـ و ئەوانیتر لە بارەی ماوەی فەرمانڕەوایی زەنگییەکان لە یەمەن و هەروەها دەربارەی ژمـ ەو ئەو ماوەی کە ئەو فەرمانڕەوایانە حوکمیان گێڕاوە گومان بکەین.

## ذی یەزەن (ذی یزن)

ـلێ زەنگییەکان لە ماوەی داگیرکردنی یەمەندا بێدادییەکی زۆریان ئەنجام دا. موڵك و ماڵی خە یان بەزۆر و زۆرکار زەوت کرد، ژنانیان بە خورتی لە ماڵەکانیان دەردەهێنان و دەیانبردن، زۆر، نێزان و ماڵبات بەمشێوەیە تووشی ماڵوێرانی و پەرێشانی بوون و ستەمکارییەکی زۆر دژی خە ئەنجام درا.

ـەرچاوەکان نووسیویانە کە لە نێو شازادەکانی یەمەندا یەکێك هەبوو بەناوی (ذی یەزەن) خدا ، خۆشیان دەویست و بە مەزنی خۆیانیان دەزانی ذی یەزەن ژنێکی هەبوو بەناوی ڕەیحانە لەو بنە ڵانە بوو کە چەندین ساڵ فەرمانڕەوایی یەمەنیان کردبوو، ڕەیحانە لە جوانی و داوێنپاکی و ژیـ لە هەموو هاماوەراندا ناوبانگی دەرکردبوو. باسی ئەم ژنەیان بۆ ئەبرەهە کرد، ئەویش بانـ ، ذی یەزەنی کرد و بەزۆرداری ژنەکەی لێسەند و کردی بە ژنی خۆی و بردییە ماڵی خۆی،

---

٢٣ - Huart1-P.88.

ڕەیحانە لە ذی یەزەن کوڕێکی دوو ساڵەی هەبوو بەناوی (مەعدی یەکرەب) و نازناوی سەیف. ئەو کوڕەی لەگەڵ خۆیدا بۆ ماڵی ئەبرەهە برد و لە ئەبرەهەش دووکوڕی بوون بەناوەکانی (یەکسوم، مەسروق) ئەبرەهە (سەیف)یشی وەکو کوڕەکانی خۆی دادەنا و (سەیف) وای دەزانی کە ئەبرەهە باوکییەتی! لەگەڵ براکانی دا یەکسوم و مسروق گەورەبوو، لە نهێنی و ڕازی ڕابردوودا بێ ئاگابوو، بەڵام ذی یەزەن کە ژن و کوڕەکەی خۆی لەدەست دابوون لە شەرمان نەیدەتوانی لە یەمەن بمێنێتەوە و ڕێی ڕۆمی گرتە بەر و دادی خۆی بۆ قەیسەری ڕۆم برد، لە دەستی ستەم و بێدادی زەنگییەکان سکاڵای کردو بۆ دەرکردنی ئەوان داوای یارمەتی پارە و هێزی کرد و ئەوەی پەسەند کرد کە ئەگەر بە هاوکاری قەیسەر توانی یەمەن لە دەستی زەنگییەکان ڕزگار بکات، ببێتە کاردار و بەرفەرمانی ڕۆم و باج و خەراج بداتە قەیسەری ڕۆم. قەیسەر کە خۆی زەنگییەکانی هان دابوون و هاوکاری کردبوون گوێی لەقسەی ذی یەزەن نەگرت، لەراستیشدا ئەو نەیدەتوانی بۆ کەسێك کە هاوئایینی ئەو نییە کەسانێك ئازاربدات کە مەسیحی و هاو ئایینی خۆین، مەگەر زەنگییەکان خۆشیان بەر فەرمان و کارداری ڕۆم نەبوون؟ بەمشێوەیە قەیسەری ڕۆم گوێی نەدایە دادی ئەو شازادە ستەمدیدە ئاوارەیە. ذی یەزەن بە نائومێدی و دەستی بەتاڵ ئەوێی بەجێهێشت .

لەوێوە یەکسەر ڕێی ئێرانی گرتەبەر تاکو هاواری خۆی بباتە بەردەم خوسرەو. یەکەمجار چووە حیرە، نوعمانی کوڕی مونزر، بە وتەیەکی تر عەمری کوڕی هیند لەوێدا لەلایەن ئەنۆشیڕوانەوە کرابووە فەرمانڕەوا. ذی یەزەن کێشەکەی خۆی بۆ باسکرد و میری حیرە کە بە ڕەچەڵەك خۆشی یەمەنی بوو دڵنەوایی کرد و ڕێزی لێگرت، ماوەیەك دواتر لەگەڵ خۆیدا بردییە دەرباری خوسرەو و بەسەرهاتەکەی بۆ باسکرد.

خوسردو ئەنۆشیڕوان ڕێگەی پێدا تاکو بچێتە لای، کە ذی یەزەن چووە بارەگای خوسرەو لەشکۆ و مەزنایەتی شای ئێران سەرسام ما! کڕنوشی برد و کەوتە نزاو پاڕاناوە، ئەنوشیڕوان فەرمووی هەڵیسێننەوە بەرزیان کردەوە. پاشای مەزن نەوازشی کرد و بەگەرمی لێی پرسی؟ ذی یەزدن دەستی بەقسەکردن کرد، بە ناڵە و پاڕانەوەوە باسی بێدادی و ناحەقییەکانی زەنگییەکانی بۆ کرد، ئەو گفتوگۆیەی نێوان ئەو ئەنوشیڕوان لە سەرچاوە مێژووییەکان دا هاتووە، نووسیویانە کە ئەو ذی یەزەنە کاتێ گەیشتە لای خوسرەو: ((چۆکی دادا و بەپاشای هەڵگوت و پەسنی کرد و باسی لەداد و دادگەری ئەو لە جیهاندا کرد، ئینجا گوتی پاشای مەزن من فلانی کوڕی فلانم... ئێمە کەسانێك بووین کە خاکی یەمەن هی بنەماڵەکەمان بوو، حەبەشی هاتن و پاشایەتی یان لە

ئێمە زەوت کرد، و ئێمەیان بێچارە و بەدبەختکرد، هەموو شتێکیان لێسەندین، زوڵم و ستەمێکی زۆریان دەرحەقی خەڵکی ئێمە پیادەکردووە و ئێمە وا پەنجا ساڵە سەبرمان گرتووە و خەڵکی ئێمە سەبری گرتووە، بەڵام ئێدی کار گەیشتۆتە ڕادەیەك کە نەتوانین بەرگەی ئەو سوکایەتی و پەستییە بگرین و شتی وا دەرحەق بەخوێن و شەرافەتمان کراوە کە لە کۆڕی پادشادا شەرم دەکەم باسیان لێوە بکەم و بیانهێنمە سەر زمان...، ئەگەر پاشا بە ڕاستی بزانێ کەچی یان بە ئێمە کردووە بە هاوار و دادمان دەگات و لە دەستی ئەو نامرۆڤە بێ مروەتانەمان دەرباز دەکات. ئەگەرچی تا ئێستا ئێمە نەهاتوینەتە دەرباری ئێوە و هیچ داخوازییەکمان نەکردووە، ئەمڕۆکە من بە ئومێدەوە هاتوومەتە بەردەرگای پادشای مەزن، و پەنا و هاواری خۆم بۆ هێناوە، ئەگەر پادشا بە گەورەیی خۆی ئومێدی من بەجێ بگەیەنێ و بەدادمان گەیشت لەشکرێکم لەگەڵدا بنێرێ تا من ئەو دوژمنە لە وڵاتی خۆم وەدەربنێم و ئەو خەڵکەی ئەوێ لە دەستی ئەوان قوتار بکەم، وڵاتی پادشای مەزن لەگەڵ یەمەندا پەیوەست دەبێ و وڵاتی بەرێزتان دەگاتە سنووری مەغریب و بەدادگەری بەرێزتان ئەو خەڵکە لەژێر کۆت و بەند و کۆیلایەتی ڕزگاریان دەبێ و ئێمەش دەگەڕێینەوە شوێنی خۆمان و من و هەموو (ئالی جەیمەر) دەبینە بەندە و بەرفەرمانی بەرێزتان.... ئەنوشێروان خۆشی لە قسەکانی هات و دڵی پێسوتاو چاوی پڕبوون لە ئاو، ذی یەزەن پیر و ریش سپی بوو، و ئەنوشێروان پێی گوت ئەی پیر قسەکانت لە جێی خۆی بوون و دڵی منت سووتاند و چاوت پڕکردم لە ئاو، دەزانم غەدرت لێکراوە ئەوەی گوتت و لە ئەنجامی ئەو غەدرو ئازارەوە بوو کە دەرحەقت کراوە، بەڵام ئەو وڵاتەی تۆ زۆر لە پادشایەتی منەوە دوورە و لە نێو بیابانی حیجازە و لەو دیوەکەی تری دەریایە بۆ ناردنی لەشکر بۆ بیابان پێویستیم بەزیاتر بیرکردنەوە و وردبوونەوە هەیە، بەڵام دەزانی وڵاتی من فراوانە و هەرچی دەخوازی بێژە... لێرە شوێنێك دیاری بکە و دڵ لە پاشایی هەڵبگرە و لە خێر و بێری ئەم وڵاتەی ئێمەدا هاوبەشبە و فەرمانیدا شوێنێکی چاکی بۆ دیاری بکەن و دوو هەزار دەرهەمی بدەنێ، کە دەرهەمەکانیان دایێ و لە کۆشکی پاشا چووە دەر، بەدوای خۆیدا دەرهەمەکانی هەڵڕشتن و خەڵك بەدواییەوە بوو دەرهەمەکانیان هەڵگرتنەوە تا گەیشتەوە ماڵی خۆی. هیچ دەرهەمی پێ نەمابوو، ئەنوشێروانیان لەوە ئاگادار کردەوە... ڕوژێ دواتر کە ڕێگەی بەخەڵك دا بێنەلای ڕێی بەئەویش دا و پێی گوت کەس ئەوە لەگەڵ بەخشیشی پاشایان ناکات کە تۆ دوێنێ بە پارەکانی ئێمەت کرد. بەپاڕانەوەوە، گوتی من سوپاسی خوام کرد بەوەی کە پادشای مەزن ڕێگەی دا بچمە لای و گوێی لە قسەی من ڕاگرت و لەگەڵمدا کەوتە ئاخافتن، لەو شوێنەی کە من لێیەوە هاتووم

خاکەکەی بریتییە لەزێڕ و زیوو لەوێدا کەم کێوێك هەیە کە تیایدا کانی زێڕوزیوی لێ نەبێ...
ئەنوشێروان پێی گوت بگەڕێوە و سەبر بگرە تابیر لە داواکارییەکەت دەکەمەوە[٢٤]، لەو
گێڕانەوەیەدا ئەوە دەردەکەوێ کە ئەنوشێروان بەڵێنی هاوکاری کردنی بە ذی یەزەن نەداوە
ئەگەرچی زۆر دڵی داوەتەوە و ڕێزی لێگرتووە، بەڵام هەندێ لە مێژوونووسان نووسیویانە کە
بەڵێنی یارمەتیدانی پێداوە، بەڵام نەیتوانیوە بەڵێنەکەی بە ئەنجام بگەیەنێ. مەسعودی
نووسیویەتی و دەڵێ: ((ئەنوشێروان بەڵێنی پێداوە کە لەجەنگ دژی ڕەش پێستەکان یارمەتی
بدات، بەڵام بە جەنگی دژی ڕۆم و وڵاتانی تر خەریك بووە))[٢٥] بەهەرحاڵ سەرچاوەکان نووسیویانە
کە ذی یەزەن وەکو پەنابەرێك دە ساڵ لە دەرباری ئەنوشێروان دا مایەوە و هەر لەوێشدا کۆچی
دوایی کردووە.

## سەیفی کوڕی ذی یەزەن

بەڵام سەیف لە ماڵی ئەبرەهە بوو و ئەوی بە باوکی خۆی دەزانی. کە ئەبرەهە مرد و یەکسوم
و مەسروق بوونە فەرمانڕەوای وڵات، ئەوکات ئەو بەڕاستی ڕووداوەکەی زانی و تێگەیشت کە
چارەنووسی باوکی چۆن بووە. بۆیە لە یەمەن ڕۆیشت و بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی باوکی ئاوارەی
جیهان بوو. نووسیویانە کە یەکەمجار چووەتە لای قەیسەری ڕۆم و سکاڵای لەو ستەمەی
زەنگییەکان کردووە کە دەرهەقیان کردوویانە. بەڵام چونکە قەیسەر بایەخی پێنەداو گوێ
لەقسەکانی نەگرت، نا ئومێد بوو و ڕێی دەرباری خوسرەوی گرتە پێش. لێرەدا پێویستە ئەو خاڵە
لەبیر نەکەین کە سەفەرەکەی ذی یەزەن و سەیفی کوڕەکەی، یەکەمجار بۆ دەرباری قەیسەر دواتر
بۆ بارەگای ئەنۆشیروان، بە یەك شێوە نووسراوە. لێرەدا ئەگەری ئەوە دێتە پێش کە بۆی هەیە
یەکێك لەوانە لە سەر ئەوەی تر دورستکرابێ و نووسرابێتەوە. ئەو کارە لە چیرۆکەکاندا نموونەی
هەیە و چەندینجار ڕووی داوە، نموونەیەکی ئەوەی (حەوت خانی ئەسفەندیار)ە کە لەسەر (حەوت
خانی ڕۆستەم) دورستکراوە. لە چیرۆکی سکاڵا و هەوڵەکانی ذی یەزەن و سەیفیش لە دەرباری
ڕۆم و ئێران لێکچوونەکە بەڕادەیەك روونە کە بێگومان دەبێ یەکێك لەسەر ئەوەکەی تر
دورستکرابێ و ڕەنگە لەو کارەدا ویستبێتیان بەسەرهاتی ئەو شازادە ئاوارە و بەدبەختە پڕئێشتر
و غەمناکتر نیشان بدەن. بەڵێ نووسیویانە کە سەیف یەکەمجار چووە لای قەیسەری ڕۆم و لە

٢٤- تاریخ بلعمی، خطی.

٢٥- مروج الذهب، ج١، ل ٢٨٤.

دەستی ڕەشپێستەکان و ستەم و بێدادی ئەوان سکالآی کرد و داوای دادپرسی کرد و داوای یارمەتیدانی قەیسەری کرد تاکو ئەوان لە ولآتی خۆی دەربکات. قەیسەر وەلآمی دایەوە کە ئەوان خۆیان پەیڕەوی ئایینی منن و ئێوە بتپەرستن، ناتوانم یارمەتی ئێوە بدەم دژی ئەوان. کە سەیف نا ئومێد بوو، ڕووی کردە دەرباری خۆسرەو یەکەمجار لە حیرە چووە لای نوعمان و نوعمان ئەوی بردە لای خۆسرەو[٢٦]

هەندێ لە مێژوونووسان نووسیویانە کە سەیفیش سالێك لە دەرباری ئەنوشێرواندا مایەوە. ڕۆژان لە بەیانی تا ئێوارە لە بەردەم دەرگای بارەگای خوسرەو دادەنیشت و دادی دەخواست و شەوانەش دەچووە سەرگۆڕی باوکی دەگریا و لەوێدا دەنووست. سالێك تێپەڕی و هیچ کەسێ چاوی بە سکالآی ئەودا نەخشاند. دواجار ڕۆژێك لە پێش مەوکەبی نۆشیرواندا ڕاستبووەوە و هاواری کرد: ((ئەی شاهەنشا؟ من میراتێکم لای تۆ هەیە، داوادەکەم مافەکەم بۆ بگێڕیتەوە)) خوسرەو بانگی کرد و لێی پرسی چ مافێکت لای منە و تۆ کێیت؟ سەیف گوتی من کوڕی ئەو پیرەمێردە یەمەنییەم کە دە سالّ بەو ئومێد و گفتەی کە بەرێزتان پێتان دابوو لەم ئاستانەدا مایەوە تامرد، ئەو بەلێنەی کە شای مەزن بەو پیرەمێردەی دابوو ئێستا وەك میرات بۆ من ماوەتەوە و مافێکی منە بەلای شاهنشاهەوە. خوسرەو دلّی پێ سووتا، دلنەوایی کرد و دە هەزار دەرەمی زێڕی دایێ. سەیف کە لەلای خوسرەو گەڕایەوە ئەو پارانەی لە ڕێگادا هەلڕشتن و خەلکی هەلّیان گرتنەوە. ڕۆژی دواتر خوسرەو هۆی هەلڕشتنی پارەکانی لێپرسی، وەلآمی سەیف هەمان ئەو وەلآمە بوو کە ذی یەزەن چەندین سالّ بەر لە هەنووکە لەو بارەیەوە دابویەوە. ئاشکرایە کە ئەو وردەکاریانە لەو جۆرە چیرۆکە کۆنانە لە ئەفسانە بەدەرنین. بەلآم ئەگەرچی ڕاستیش نەبن کەچی بۆچوونێکمان لەو وێناکردنەی کە دیرۆکزان و گێڕەرەوەکانی عارەب دەربارەی پاشاکانی ئێران هەیانبووە، دەداتە دەست.

نووسیویانە کە ئەنۆشێروان سەبارەت بە کێشەی ناوبراو، لەگەلّ سەران و سەردارانی خۆیدا کۆبووەوە و ڕای ئەوانی پرسی، گوتیان لە نێو زیندانی دەولەتدا کەسانێکی زۆری حوکمدراو بە مەرگ هەن. واباشە ئەوانە ڕەوانە بکەین، ئەگەر کوژران ئەوە هیچ و ئەگەر سەریش کەوتن ولآتێکی تازە بۆ بەرێزتان زیاد دەبێ و دەکەوێتە دەست. ئەنوشێروان ئەو ڕایەی پەسند کرد و فەرمووی چاو بە کارنامەی زیندانییەکاندا بگێڕنەوە، هەشت سەد کەسی شایانی مردن لە نێو

---

٢٦- دینەوەری : اخبار الطوال، ل ٦٦.

زیندانییەکاندا هەبوون کە کوشتنیان پێویست بوو.[٢٧] هەندێ لە مێژوو نووسان نووسیویانە کە هەموو ئەو هەشت سەد کەسە لە نەوەی ساسانییەکان و نەژادی پاشاکانی تر بوون. ئەو قسەیە سەیرەو زیادەڕۆیی تیایە. بۆی هەیە، نەوەکانی ئەوان کە خۆیان بە ((نەژادە ئازادەکان)) یا نەوە ئازادەکان ناو دەبەن، ئەو چیرۆکەیان دروستکردبێ تا نەژاد و ڕەچەڵەکی خۆیان بگەیەننەوە بە شاکان و خۆیان لە نەنگی زیندانیان و حوکمدراوان بە مەرگ جیا بکەنەوە. بەڵێ ئەو زیندانیانە لە هەشت سەد کەس زیاتر نەبوون. ئەوانەیان لە زینداندا هێنانە دەر تا لەگەڵ سەیفی کوڕی ذی یەزەندا بۆ یەمەنیان بنێرن. سەیف گوتی شاهەنشاها بەو ژمارە کەمە چیمان پێ لەگەڵ زەنگییەکان دەکرێ؟ ئەنوشیروان گوتی داری زۆر بە ئاگرێکی کەم دەسووتێندرێ. فەرمانی دا هەشت کەشتیان ئامادەکردن و ئەوانەیان بە چەك و ئازوقەی پێویستەوە سواری کەشتییەکان کردن))[٢٨]

## ڤەهرەزی دیلەمی

سەردارو سوپاسالاری دلاودرانی ئێران (ڤەهەزی سپەبۆدی دیلەم)[٢٩] بوو. هەندێك بە ڤەهرەزی کوڕی کامکار تۆماریان کردووە و گوتویانە کە ئەو پیرێکی بە ساڵاچوو بووە و تەمەنی لە سەد ساڵ تێپەڕیوە و یەکێك لە سوار و پاڵەوانەکانی ئێران و لە بنەماڵەی گەورەکان بووە و لەبەر ئەوەی کەوتبووە دوای چەتەیی و ڕێگرییەوە، خوسرەو گرتبووی. هەندێك بە خورزاد کوڕی نێرسی نەوەی جاماسبی برای قوباد فەیرۆزیان زانیوە و گوتویانە کە ئەنوشێروان ئەوکات بۆ یارمەتیدانی سەیفیی کوڕی ذی یەزەن ناردییە یەمەن و پلەی ڤەهرەزی پێ بەخشی[٣٠] بەم پێیە ڤەهرەز ناوی ئەو نییە، بەڵکو ناوی پێگەیەکە ئەنوشێروان پێیداوە. هەندێکی تریش ناوی ئەویان بە ڤەهرەزی کوڕی بێهئافەرید کوڕی ساسان کوڕی بەهمەن نووسیوە و گوتویانە کە پردی نەهرەوان لە ئێراقدا ئەو ڤەهرەزی کوڕی بێهئافەریدە دروستی کردووە.[٣١] ئەوەی کە لە هەموو ئەو ریوایەتانەدا دەردەکەوێ ئەوەیە کە ئەو سەردارە، لە خانەدانی ساسانی بووە و لە نێو سوپای ئەنوشێرواندا پلەیەکی گرنگی هەبووە. بەلعەمی دەڵێ کە پیاوێك بوو لە نێو سوپای ئەودا. پیرێکی هەشتا

---

٢٧- ا بن بلخي: فارسنامە، ل ٩٥.

٢٨- مسعودي: مروج الذهب، ج ٢، ل٢٨٣.

٢٩- دينوري: اخبار الطوال، ل٦٦.

٣٠- مسعودي: التنبية الاشراف، ل ٢٢٦. مؤلف مجهول: مجمل التوراريخ، ل ١٧٢.

٣١- فارسنامە ابن البلخي، ل ٩٦.

ساڵە ناوی (ئوهزار) لە نێو هەموو ئێراندا کەسێك لەو تیرهاوێژتر نەبوود و ئەنوشێروان بە تەنیا بارتەقای هەزار پیاوی گەنجی داناوە و بۆ هەر جێیەك بیناردبا دەیگوت هەزار پیاوی سوارم ناردووە، ئەو پیر و لاواز بووبوو، لەکار کەوتبوو و چاوەکانی کزببوون. ئەنوشێروان بانگی کرد و کردییە فەرماندەی ئەو لەشکرە).[32] ڤەهرەز لەگەڵ هاوەڵانی خۆی و سەیفی ذی یەزەن بە ڕێی دەریادا بەرەو هاماوەران کەوتنە ڕێ. لە دەریادا دوو کەشتی بە دووسەد سەرنشینەوە لەو جەنگاوەرانە نقۆمی ژێر ئاو بوون. شەش کەشتی گەیشتنە عەدەن و سەربازەکان لە دەریا هاتنە دەر. پاشای زەنگییەکان لە هاتنی ئەوان ئاگاداربووەوە. کە زانی ژمارەیان کەمە پێیسەیر بوو و بە هەندی هەڵنەگرتن. لە لایەکی تر، کەس وکارەکانی سەیف و زۆر لە خەڵکی هاماوەرانیش کە لە ماوەی چەندین ساڵدا بێدادی و ئێش و ئازارێکی زۆریان لە دەستی زەنگییەکان چێشتبوو، پەیوەندییان بە هێزی جەنگاوەرانی ئەو کرد. ژمارەی ئەو گروپەیان بە پەنجا هەزار کەس نووسیوە. نووسیویانە کاتێ کە ڤەهرەز گەیشتە کەناری دەریا هەرچی تۆشەو خواردەمەنییەك کە لە نێو کەشتییەکاندا مابوو فڕێی دایە نێو دەریاو کەشتییەکانی سووتاند و بە سەربازەکانی خۆی گوت کەشتییەکان و شتومەکەکانم بۆیە سووتاند تا ئێوە بزانن ئیدی ڕێگای گەڕانەوە نییە و دوژمنیش بزانێ کە ئەگەر ئێمەی بکەوێتە بەر دەست هیچ شتێکی لە ئێمە پێنابڕێ، هەنووکە بۆ ئێمە مەرگ لەدواوە و سەرکەوتن لە پێشەوەیە و جگە لە بۆ پێشەوە ڕۆیشتن ڕێگا چارەیەکی ترمان نییە. جەنگاوەرەکان هەموویان سوێندیان خوارد کە تا گیانیان تیایە شەڕ بکەن. جەنگێکی خوێناوی روویدا کە (تەبەری) و (بەلعەمی) وردەکارییەکانیان بە درێژیی نووسیوە. لەو جەنگەدا تیری ڤەهرەز پاشای زەنگییەکانی پێکاو کوشتی. ئێرانییەکان زەنگییەکانیان تیرباران کرد و زۆریان لە نێو بردن. ستەملێکراوانی هاماوەرانیش ڕق و کینەیەکی دێرینیان بەرامبەر زەنگییەکان لە دڵ دا بوو دەست هەڵێنانیان کردو هەرکەسێکیان لەوان بکەوتبایە دەست دەیانکوشت، بەم جۆرە سەیفی ذی یەزەن و خەڵکی هاماوەران تۆڵەی خۆیان لە دووژمنەکانیان ستاندەوە و دوای چەندین ساڵ ئەوانیان لە وڵاتی خۆیان وەدەرنان.

## کوژرانی سەیفی ذی یەزەن

سەیفی ذی یەزەن بوو بە فەرمانڕەوا. لەلایەن ئەنوشێروانەوە فەرمانێك بە سپەهبود ڤەهرەز گەیشت کە بگەڕێتەوە و دەسەڵات بەسەیف بسپێرێ. وایکرد و ئێرانییەکان لە یەمەن مانەوە،

---

٣٢- بلعمی، خطی

بەڵام ئەنوشیروان لەگەڵ پادشای یەمەن چەند مەرج و پەیمانێکی بەست. یەکێك لەو مەرجانە ئەوە بوو کە پیاوە ئازادەکانی ئێران دەتوانن ژنی یەمەنی بهێنن، بەڵام یەمەنییەکان بۆیان نییە کچی ئێرانی بخوازن.[٣٣] رەنگە بەو مەرجەی مەبەستی زیادکردنی ژمارەی ئێرانییەکان بووبێ تا ئێرانییەکان لە رێی ژنهێنانەوە ژمارەیان زۆرتر بێ و فەرهەنگ و شارستانیەتی ئێران لەو ناوچەیەدا زیاتر بڵاو ببێتەوە و پەرەبسەنێ. لەوە بەدواوە یەمەن کەوتە ژێر قەڵەمڕەوی ئێرانییەکان و فەرمانڕەوایی ئێرانییەکان لەو وڵاتەدا دەستیپێکرد. سەیفیش بەردەوام باج و خەراجی بۆ دەرباری ئەنوشیروان دەنارد و بە خەڵات و ناردنی پێشکەشییەکانی خۆیی بەرفەرمانی و بەندایەتی خۆی دەردەبڕی. لەوەش زیاتر چارەیەکی نەبووە، چونکە لەو کاتەی کە زەنگییەکان لە یەمەن دەرکرابوون، ئێرانییەکان دەستیان لە هەموو کاروباری سیاسی و سەربازییەکاندا هەبوو و سەیف خۆیشی ئامرازێك بوو لە دەستی ئەواندا. ژمارەیەك لە حەبەشییەکان کە وەکو پاسەوان و دیدەوان لە بارەگای سەیفدا خزمەتیان دەکرد لە پڕ لێیهەڵگەڕانەوە و لە نێویان برد. سەرچاوەکان نووسیوویانە ((کە سەیفی ذی یەزەن دەسەڵاتی گرتە دەست هیچ کەسێکی حەبەشی لە یەمەن نەهێشت مەگەر پیرانی پەککەوتە و منداڵانی بچووك کە توانای چەك هەڵگرتنیان نەبوو و ژنان دەنا ئەوانی دی هەموو خستنە بەر ڕەحمەتی شمشێر و لە نێوی بردن. ساڵێکی پێچوو، نێردراوی خۆی بە دیاری و خەڵاتی زۆرەوە بۆ بارەگای ئەنوشیروان نارد. کۆمەڵێك لاوی حەبەشەیی لای ئەو بوون، کە دەسەڵاتی یەمەنی گرتەدەست چوون و ملکەچی و خزمەتی خۆیان ڕاگەیاند و زۆر بە چاکی هاتنە بەرچاو و لێیان دڵنیا بوو و متمانەی پێکردن. ڕۆژێك لەگەڵ سوپاکەیدا بوو ئەو حەبەشیانە لە پێشەوە ڕایاندەکرد و ئەویش بەسواری ئەسپەوە لەدوای ئەوانەوە ئەسپی تاو دەدا و سەربازە پیادەکانی زۆر لە دوایەوە بەجێمان و ئەو حەبەشیانە بە ئەسپەکانیان ڕایاندەکرد کە سوپا بە چاکی لێی دوورکەوتەوە، هەر چوار دەوریان گرت و کوشتیان. سوپاکەی پەرش و بڵاو بوو، حەبەشییەکان سەریان هەڵبڕییەوە و زۆریان لە حیمیەرییەکان و کەسوکاری سەیف کوشت. بێ سەروبەری دروست بوو، کەس نەبووە فەرمانڕەوا، وڵات بێ سەردار مایەوە. هەواڵ بە ئەنوشیروان گەیشت زۆر تووڕەبوو و دیسان (ڤەهرەز)ی ناردەوە یەمەن و چوار هەزار سەربازی خستنە ژێر فەرمان و پێی گوت هەر حەبەشی یەك لە یەمەن بوو، پیرو لاو و پیادە و ژن و گەورە و بچووك گشتیان بکوژە و هەر ژنێکیش کە دووگیان بێ لە حەبەشییەکان زگی بەشمشێر هەڵدڕە و زارۆی ناوزگی ئەو ژنانە بێنەدەرەوە و بیکوژە، هەرکەسێك کە لە یەمەن مووی سەری

---

٣٣- مسعودی: مروج الذهب، ج ١، ل ٢٨٣

گروازه بوو وەك هی حەبەشییەکان ئەگەر نەشتزانی بە دڵنیاییەوە حەبەشییەو لەنەوەی حەبەشییەکانە بیکوژە و هەرکەسێکت زانی کە لایەنگری حەبەشییەکانە لە یەمەن و مەیلی ئەوانی لە دڵدایە بکوژە تا لە هەموو یەمەندا حەبەشییەك نامێنێ [٣٤].

## ئێرانییەکان لە یەمەن

ئەمجارە دەسەڵاتی ئێرانییەکان لە یەمەن لە پێشان توندتر و سەرسەختانەتر بوو. سپەهبود ڤەهرەز بە رك و کینەیەکی زۆرەوە کەوتە کوشتن و ئازاردانی زەنگییەکان، چونکە ئەو یاخیبوونەی ئەوان لە دەرباری ئێراندا، وەك هەوڵدانێك بۆ باڵا دەستبوونی رۆم لێکدرایەوە. ڤەهرەز بووە (مەرزەبان)ی یەمەن و بەمشێوەیە یەمەن کەوتە ژێر دەسەڵات و فەرمانڕەوایی ئێرانییەکان و باج و خەراجی ئەو وڵاتە بۆ خەزێنەی خوسرەو شوڕ دەبوودەوە. ماوەی فەرمانڕەوایی ڤەهرەز لە یەمەن بە تەواوی دیار نییە، بەلعەمی چوار ساڵ، دینەوەری پێنج ساڵ دانەری کتێبی (البدء و التاریخ) شەش ساڵیان نووسیووە. سەبارەت بە سەرەنجامی ژیانی ئەویش ئەم چیرۆکەی خوارەوەیان نووسیووە: کاتێ مردنی خۆی نزیك بینی، داوای تیروکەوانی کردو گوتی بمگرن، ئینجا کەوانەکەی گرتەدەست، تیرێکی هەڵدا و گوتی سەیرکەن داخۆ تیرەکە دەکەویتە کوێ؟ ئەوێ بکەنە گۆڕخانەی من. تیرەکەی کەوتە ئەو دیوی کەنیسەوە ئەوێیان لەو ساوە تاکو ئەمرۆش ناو ناوە گۆڕی ڤەهرەز.[٣٥] لە بارەی جێنشینایەتی ڤەهرەز لە نێو ریوایەتە مێژووییەکاندا بۆچوونی جیاواز هەیە. بەلعەمی مێژوونووس و ئەو کەسانەی کە لە زاری ئەو گێراویانەتەوە، هەروەها ئیبن ئەسیر و ئەوانی تر گوتویانە کە ڤەهەرەز کوڕێکی هەبوو بە ناوی (مەرزەبان). ئەنوشێروان فەرمانڕەوایی یەمەنی دایە ئەو، ئەویش وەکو باوکی باجی یەمەنی بۆ سەرای خوسرەو دەنارد. گومان لەوە دانییە کە مەرزەبان لەو کاتدا ناوێکی دیاریکراو نەبووە، بەڵکو پلەیەکە کە فەرمانڕەوایانی ژێردەستی شای ئێران و کەسانێك کە بە فەرمانی ئەو لە وڵاتی عارەبان و شار و دەڤەرەکانی تر فەرمانڕەواییان دەکرد، لە ئەستۆیان بووە. (هەمزە) ئەو جێنشینەی ڤەهرەزی بە (ولسیجان) و دانەری (ئەلبدء والتاریخ) و (بنجان کوڕی وه هرەز)[٣٦] ناوی بردووەو و مەسعودی بە پیاوێك لە ئێرانییەکان کە پێیان دەگوت سیمان تۆماری کردووە. لە (کامل)ی (ابن ئەسیر)دا، دوای

---

٣٤- تاریخ بلعمی، نسخه خطی.

٣٥- دینوری: اخبار الطوال، ل٥٦. طبری، ل٩٨٨.

٣٦- البدء والتاریخ، ل ١٩٤.

مەرزەبان کوڕی ڤەهرەز، ناوی بینجان کوڕی مەرزەبان هاتووە و ئەمەش بە دڵنیاییەوە کۆپییەکە لە هەمان (ولسیجان)ی هەمزە. لایەنە لێکجیاکان و مانا و تەنانەت خوێندنەوەی ئەم ناوە بە دڵنیاییەوە ساغ نەبۆتەوە. ئەوەی کە نزیك لە هەموو ئەو گێڕانەوە مێژووییانە دەردەکەوێت ئەوەیە، کە جێنشینی ڤەهرەز لە کوڕەکانی ئەو بووە و ئەمەش لەگەڵ داب و نەریتی ساسانییەکاندا کۆکە. هەندێ مێژوونووس گێڕانەوەیەکی تریشیان لە بارەی جێنشینایەتی ڤەهرەزەوە نووسیووە. دەڵێن ئەنوشێروان دوای ڤەهرەز، (زەرین)ی دانا، ئەو کەسێکی توندوتیژ و بێ بەندوبار و دەستبڵاو بووە. کاتێ دەیویست دابنیشێ کەسێکی دەکوشت و بە نێو ئەندامە براوەکانی ئەو دا تێدەپەڕی و، ئەنوشێروان مردو گوایە ئەو هێشتا هەر فەرمانڕەوای یەمەن بوو و هورمزی کوڕی ئەنوشێروان ئەوی لە سەر کار لادا. ناوی ئەو (زەرین)ە لە هەندێ ریوایەتاندا بە شێوەی (وەین) یا (یەن) یا (زەین)یش هاتووە. نووسیویانە کە ئەو لە سوارچاکەکانیش بووە[٣٧].

ئەوەی کە لە بارەی خوێنڕێژی و توندوتیژی و بڕیاردانی بەپەلەی ئەویش باسکراوە گوایە لەو ڕووەوە بووە کە ڤەهرەز و جێنشینەکەی، بە فەرمانی خوسرەو لە سەرەتای بوونیان بە فەرمانڕەوا دەبوا زەنگییەکان بە توندی سەرکوب بکەن. باسکردن و ناوهێنانی (مەرزەبان)ەکانی دوای ئەو لەوەی تا ئێستا گوتراوە ئاڵۆزتر و بێ سەروبەرترە. هەمزە ناوی هەشت کەس لە مەرزەبانەکانی ئێران کەدوای کوژرانی سەیفی ذی یەزەن لە یەمەن فەرمانڕەواییان کردووە، باسیان دەکات، بەڵام ئەو ناوانەی باسیان دەکات لەسەر لاپەڕە چاپکراوەکاندا کراوە، لە هەڵە بەدەرنین. لە پێرستێکدا کە ئەو کێڕاویەتەوە دوای ڤەهرەز فەرمانڕەوایی یەمەن کەوتۆتە دەستی (ولیسجان) دوای ئەویش (خۆرزادان شەهر) دەسەڵاتی گرتۆتە دەست، ئینجا (نوشجان) و دواتر (مەرزەوان) و دوای ئەویش خۆر خوسرەوی کوڕی بۆتە فەرمانڕەوای یەمەن، ئەو دوای خۆر خوسرەو باس لە فەرمانڕەوایی (بادان کوڕی ساسان ئەلجەرون) دەکات و دەڵێت: شەڕو غەزووەکانی پێغەمبەر دژی تیرە و هۆزە عارەبەکان لە سەردەمی ئەودا بووە، و دوای ئەو (دادویە کوڕی هورمز کوڕی فەیروز) بۆتە فەرمانڕەوای یەمەن و هەمزە ئەو (دادویە) بەدوایین مەرزەوانی ئێرانی لە یەمەن ناوزەد دەکات، هەندێ لەوناوانە بە شێوەیەکی شێوێندراو لە کتێبی (مروج الذهب – مسعودي)شدا باسکراون، بەڵام لەگێڕانەوەی (تەبەری) و ئیبن ئەسیردا دەردەکەوێ کە تا ئەوەدەمەی پادشای ساسانی

---

٣٧- مارکوات لە جیاتی زەین، وین خوێندوتەوە گۆڕینی پیتی واو و زێ لە خەتی عارەبی ڕووی داوە. دور نییە کە واژەی بینجان وە لیسیجان وە تینجان ود سیعان و بیجان کە بۆ جێنشینی ڤەهرەز هاتوون شێوازی دەستکاری کرابێ ناوێکی دووبەش بێت کە بەشی یەکەمی واژەکە زین یا دین بووبێ.

(باژان)ی بۆ فەرمانڕەوایی یەمەن ناردووە، کوڕەکانی (ڤەهرەز) یەك بەدوای یەك لە شوێنی باوکیاندا فەرمانڕەواییان کردووە. دەنووسن کاتێك کە ڤەهرەز کۆچی دوایی کرد، خوسرەو (مەرزەبانی کوڕی ڤەهرەز) واتە کوڕی ڤەهرەزی کردە فەرمانڕەوای یەمەن و هەر کە ئەویش مرد کوڕەکەی کەناوی (وینجان) بوو لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی ئەو وڵاتەدا دانیشاند. دوابەدوای ئەویش کوڕێکی ئەوی بەناوی (خوڕ خوسرەو) کردە (مەرزەبان)ی یەمەن" دوای چەند ساڵێك هورمز لەو خوڕ خوسرەو ناوە توورە بوو و کەسێکی نارد کەبیگرێ و بەدەستبەستراوی لەیەمەنەوە بیهێنێتەوە. هورمز ویستی بیکوژێ، بەڵام پیاوێك لە گەورە پیاوانی پارس روپۆشێکی بەدەستەوە بوو کەکاتی خۆی ئەنوشێروان بەخەڵات پێیدابوو، روپۆشەکەی بەسەر سەری خوڕخوسرەو دا دا، هورمز بۆ ڕێزگرتن لەو روپۆشەی ئەنوشێروان خوڕخوسرەوی نەکوشت و ڕەوانەی زیندانی کرد و پیاوێکی نارده یەمەن کە ناوی (بازان) بوو و کردییە فەرمانڕەوای ئەو وڵاتە... ئەو کاتەی کە پێغەمبەری ئیسلام لە مەککە رابوو، بازان تا ئەوی دەمی ژیاوە و لەگەڵ خەڵکی یەمەن بۆتە موسڵمان[38].

لەو گێرانەوەیەدا وەك دەبینن هیچ باس لە (دادویە کوڕی هورمز کوری فەیرۆز) کە بە پێی ڕیوایەتی حەمزە، خوشکەزای بازان بووە نەکراوە، گێرانەوەیەکی تریش هەیە کە هی (بەلعەمی)یە کە دەڵێ: ((دوای ئەوە پێغەمبەری ئێمە (مەعاز جەبەل)ی نارده ئەوێ تارێنوێنی بکات و بنەماو ئەحکامەکانی ئیسلامی فێر بکا و ئەویش ئەو شتانە فێربوو و لەگوێی گرتن"[39].

بەمشێوەیە لە کۆتاییەکانی سەردەمی فەرمانڕەوایەتی ئەنوشێرواندا بێجگە لە میرنشینی (حیرە) کە لە دێرزەمانەوە لەژێر فەرمان و چاودێری (تیسفون)دا بوو، وڵاتی یەمەنیش لەژێر دەسەڵات و ئاڵای ساسانییەکاندا بوو. میرەکانی کیندە دەسەڵاتێکی ئەوتۆیان نەبوو و (غەسانی)یەکانش دانراوی دەستی ڕۆمییەکان بوون. لە هەموو هەرێمەکانی تری عارەباندا هیچ دەسەڵاتداری و دەوڵەتێك بوونی نەبوو. لە مەککە و (طائف) و (یثرب)دا عارەبەکان و جوولەکەکان لەکاری کشتوکاڵی و بازرگانی و پاسەوانیکردنی ڕێگاکان بترازێ کارێکی تریان نەبوو، ئەو هەرێمە ئەوەندە بایەخی نەبوو کە دەوڵەتی گەورە و پڕشکۆی ساسانی مەترسی و دڵ

---

٣٨- تاریخ بلعمی :خطی

٣٩- تاریخ بلعمی، خطی.

لەدڵدانێکی لەبارەوە هەبێ. لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەتی ساسانی وێرای ئەو مەزنی و شکۆ رووکەشەی کە هەیبوو بەخێرایی رووەو داتەپین و پشێوی دەچوو.

لە کۆتاییەکانی پادشایەتی ئەنوشێرواندا ئێران لە رەوشێکی زۆر ناجێگیردا دەژیا. سوپا یاخی و رۆحانییەت رووی لە گەندەڵکاری بوو، گەندەڵییێك کە لە نێو رۆحانییەتدا بوو، لەدەسەلات و ئوتوریتەی (موبد)ەکانەوە سەرچاوەی گرتبوو، پچڕ پچڕی و ناکۆکی کەوتبووە ناوپرسی باوەڕ و تێروانینەکان، مۆبدەکان تابینا قاقایان کەوتبوونە ناو ریاکاری و دەمارگیری و درۆ و بەرتیل خۆرییەوە. (مەزدەك) مردووە لە ساڵی (٥٣١ز) و بەرلەویش (مانی) مردووە لە (٢٧٦ز) بۆ ئەوەی گۆڕانێك لە رەوشی رۆحانی و ئایینی دروست بکەن، خۆیان هەوڵێکیان دابوو، بەڵام نەگەیشتنە ئەنجامێك. هەنگاوەکەی (مەزدەك) رووبەڕووی بەرگری رۆحانییەکان و دژایەتی سوپا بووەوە و بوودمایەی ئاژاوەو لە نێوچوون. تێڕوانین و رێگەچارەی ئەنوشێروان کەبەو پەڕی توندوتیژی و سەرسەختییەوە ئەنجامدرا بە رواڵەت ئاژاوەکەی دامرکاند، بەڵام ئەو دادگەریەی کە لە ئەفسانەکاندا دراوەتەپاڵ ئەوەوە نەیتوانی رەگ و ریشەی ستەم و گەندەڵی یەکسەر لە نێو ببات، بۆیە لەگەڵ مردنی ئەو، رووحانییەکان و سوپاییەکان دیسان دەستیان کردەوە بە ئاژاوەگێری. پاشایەتی کورتی (هورمز) بەدژایەتی کردنی روحانی و سوپاییەکان کۆتایی هات و (پەروێز)یش ئەگەرچی لە جەنگەکاندا چەند سەرکەوتنێکی بەدەست هێنابوو، بەڵام بە هۆی سەرقاڵ بوونی بەعەیش و نۆش و هەوەسبازی، ئەو دەرفەتەی وەرنەگرت کە ئەو دۆخە شێواوە کەمێك رێك خاتەوە و چاکی بکات، جەنگە بێهودەکانیشی لەگەڵ ئەو هەموو پارەو پوول و زێڕ و زیوەی کەکۆی کردبوودەوە، جگە لەوەی خەزێنەکانی حکوومەت بەتاڵ و خاڵی بکات ئەنجامێکیان نەبوو، ئەو ئاژاوەیەی کە دەستی (شێرویە)ی بەخوێنی باوکی ئاڵودەکرد پیلانێك بوو کە لەلایەن رۆحانییەکان و سوپاوە دارێژرابوو، لەوەش بەدواوە ئەو دوو توێژە بە شێوەیەك پاشایەتییان کردە یاریچەی دەستی خۆیان کە لەناو بترازێ بۆ ئەوانی تر شتێکی دی نەمابووەوە. سەردارانی سوپا وەك (شەهر براز) و (پیروز) و (فەرۆخ هورمز) هەمان ئەو رێگەیان گرتەبەر کە بەرلەوان (بەهرامی چوبین) گرتبوویە بەر و هەریەکەیان چەند رۆژێك دەستی بەسەر تاج و تەخت دا گرت.

(ئەردەشێر)ی بچکۆلەی کوڕی شیرۆیە و (پوراندۆخت) و (ئازەرمیدۆخت)یش ئەو تواناو دەسەڵاتەیان نەبوو کە رووبەڕووی نفووز و چاوچنۆکییەکانی فەرماندەکان ببنەوە. چەند کەسێکی تریش کە لەسەر ئەو تەختە لەرزۆك و ناجێگیرە دانیشتن، یاکوژران یا لەسەر تەختی پاشایەتی لادران. (یەزدکورد) دوایین جێماوەی تاجداری بوو کە لە توخمی ساسانییەکان مابوودەوە. بەڵام

ئەویش شتێکی بەشتێك نەکردو گرفتاری چارەنووسێکی شوومی بەدئاکام بووەوە کە دەوڵەت و پاشایەتی ساسانییەکانی بە یەکجاری لەنێو برد.

بەمشێوەیە سوپاییە یاخییەکان و ڕۆحانییە گەندەڵبووەکان خەمی بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتیان نەبوو. لە سوودخوازی و خۆشگوزەرانی خۆیان بەولاوە شتێکی تریان لە مێشکدا نەبوو: پیشەوەران و وەرزێرەکانیش کەباری گرانی ئەو خەرجی و خوشگوزەرانییەی ئەوانیان لەسەرشان بوو هیچ سوودێکیان بۆ خۆیان لەمانەوە و پاراستنی ئەو بارودۆخەدا نەدەبینی، بۆیە وڵات گەیشتبووە سەر ڕۆخی لە نێو چوونەوە و تەنها گورز، لێدانێك بەس بوو کە بیخاتە نێو لافاوی کارەساتەکان.

ئەو گوزەرەش ئەوەبوو کە عارەبەکان وەشاندیان و ماوەی دوو سەدەی درێژ وڵاتێکی ئاوەدان و رازاوەی هەڵدایە نێو دەردناکترین لافاوی ڕووداو و کارەساتەکانەوە.

## بەیامی محەمەد (د.خ)

له هەمان ئەو کاتەی کە ئەهریمەنی ناکۆکی و دووبەرەکی، ولاتی ساسانییەکانی بەرەو کێژدنی مەرگ و نابوودی دەکێشاند، سروشتی خراپی، بیابانگەڕانی عارەبی لەسەر رێچکەی کوفر و ناکۆکی بۆ ڕێگای هێنابوو، و ڕزگاری بانگ دەکرد. عارەبەکان کە تەنانەت خۆشیان خۆ بە نزم و درندە دەزانن[40] لە ژێر ئالای ئایینێکدا کە موحەمەد دایهێنا بوو، هەنگاویان بۆ یەکخستن و شکۆمەندی دەناڵینا. ئەم پەیامە نوێیەی کە موحەمەد خۆی بە هەڵگری دەزانی، هەموو جیهانی بۆ یەکسانی و چاکە و برایەتی بانگ دەکرد و شیرك و دووبەرەکی و ستەمکاری رەت دەکردەوە. نەك هەر عارەبەکان کە ژیانیان تەواو لە نێو ستەم و تالان شیرك و گەندەڵیدا دەبووری، بەڵکو ئێران و رۆمیش کە داب و نەریت و ئایینی دێرینیان کەوتبووە بەر شالاوی ناکۆکی و دەمارگیریی رۆحانییەکان، لەو رۆژگارەدا پێویستیان بە رەها پەیامێکی دڵنشین هەبوو و ئەو پەیامەیان بە مژدەی رزگاربوونی خۆیان لێکدەدایەوە، بەلام ئەو مۆژدە ئاسمانییەی، بەر لە هەرشتێك عارەبەکانی کە نزمترین و پەراکەندەترین خەڵکی جیهان بوون، بەرەو بەرزی و یەکبوون رێنوێنی دەکرد. راستە کە موحەمەد تەنانەت پێش ئەوەی کە مەککە و (تائیف) بگرێ و هەموو عارەبەکان بخاتە ژێر ئالای خۆی، نامەی بۆ (پەروێز) و (هەرقل) نووسین و ئەوای بۆ سەر ئایینی خۆی بانگهێشت کردن، بەلام لەوی دەمی بەولای ئەوەوە روون بوو کە ڕێگای ئەو ڕێگای خۆشبەختی و یەکگرتنیە. لەو نامەیەدا کە ساڵی (٦-٧ کۆچی)[41] بۆ پەروێز شای نارد ئەوی بۆ قبوڵکردنی ئایینی خۆی بانگ کردووە. ئەو ترسەشی وە بەرنا کە ئەگەر ئایینی خوا قبوڵ نەکات ئەوا جەنگی لەگەڵ دا رادەگەبەنێ. کوتویانە کە پەروێز لە تووڕەیی و بەرزەفڕییەوە نامەی پێغەمبەری دڕاندووە و نامەی بۆ بازانی فەرمانڕەوای یەمەن نارد کە ئەو عارەبە بگرێ و کۆت و بەندی بکات و بینێرێ بۆلای. تووڕەیی پەروێز ئەوەوە بوو کە ئەو کابرا عارەبە، لەگەڵ ئەوەشدا کە یەکێك لە بەندەکانی ئەوە چۆن زاتی کردووە ئاوا پەیام و نامەیەکی بۆ ئەو نووسیوە. پەروێز نەیدەزانی کە ئایینی ئەم عارەبە جیهان دەگرێ و دابی دەخلوق بەردەستی لە نێو دەبا و شانشین و دەوڵەتی ئەویش تا چەند ساڵێکی ئایندە بەتەواوی هەڵدەوەشێنێتەوە و پارچەپارچەی دەکات.

---

٤٠- بگەڕێوە وتەی جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب لە بارەی نەجاشی، سیرة ابن هشام

٤١- بە باوەڕی (کوستن زێرسوال) ساڵی شەشەم، بەڵام بە پێی سێ چوونی مێژوونووسانی عارەب ساڵی حەوتەم. بڕوانە: تاریخ ادبی ایران، ب١، ل٣٧٣.

بەڵێ ئەو پێشبینییە ڕوویدا و فەرمانڕەوایانی بیابان، شار و کۆشکەگەورە و پڕ لە شکۆکانی وڵاتی شاهانەیان خستە ژێر چەپۆکی خۆیانەوە.

## ئایینی تازە

ئایا ئەو سەرکەوتنە سەرسوڕهێنەرە چاوەڕواننەکراوەی کە عارەبەکان لە جەنگی دژی ئێران وە دەستیان هێنا و هەموو جیهانی خستە سەرسوڕمان و پەند لێوەرگرتن پشتیوانێکی ئاسمانی هەبوو؟ ئەو کەسەی باوەڕی بە هێزێکی (غەیبی) نادیار هەیە هیچ گومانێکی لەوە نییە. بەڵام لێکۆڵەرێکی سەربەپرسیار کە بۆ هەرپرسێك بەدوای هۆیەکی ڕووندا دەگەڕێ باوەڕ بەو بۆچوونە ناکات. ئەوەندە دەتوانین بڵێین کە ئەوەی بووە هۆی شکستی ئێران لەو ڕێرەوەدا کێماسی و گەندەڵیی ناوخۆ و دووبەرەکی و ناکۆکی ناوخۆیی بوو کە گەورە و سەرانی ئێرانی تێك بەردابوو. هەروەها سەرکەوتن و بە ئامانج گەیشتنی عارەبەکانیش لە پای یەکێتی و ڕێککەوتن و عەشق و باوەڕەوە بوو، ئەمە هەموو بەرهەمی ئاو ئایینە تازەیە بوو کە موحەمەد خەڵکی بۆ سەر ڕێگاکەی بانگێشت دەکرد. ئەو قسەیە لە شەن و کەو کردن و هەڵسەنگاندنی ڕەوتی ئەو جەنگانەدا دەتوانین پشتڕاست بکەینەوە.

لە سەرچاوە مێژووییەکاندا بەسەرهاتی ئەو جەنگانەیان بە درێژی باسکردووە. عارەبەکان کە پێش ئەو دەمە لە ڕیزی بەندەو بەرفەرمانانی ئێران بوون. یەکەمجار زۆر لەو جەنگە دەترسانو پێیەوە نیگەران و هەراسان بوون، لەبەر شکۆ و گەورەیی شاهانە، بیریان لە دەستدرێژی کردنە سەر سنوور و کەوشەنی ئێرانییەکان نەدەکردەوە، تەنانەت لە ڕووداوەکەی (ذیقار)یشدا کە چەند تیرەیەك لە عارەبەکان ژمارەیەك سەربازی ئێرانیان کوشتن، ئەو سەرکەوتنەی خۆیان ئەوەندە چاوەڕوان نەکراو و گرنگ لە قەڵەمدا کەئێدی لە خۆوە کەوتنە خۆ هەڵکێشان. ئاخر ئەوان هەرگیز چاوەڕوانی و ئومێدی ئەوەیان نەبوو کە بتوانن ڕووبەڕووی سوپای ئێران ببنەوە.

## دەستدرێژی عارەبان

بەمشێوەیە، لەو ساڵانەی کە ڕەوشی ئێران شێواو بوو و هەرچەند ڕۆژ جارێك یەکێك لە سەرداران ئاژاوەیەکی دەنایەوە یا شازادەیەکی تر دادەنیشتە سەر تەختی پادشایەتی، هۆزی (بەکربن وائل) کە لە لێواری ڕووباری فورات نیشتەجێبوون، جارجار دەرفەتێکیان وەردەگرت و بەسەر

دێهاتەکانی دراوسێی سنووری ئێرانیاندا دەدا و کە سنوور پارێزەکانی ئێران راویان دەنان و دەکەوتنە وێزەیان. رایاندەکردەوە ناو بیابان و خۆیان لە دەستی ئەوان دەرباز دەکرد.

لە رۆژکاری خەلافەتی (ئەبوبەکر)دا [مردووە لە سالی (١٣ك/٦٣٤ز)] دوو کەس لە جەنگاوەرانی ئەو هۆزە، یەکێك (موثاننا بن حارثە) و ئەوەی دی (سوید بن قطبە) لەسەر مەرزەکانی ئێراندا دەستیان بە دەستدرێژی و تالان و جەتەیی کرد. موثاننا لە سنووری حیرە رێگری دەکرد و سویدیش لە سنووری (ئەبللە)[٤٢] ئەو کەسادی و لاوازی و سستییەی کە تووشی ساسانییەکان ببوو، ئەو سەرکەشی و پێدرێژیکردنانەی بێ سزادان و تەمبێ کردن دەهێشتەوە. بۆیە رێگرەکان، رۆژ بە رۆژ ئازاتر و بێ باکتر دەبوون. (موثاننا) نامەی بۆ (ئەبوبەکر) نووسی و ئەو رەوشە سست و لەرزۆکەی ئێرانی باس کردبوو و داوای یارمەتی کرد تا بۆ بلاوکردنەوەی ئیسلام لەناو سنوورەکانی ئێراندا دەست بە جیهاد بکەن. موثاننا چاوی لەوە بوو کە ئەبوبکر لەشکرێك رێك بخاو ئەو بکات بە فەرماندەی ئەو لەشکرە. بەلام ئەبوبەکر، (خالیدی کوڕی وەلید) ی بۆ ئەو ئەرکە داناو (موثاننا)ی کردە بەرفەرمانی ئەو. خالید دەستی بەسەر حیرەدا گرت، لەگەل خەلکی ئەوێدا لە سەردانی باج و خەراج پێکهات و ئاشتی کرد. ماوەیەك دواتر خالد بووە ئەرکداری شام و کاروباری عێراق و حیرە بۆ موثاننا مایەوە.

## ئامادەکاری جەنگ

کاتێ عومەر خەلافەتی وەرگرت، رەوشی ئێران ئالۆز تر و پەرێشان تر بوو. یەزدگوردی شەهریار لە مەدائین دانیشتبووە سەر تەختی پاشایەتی، بەلام سوپاییەکان و موبدەکان وازیان لە پیلانگێری و ئاژاوە نانەوە نەهێنابوو. عارەبەکان لە سنووری حیرەدا جێگیربوون و تا لێوارەکانی دیجلە هەرەشەیان لە سنوورەکانی ئێران دەکرد. یەزدگورد رۆستەمی فەرۆخ هورمزدی کە سپەهبودی خوراسان بوو بۆ دەربار بانگکرد و فەرمانی دا تا بۆ راونان و کپکرنەوەی عارەبەکان رێگا چارەیەك بدۆزێتەوە. موثننا کوری حارسەش کە ئەوەی بیست بەرەو مەدینە کەوتە رێ تا داوای یارمەتی لە عومەر بکات. لە مەدینە موسلمانەکان لە جەنگکردن لەگەل ئێران دەترسان و ملیان بۆ ئەو جەنگە نەوەدا. رووبەڕووبوونەوە لەگەل ئێرانییەکان بەلای ئەوانەوە رێی تێنەدەچوو. چونکە ترس و هەراسێکی زۆریان لە توانا و

---

٤٢- اخبار الطوال، ص١٠٧

شکۆی ئێران هەبوو. بەڵام موسەننا دڵگەرمی دانێ و پێیگوتن ئەو پرسە ئەوەندە بە گەورە مەگرن، کە ئێمە لە (سەواد) ڕووبەڕووی ئەوانە بووینەوە و شەڕمان کردن و باشترین دێهات و ئاوەدانییەکانی سەوادمان لێسەندن، بەر لەوەش میللەتانی تر لەگەڵ ئەمانە شەڕیان کردووە ئێمەش پەنا بە خوا شەڕیان لەگەڵ دەکەین[٤٣].

بەڵێ لە شەڕێکی وەهادا عارەبەکان هەم ئومێدی دەستکەوت و هەم ئاردزووی پاداشیان هەبوو. کاتێ خەلیفە چووە سەر منبەر و وتارێکی دا و کوتی نەی خەڵکینە، خواوەند لەزمانی پێغەمبەرەوە بەڵێنی گەنجی خوسرەوان و قەیسەرەکانی ڕۆمی بە ئێوە داوە، ڕابن و دەست بە جەنگ دژی فارس (ئێران) بکەن، خەڵك کە گوێیان لە ناوی ئێران بوو بێدەنگ بوون تەنها (ئەبو عوبەید کوڕی مەسعوودی سەقەفی) نەبێ کە هەستایە سەرپێ و گوتی من یەکەم کەس دەبم کە بۆ ئەم ئەرکە ئامادەم. ئەوانی تریش پەیڕەویان لەوکرد. عومەر، ئەبو عوبیدی کردە فەرماندەی ئەوان و ئەو لەشکرە لەگەڵ (موثاننا)ی کوڕی حارسە ڕێگەی عێراقی گرتەبەر[٤٤] ئەوانە لە سنووری حیرە و (کەسکەر) دووجار لەگەڵ مەرزوانەکانی ئێران ڕووبەڕووبوونەوە و سەرکەوتن بەسەریاندا. دواتر لەو دیوی فرات، لەگەڵ ژمارەیەك سەربازی ئێراندا ڕووبەڕووبوونەوە. ئەو سەربازانە فیلیان پێبوو، فیلێك بە خەرتوومەکەی خۆی ئەبو عوبیدی ڕاکێشا و خستیە ژێر پێیەکانی و شێلای. سوپای عارەب لە ترسان هەڵاتن و ئەگەر ئازایەتی (موسەننا) نەبوایە هەموو ئەو سوپایە لەنێو زێی فوراتدا نقوم دەبوو. کە هەواڵی ئەو شکستە لە مەدینە گەیشتە عومەر، ترسا و خەم دایگرت، بەڵام جارێکی تر لەشکرێکی بە فەرماندەیی (موسەننا) ڕەوانە کردەوە. ئەو لەشکرە توانی قەرەبووی شکستی پێشویان بکاتەوە. موسەننا سوپای ئێرانی کە فەرماندەکەی ناوی (مەهران مەهروبە) بوو شکاند و تا دیجلە پێشڕەوی کرد. لەو کاتە لەلای (ئەبللە) و (بەسرە)ش لەشکری عارەبان پێشکەوتنگەلێکی وەدەست هێنابوو و لە خوزستان و بەسرە سنووردارانی ئێرانی شکاندبوو. موسەننا لەوە ئاگادار بووەوە کە ڕۆستەم لە مەدائین سەرگەرمی ڕێکخستنی لەشکرە. ئاگاداری عومەری کردەوە و داوای هێزی لێکرد. ڕەوشێکی دژوار هاتبووە پێش، ئەگەرچی لە مەدینەدا هەمووان سەبارەت بەو شەڕە نیگەران بوون، بەڵام درێژەپێدانی شەڕەکەیان بە پێویست دەزانی. بۆیە هێواش هێواش ئامادەیی

---

٤٣- طبري: ڕووداوی ساڵی ١٣ك و اخبار الطوال، ص ١٠٧

٤٤- مقدسي، البدء و التاريخ، ج٥، ل ١٦٩.

شەڕەکە دروست بوو. لەو میانەدا ڕۆژێك عومەر لەشکری بۆ دەرەوە هێنا و کەس نەیدەزانی مەبەستی کوێیە. لە دەرەوەی مەدینەدا مەبەستی خۆی باسکرد و هانی موسڵمانانی دا بۆ جیهاد کردن و ئەو کارەی زۆر بە ئاسانی نیشاندا، هەموو‌ان قبوڵیان کرد و ئامادەی نەبەرد بوون، ئینجا داوایان لەویش کرد لەو سەفەرەیاندا لەگەڵیاندابێ. گوتی هاتنی من ئاسانە و من دێم لەگەڵتاندا، بەڵام هەندێك لە هەڤاڵەکانی وایان بە باشزانی کە کەسێکی تر بکاتە فەرماندەی ئەو لەشکرە و خۆی لە مەدینەدا بمێنێتەوە و لەکاتی پێویست هێزی پشتیوانیان بۆ بنێرێ. (سەعدی وەققاس)ی کردە فەرماندەی لەشکرەکەو کاروباری عێراق و داگیرکردنی ئەو هەرێمەی بەو سپارد.

سەعد بە لەشکرەکەی خۆیەوە کە نزیکەی تەواوی جەنگاوەرە خۆبەخشەکانی سەرجەم تیرە و هۆزەکانی عارەبی تیا بوو کەوتەڕێ. نووسیویانە کە عومەر خۆیشی تا چەند فەرسەخ بۆ بەڕێکردنیان لەگەڵیان ڕۆیشت. سەعد بەڕێگای حیرەدا ڕۆیشت و ڕووی کردە (قادسیە) کە بە دەروازەی پاشایەتی ئێران دەژمێردرا. هەرکە هەواڵی لەشکری سەعد گەیشتە ئێرانییەکان، ڕۆستەمیان بە سێ هەزار سەربازەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو ڕەوانە کرد. ڕۆستەم گەیشتە حیرە و عارەبەکان نەوێندەریان بەجێ هێشت و پاشەکشەیان کرد. ڕۆستەم لە (دێر ئەعورە) ی حیرە لەشکرگای دانا و سەعدیش لە قادسیە [٤٥] دامەزرا.

## لە قادسیەدا

سەرچاوە مێژووییەکان نووسیویانە کە لە قادسیەدا هەر دوو لەشکر گەیشتنە یەك، کە ئێرانییەکان ساز و بەرگ و چەك و چوێڵی عارەبەکانیان بینی پێدەکەنین و نێزەکانی ئەوانیان بە تەشی ژنان دەچواند. نێردراوانی سەعد دەستیان بە هاتن و چوون بۆ لای ڕۆستەم کرد و هەریەکێك لەو نێردراوانە کە بەنامەیەکەوە دەهاتەلای ڕۆستەم دەیبینی وا ڕۆستەم لەسەر تەختێکی زێڕین دانیشتووە، تاجێکی بەسەرەوەیە و پاڵشتی زێڕ چینی خستۆتە بن باڵی و لە شوێنێکی ڕازێندراوەوە دانیشتووە و هەموو لەشکرەکەی پوختەیە و چەك و چوڵی باش و سازو

---

٤٥- قادسیە شارێك بوو لە پێنج فەرسەخی کوفە بەلای ڕۆژئاوا کە دەورتا دەوری باخ و بێستانی دار خورما بوو، شەڕی بەناوبانگ لەو نزیکە روی دا. قادسیە دواتر بـچووکتر کـرا لـە سـەردەمی (حمد الله مـستوفی) زۆربەی ئەم شارە لێك دراوە.

بەرگی پڕ باق و بریق و گرانبەهای هەیە و لە بەردەم بارەکاکەیدا فیلی جەنگی هەن، نێردراوەکەی سەعدیش شمشێرەکەی بەرانپیل داوە و نێزەی کرتۆتە دەست و دێتە پێش، وشترەکەی لە نزیك تەختی ڕۆستەم دەبەستێتەوە سەربازەکانی ڕۆستەم دەنگ هەڵدەبڕن، ڕۆستەم پێیان دەڵێ وازبێنن، نێردراوەکە بۆ لای خۆی بانگ دەکات. نێردراو بەچەکەوە دەچێتە لای و ئاسنی بن نێزەکە لەسەر رایەخەکە دادەنێ، زۆری نامێنێ رایەخەکە کون بکات. پاڵی وەنێزەکەی خۆی داوە قسە لەگەڵ ڕۆستەمدا دەکات. ڕۆستەم پیاوێکی ژیر بوو لە قسەکانی ئەودا ورد دەبێتەوە و قسەکانی ژیرانە و لێبڕاوانە دەکەونە بەر چاو، بیریان لێدەکاتەوە و ترس و هەراس بەسەریدا زاڵ دەبێ، بۆ نموونە ئەوەی زۆر پێ سەیر دەبێ کە لە لایەن سەعدەوە هەر جارێ نێردراوێك دەهات و کەسێك دووجار نەدەناردرا. ڕۆستەم لەیەکێ لە نێردراوەکانی پرسی هۆی چییە فەرماندەی ئێوە هەرجارێك نێردراوێك دەنێرێ و کەسێك دووجاران وەك نێردراو نایەتەوە ئێرە؟ نێردراوەکە گوتی هۆیەکەی ئەوەیە کە ئەمیری ئێمە بۆ پشوودان و ئەرك و زەحمەتی لە نێوان سەربازەکاندا دادگەری و یەکسانی پیادە دەکات و ڕەوا نابینێ کە لەسەر یەك زەحمەت بداتە بەر تەنها کەسێك و ئەوانی تریش حەساوە بن. ڕۆستەم لەو قسە و داب و ڕێ و شوێنەی ئەوانە نیگەران بوو و بۆی دەرکەوت کە کاروباری ئەو عارەبانە لەسەر بنەمایەکی پتەو دارێژراوە. ڕۆژێك ڕۆستەم بەیەکێ لە نێردراوەکانی، کەنێزەیەکی لەدەستدا بوو گوتی ئایا ئەوە نووکە تەشییە بە دەستتەوەیە؟ عارەبەکە وەڵامی دایەوە و گوتی ئاگر بە گەورەیی و بچووکی نییە. بە یەکێکی تری گوت کالانی شمشێرەکەت زۆر کۆن دەبینم، نێردراوە عارەبەکە گوتبووی ئەگەرچی کۆنە، بەڵام تیغەکەی نوێیە و چاکی و کاریگەریی شمشێریش لە تیغەکەی دایە نەك لە کالانی ڕازاوە و نوێیدا، ڕۆستەم لەو وەڵامە خێرا و حازر بەدەستانەی ئەوانە نیگەران بوو بە هاوەڵانی خۆی گوت ئەوەی ئەو عارەبانە دەیڵێن و خەڵکی بۆ بانگهێشت دەکەن لە دووحاڵەت بەدەر نییە یان لەوەی دەیڵێن ڕاستگۆن یان درۆزن. ئەگەر درۆ بکەن بەڕاستی کەسانێك بۆ پاراستنی پەیمان و نهێنییەکانی خۆیان تا ئەو رادەیە تێبکۆشن و هەموویان یەك قسە بن و کەس قسەیەکی ناکۆکی ئەوانی تر لە هیچ کامیان نەبیسێ ئەوا نەوپەڕی خۆراگر و بوێرن، ئەگەر ڕاستگۆش بن ئەوا هیچ کەس ناتوانێ خۆیان لە بەرامبەر ڕابگرێ. سەربازانی ئێران زۆر بەو قسەیەی ڕۆستەم دڵگیر و نیگەران بوون و هاواریان لێهەستا و گوتیان چیتر ئەو قسەیە مەکە و وڕێنە گۆیی ئەو گومناوانە بە هەند هەڵمەگرە و سەرسام مەبە و بەرەنگاربوونەوە و شەڕ کردنی ئەمانە بەئەرك و بڕیارێکی پێویست بزانە. ڕۆستەم گوتی:- ئەو قسەیە بۆ ئێوە لەبەر ئەوە نالێم کە لە ڕووبەڕووبوونەوە و

شەڕ کردن لەگەڵ ئەمانە دوو دڵ بم، بەڵکو بۆ ئەوەمە کە ئێوە لەوانە ئاگادار بکەمەوە و ئەو قسەیەی کە لە نێو دڵم دایە بۆ ئێوەی ڕادەگەیەنم...))[٤٦] ئەو ڕووبەڕووبوونەوە بێباکانە و ئەو زماندرێژیەی نێردراوەکان، هاوکارەکانی ڕۆستەم و سەربازەکانی ئێرانی دەترساند و نیگەران دەکرد. ئەوکاتەی (موغەیرە بن شعبە) لەلایەن عارەبەکانەوە وەك نێردراو هاتە لای ڕۆستەم، ئەو زیاتر شوولی لێهەڵکێشاو لە تەنیشت ڕۆستەم لەسەر کورسییەکەی ئەو دانیشت. فەرماندەکانی ڕۆستەم، ئەویان دوورخستەوە و سەرکۆنەیان کرد. موغیرە گوتی (ئێمە ئێوەمان بە خەڵکێکی ژیر و هۆشمەند دەزانی کەچی ئێستا هیچ کەس لە ئێوە نەزانتر نابینم. لە نێو ئێمەی عارەب ئیدی هیچ کەس کۆیلە و بەندەی کەس نییە، پێموایە کە ئێوەش وان، باشتر بوو لەهەوەڵەوە بتانگوتبا کە ئێوە هەندێکتان بەندەی هەندێکی ترن. من لەو ڕەفتارەی ئێوە بۆم دەرکەوت کە کاری ئێود کۆتایی هاتووە و وڵات و دەوڵەتداری بەو شێوەیە پایەدار نامێنێتەوە[٤٧].

ئەو دیدارەی موغیرە بە شێوەیەکی تریش لە کتێبەکاندا باس کراوە بۆ نموونە سەرچاوەکان نووسیویانە ڕۆستەم پەیامێکی بۆ سەعد نارد کە کەسێکی وا بنێرێ تا بتوانم قسەی لەگەڵدا بکەم. سەعدیش موغیرە بن شەعبەی نارد موغیرە هات و سەر و قژێکی پەرش و بڵاو و زوڵفەکانی کردبووە چوار کەزی و شۆڕ ببوونەوە. ڕۆستەم پێیگوتووە ئێوەی عارەب ژیانتان هەمووی لە سەختی و ڕەنج و زەحمەتی دابووە و وەکو سەوداگەرو کرێگرتە دەهاتنە لای ئێمە کە نان و خێرو بێری ئێمەتان دەخوارد و دەچوونەوەو کەسانی تری خۆشتان دەهێنا. کێشەی ئێوە و ئێمە وەکو چیرۆکی ئەو کابرایەیە کە گوایە باخێکی هەبووە و ڕۆژێك ڕێوییێکی لەناو باخەکە بینی گوتی ڕێویەك بۆ خۆی چییە تا زیان بە باخەکەم بگەینێ، بۆیە ڕێویەکەی دەرنەکرد و وازی لێهێنا، ڕێوی کەلەبۆر چوو ڕێوییەکانی دیکەی کۆکردەوە و بۆ باخەکەی هێنان، باخەوانەکە ئەمجارە کە هاتەوە ناوباخەکەی و بارودۆخەکەی ئاوا بینی، دەرکە و کون و کەلەبەرەکانی باخەکەی گرت و هەموو ڕێوییەکانیشی کوشت. من پێموایە ئەوەی ئێوەی تووشی ئەو سەرکێشیە کردووە، سەختی و ڕەنج و ماندوو بوونە، و بۆ شوێنێ خۆتان بگەڕێنەوە و ئێمە نان و جلوبەرگتان دەدەینێ.

---

٤٦- نخجوانی: تجارب السلف، ص ٣٩-٣٧.

٤٧- طبری، ڕووداوی ساڵی ١٤.

ئێستا بچنەوە بۆ زێدی خۆتان، لەوە زیاتر مەبنە مایەی ئازار بۆ ئێمە. موغیرە وەڵامێکی توندی دایەوە و گوتی سەبارەت بە سەختی و ڕەنج و کوێرەوەری زۆر زیاتر لەوەی تۆباست کرد چەشتومانە، تا ئەو دەمەی پێغەمبەرێکمان لەناو رابوو، ئیدی ڕەوشی ئێمە گۆڕاوە و فەرمانیدا کە ئێوە بۆ ئەم ئایینە ڕەوایەی خۆمان بانگێشت بکەین. ئەگەر قبوڵتان کرد، ئەوا وڵاتی خۆتان هی خۆتان دەبێ و بەبێ پرسی ئێوە ناهێینەوە ناویەوە، ئەگەر نا دەبێ (جزیە) بدەن یا شەڕ بکەن، بزانین سەرەنجام چۆن دەبێ؟

ڕۆستەم وروژاو گوتی هەرگیز بیرم لەوە نەدەکردەوە کە ئەوەندە بژیم ئەو قسانە ببیستم[٤٨]، عارەبێکی تر بەناوی (ربعی بن عامر) کە وەك نێردراو هاتە لای ڕۆستەم، گوتی ئێوەی ئێرانی زۆر گرنگی بە خواردن و خواردنەوە دەدەن و ئەو شتە بە هەند هەڵدەگرن و ئێمە ئەو شتانە بە هیچ نازانین و لەو جۆرە قسانە. ڕۆستەم و هاوەڵەکانی زۆر سەریان لەو سادەیی و هەڵسوکەوت و رانەگۆڕی ئەو کۆمەڵە خەڵکە سادە بیابانگەڕە کە جلوبەرگی دڕاو و وردیەکی بەرزیان هەبوو، سوڕما بوو، ئەو قسەڕاشکاو و رەفتارە دلێرانەیە نیشانییان دەدا کە زوو یادرەنگ، عارەب وڵاتی شاهانە دەخەنە ژێر رکێفی خۆیان. ڕۆستەم و سەرداران و سەربازەکانی ئەو لە هەر ڕووداوێك ڕووبەڕووی ئەو خاڵە دەبوونەوە کە ئیدی نۆرەی دەوڵەت و شکۆی شاکانی ساسانی تێپەڕیوە و ئێستا نۆرەی سادەیی و نەمانی کۆیلایەتییە. زۆر کەس نەمانی شکۆ و هێز و دەسەڵاتی ئێرانییەکان بە کاری تەقدیر و چارەنووس دەزانن. ئەو ئەفسانە گشتیانەی کە لە ڕێی (خوداینامە)کان و شاهنامەدا ڕەنگیان داوەتەوە، باس لەوە دەکەن کە ڕۆستەم لە ڕەوشی ئەستێرەکانەوە روخان و نەمانی دەوڵەتی ئێرانی پێشتر بینیبوو، بەڵام ئەگەر لەو ئەفسانانەش کە دراوەتە پاڵ ڕۆستەم گومانمان هەبێ و پێمانوابێ ڕاست نین ئەوا بە دڵنیایەوە نیشانەو بەرژەنگی وا هەن کە نیشان دەدەن رۆستەم و سەردار و فەرماندەکانی تر هیچ ئومێدێکیان بەسەرکەوتن نەبووە، بە هۆی ئەو گەندەڵی و پشێویەی کە لە هەموو پایەو لایەنێکی ساسانیدا بەدی دەکرا، بۆ ڕۆستەم زەحمەت نەبوو کە شکستی ئێران لە بەرامبەر سوپای تازە نەفەس و بێباکی عارەبان پێشبینی بکات.

---

٤٨- مقدسی: البدء التاریخ، ب٥، ل ١٧٣ و طبری روداوی ساڵی١٤.

## ئەنجامی جەنگ

بەڵێ چوار مانگ هەردوو لەشکر بەرامبەری یەکتر بوون و دانوستان و گفتوگۆی نێردراوەکانی هەردوولا بەردەوام بوو. سەرەنجام رۆستەم شەڕی راگەیاند و دوو لەشکر پێکوەرهاتن. سێ رۆژ نەبەردێکی سەرسەختانەیان ئەنجامدا و خەڵکێکی زۆر لە هەردوولا کوژران. رۆژی چوارەم ڕەشەبا بە پێچەوانە هەڵیکرد و لم و گەرد و خۆڵی بیابانی بە سەروچاوەی ئێرانییەکاندا دەکرد. رۆستەم لەم رۆژەدا کوژرا و تەرمەکەیان لە مەیدانی جەنگدا دۆزیەوە. سەد برینی زیاتر پێوە بوو. نووسیویانە کە ڕۆستەم تەختی خۆی بە هێسترێکەوە بەستبوو و خۆی لەبەر گەرما خزاندبووە ژێر سێبەری تەختەکەی. عارەبێك، بەناوی (هلال بن عـلقمه) شیرێکی لەسەر سندوقی تەختەکەدا و سندوقەکە بەسەرسەری ڕۆستەمدا کەوت، لەبەر گرانی سندوقەکە ڕۆستەم پشتی شکا، بەڵام هەڵسایەوە بۆ خۆدەر بازکردن خۆی هەڵدایە نێو ئاو. هلال زانی کە ئەوە فەرماندەی سوپایە. بەدوای کەوت و لە نێو ئاوەکە دەری هێنا و کوشتی. کە سوپای ئێران لە کوژرانی ڕۆستەم ئاگاداربوونەوە، ترسیان ڕێ نیشت و دەستیان بە هەڵاتن کرد. بەو سەرکەوتنەی کە عارەبەکان وەدەستیان هێنا، ئێران بەتەواوی شکستی خوارد. (درەفشی کاویانی)و گەنجی ڕۆستەم کەوتە دەستی سەعد کە هەموو ئەمانەی ڕەوانەی مەدینە کردنەوە. سەرچاوەکان نووسیویانە هەرکە ڕۆستەم کوژرا جل و ساز و بەرگ و تەختەکەیان بە (غەنیمەت) برد. ئەو پشکەی کە لەو دەستکەوتە جەنگییە بەر هەر شەڕکەرێکی عارەب کەوت بە ئەندازەیەك زۆر بووە کە ناتوانرێ قسەی مێژوونووسەکان باوەڕ بکەین[٤٩] ئەوەندە هەیە کە شکۆ و باق و بریقی سوپای ئێران دەتوانین لەسەر ئەوە پێوانە و بەراورد بکەین و هەمان ئەو باق و بریق و شکۆ و خۆڕازاندنەوەیە هۆی سەرەکی شکستی ئێرانییەکان بووە لەو جەنگەدا.

دوای ئەوە سەعد (سەرکەوتننامە) ی بۆ عومەر نووسی و هەرچی دەستکەوت و کەل و پەلێکیان لەلا بوو بۆلای عومەریان ڕەوانە کرد و عومەر لە وەڵامی سەعد دا نووسییەوە، هەرشتێك کە بە کەلکی وشتر و مەر و ماڵات نییە، شایانی عارەب نییە. دەشتێك بدۆزەرەوە و موسڵمانان لەوێ جێگیر بکە، لەشکرێك بۆ خوراسان بنێرە و لەشکرێکی تر بۆ (جەزیرە) کە گەیشتیتە ئەوێ بمێنەرەوە، چ دەریا و رووباران مەخەرە نێوان من و موسڵمانان. سەعد لەو شوێنەی کە هەنووکە (کوفە)یە هەڵوەستەی کرد و جێگیر بوو، ئەوێ شوێنێکی لماوی بوو،

---

٤٩- یعقوبی، ب٢، ل١٢٣

ئاوەدانی کردەوە و شار و مزگەوتی تێدا دروست کرد. هەندێك گوتویانە کە کوفە، چەند ساڵ دواتر بە فەرمانی عومەر دروستکراوە و نووسیویانە کە سەیری کرد عارەبەکان خوو دابیان گۆڕاوە و رووەو گەندەڵی دەڕۆن، فەرمانی دا کە کوفە لە لێواری بیابان بنیات بنێن و بڕیاری دا کە عارەب لەو شوێنەدا نیشتەجێ بن.

## بەرەو مەدائن

بەڵێ! سەعد کەوتە دوای شکستخواردووەکان و پێ بەپێ رێی مەدائنی گرتە پێش. مەدائن چەند شارێکی پەیوەست بە یەکتر و لێك نزیك بوون لە هەردوو بەری رووباری دیجلە کە هەردوو شاری (تیسفون) و ئەنتاکیەی خوسرەو (وە ئەنتوخوسرەو) کەوتبوونە کەناری رۆژئاوی دیجلە و لەلای رۆژئاواشیەوە شاری یۆنانی (سلوکیە) و (دەرزیجان) و بەهرەشێر (وەئەردەشێر) هەڵکەوتبوون[٥٠]، لە نێوان ئەو چەند شارەدا تیسفون لە هەمووان کرنگتر بوو. یادگاریی مێژوویی و کۆشك و ساختمانی گەورەو گەنجینە و داهات و دارایی زۆرتری هەبوو. لە (کۆهندز) کۆنە قەڵایەکەیدا (کۆشکی سپی) هەبوو کە پادشاکانی ئەشکانی دروستیان کردبوو لە شارە تازەکەشدا (ئەیوانی کیسرا) هەبوو کە شاپووری یەکەم دروستی کردبوو. بەڵام، شارەکە لەوەش کۆنتر بوو و رەنگە لە سەردەمی پێش ئەشکانییەکاندا بنیات ترابێ. بەهەرحاڵ، کە سوپای راکردوو گەیشتەوە مەدائن، عارەبەکانیش بەدوایدا هاتن و لەبەردەم دەروازەی مەدائندا چادریان هەڵدان. لەوێ چەند مانگێك لەبەردەم دەروازەی شار مانەوە و ماوەی مانەوەیان لەوێ زۆر درێژەی کێشا. بە رادەیەك کە دووجار خورمای تازەیان خوارد و دووجار مەڕ و وشتریان کردنە قوربانی. لەبەر ئەوەی مانەوە لەو سنووردا دێژەی کێشا، لە مەدائندا قات و قڕی دروست بوو و خەڵك بەناچاری کەوتنە خواردنی گۆشتی سەگ و پشیلە، وەرزێرەکان هاتن و داوایی ئاشتییان کرد. یەزدی گورد لەو کاتە لە مەدائن بوو کە ئەو هەواڵەی بیست، سنورڤان و گەورە پیاوانی بانگ کرد و هەموو گەنج و پارە و پووڵی خەزێنەکانی خۆی بەوانە

---

٥٠- یەعقوبی کەلە سەدەی سێیەم ژیاوە پێنج شار لەو حەوت شارانە مابوونە. لەلای رۆژهەڵاتی دیجلە، تیسفون، ئەسپانبەر، رۆمییە، لای رۆژئاوا بە حریسێر (ویە ئەردەشێر) و سابات (وەلاش ئاوا) لۆسترانج: بلدان خلافت شرقیە، ل ٥٣ وتاری ئاب ئەنستاس کرملی لە گۆڤاری المشرق (٥) بەیروت ١٩٠٢ و هەروەها وتاری streeh لە دایرةالمعارف اسلام، ج٣ واژەی مەداین.

بەخشی و چەند نامە و بەڵێننامەی لەو بارەیەوە نووسین و گوتی: ئەگەر ئەم خاك و داراییەمان لەدەست بچێ ئەوا ئێوە لە عارەبەکان لە پێشترن و ئەو داراییانە پێویستە بۆ ئێوە بن، ئەگەر خاکەکەشمان بەتەواوی کەوتە دەست ئەو ئێوەش داراییەکان دەگەڕێننەوە. ئینجا خزم و هاوەڵەکانی خۆی هەڵگرتن و بەرەو (حەلوان) کەوتە ڕێ. دوای ئەوەی (خۆرەزاد کوڕی فەروخ هورمزد)ی کە برای ڕۆستەم بوو کردە سوپاسالاری لەشکر و تیسفۆنی پێ سپارد. سەعد کە ماوەیەکی زۆر لەهەمبەر مەدائن مابووەوە، شەکەت و کەوەڕێ ببوو. هەندێ لە ئێرانییەکان خۆیان چوونە لای و پێیانگوت کە تا زووە بەسەر مەدائندا دابدە و بیگرە، پێیانگوت ئەگەر پەلە نەکەی یەزدگورد ئیدی هیچ شتێکی تیا ناهێڵێتەوە. شوێنێکیان لە دیجلە پێ نیشاندا کە تەنکاو بوو، و لەشکری عارەب بە ئاسانی دەیتوانی لەوێدا بپەڕێتەوە. ئەو بانگهێشت و ڕێنوێنیکردنە کە لەلایەن کۆمەڵێك ئێرانییەوە کرا، غیرەتی وەبەر سەعدنا. ئامادەکاری بۆ هێرشبردن کردو بە هاوەڵانی خۆی گوت خۆ لە ئاوەکە بدەن و لە دیجلە بپەڕنەوە. بۆ خۆیشی ئەسپی خۆی تاودا و لە ئاوی دیجلە پەڕییەوە. هاوەڵانی بە دوای ئەودا لە ئاوەکە یان داو زۆر بە ئارامی و بێ گرفت چوونە ئەوبەری ئاوەکە. نووسیوویانە لە هەموو سوپایی سەعد کە ئاوا بێ باکانە خۆی لە ئاوەکەدا تەنها یەك کەس نقوم بوو دەنا ئەوانی دی گشتیان بە ساغ و سەلامەتی پەڕینەوە. پاسەوانەکانی مەدائن کە عارەبەکانیان لە کەناری دەروازەکانی شاردا بینی، هاواریان کرد کە: (دێوهاتن! دێوهاتن!)[٥١]. خورەزاد لەگەڵ بەشێك لە لەشکرەکەی لە شار هاتە دەر و لەگەڵ هێرشبەران کەوتنە جەنگ، بەڵام شکاو پەنای بۆ ناو شار بردەوە و عارەب لەو دەروازەی شار هاتنە ژوور. ئیدی خۆرەزاد توانای خۆڕاگری نەما. نیوە شەو بە لەشکرەکەی خۆیەوە لە دەروازەی ڕۆژهەڵاتی شارەوە بۆی دەرچوو و شاری بەجێهێشت و ڕێی جەلەولای گرتە بەر.

## غەزووی مەدائن

عارەب هاتنە نێو تیسفون و دەستیان بە تاڵان و کوشتن و بڕین کرد. سەعد کە هاتە نێو مەدائن نوێژی سەرکەوتنی کرد: هەشت رکعەت و کە هاتە نێو (کۆشکی سپی) کیسرا، لە قورئان ﴿کم ترکوا من جنات و عیون﴾ی خوێندەوە. بەم شێوەیە بوو کە تیسفون بە کۆشکە

---

٥١- دینوری: اخبار الطوال، ص١٢١-١٢٠.

شاهانەکانی گەنجە گرانبەها چوار سەد ساڵییەکانی بنەماڵەی ساسانییەوە، کەوتە دەستی عارەبەکان و ئەو کەسانەی کە کافوریان لە خوێ جیا نەدەکردەوە و جیاوازی بەهای سیم و زێڕیان نەدەزانی، لە هەموو ئەو کۆشکە ئەفسانەئامێزانە لە ویرانی بەولاوە شتێکیان جێنەهێشت. سەرچاوەکان نووسیویانە فەرشێکی گەورەیان بۆ مەدینە هێنا کە لەبەر گەورەیی جێگەکی بەو تۆ نەبوو بشێ لێی راخەن، پارچەپارچەیان کرد بەسەر سەرانی تیرە و هۆزەکانیان دابەش کرد. پارچەیەکی دوانیان بە بیست هەزار درهەم فرۆشرا.

لەراستیدا ئەرکانەی سەعد هاتە نێو مەدائنەوە، بەرگریکاران جێیانهێشتبوون. سەربارەکانی یەزدگورد خۆیان لە کاتی راکردنیان نەیانوانیان تالان کردبوو. بەڵام هێزی سەرکەوتووی عارەبەکان بەدوویان کەوتن و ئەو ئەلێپەل و دارایییە تالانکراوەیان لێ سەندنەوە. لە ژمارەیەکی کەمی سەرباز بترازێ کە بۆ پارێزکاری کۆشکەکان دانرابوون، دەنا لە تیسفون کەسێک نەمابوو. سەعد لەگەڵ عارەبەکانی خۆی هاتە نێو کوچە و کۆڵانە چۆڵ و هۆڵەکانی شارێکی ئارام و بێ بەرگری. ئێرانییەکان بواری ئەوەیان نەبوو کە هەموو دارایی و گەنجە پڕ بەها دێرینەکان لەگەڵ خۆیاندا ببەن. ئەو دارایی و کەلوپەل و قاپ و جیبار و زێڕ و گەوهەرەی کە لەوێیوەدا مابوونەوە زۆر بوون. بەپێی ریوایەتێک سێ ملیۆن درهەم لە خەزێنەدا هەبوو کە نیوەی ئەو پارەیە مابووەوە. بەمپێیە گەنج و خەزێنەیەکی زۆر کەوتە دەستی عارەبان.

سەعد بڕیاری دا کە لە شاری کۆنەکەدا مزگەوتێک دروست بکەن و لەوە بەدوا لە جیاتی ئاتەشگا و باژی بەرسەم و زەمزەمەی لەو شارە گەورەیەی کە سالەهای ساڵ مەڵبەندی موبدان و موغان بوو، لە دەنگی بانگدار و تەهلیل و تەسبیح بترازێ شتێکی تر نەدەبیسترا و ئیدی هەرگیز ئەو دەقەرە رێ و رەسم و ئایینی موغان و موبدانی بە خۆوە نەبینییەوە. هێواش هێواش شارەکەش بایەخی خۆی لەدەستدا، بەتایبەتی بەسەردوا هاتنی بەسرە و کوفە، مەدائن بە شارێکی بچووک و بێ بایەخ زیاتر نەمایەوە. ئەگەرچی ئەیوان (واتە بارەگای شا) سالەها هەروا مایەوە و وێرانەکانی باسیان لە شکۆ و مەزنایەتی رۆژگاری رابردوی ئێران دەکرد و ئەفسانەگەلێکی دلنشینیان پێکەوە دەنا.

# جەنگی جەلەولا

دوای ڕووداوی مەدائن، کارەساتی جەلەولا هات، پێش کە لەوێشدا ئێرانییەکان شکان [٥٢] لەو باردیەرە نووسیریانە تەوکاتەی ئێرانییەکان لە مەدائن هەڵاتن کە گەیشتنە جەلەولا، لەوێ هەریەك لە خەڵکی ئازەربایگان و باب و خەڵکی چیا و فارس بۆ ئەوەی بچنەوە شار و ناوچەکانی خۆیان ڕێگاکانیان لەیەك جیا بوو. بەر لەوەی لەیەك جیاببنەوە و هەریەکەی ڕێگەی خۆی بگرێتە بەر، کۆبوونەوە و گوتیان ئەگەر ئێستا بڵاوەی لێبکەین، جارێکی تر هەرگیز ناتوانین کۆببینەوە و ئاوا یەکبگرینەوە و ئێرە جێگایەکە کە ڕێگای هەمووان لێکجیا دەکاتەوە. وا چاکە لێرە کۆببینەوە و جارێکی تر لەگەڵ عارەباندا شەڕ بکەین. ئەگەر سەرکەوتین ئەوان دەردەکەین و ڕاویاندەنێین، ئەگەر سەریش نەکەوتین ئەوا ئەوەی لە دەستمان هاتووە کردوومانە و دواتر پەنجەی خۆمان ناشکێنینەوە و ناڵێین خۆزگە ئەوەمان کردبا. هەمووان قبووڵیان کرد. (مەهران ڕازی)یان کردە فەرماندەی خۆیان و کەندریان لە وێ لێدان و خۆیان ئامادەی جەنگ کرد. نامەیەکیان بۆ یەزدی کورد نووسی و داوای پارەو لەشکریان لێکرد. یەزدی کورد پارە و هێزی سەربازی بۆ ناردن. ئەو ژمارەیەی کە لە جەلەولا بوون بۆ ئەوەی لە هەڕەشەی عارەبان کە بوی هەبوو هەرساتێك بگەنە سەریان پارێزراو بن، خەندەقیان بە چوار دەوری لەشکرگای خۆیان لێدا. لەو ڕۆژانەدا باروودۆخی ئێران زۆر شێواو و پەرێشان بوو. هەرکەس لە سەرداران و سنوورقانەکانی ئێران سەربەخۆ بوو و شای بە سەپانی خۆی نەدەزانی. یەزدگرد بێهوودە هەوڵی دەدا کە ئاوەکە بخاتەوە سەر جۆگاوەکەی، سەری بە هەموو جێیەکدا دەکرت تاهێزێك بۆ بەرەو دژی دوژمن فەراهەم بکات، بەڵام ئیدی درەنگ داهاتبوو و ڕەوشەکە ئەوەندە شێوا و و ڕووی لە بەرەڵڵایی و بێ سەرایی بوو کە هیچ هەوڵدانێك سوود و ئەنجامێکی لێنەدەکەوتەوە. مەدائن لە دەستی عارەبان دابوو و لە شارەکانی تر کە ڕەوشێکی ناهەموار بوو چ شتێك دەکرا؟ لەو ماوەیەدا (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس) لە مەدائن بوو. بیستی کە ئێرانییەکان هێزە بەرت و بڵاوەکانی خۆیان لە جەلەولا

---

٥٢- جەلەولا شارێك بوو نزیك خانەقین لە کوفەوە مەنزڵگەی نێوان عێراق و خوراسان دەژمێردرا، بە پێی گێڕانەوەی حمدالله مستەوفی مەلیك شای سەلجوقی کاروانسەرایەکی لێ دروست کرد کە لەوکات بە دوا کاروانسەرای جەلەولایان پێدەکوت. پێدەچێ ئەو شارە لە شوێنی ئێستای قزل ربات بووبێ. دەوڵەتی عێراقیش بە هۆی سەعدی کوڕی وەقاس ناوی نا(سەعدیە).

کۆکردونەتەوە و نیازی شەڕیان هەیە. تەنانەت لە ئەسفەهان و ولاتی چیاشدا هێزی سەربازی بۆ یارمەتی ئەو ئێرانیانەی جەلەولا دەگات. سەعد کە ئەو هەواڵەی بیست نامەیەکی بۆ عومەر نووسی داوای بۆ چوونی ئەوی کرد. عومەر فەرمانی دا کە پێویستە خۆ بۆ شەڕ ئامادە بکەن و بواری پەلامار نەدەنە دوژمن. سەعدیش ژمارەیەك لە سوپای عارەبی ڕەوانە کرد کە بەرامبەر لەشکرگای ئێرانییەکان خیوەت هەڵدەن و لەشکرگا دروست بکەن. سەرەنجام لە جەلەولا جەنگێکی سەخت ڕوویدا. ئێرانییەکان شکان و پشتیان داو هەلاتن. زۆریان لێکوژران و زۆریشیان بە دەستکەوتی فراوانەوە کەوتنە چنگی دوژمنەوە. ئەوانەی کە لە چنگی دوژمن قورتار بوون خۆیان گەیاندە (حلوان) و یەزدی گورد هێشتا هەرلە (حەلوان)بوو. کە لەو شکستە ئاگادار بووەوە ترساو باروبنەی خۆی پێچایەوە و بەخۆی و دارو دەستەو خزمەتکارەکانییەوە ڕێگای هەلاتنی گرتە پێش. لە جەلەولاوە چوار هەزار سەربازی عارەب جێگیر بوون و ئەوانی تر چوونەوە بۆ مەدائن بۆ لای سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس. سەعدیش لەوێڕا چووە کوفە و سەعد ئەو شارەی بە فەرمانی عومەر بنیات نابوو و خۆی لەلایەن خەلیفە سێ ساڵ و شتێك فەرمانڕەوایی ئەوێی کرد. لە جەنگی جەلەولادا دەستکەوتێکی زۆر کەوتە دەستی عارەبەکان، دەستکەوتێکی ئەوەندە زۆر کە پێشتر دەستیان نەکەوت بوو، هەروەها ژنان و کچانی زۆریشیان بەدیلی کەوتنە دەست، ئەوەندە زۆر کە عومەر لە ژمارەی زۆری دیلەکان نیگەران بوو. (دینەوەری) دەنووسێ کە عومەر بەردەوام دووپاتی دەکردەوە لە پاپی منداڵانی ئەو ژنانەی کە لە جەلەولا بە دیل گیراون پەنا دەبەمە بەر خوا. [٥٣*] هەندێك کوژراوانی جەلەولایان پتر لە سەد هەزار کەس نووسیوە [٥٤].

---

٥٣- اخبار الطوال. ل١٢٣.

٥٤- یاقوت: معجم البلدان، ب٢، ل١٠٧.

*- سەرچاوە مێژووییەکان باس لە ئەنفالکردنی ئەو ژن و منداڵانە دەکەن کە لە پەلاماری لەشکری عارەبەکاندا بردراون یان لە بازاڕەکانی عارەبستان هەرزانفرۆش کران یان بەسەر سەران و شەرکەرەکاندا دابەشکران.

## شوشتەر و شوش

کاتێك شکستخواردووەکانی جەلەولا کە لە هەمبەر عارەبان تێکشکابوون و هەڵاتبوون گەیشتنە حلوان، یەزدی کورد وەك دەگێڕنەوە لەبەر ترس و نیگەرانی نەیتوانی زیاتر لە حەلوان بمێنێتەوە، ڕێی هەڵاتنی گرتە بەر و لەگەڵ خزم و هاوەڵەکانی خۆی بەرەو (ئستەخر) بە ڕیوایەتێکی تر بەرەو (قوم) و (کاشان) ڕۆیشت. یەکێك لە کەسە نزیکەکانی شا کە لەو سەفەرە هاوڕێی بوو و ناوی (هورمزان) بوو. دەڵێن کە خاڵی (شیرۆیە)ی کوڕی خوسرەو بوو و لە دەرباری شا دا نزیکایەتییەکی تەواوی هەبوو، گوتویە عارەب لەلای حەلوانەوە بەسەر ئێمەیان دادا و پێشڕەوییەکی زۆریان کردووە و لەوێوە ناتوانین ڕووبەڕوویان ببینەوە، بەڵام کۆمەڵێکیان لە سنووری ئەهواز و خورستانن کە سەرداری ئازاو شەڕکەریان نین و خۆ لەبەر هێرشی ئێمە ڕاناگرن. ئەگەر پادشا بڕیار بدات من دەچمە ئەو دەڤەرە و لەشکرێك کۆدەکەمەوە هەڵدەکوتمە سەر فەرماندەی ئەو تاخمەی ئەوێ کەناوی (ئەبو موسای ئەشعەری)یە و دەیشکێنم و لە ناوچەی فارس و ئەهوازەوە پێداویستی و لەشکرێك پێکەوە دەنێم. یەزدی گورد ئەو پێشنیازەی هورمزانی پەسەند و قبوڵ کرد و ئەوی لەگەڵ کروپێکدا بۆ ئەو ئەرکە دیاری کرد و بە پارە و لەشکرەوە ڕەوانەی ئەوێی کردن. ئینجا هورمزان ڕۆیشت تاگەیشتە شاری شوشتەر. لەوێ دایکۆتاو فەرمانی دا شوورای شارەکە چاك بکرێتەوە و دواتر ئازوقە و خەڵکێکی زۆری کۆکردەوە (ئەبو موسا)ش کەلەوە ئاگاداربوودوە نامەی بۆ عومەر نووسی و لە بارودۆخ و ڕەوشی ئەوێی ئاگادار کردەوە. عومەر نامەی بۆ (عەممار کوڕی یاسر) کە لە جێی سەعد کردبوویە فەرمانداری کوفە و سەواد، نووسی و فەرمانی پێکرد کە بەنیوەی لەشکرەکەی خۆیەوە پەیوەندی بە ئەبو موساوە بکات. کە سوپای عارەب لە دەوری ئەبو موسا کۆبووەوە خۆی گەیاندە دەروازەی شوشتەر و کەمارۆی هورمزانی دا و جەنگ دەستی پێکرد. کوشتارێکی گەورە ڕوویدا و سوپای ئێران شکاو ڕایکردەوە ناو شار. ئەبو موسا ئەمجارە ئابلوقەی شاری داو ئەو ئابلوقەدانە ماوەیەك درێژەی کێشا و خەریك بوو کە لەشکری عارەب لە پەلو پۆبکەوێ و نائومێد بێ، بەڵام خیانەتی ئێرانییەك بارەکەی بە قازانجی عارەبەکان شکاندەوە. نووسراوە کە ڕۆژێك کابرایەك لە گەورەکانی شوشتەر، بە نهێنی لە شار هاتە دەردەوە و چووە لای ئەبو موسا و گوتی ئەگەر من بەکیان و ماڵ و منداڵمەوە پەنابدەیت و پارێزراو بین، ئەوا لە گرتنی شاردا هاوکاریت دەکەم. ئەبو موسا ڕازی بوو. ئەو پیاوە کە ناوی (سینە) یا (سیە) بوو، گوتی یەکەم پیاوێکی خۆتم لەگەڵ بنێرە تاکو لەگەڵ خۆمدا بیبەمە ناو

شارو هەموو شوێنەکانی نیشان بدەم، ئینجا رێ و شوێن و تەدبیری پێویست دەکەین. ئەبو موسا بە هاوەڵەکانی خۆی گوت لە ئێوە کێ هەیە لە گیانی خۆی خۆش بێ و لەگەڵ ئەم پیاوە بڕوا تا بەڵکو گیانی هەمووان رزگار بکات یاخود خۆی بچێتە بەهەشت؟ پیاوێك لە هۆزی (بەنی شەیبان بەناوی ئەشرەس کوری عوف) هەڵسا و لەگەڵ سینە، بەرێی نهێنیدا چووە نێو شارەوە. سینە ئەوی بردە ماڵەکەی خۆی و جلوبەرگی ئەوێی لەبەر کرد و پێی گوت دەبێ ئێستا لەگەڵ من بێی و وایبنوێنی کە خزمەتکاری منی، کابرای عارەب وایکرد، سینەی بەو شێوەیە لە نێو هەموو شاردا گێڕای. تەنانەت جارێك بە بەر دەرگای کۆشکی هورمزاندا تێپەڕین. لەوێ هورمزان لەگەڵ چەند کەس لە سەرهەنگ و گەورە فەرماندەکانی خۆی ڕاوەستا بوو و خزمەتکارەکان مەشخەڵیان لە پێش ئەواندا بەدەستەوە گرتبوو. ئەشرەس ئەمەی هەموو بینی و ئینجا لەگەڵ سینە دا گەڕایەوە ماڵەوە و دواتر بە هەمان ڕێگا نهێنییەکەدا لە شار چوونە دەر و گەڕانەوە لای ئەبو موسا. ئەشرەس ئەوی بینیبووی بۆ ئەبو موسای باس کرد، ئینجا گوتی ئێستا دوو سەد کەس لە موسڵمانانم لەگەڵدا بنێرە و خۆشت لە دەروازە چاودێریمان بکە تا ئێمە لەناو شار لەگەڵ پاسەوانەکاندا دەستەو یەخە دەبین و دەروازەی شار دەکەینەوە و لەشکری عارەب دەبەینە نێو شارەوە. ئەبو موسا گوتی ئەی خەڵکینە کێ هەیە لە ئێوە لە گیانی خۆی خۆش بێ بالەگەڵ ئەشرەسدا بڕوا تا ئەو پیلانە سەر بگرێ. دوو سەد عارەب هاتنە پێش و لەگەڵ ئەشرەس و سینە دا بەهەمان ڕێگای نهێنی کە ژێر زەمینێ بوو خۆیان گەیاندە ناو شار. یەکەمجار بە تونێلەکەدا خۆیان گەیاندە ماڵی سینە و خۆیان بۆ نەبەرد ئامادە کرد. ئینجا لەو ماڵە چونەدەر و بۆ لای دەروازە رۆیشتن. لە دەرەوەی شاریشدا ئەبو موسا لەگەڵ کۆمەڵێك جەنگاوەری خۆیدا لەپشت دەروازەی شار وەستا بوو بەدەنگی بەرز (تەکبیر)ی دەرکرد. ئەو دوو سەد کەسە کە لەگەڵ ئەشرەس و سینە لەناو شاردا بەسەر پاسەوانەکانیان داداو کوشتنیان و دەروازەکەیان کردەوە و ئەبو موسا و عارەبەکانی تر هاتنە ناو شار و شمشێریان لە کوشتنی خەڵکدا خستە گەڕ، لە گێر و گازی ئەو هەرایە دا، هورمزان کە بە هۆی خیانەتی یەکێ لە هاوولاتیانی خۆی کەوتبووە داوەوە. خۆی و هەندێ لە هاوەڵەکانی توانیان رابکەن و خۆیان لە نێو قەڵایەك کە لە ناو شاردا بوو قایم بکەن و ئەبو موسا هەموو شاری گرت و ئینجا کەمارۆی ئەو قەڵایەی دا کە هورمزانی تیا بوو. لەبەر ئەوەی ماوەیەکی زۆری پێچو و هیچ ئازوقە و خواردەمەنییەك لە ناو قەڵاکە بۆ هورمزان

نەمایەوە، داوای کرد گیانی پارێزراو بێ و خۆی رادەست بکات، ئەبو موسا قبوڵی کرد کە نەیکوژێ و بینێرێتە مەدینە لای عومەر تالەوێ خەلیفە خۆی بڕیار لە چارەنووسی بدات [٥٥].
سەرچاوەکان نووسیویانە کە ئەبو موسا هورمزانی بە سێ سەد کەسەوە ناردە لای عومەر، کاتێ ئەو کۆمەڵە گەیشتنە مەدینە و چوونە لای عومەر، هەموویان عەبای زێڕین و شمشێر و کەمەربەندی گرانبەهایان پێبوو *. دەگێڕنەوە کاتی هورمزانیان بردە مەدینە، جلوبەرگی گرانبەهای لەبەر بوو، ئەویان بردە مزگەوت تا عومەر ببینێ. عومەر لە مزگەوت خەوتبوو و قەمچییێکی لە ژێر سەر بوو. هورمزان پرسی (میری باوەڕداران )لە کوێیە؟ گوتیان ئەمەیە کە خەوتووە. گوتی ئەی پەردەدارەکانی کوان؟ گوتیان ئەو نە پەردەدارێکی هەیە نە دەروانێك و نە کاتبێك. گوتی ئەو پیاوە مەگەر پێغەمبەرە؟ عومەر لە خەو هەستاو هورمزانی ناسی. لە چیرۆکەکاندا وا باسکراوە کە عومەر ویستی بیکوژێ، هورمزان داوای ئاوی کرد ئاویان بۆ هێنا. ئینجا داوای لە عومەر کرد تا ئەو ئاوە نەخواتەوە، نەیکوژێ. عومەر قبوڵی کرد، ئینجا هورمزان ئاوەکەی ڕێشت و عومەر ناچار بوو واز لە کوشتنی بێنێ لە غەزووی (شوش) یش بەسەرهاتێکی لەو چەشنە باسکراوە. دەڵێن کە ئەبو موسا ئەوێی گەمارۆدا، مەرزەبانی شوش بۆ هەشتا کەس لە هاوەڵان و کەس و کارەکانی خۆی داوای ئەمانی کرد تا شاری رادەست بکات. ئەبو موسا قبوڵی کرد و کە شاری گرت هەشتا کەسی کە هاوەڵ و کەس و کاری ئەو بوون ئازاد کردن، بەڵام فەرمانی دا کە سەری خۆی بپەڕێنن. لە ڕاستیدا مەرزەوانی شوش کە شاری رادەستی ئەبو موسا کردبوو بووە قوربانی دەستپاچەیی خۆی، چونکە ئەو بۆ هەشتا کەس لە هاوەڵەکانی خۆی داوای ئەمانی کردبوو. (ئەبو موسا) شاری گرت و دەستکەوتی زۆری گلدایەوە و دوای ئەوە عارەبەکان هەرێمی خوزستان و فارسیان کردە مەیدانی جلیتبازی و تەراتێنی خۆیان و لەماوەی یەکساڵدا، مهرەگان کدك قەزەق و سەیمەرە و ئیستەخر و ئەرجانیشیان گرت.

## لە بارەی خیانەتەوە

ئەو خیانەتەی کە بووە هۆی تێشکانی ئێران، (تەبەری) داویەتە پاڵ کەسێك بەناوی (سیاه دیلەمی ) کە یەکێك بوو لە فەرماندەکانی یەزدی گورد. ناوبراو ئەم ریوایەتە لەمەڕ غەزووی شوش دەگێڕێتەوە، تۆ بڵێی لە هەموو ئەو شەڕانەدا شەڕێك هەبێ کە ئەو چەشنە خیانەتانەی

٥٥- ابن اثیر: ڕووداوی ساڵی ١٧.

تێدا نەکرابێ؟ بەهەر حاڵ ئەو ریوایەتەی کە (تەبەری) دەیگێڕێتەوە بەم چەشنەی خوارەوەیە: کاتێ کە یەزدی گورد لە شکستی جەلەولا ئاگاداربوو، خۆی لە حلوان بوو. هەڤاڵ و دار و دەستەو پیاوەکانی خۆی بانگ کردو (موبد)یشی داوا کرد و ئامادەبوو. کە کۆبوونەوە گوتی ئەم عارەبانە هەر سوپایەکیان بۆ شەڕکردن دەنێرینە پێش دەیشکێنن، رای ئێوە چییە و چی بکەین باشە؟ (موبد) گوتی ئەوە چاکە کە تۆ ئەم شارە جێبێڵێ و بچینە ئیستەخر کەماڵی شایەو ئینجا لەوێ لەشکر و هێز بنێری. یەزدی گورد ئەم بۆ چوونەی پەسەند کرد و بەرەو ئیسفەهان رۆیشت. بانگی (سیاه) و سێسەد کەسکە لە نێوانیاندا هەفتا کەسیان لە گەورە گەورەکان بوون، کرد و فەرمانی پێدان کە بەهەر شارێکدا کە ڕەت بوو هەر کەسێکی ویست هەڵیبژێرێ و لەگەڵ خۆیدا بیبا و خۆی بگەیەنێتە شوش و لەوێ بەگژ عارەباندا بچێتەوە. سیاه رۆیشت و لە شوێنێك بەناوی (کەلبانیە) جێگر بوو، هێشتا ئەو نەگەیشتبووە شوش کە دانیشتوانی شوش داوای ئاشتیان کردو لەگەڵ ئەبو موسا رێککەوتن. ئەبو موسا ئاشتی لەگەڵ کردن و ڕێی (رامهورمز)ی گرتەبەر. بەڵام سیاه لە کەلبانیە بوو و زۆر لە موسڵمانەکان دەترساو لەوێ مایەوە تا ئەبو موسا چووە نێو شوشتەر. (سیاه)ش جووڵا و لە شوێنێکی نێوان رامهورمز و شوشتەر دابەزی. (عەممار کوڕی یاسر)یش گەیشت. دوای ئەوە سیاه و گەورە و سەرانی ئێران کە لە ئیسفەهانەوە لەگەڵی هاتبوون، کۆبوونەوە و پێی گوتن هیچ لەشکرێك نەماوە کە ئەم عارەبانە نەیانشکاندبێ و هیچ قەڵاو شورەیەك نەماوە نەیانگرتبێ، رای ئێوە لەو بارەیەوە چییە؟ گوتیان باشترین ڕێگا ئەوەیە کە خۆمان تەسلیم بکەین و بچینە سەر رێبازی ئەوان. ئینجا یەکێکیان لەو گەورە پیاوانە بەناوی شێرۆیە، ناردە لای ئەبو موسا و داوای ئاشتەواییان کرد و ئەمانیان خواست و چوونە سەر ئایینی ئیسلام. [٥٦] لەوە بە دواوە سیاه کەوتە خزمەتی عارەبەکان و لەجەنگەکاندا بوو بە هاوڕێ و هاوکارییان. بۆ نموونە کاتی کە عارەب گەمارۆیی شوشتەریان دا ئەویان لەگەڵدا بووە. نیوە شەوێك جلوبەرگی ئێرانیانی پۆشی و خۆی هەڵدایە بەردەمی قەڵا، جلەکانی خۆی خوێناوی کرد. بەیانی دانیشتوانی قەڵا پیاوێکیان بینی کە جلوبەرگی ئێرانی لەبەرەو لەبەر دەم قەڵا کەوتووە، وایانزانی لە خۆیانە، دەروازەی قەڵایان کردەوە تابیبەنەوە نێو قەڵا. لەو دەمەدا سیاه هەڵسایەوە

٥٦- طبری، ج٣، ص٦ — ١٨٥ چاپ مصر.

دەستەو یەخەی پاسەوانەکان بووەو ئەوەندە شەڕی لەگەڵدا کردن تا دەروازەی قەڵایان جێهێڵا و هەڵاتن. ئینجا سیاه دەروازەی قەڵای کردەوە و سوپای دوژمن خۆی گەیاندە ناو قەڵایە کەوە [57*].

## دواین نەبەرد

یەزدی گورد کاتێ کە مەدائنی بەجێهێشت، ڕەنگە پێیوابووبێ کە عارەبەکان دڵیان بە (سەواد) ئاو دەخواتەوە و هەرێمی چیا بۆ ئەو جێدەهێڵن، بەڵام گەمارۆی شوش و پێشڕەوکردنیان بەرەو ئیسفەهان ئەو بۆ چوونەی ئەویان بەتاڵ کردەوە.

بۆیە نامەو پەیامی بۆ هەموو سەردارانی وڵات نارد تا بە لەشکر و کەلوپەل و دارایی یارمەتی بدەن. هەڵبەتە لەو ئاشووب و بێ سەرەوبەرەییەی کە باڵی بەسەر وڵاتدا کێشابوو، سەردارانی وڵات بەتەنگ یارمەتیدانی یەزدگوردەوە نەبوون، بەڵام چونکە مەترسی عارەبان هەڕەشەی لەوانیش دەکرد، بە دەنگ بانگەوازی شای شکستخواردووەوە هاتن، لە لێواری خەزەرەوە تا دەریای هیند لە جەیحونەوە تا دەریای فارس لە هەموو لاوە سوپا گرد بوودەوە. لە نزیك هەمەدان سوپایەکی نزیك بە سەد و پەنجا هەزار کەس کۆبووەوە. فەرماندەی ئەو سوپایە (فەیروزان ) بوو. ئەو سوپا مەزنە دەیویست لە ڕێی حەلوانەوە بەرو لای کوفە کە لەشکرگای عارەبەکانی لێبوو، بچێ. هەلومەرجێکی دژوار بۆ عارەبان هاتبووە پێش و کوفە و بەسرە لەژێر هەرەشە دابوون.(عەماری کوڕی یاسر) فەرماندەی عارەبان کە بەو هەواڵەی زانی، نامەی بۆ مەدینە نووسی و ڕەوشەکەی تێدا باس کرد بوو. (عومەری کوڕی خەتاب) مردووە لە ساڵی (٢٣ ك/ ٦٤٤ ز) نامەکەی وەرگرت و چووە سەر مینبەر و رووی لە خەڵکەکە کردو گوتی ئەی خەڵکینە تا ئێستا بە بەرەکەتی ئیسلام و یارمەتی خوا لە جەنگی دژی ئێرانییەکاندا سەرکەوتن بەلای ئێمەدا بووە، هەنووکە ئێرانییەکان سوپایەکیان کۆکردۆتەوە و بەتەمان ڕۆشنایی خواوەند دامرکێننەوە. ئەمە نامەی عەممار کوڕی یاسرە کە بۆ منی ناردووە و نووسیویەتی کە خەڵکی توس، تەبەرستان، دەماوەند، گورگان، ڕەی، ئیسفەهان، قوم،

---

٥٧- گبری، هەمان سەرچاوە

* هەمیشە یەکێك لە فاکتەرە هەرە کاریگەرەکانی هەموو شکستەکان بریتی بووە لە خیانەتی نێوخۆیی ... بەداخەوە تا ئەم ڕۆژگارەش دەیبینین.

هەمەدان، ماهین و ماسبزان لە دەوری پادشای خۆیان کۆبوونەتەوە تابەسەر برادەران و هاوەڵانی ئێوەدا بدەن لە کوفە و بەسرە و ئەوان لە نیشتمانی خۆیان دەربکەن و بێنە شەڕی ئێوەش. جا داوا دەکەم ڕاو بۆچوونی خۆتان لەو بارەیەوە بە من بڵێن. (تەلحە) گوتی ئەی ئەمیر ڕای تۆ لە هەمووان ڕاسترە، هەرچی تۆبڵێی ئەوە دەکەین، (عوسمان) گوتی ئەی ئەمیر نامە بۆ خەڵکی شام بنووسە تا لە شامەوە بێن و کەسێك بە دوای خەڵکی یەمەندا بنێرە تا لە یەمەنەوە بێن و لە خەڵکی بەسرەش داوا بکە کە بێن و تۆ بۆ خۆشت لێرە ڕا خۆت بگەیەنە کوفە، کە ئەو هەموو خەڵکەت لێکۆبووەوە سوپای تۆ زیاتر دەبێ لە هی ئەوان و کارەکەت بۆ ئاسان دەبێ. ئەوموسوڵمانانەی کە لەناو مزگەوتدا بوون ئەو ڕایەی عوسمانیان پەسەند کردو ئافەرینیان کرد. عومەر ڕووی لە (علی کوڕی ئەبو تالب) مردووە لە (٤٠ ك/ ٦٦١ ز) کرد کە ئەویش لەوێ بوو و لێیپرسی ڕای تۆ چییە ئەی (ئەباحەسەن)؟ علی گوتی ئەگەر سوپای شام هەموو بۆ یارمەتدیدانی تۆ بێن و ئەوێ بە جێبێڵێن ئەوا ڕۆم دەست بەسەر شام دا دەگرێ، ئەگەر هەموو سوپای یەمەن بێت و یەمەن جێبهێڵن بە هەمان شێوە زەنگیینەکان چاو دەبڕنە ئەوێ و داگیری دەکەن، چوونی تۆش لە جێی خۆینییە و ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەرەوە هەرگیز بە زۆری ژمارەی سەرباز بەسەر دوژمندا زاڵ نەبووین، بەڵکو سەرکەوتنی ئێمە بە هۆی ڕەواییەوە بووە نەك بەهێز و توانا. ئێستا وا چاکە نامە بۆ سوپای شام و عەممان و شارەکانی تر بنووسی کە لە شوێنی خۆیان بن و هەریەکەو سێیەکی ژمارەی خۆیان بۆ یارمەتیدانی تۆ بنێرن.

عومەر ئەو ڕایەی پەسەند کرد و گوتی دەبێ کەسێکی وا بکەمە فەرماندەی ئەو شەڕە کە لە بەرامبەر ئێرانییەکاندا خۆڕاگربێ. ئینجا (نوعمان کوڕی مقرن) ی کە یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر و سوارچاکێکی عارەبان بوو و لەو کاتە لە (کەسکر) بەرێوەبەری کۆکردنەوەی باج بوو، کردە فەرماندەی ئەو سوپایە و نامەی بۆ نووسی کە تۆ فەرماندەی سوپای. فەرمانی دا ئەگەر نوعمان کوژرا (حەزیفە کوڕی ئەلیەمان) مردووە لە (٣٦ ك/٦٥٧ ز) فەرماندەیە ئەو ئەگەر حەزیفە کوژرا (جەریر کوڕی عەبدوڵلا) و هەروەها دوای جەریر (موغەیرە کوڕی شعبە) دوای موغیرەش (ئەشعەث کوڕی قەیس). لە نامەیەکدا کە بۆ (نوعمان کوڕی مقرن)ی نووسی، پێی گوتبوو کە دوو لە دلاوەرانی عارەب لە نێو سوپای تۆدا هەن (عەمرو کوڕی مەعد یەکرب) و (تەلیحە کوڕی خوەیلد)، ئەمانە بۆ هیچ ئەرکێك دامەنێ، بەڵام لە هەرکار و هەنگاوێکدا پرس و ڕایان پێبکە. ئەبو موسا لەو کاتەدا لە بەسرە بوو. سێیەکی سوپای بەسرەی برد و چووە کوفە. نوعمانیش هات و سوپا لە هەموو لایەکەوە گەیشت و کۆبووەوە. ئامادەکاریان وەرگرت و ڕێی (نەهاوەند)یان گرتە بەر.

## غەزووی نەهاوەند

سوپای ئێرانیش بە فەرماندەی فەیرۆزان یا (مەردان شاە) ئامادەکارییەکی زۆریان کردبوو. دوو لەشکر لە نزیك نەهاوەند ئوردویان دانا و ماوەیەك لە بەرامبەر یەکتر دا سەنگەریان گرت. کە ئێرانییەکان دەست پێشخەریان نەکرد لە شەڕ و ڕۆژانەش لە هەموو لاوە هێزی یارمەتیدەریان بۆ دەهات، عارەبەکان تەنگەتاو بوون و ترس و هەراسیان لێ نیشت و لە ئاکامی کاردا نیگەران بوون. سەرانی سوپای عارەب بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەك بۆ ئەو ئاستەنگە کۆبوونەوە و وایان بە باش زانی کە پێویستە وا بلاو بکەنەوە کە خەلیفەی موسوڵمانان لە مەدینە دا مردووە و دەبێ سوپا دەست لە جەنگ هەڵبگرێ و بگەڕێنەوە. ئەوەیان کردو دەستیان بە گەڕانەوە کرد. ئێرانییەکان لە قەلا و سەنگەرەکانیاندا هاتنەدەرەوە و کەوتنە دوای عارەبەکان و بەمشێوەیە پەرش و بلاوبوونەوە کە خەریك بوون لێیان نزیك ببنەوە، عارەب لەبەردەمیان ڕاست بوونەوە و جەنگێکی سەخت ڕوویدا و چەند ڕۆژێك درێژەی کێشا و لە هەردوولادا خەڵکێکی زۆر کوژرا. سەرەنجام سوپای ئێران شکا و هەلات و نەهاوەندیش کەوتە دەستی عارەبەکان. لەوێوە بۆ هەمەدان و ئازەربایگان چوون و ئیدی ئێرانییەکان توانای بەرگریان نەما. گرتنی نەهاوەند لە ڕاستیدا ڕێی داگیرکردنی هەموو ئێرانی بۆ عارەبان کردەوە و ئەمە دوایین بەرگری ڕێك و پێك بوو کە دەوڵەتی ساسانی لە بەرامبەر عارەبەکاندا کردی. لەوە بەدواوە ئیدی نە دەوڵەتێك هەبوو نەولاتێك. هەموو شتێك کەوتبووە دەستی عارەبەکان. ساڵێك دواتر هەمەدان و کاشان و ئیسفەهان و ئیستەخریش کەوتنە دەستی عارەبان و یەزدی گورد لە فارسەوە بۆ کرمان لەوێشەوە بۆ سیستان ڕۆیشت و سەرەنجام بۆ (مرو) کشا.

لە غەزووی نەهاوەندا دوایین پاشماوەی گەنجەکانی پاشایەتیش کەوتنە دەستی عارەبە سەرکەوتووەکان. دوای ئەوەش چیتر ئێرانییەکان بۆیان مەیسەر نەبووکە لەشکرێك پێکەوە بنێن و لە بەرامبەر عارەباندا ڕابوەستن. هەموو شتێك و هەموو جێیەك لە دەستی عارەبەکاندا بوو، بۆیە عارەبەکان ناویان لەو غەزووە ناوە سەرکەوتنی سەرکەوتنەکان.

## سەرەتای کارەساتێك

گرتنی نەهاوەند لەساڵی٢١ك/٦٤٢ ز کۆتایی بە چوارده سەدەی پڕ لە رووداو و شکۆداری ئێرانی دێرین کە لە حەوت سەدە بەر لە زایین تا حەوت سەدەش دوای زایین درێژ ببووەوە، هێنا. ئەو رووداوە تەنها رووخانی دەوڵەتێکی مەزن نەبوو، رووخانی دەزگایەکی کرمێ و گەندەڵ بوو. چونکە لە کۆتایی تەمەنی پاشایەتی ساسانییەکاندا لەبەر بەرەڵلایی و پشێوی و بێ ئاکامی، هەموو دەزگا و دامەزراوە و گشت کار و بارەکان تووشی گەندەڵکاری ببوون. ستەم و زۆرداریی شاکان، ئاسایش و ئۆقرەیی خەڵکیان خستبووە ژێر هەڕەشەوە، رەقەکاری و کەمتەرخەمی موبدان ناکۆکیی ئایینیان پەرەپێدەدا. لەلایەك وتەو رێنوێنییەکانی (مانی) و (مەزدەك) خۆیان دەخزاندە نێو بیر و باوەڕی خەڵکی و لەلایەکی ترەوە کاریگەریی ئایینی مەسیحی لە رۆژئاواو پێشکەوتنی ئایینی (بودا) لە رۆژهەڵاتدا تواناو دەسەڵات و کاریگەریی ئایینی زەردەشتیان کەم دەکردەوە. رۆحانییەکانیش وا نوقمی نێو وەهم و نەریتی کۆنەپەرستانە ببوون کە بیرو هۆشیان تەنها لەسەر ئاتەشگا و خێر و بێر و سوودەماددییەکانی بوو و توانای بەرگریکردن لە ئایینی خۆشیان نەمابوو . یەکێتیی ئایینی لەو رۆژگارەدا تەواو شێوا بوو و بەرەو لە نێو چوون دەچوو. بە هۆی ئەو گەندەڵکارییەی کە لە ئەخلاقی موبداندا سەری هەڵدا بوو، زانا و هۆشمەندانی وڵات لە ئایینی زەردەشتی بێزار ببوون و بە دوای ئایینێکی تر دا دەگەڕان کە لایەنی ئەخلاقی و رۆحی لە ئایینی زەردەشتی بەهێزتربێت و نەریت و رێ و شوێنی چینایەتی کۆنیش هەڵبوەشێنێتەوە. ئەو نفووز و ئۆتۆریتەیەی کە ئایینی مەسیحی لەو رۆژگارەدا لە ئێران پەیدای کردبوو هەر لەبەر ئەوە بوو. سەیر نییە کە (روزبە کوڕی مەرزبان) مردووە لە (٣٦ ك/٥٧ ز)، یان وەك دواتر بە (سەلمانی فارسی) ناوی دەرکرد، چووە سەر ئایینی مەسیحی و دیسان بەو ئایینەش دڵی ئۆقرەی نەگرت و ناچار بە دوای ئایینێکی تازەدا چووە شام و حیجاز. بەڵێ لەبەر ئەوە بوو کە لەو رۆژگارەدا لە هەموو رووێکەوە زەمینە و رەوتی قبولکردنی ئایینێکی تازە ئامادەبوو و دەوڵەتیش کە لە سەرەتای قۆناغی ساسانییەکانەوە تێکەڵ بوو لەگەڵ ئایین، چیتر بە هۆی لاوازی و بێ سەروبەری خۆی نەیدەتوانی خۆی لەبەرامبەر هیچ پەلامارێکدا رابگرێ. بەمشێوەیە، دەزگای ئایین و دەوڵەت بەو بێ سەر و بەریی بە خوێناوی و ئەو ستەم و زۆرداری و بێدادیە لەرادەبەدەرەی کە لە کۆتاییەکانی سەردەمی ساسانییەکاندا هەبوو، ئیدی وا لێکترازا بوو کە هیچ بواری بەردەوامی و مانەوەی

نەبوو. دام و دەزگایەکی پەرێشان و کاروبارێکی بێ سەروبەر باڵی کێشا بوو کە هێزێکی خاوەن باوەڕ و بڕیاری بچووکترین و کەم مایەترین میللەت دەیتوانی لە بەریەکی هەڵیبوەشێنێتەوە و یەکسەر لەنێوی ببات و تەفروتونای بکات. (بێزەنتیە)، یان وەك ئەمڕۆ پێیدەگوترێ (بیزانس)، کە دوژمنی چەندین ساڵەی ئێرانیش بوو لەبەر ئەوەی لەو کاتانەدا خۆی گیرۆدەی تەنگ و چەڵەمەی خۆی بوو، نەیتوانی ئەو دەرفەتە بقۆزێتەوە و عارەب کە تا ئەوددەمی هەرگیز بیریان لە پەلاماردانی ئێرانش نەدەکردەوە، زاتیان هاتە بەرو بەو هەنگاوە هەستان.

بەمشێوەیە، ئەو کارەی کە دەوڵەتی گەورەی ڕۆم بە ئاییینی دێرینی مەسیحییەوە نەیتوانی لە ئێراندا ئەنجامی بدات، دەوڵەتی خەلیفەی عارەب بە ئاییینی تازە سەرهەڵداوی ئیسلام ئەنجامی داو ئەو بۆشاییەی کە ئاییینی مەسیحی نەیتوانیبوو پڕی بکاتەوە ئاییینی ئیسلام پڕی کردەوە. بەم چەشنە بوو کە ئیسلام بەسەر ئاییینی زەردەشتدا سەرکەوت. بەڵام ئەو ڕووداوە ئەگەرچی بەڕواڵەت بە ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراو دەهاتە بەر چاو کەچی پێویستییێك بوو هەر دەبوا ڕوویدا با. چەندین ساڵ بوو کە مەترسی رووخان و لە نێوچوون لە کەنار مەرزەکان و پشت دەروازەکانی دەوڵەتی ساسانی دەینەڕاند. خەڵك لە دەستی ستەمی فەرمانڕەوایان و گەندەڵی ڕۆحانییەکان وەتەنگ هاتبوو، ئاییینی تازەیان بە مژدەیەك دەزانی و بۆیە بەگەرمی پێشوازیان لێدەکرد. وەك چۆن لە لێواری فرات، لە شوێنێك کۆمەڵێك دێهاتی پردێکیان دروست کرد تا سوپای ئەبو عوبەیدە خۆی بگەیەنێتە ناو خاکی ئێران و شاری شوشتەر لەلایەن یەکێ لە گەورە پیاوانی شار بە خیانەت رادەستی عارەبان کراو هورمزانی فەرمانڕەوای شوشتەر بە هۆی ئەو خیانەتە بە دیلی کەوتە دەستی دوژمنەوە. لە نوستانەکانی وەکو (ڕەی، قومس و ئیسفەهان و جۆرجان و تەبەرستان) خەڵك بە دانی جزیە رازی دەبوون، بەڵام چاویان لە شەڕکردن نەبوو و هۆیەکەش ئەوە بوو کە لە بەرئەوەی دەوڵەتی ساسانی ئەوەندە تووشی ستەمکردن و بێدادی و پشێوی ببوو کە هیچ کەس مەیلی لەبەرگریکردن نەبوو لێی، بۆ نموونە دەگێڕنەوە کە مەرزەبانی ئیسفەهان کە ناوی (فازوسبان) بووە، پیاوێکی ئازاو چاو نەترس بووە، کە دیتی خەڵك هیچ حەزی لە شەڕ کردن دژی عارەبان نییە و ئەو بەتەنێ بەجێدێڵن، ئیسفەهان بەجێدێڵێ و لەگەڵ سی کەس لە چەکدارەکانی خۆی ڕێی کرمان دەگرێتە بەر تاخۆی بگەیەنێتەوە یەزدی گوردی پادشا، بەڵام عارەب وە دوای دەکەون و دەیگێڕنەوە و دوا جار ئاشتی دەکەن لەسەر ئەوەی کە جزیە بدات، کە فازوسبان هاتە ئیسفەهان، لۆمەی خەڵکی کرد و پێیگوتن ئێوەمنتان بە تەنیا جێهێڵا و یارمەتیتان نەدام، بۆیە سزای ئێوە ئەوەیە جزیە بدەنە

عارەبان. تەنانەت هەندێ لە سوارەکانی سوپای ساسانی بە پێخۆشیی خۆیان بوونە موسڵمان و پەیوەستی (بەنی تەمیم) بوون. وەك چۆن (سیاه ئەسواری) لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوەڵەکانی خۆی کە هەموویان لە گەورە پیاوانی سوپای یەزدی گورد بوون کاتێ ئەو چوستی و چالاکی و بێنە و بەردەی عارەبەکانیان بینێ و لە یەزدی گورد نائۆمێد بوون، چوونە سەر ئایینی ئیسلام و تەنانەت ڕۆڵیشیان لە بڵاوکردنەوە و پەرەپێدانی ئیسلامدا گێڕاوە.

هەر ئەو نائومێدی و ناڕەزایەتیانە بوون کەوایانکرد عارەبەکان بەسەر ساسانییەکاندا سەرکەون و بە گیران و رووخانی نەهاوەند، شان و شکۆ و مەزنایەتی خانەدانی ساسانی بەیەکجاری تەفروتونا بکەن. ئەو سەرکەوتنەی کە عارەب لە نەهاوەند بە دەستیان هێنا بواری هەمەجۆرە خۆڕاگری و بەرگریکردنێکی شایانی باس و کاریگەرانەی کە بەرامبەریان بکرێ نەهێڵا.

لە راستیدا ئەو غەزووەی نەهاوەند، لەو رۆژگارەدا سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ عارەبان. سەرکەوتنێکی یەکجارەکی باوەڕ و دادگەری بوو بەسەر ستەم و گەندەڵی سەردار و دەسەڵاتدارەکانی ئەو دەم. سەرکەوتنی ئەوپەڕی سادەیی و فیداکاری عارەبان بوو بەسەر خۆپەرەستی و ژیانی پڕباق و بریق. رەفتاری سادەی عارەبەکان لە جەنگی قادسییە و جەلەولا و ئەو سەرکەوتنە سەیرەی کە بە ئاسانی بە دەستیان هێناو وەکو پشتیوانی کردنێکی ئاسمانی وابوو، جەنگاوەرانی ئێرانی لە شەڕ و نەبەردەکانی ئێرانی دەخستە نێو گومان و دوو دڵییەوە و ڕێشی تێدەچوو. ئەو عارەبانەی کە جێی پادشا و مەرزوانە پڕشکۆ و مەزنەکانی ساسانییەکانیان دەگرتەوە، کەسانێکی سادەو ساکار بوون کە لە هێز و دەسەڵاتی خوا بەولاوە شتێکی تریان نەدەبینی. خەلیفەی ئەوان کە لە مەدینە دەژیا هیچ شتێکی لەو خۆشی و جوانکارییەی کە پاشاکانی جیهان هەیانە، نەبوو و وەکو هەرکەسێکی تر وابوو، ئەوانیش کە لەلایەن ئەوەوە لە شار و دەڤەرە داگیرکراوەکاندا فەرمانڕەواییان دەکرد و لە جێی مەرزەوانان و سەردارانی پادشا ساسانییەکان بوون، ژیانێکی سادەو هەژارانە یا سەربازیانە دەژیان. سەلمانی فارسی کە دواتر لەلایەن عومەرەوە بە فەرمانڕەوای مەدائن دانرا، نانی جۆی دەخوارد و جلی پەشمینەی لەبەر دەکرد، لە ترسی مردن دەگریا کە جگە لەوانەی باریان سووکەو بێ گوناهن کەسی تر دەربازبوونی بۆ نییە و من بەو هەموو ئامرازە، دنیاییانە چۆن دەتوانم پێیدا رەت بم. لە ئامرازی دنیاییش جگە لە قەڵەم و مەرەکبدانێك شتێکی تری نەبوو، ئەو سادەییە سەربازی یا زاهیدانەیە، هەڵبەتە مایەی سەرسوڕمان بوو، بتەوێ یان نا لە دیدی ئەو خەڵکەی کە باری

ئەو هەموو خەرجەی خۆشگوزەرانییەکانی فەرماندە و گەورەکانی ساسانییەکانیان بە ڕەنج و ماندووبوون و بەدانی باج و سوخرەکێشییەوە هەڵدەگرت، بەهایەکی زۆری بە ئیسلام داوە. لە ڕۆژگارێکدا کە خەڵکی ئێران پادشاکانی خۆیان تا پلەی خواکان دەپەرەست و لە ترس و شەرماندا نەیاندەتوانی ڕووبەڕوویان ببنەوە و ئەگەر چوشبانە بەردەرگایان، ڕووپۆشیان بەسەر چاویان دادە دا، وەك چۆن لە ئاتەشگاکان باو بوو، عارەبە سادەو هیچ نەزانەکان لەگەڵ خەلیفەی خۆیاندا دادەنیشتن و وتوویژیان لەگەڵدا دەکردن و ئەو پەڕی سادەییان دەنواند. خەلیفە لە مزگەوت لەگەڵ ئەواندا دادەنیشت و وتوویژ و ڕاوێژی لەگەڵدا دەکردن، زۆر جار قسەی ئەویان دەبڕی و ڕەخنەیان لێدەگرت و ئەو شێوە ڕەفتار و هەڵسوکەوتە سادەیە، بەناچاری ئەو کەسانەی کە لە دەست حکوومەتی خۆیان وە تەنگ هاتبوون وا لێکرد بە چاوی پەسند و سەرنج ڕاکێشانەوە سەیری عارەب و ئایینە تازەکەیان بکەن. بەڵێ گێرانی نەهاوەند، کە ڕەچەڵەکنامەی دەوڵەتی ساسانییەکانی پەڕ پەڕ هەڵدایەوە و دای بە دەم لافاوی لە نێو چوونەوە، کۆتایی بەو بێدادی و گەندەڵکارییە سەرسوڕهێنەرە هێنا کە لە کۆتاییەکانی تەمەنی ساسانییەکاندا باڵی بەسەر هەموو کار و بارەکانی وڵاتدا کێشا بوو و ئەو دیوارە نیوە ڕوخا و لەرزۆکەی دەوڵەتێکی ناپایەداری کە مۆریانەی گەندەڵی و بێدادی بنکۆڵی کرد بوو و زەبرو گورزی ڕووداوەکان هەژاندبوویە سەریەك، بەرە و ڕووخانی تەواوی برد.

هەندێ خۆراگری و بەرگرێکردنی بچووکی ناوچەیی کە دوا بەدوای غەزووی نەهاوەند لە شار و دێیەکانی ئێران جارجار لەبەرامبەر عارەباندا ڕوویاندا هەڵبەتە بۆ هێرشبەرەکان بەگران کەوت، بەڵام هەموو ئەو بەرگریکردنانە نەیانتوانی ((سوارە نێزە دارەکان)) لە هاتنە ناو وڵاتی ((پادشاکان)) و سەر زەمینی (جەنگی سواران) قەدەغە بکات.

## بەرخۆدانە ناوچەییەکان

ئەو بەرخۆدانە ناوچەییانە زۆربەیان لە پەلامارێکی شێتانەی بێ بەرنامە بترازێ شتێك نەبوون. دوای ئەو شکستە گەورەیەی کە دەزگای حکوومەت شیرازەی کۆمەڵگەی ئێرانی تەفرو تونا کرد، ئەو نا ئارامی و بزاڤانە پێویست بوون تا جارێکی تر ڕەوشی کۆمەڵایەتی سەقامگیر ببێتەوە و پارسەنگی خۆی وەربگرێتەوە. (ڕەی) دوای نەهاوەند کەوتە دەستی عارەبان. خەڵك چەندین جار لەگەڵ داگیرکەراندا ئاشتیان کرد و پەیمانیان بەست، بەڵام هەرکە میرێك دەگۆڕا یا دەرفەتێکیان بۆ دەڕەخسا هەڵدەگەڕانەوە و ڕادەپەڕین. ماوەیەکی زۆری پێچوو، واتە تا ئەو

کاتەی کە (ئەبو موسا ئەشعەری) بووە فەرمانڕەوای کوفە و دەوروبەری ئینجا ئینجا بارودۆخی (ڕەی) سەقامگیر بوو. ئەبو موسا کاتێ گەیشتە ئەسفەهان داوای لە خەڵکی کرد ببنە موسڵمان، خەڵك قبوڵیان نەکرد، بۆیە داوای جزیەی لێکردن و قبوڵیان کرد و ئەو شەو پەیمانی ئاشتی بەسترا، بەڵام کە ڕۆژ بووەوە پەشیمان بوونەوە و لەگەڵ عارەباندا کەوتنە شەڕ. ئەمە لە بارەی خەڵکی (قوم)یشەوە هەر ئاوا باس کراوە. لە ساڵی (٢٨-٣٠ی کۆچی) عارەب دووجاران ناچاربوون ئیستەخر داگیر بکەن و غەزووی بکەنەوە. لە جاری دووەمدا بەرگری خەڵکی ئەوەندە دلێرانە و سەرسەختانە بوو کە فەرمانەدەی عارەبانی لە ڕك و تووڕەییان، شێت و هار کرد. سەرچاوەکان نووسیویانە کاتێ کە (عەبدوڵڵای کوڕی عامر)ی فەرماندەی عارەبان لە هەڵگەڕانەوەی خەڵکی ئیستەخر ئاگاداربووەوە و زانی کە خەڵکی ئەوێ دژی عارەبان ڕاپەڕیون و دانراوی ئەویان لەوێ کوشتوە (سوێندی خوارد) کە ئەوەندە لە خەڵکی ئیستەخر بکوژێ تا خوێن هەڵدەستێ. هاتە ئیستەخر و شەڕی ڕاگەیاند و خوێنی هەمووانی حەڵاڵ کرد و چەندی لێیدەکوشتن خوێن لە عەردەکە نەڕۆیی بۆیە ئاوی گەرمیان بە خوێنەکە دادەکرد تا خوێن هەستێ و سوێند لە فەرماندەی موسڵمانان نەدا. ژمارەی کوژراوەکان ئەوانەی ناویان تۆمارکرا چل هەزار کەس بوو، جگە لەوانەی ناویان تۆمارنەکراو دیار نەمان.[٥٨] بەرگری خەڵکی قارەمانی ئێران ئاوا دلێرانەو تاوانکارانە تێکدەشکێنرا، بەڵام ئەو دلێرەقی و زەبر و زەنگەی عارەبان هەرگیز نەیدەتوانی ڕۆحییەتی ئەو ژمارە کەمەی کە لە ڕێی داکۆکیکردن لە مەرز و بووم و خاك و وڵاتی خۆیان گیان و خوێنی خۆیان دەبەخشی، بەیەکجاری کپ بکا و دامرکێنێ. بۆیە لە هەر جێیەکدا کە بۆیان بلوابا لە هەمبەر داگیرکەران ڕاست دەبوونەوە و دژایەتیان دەکردن. هەر شارێك کە دەشبووە ئیسلام و تەسلیم دەبوو کاتێ کە بەرگریکاران و خەڵکی نارازی دەرفەتی ڕاپەڕین و سەرهەڵدانیان بۆ دەڕەخسا ئەوا لە شکاندنی ئەو پەیمانەی کە بە ناچاری چووبوونە ژێری بێ دوو دڵی پەشیمان دەبوونەوە. لە مێژوودا داگیرکردنی ئێران لە لایەن ئیسلامەوە، چەندین جار ئەو حاڵەتانە دەبینین. ساڵی سێیەمی کۆچی خەڵکی خوراسان کە ئیسلامیان قەبوڵ کرد بوو، هەڵگەڕانەوە و (عوسمان)ی خەلیفەی موسڵمانان، فەرمانی بە

---

٥٨- فارسنامەی ابن بلخی، ص١١٦.

(عەبدوڵڵای کوڕی عامر) و (سەعدی کوڕی عاص)دا کە سەرکوتیان بکەن و بۆ جاری دووەم عارەبەکان ناچاربوون گورگان و تەبەرستان و تیمشە غەزوو بکەنەوە [59].

سیستان لە سەردەمی خەلافەتی عوسماندا گیرا، بەڵام کاتێ هەواڵی کوشتنی عوسمان گەیشتە ئەوێ، خەڵك راپەڕین و ئەو کەسەیان لەوێ دەرکرد کە بە فەرمانداری عارەب دانرا بوو [60] مەرزەوانی ئازەربایگان کە لە ئەردەبیل جێگیر بوو، ئازایانە لەگەڵ عارەبان شەڕی کرد و دوای شەڕ و نەبەردی خوێناوی لەسەر بڕی هەشت سەد هەزار دەرهەم لەگەڵ (حەزیفەی کوڕی ئەلیەمانی) ئاشتی کرد. بەڵام کاتی عومەر خەلیفەی دووەم حەزیفەی بانگ کردەوە و یەکێکی تری لە شوێنی ئەو کردە فەرمانداری ئازەربایگان، خەڵکی ئازەربایگان دیسان دەرفەتیان قۆزتەوە و راپەڕین ..... [61]

ئەو سەرهەڵدان و بەرگریکردنانە بۆ گەڕاندنەوەی دەوڵەتی ساسانی نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە خەڵك سەر بۆ عارەبان دانەنەوێنن و ئەو جزیە گرانەی کە بەسەریاندا دەسەپاندن قبوڵ نەکەن. ئەو هەڵشاخان و رووبەڕووبوونەوانە دژی عارەبان نەك هەر لەلایەن ئەو کەسانەی کە لە شارەکانی ئێراندا بوون بە توندی هەبوو بەڵکو لەلای ئەو خەڵکەی کە لە نێو عارەبەکاندا و لە عێراق و حیجازیشدا بوون، ماوەیەکی باش درێژەیان کێشا.

## کوشتنی عومەر

پیلانی کوشتنی عومەر کە هەندێ لە ئێرانیانی دانیشتووی مەدینە دەستیان تێدا هەبوو بەو شێوەیە بوو: (ئەبو لوئلوئەی فەیرۆز) مردووە لە ساڵی (٢٣ ك/٦٤٤ ز) کە ناوە ڕاستەقینەکەی (باوکی مەرجانەی فەیرۆزی)ە و خەڵکی نەهاوەند بوو دوو ساڵ دوای غەزووی نەهاوەند، عومەری کوشت. سەرچاوەکان نووسیویانە کە ناوبراو بەر لە ئیسلام بە دیلی کەوتبووە دەستی ڕۆم و دواتر موسڵمانەکان بە دیلیان گرتبوو. هەر لەبەر ئەوەشە کە بە ڕۆمی و حەبەشی و مەسیحی دراوەتە قەڵەم، ئەوەش جێی لێوردبوونەوەیە. بە هەر حاڵ نووسیویانە کاتێ کە دیلەکانی نەهاوەندیان بردنە مەدینە، ئەبو لوئلوئەی فەیرۆز ڕاوەستا بوو، سەیری

---

٥٩- مؤلف مجهول: مجمل التواريخ و القصص، ص ٢٨٣.

٦٠- ابن اثير: تاريخ كامل حوادث، سنة ٢٩.

٦١- بلاذري: فتوح البلدان، ل ٣٢٦.

دیلەکانی دەکرد و دەستی بەسەر ئەو منداڵە وردیلانە دا دەهێنا و دەگریا و دەیگوت (عومەر جەرگت بریم). نووسیویانە ئەو فەیرۆزە غولامی (مەغیرەی کوڕی شەعبە) بووە. بەلعەمی دەڵێ (کاری دارتاشی دەکرد و هەموو رۆژێ دوو دەرهەمی دەدایە موغیرە. رۆژێك چووە لای عومەر و پێی گوت: ئەی عومەر، موغیرە باجێکی گرانی بەسەر دا سەپاندووم و ناتوانم بیدەم، بفەرموو کە کەمی بکاتەوە. عومەر گوتی چەندە؟ گوتی رۆژی دوو دەرهەم. پێی گوت چ کارێك دەزانی؟ گوتی (دارتاشی دەزانم و نیگارکێشم و ئاسنگریش دەزانم.) بۆیە عومەر پێی گوت رۆژی دوو دەرهەم بۆ ئەو هەموو کارەی دەیانزانی زۆر نییە. بیستومە گوتوتە دەتوانم ئاش دروست بکەم کە بە با ئیش بکات، گوتی ڕاستە. عومەر گوتی دەبێ ئاشێکی ئاوا بۆ من دروست بکەیت، فەیرۆز گوتی ئەگەر بژیم ئاشێکت بۆ دروست دەکەم هەموو خەڵکی ڕۆژ هەڵات و ڕۆژئاوا باسی بکەن. ئینجا ڕۆیشت. عومەر گوتی ئەو غولامە هەڕەشەی کوشتنی لە من کرد. مانگی (ذی الحجة) بوو، سپێدەی بەیانییەکی زوو عومەر بۆ نوێژی بەیانی دەچووە مزگەوت ((مزگێت)) و هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر ریزیان بەستبوو، ئەو فەیرۆزەش لە ریزی پێشەوە ڕونیشتبوو و کێردێکی حەبەشی پێبوو. چەقۆیەکە هەردوو لای تیغ بوو دەسکەکەی لە نێوەڕاست بوو بۆ ئەوەی بە ڕاست و چەپدا بتوانێ بیوەشێنێ، ئەم جۆرە چەقۆیە تایبەت بوو بە خەڵکی حەبەشە. کاتی کە عومەر چووە ریزی پێشەوە، فەیرۆز یەکسەر ڕاست و چەپ شەش چەقۆی لێدا، لە قۆڵ و ورگ و چەقۆیەکی لە خوار ناوکییەوە دا، بەو برینەوە مرد. فەیرۆز لە نێو خەڵکەکە دەرپەڕی...)) بە ڕواڵەت وەك چۆن نیشانەکان دەریدەخەن هۆرموزان و چەند کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر دەستیان لە پیلانی کوشتنی عومەردا هەبووە. بەلعەمی دەڵێ کاتێ کە (عوسمان هاتە (مزگەوت) و خەڵك کۆبووەوە، یەکەمین کارێك کە کردی بانگی (عوبەیدوڵڵای کوڕی عومەر) ی کرد، عوبەیدوڵڵا لە هەموو کوڕەکانی تری عومەر لە پێشتر بوو، ئەو هورمزانە کە کابرایەکی ئێرانی بوو و لە ئەهوازەوە هێنابوویانە لای باوکی، (واتە لای عومەر) و ببووە موسوڵمان، بەڵام لەگەڵ مەسیحی و جووەکاندا هامۆشۆ و هەستان و دانیشتنی بەردەوامی هەبوو و هێشتا دڵی پاك نەبووەوە و فەیروزە کە عومەری کوشت مەسیحی بوو و ئەویش لەگەڵ هورمزان هاودەست بوو. غولامێکی (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص)یش بەناوی حەنیف (جفنە؟) هەرسێکیان لە شوێنێکدا دانیشتبوون، ئەبوبەکر کوڕێکی هەبوو بەناوی (عەبدولرەحمان) ئەو عەبدولرەحمانە برادەری عوبەیدوڵڵای کوڕی عومەر بوو و ئەو کێردەی کە عومەری پێکوژرا هی حەبەشە بوو، سێ ڕۆژ بەر لەوەی عومەر بکوژرێ،

عوبەیدوڵڵا گوتی بە بەردەرکەی ماڵی هورموزاندا ڕەت بووم دانیشتبوو و فەیرۆزی مەسیحی، غولامی موغەیرە کوڕی شوعبە و ئەو غولامە مەسیحییەی سەعد کوڕی ئەبی وەقاسیش لەویّ بوون و هەرسیّکیان پیّکەوە قسەیان دەکرد، کە من گەیشتمە لایان هەستان و ئەو کیّردە لەسەر پشتی فەیرۆز کەوتە خوارەوە.... ئەو ڕۆژەی کە فەیرۆز عومەری زامدار کرد لە مزگەوت هاتە دەر و رایکرد، پیاویّك لە تیرەی (بەنی تەمیم) گرتی و کوشتی و کیّردەکەی هیّنا. عوبەیدوڵڵا کیّردەکەی وەرگرت و گوتی من دەزانم فەیرۆز ئەو کارەی بە پیلان و بەرنامەی خۆی ئەنجام نەداوە، سویّندم بە خوا ئەگەر (میری باوەڕداران ) بەم برینە وەفات بکات، من کەسانیّك کە لەو پیلانەدا هاووەستیان کردووە دەکوژم، بۆیە ئەو ڕۆژەی کە عومەر بە برینەکەیەوە گیانی سپارد، عوبەیدوڵڵا کە لەسەر گۆڕی باوکی گەڕایەوە، چووە بەردەرکەی هورمزان و ئەوی کوشت و چووە بەر دەرکەی ماڵی سەعد و حەنیفەی کوشت. سەعد لە ماڵیّ هاتە دەر و گوتی بۆچی ئەو غولامەی منت کوشت؟ عوبەیدوڵڵا گوتی (بۆنی خویّنی میری باوەڕداران عومەر)ت لیّدیّ، تۆش نزیکی لە کوشتن. عوبەیدوڵڵا قژیّکی دریّژی پیّوە بوو کە تاسەر شانی دەهات، کە هەڕەشەی کوشتنی لە سەعد کرد، سەعد هەڵسا پرچی سەری گرت و لە عەرزی داو شمشیّری لە دەست دەرهیّنا و بە پیاوانی خۆی گوت لە ژووریّکی کەن تاخەلیفە دیاری دەکریّ و (قصاص) دەکات، جا کە عوسمان بوو بە خەلیفە یەکەمین کار کە کردی ئەوە بوو عوبەیدوڵلای لە ماڵی سەعد هیّنایە دەر و هاوەڵانی پیّغەمبەر دانیشتبوون، پیّیگوتن ڕای ئیّوە چییە و چی بکەین؟ علی گوتی پیّویستە لە تۆڵەی خویّنی هورمزان بکوژریّتەوە چونکە هورمزانی بەبیّ گوناح کوشت و ئەو پیاوە مەولای (عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب) بوو..... و فیّری قورئان و ئەحکامی شەرعییەت ببوو، بەنی هشام داوای تۆڵەی خویّنی ئەویان دەکردەوە * کە عەلی بە عوسمانی گوت دەبیّ عوبەیدوڵڵا بکوژریّتەوە (عەمر و کوڕی عاس) گوتی ئەو پیاوە باوکی کوژراوە، ئەگەر بیکوژن، دوژمنان دەڵیّن: خوای مەزن، کوشتن و ناکۆکی خستە نیّو هاوەڵانی پیّغەمبەرەوە، خوای گەورە تۆی لەم تۆوی دووبەرەکییە دوور کردۆتەوە، ئەوەش لە سوڵتانیەتی تۆ ناوەشیّتەوە. عوسمان گوتی ڕاست دەڵیّی، من ئەم پیاوە دەبەخشم و دیەی هورمزان لە گیرفانی خۆم دەدەم و دەستی لە عوبەیدوڵڵا هەڵگرت. بەمشیّوەیە، ئیّرانییەکان ئەو ستەم و زوڵمەی کە لە دەستی عومەر لە قادسیە و جەلەولا و نەهاوەند دیبوویان لە مەدینە لیّیان سەندەوە، هەروەها لە هەر شاریّکیش کە لە لایەن عارەبەکانەوە داگیر دەکراو دەکەوتە بەر هیّرش و پەلامارەوە، بەرگریکاران تا

بۆیان دەکرا بەرگریان دەکرد و تا بەتەواوی لە بەرگری و داکۆکی کردنیان بێئومێد نەبوویان ملیان بۆ پەلاماردەران کە لەگەڵ سادەیی سەربازیانەیان ڕەفتارێکی توند و دڵڕەقانەیان هەبوو، کەچ نەدەکرد. بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا کاتێ کە دوایین پادشای سەرگردانی بەد ئەنجامی ساسانی لە (مەرو) بە دەستی ئاشەوانێکی گومناو کوژرا و شازادە و گەورە پیاوانی ئێران پەرت و پەلا و بێ ناونیشان بوون، وردە وردە دوایین هەڵچوونەکان دامرکانەوە و بەرخۆدانە ڕەمەکی و بێ بەرنامە و بێ ئەنجامەکانیش کە لە هەندێ شارەکان لەلایەن ئێرانەییەکانەوە لە هەمبەر عارەبەکان ئەنجام دەدران هێواش هێواش کۆتاییان هات. عارەب بەسەر بارودۆخ و ڕەوشەکەدا زاڵ بوون. بەڵام هیچ شتێك پێکەنیناوی ترو سەیرتر و لە هەمانکاتدا زاڵمانە تر نەبوو لە ڕەفتاری ئەو داگیرکەرە توند و سادە دڵانە کە بەرامبەر شکستخواردووەکان پەیڕەویان دەکرد.

## ڕەفتاری غەزووکارانی عارەب

ئەو باس و بەسەرهاتانەی کە لە کتێبەکان باسکراون مایەی سەرسوڕمانن و بەڕاستی جێی حەسرەت و کەسەرن. سەرچاوەکان نووسیویانە کە فەرماندەی گرتنی سیستان (عبدالرحمن کوڕی سەمرە) دابێکی داهێنا کە ((نابێ دەڵەك و ژوشك بکوژن))[٦٢]، بەڵام گوایە مارمیلکە خۆرە برسییەکان نەیاندەتوانی چاو لە خواردنی گۆشتی دەڵەك و ژوشك بپۆشن. لە گرتنی مەدائینشدا عارەبەکان نموونەگەلێکی ناوایان لە سادەی و گێلۆکەیی خۆیان، نیشان دا. ((دەڵێن عارەبێك پارچە یاقوتێکی دۆزییەوە و کە تا بڵێی جوان و ڕەسەن بوو، بەڵام ئەو نەیدەناسی، کابرایەکی تری گەیشتێ کە نرخەکەی دەزانی و بەهەزار دەرهەم لێی کڕی. کەسێکی تر بەو مامەڵەیەی زانی و پێیگوت ئەو یاقووتەت بە هەرزان فرۆشت ئەو گوتی ئەگەر بمزانیایە لە دوای ژمارەی هەزار ژمارەیەکی تر هەیە، ئەوا داوای ئەوەم دەکرد.

یەکێکی تر هەندێ زێری سووری دەستکەوت و هاتە ناو سەربازەکان و هاواری کرد کێ زەردەم بە سپی لێدەکرێ؟ ئەو پێیوابوو کە زیو لە زێر باشترە. دیسان دەستەیەك لەو عارەبانە هەنبانێکی پڕ کافوریان دۆزییەوە وایان زانی خوێیە، کەمێکیان رشتە نێو مەنجەڵ و تامەکەی

---

٦٢- مؤلف مجهول: تاریخ سیستان، ل٨٥.

تاڵ بوو و هیچ تامی خوێی نەدا، ویستیان هەنبانەکە بڕێژن پیاوێك پێیزانی و ئەو هەموو کافورەی بە پارچە قوماشێك کە تەنها نرخەکەی دوو دەرهەم بوو لیٚ کڕین))[٦٣]

بەڵام دڕندەیی و ڕەقەکاریی هێزە پەلاماردەرەکان ئەو کاتە زیاتر دەرکەوت کە جڵەوی دەسەڵاتیان لەوڵات و هەرێمە داگیرکراوەکاندا گرتە دەست. لە میانی فەرمانڕەوایی و هەڵسوڕانی کاروبارەکان لەوڵاتە گیراوەکان بوو کە زەبوونی و بیٚ توانایی و لە هەمانکاتدا بەهانەگیری و دڕندەیی عارەبان باش دەرکەوت. ئەو باس و بەسەرهاتانەی کە لەو بوارە لە دوو توێی کتێبەکاندا تۆمارکراون، چاوچنۆکی و توندوتیژی ئەو عارەبە هێرشبەرە داگیرکەرانە، لە بەرامبەر دۆڕاوەکانی جەنگ نیشان دەدا. زۆرێك لەو باس و بەسەر هاتانە ڕەنگە هەر ئەفسانە بن، بەڵام لە هەمانکاتدا ڕەفتاری گاڵتەجاڕ و شێتانەی میللەتێکی سەرکەوتوو و داگیرکەر، بەڵام دوور لە فەرهەنگ و پەروەردە بە چاکی دەردەخا. دیرۆکنووسەکان نووسیویانە: عارەبێك دەکرێتە والی هەرێمێك، هەموو جوولەکەکانی ئەو دەڤەرەی کۆکردنەوە و لە بارەی مەسیحییەوە لێی پرسین، گوتیان لە دارمان داو کوشتمان. پێیگوتن خوێنبەهاکەیشتیان دا؟ گوتیان نەخێر. گوتی سوێند بە خوا لێرە نارۆنەدەر تا خوێنبەهاکەی دەدەن.... (ئەبولحاج) والی بەسرە بوو، پیاوێکی مەسیحیان هێنایە لایو لێی پرسی ناوت چییە؟ کابراکە گوتی (بنداد شەهر بنداد) گوتی سیٚ ناوت هەن و جزیەی یەك کەسیش دەدەی؟ فەرمانی دا کە بە زۆری جزیەی سیٚ کەسانی لیٚ بسەنن [٦٤]. دەتوانین زۆر نموونەی ئەو جۆرە بەسەرهات و باسانە لە کتێبە کۆنەکاندا ببینین. لە ئەمانە هەمووی بە چاکی دەردەکەویٚ کە عارەب بۆ بەڕێوەبردنی وڵاتێك کە دەستیان بەسەردا گرتبوو تا چ ئەندازەیەك دەستەوەستان و بیٚ توانا بوون. بەڵام دیسان زۆری نەبرد کە بەرخۆدانە ناوچەییەکانیش نەمان و عارەبەکان لەگەڵ هەموو بیٚ توانایی و دەستەوەستانێك کە هەیانبوو، بەسەر ڕەوشەکە دا زاڵ بوون و دوای ئەوە میحراب و منارەکان، جێی ئاتەشگا و پەرەسگاکانیان گرتەوە. زمانی (پەهلەوی) جێی خۆی دایە زمانی عارەبی. ئەو گوێیانەی کە بە بیستنی زەمزەمە و وێردی موغانە و سروودی شاهانە

---

٦٣- نخجوانی: تجارب السلف، ل٣٠.

٦٤- عیون الاخبار، ب١، ل-ل ٧٦-٧٧. هەر بەم شێوەیە داستانی ئەو عارەبەی کە حەجاج کردییە والی ئەسفەهان ئەو کەسانەی ئامادەنە بوون باج بدەن سەری بڕین و سەری خستنە ناو جۆرك ، بگەڕێوە بۆ مروج الذهب، ب٢، ل ١٦٠چاپ مصر و ئەم کتێبەی بەردەست.

ڕاهاتبوون، بە بانگی (تەکبیر) و زرنگانەوەی دەنگی بانگدانی پڕ حەماسەت ئاخنران. ئەو کەسانەی کە تەمەنێك بوو چێژیان لە گۆرانییە پڕ لە جۆشەکانی (باربد) و (نکیسا) وەرگرتبوو هێواش هێوش لەگەڵ بانگی (حدی) و زەنگولەی ملی وشتران ڕاهاتن. ژیانی پڕ باق و بریق، بەڵام هێمن و ئارامی خەڵك پڕ بوو لە غەوغا و هەراو هەنگامەیەکی زۆر. لە جێی باژ و بەرسەم و کستی و هوم و زەمزەمە، نوێژ و غوسل و ڕۆژوو زەکات و حەج وەکو دروشمە ئایینییەکان برەویان سەند[٦٥]. بەڵێ خەڵکی ئێران. لە وانە بترازێ کە کەوتبوونە ژێر کاریگەریی ڕێنوێنییەکانی ئیسلام بە چاوی ڕك و کینە و نەفرەتەوە سەیری عارەبانیان دەکرد. ئەو کینە و نەفرەتە لەلایەن جەنگاوەران و سوپاییەکانەوە تێکەڵ بوو بە هەستی بە پووچ و سووکگرتنی عارەبان، ئەو توێژە، عارەبیان بە پووچترین و نزمترین خەڵك دەزانین. ئەو گوزارەیەی خوارەوە کە لە کتێبە عارەبییەکاندا لەزاری خوسرەو پەروێز گێردراوتەوە، نموونەی بیرکردنەوەی جەنگاوەر و سوارانی ئێران دەربارەی عارەبەکان دەردەخات، خوسرەو دەڵێ: ((نە لە کاری ئایین و نەلە کاروباری دنیادا هیچ خەسڵەتێکی باشم لە عارەباندا نەبینیوە. ئەوان نەخاوەنی ئیرادەن و نە سەریان لە هیچ دەردەچێ و نە ئەهلی هێز و دەسەڵاتن. بۆ ئەوەی هیچ و پووچی و نزمی ئەوانت بۆ دەرکەوێ ئەوەندە بەسە کە ئەوان لەگەڵ جانەوەری گەزەندە و قەل و داڵی سەرگەردان و بێ جێ و مەکان یەکسان و بەرامبەرن، منداڵان لەبەر بێ نەوایی و بێ دەرامەتی و پێداویستی دەکوژن و لەبەر پاشقەڕۆیی و برسێتی یەکتری دەخۆن، ئەوانە لە هەموو خواردن و پۆشاك و چێژ و خۆشییەکانی ئەم جیهانە بە تەواوی دوور و بێ بەهرەن. باشترین خواردنێك کە دەتوانن وەدەستی بێنن. بریتییە لە گۆشتی وشتر کە زۆر لە گیانداراانی دڕندەش لە ترسی ئەوەی تووشی نەخۆشی نەبن و بە هۆی نەخۆشی و قورسییەوە نایخۆن...))

کەسانێك کە ئاوا لە بارەی عارەبان بیریان دەکردەوە بێگومان نەیاندەتوانی مل بۆ دەسەڵات و هەژموونی ئەوان کەچ بکەن. دەسەڵاتی عارەبان بۆ ئەوان هەرگیز مایەی یەکگرتن نەبوو. بە تایبەت کە زاڵبوونی عارەبان بەبێ تاڵان و بڕۆ و وێرانکاری و کوشت و کوشتار ئەنجام نەدراوە. زۆر شار و قەڵا لە ئەنجامی پەلاماری عارەباندا وێران بوون. زۆر بنەماڵە و خانەدانی مەزن لە نێو چوون. سامان و دارایی و خێر و بێری خەڵکی دەوڵەمەندیان تاڵانکرد و ناویان نا (غەنائم) و (ئەنفال). کچان و ژنانی ئێرانیان لە بازاڕی مەدینەدا دەفرۆشتن و ناویان نا

---

٦٥- عقدالفرید، ب٣، ل٥، چاپ قاهیره ١٣٥٩.

(سەبایا) و (ئوسەرا). باج و خەراجێکی زۆریان بە خورتی لە پیشەوەرو گەورەپیاوان دەستاند کە ئایینی ئیسلامیان قەبوڵ نەدەکرد و ناویان نا (جزیە). هەموو ئەو کارانەشیان لە ژێر سایەی شمشێر و قەمچی ئەنجام دان. لەبەرامبەر ئەو هەموو زۆرداریانەش کەسێك بە ئاشکرا توانای نارەزایەتی نەبوو. (حەدد و رەجم) و کوشتن و سووتان تاکە وەلامێك بوو کە عارەبەکان، بە تایبەت لە سەردەمی (ئەمەویە)کاندا بەرامبەر هەر جۆرە نارەزایەتییێك دەیاندایەوە.

## مەوالی و بەنی ئومەییە

حکوومەتی (بەنی ئومەییە) بۆ ئێرانیە ئازاد و خانەدانەکان قابلی بەرگەگرتن نەبوو، چونکە بنچینەکەیان لەسەر بە سووکگرتن و بچووك تەماشاکردنی خەڵکی ئێران و گەورە و بەرزتر بوونی عارەب دارێشتبوو. چین و توێژەکانی خوارەوەتریش زۆر بە زەحمەت دەیانتوانی بەرگەی بگرن، چونکە ئەوان نە لە خەلیفە و دارو دەستەکەی خۆشی و ئاسایشێکیان بینیوو نە دەمارگیریی و خۆشویستنی ئایینی دێرینی خۆیان لە بیر کردبوو. لە خۆڕا نییە کە لە هەر جێیەکدا سەرهەڵدان و ئاشوبێك دژی دەسەڵاتدارێتی بەنی ئومەییە رووی دەدا، ئێرانییەکان دەستیان تێدا دەبوو. توندوتیژی و دڵڕەقی عارەبان بەرامبەر شکستخواردووەکان بێ ئەندازە بوو. بەنی ئومەییە کە دەمارگیری و شۆڤێنییەتی عارەبیان لە مێشکدا خولی دەخوارد، حکوومەتی خۆیان لەسەر بنەمای (سیادەتی عارەب) بنیات نابوو. عارەب بە خۆهەڵکێشانێکی منداڵانە کە خەسڵەتێکی هەموو داگیرکەرێکە. موسوڵمانانی تری بە (مەوالی) یا کۆیلەکانی خۆی دەزانین و بە سووککگرتن و بێحورمەتییەك کە لەو نارەوایەدا هەبوو بەس بوو کە هەمیشە ئێرانییەکان بەرامبەر عارەبان ناویستەنی و کینەئامێز بهێڵێتەوە. بەڵام ئەو قەید و بەندانەی کە بەسەریاندا دەسەپێندران ئەو رك و کینە و نەفرەتەیان زیاتر و زەقتر دەکرد. بێدادی و گوشاری دەزگای حکوومەت زۆر مایەی نیگەرانی و نارەزایەتی خەڵك بوو. سیستمی حکوومەتی ئەرستوکراسیانەی بەنی ئومەییە، ئێرانییە ئازاد و نەژادییەکانی وەکو کۆیلەی کردراو لە هەموو ماف و کاروبارێکی مەدەنی و کۆمەڵایەتی بێبەش دەکردن و بەمشێوەیە سووکایەتی پێکردن و هەموو چەشنەستەم و و زۆرداریێك بەناوی (مەوالی)یەوە لکابوو. کەسێکی (مەوالی) نەیدەتوانی هیچ کارێکی نابرومەندانە بکات. مافی ئەوەی نەبوو چەك دروست بکات و سواری ئەسپ بێ. ئەگەر مەوالییێکی بە نەژاد ئێرانی، کچێکی بیابانشینی بێ ناونیشانی عارەبی بهێنابا و بیکردبابە ژنی خۆی، ئەوا قسەبەرێکی فیتنەچی

بەس بوو کە بە زمانلێدان و تێهەڵشێلانێك، تەڵاق و جیابوونەوە بەسەر ژنەکە و قەمچی و زیندان و تێهەڵدان بەسەر پیاوەکەدا پیادە بکات. حکوومەت و داوەریکردنیش لە هەموو جێیەکدا تایبەت بە عارەبان بوو و هیچ مەوالییێك نەدەگەیشتە ئەو جۆرە پلەو پۆستانە. (حجاجی کوڕی یوسف) زۆر منەتی بەسەر (سەعید کوڕی جەبیر)دا دەکرد کە یەکێك لە پارێزکارترین و هۆشیارترین موسڵمانی سەردەمی خۆی بوو، بەوەی ئەگەرچی یەکێك لە مەوالییەکان بوو ماوەیەك کردی بە قازی کوفە. لای ئەوان وەرگرتنی ئەو پۆست و پلە و پایە حکومیانە شایانی مەوالییەکان نەبوو، چونکە لەگەڵ بنەمای (سیادەت)ی خۆرسکانەی رەگەزی عارەب ناکۆك بوو. بەڵام ئەو رەوشە نەیدەتوانی بەردەوام بمێنێتەوە چونکە عارەب بۆ کاروباری وڵاتداری و چاودێریکردنی جیهان هەرگیز توانا و لێوەشاوەیی و ئەزموونی پێویستیان نەبوو.

## باڵاتریی ئێرانییەکان

ئەو (نەژادە باڵاترە) کە مەیدان و پانتایی بیر و کارکردنی هەرگیز لە مەیدانی جلیتبازی (ئەسپ و وشترەکانی) تێپەڕی نەکردبوو، بۆ بەڕێوەبردن و هەڵسوڕاندنی کاروباری ئەو وڵاتە پان و پۆڕ و فراوانانەی کە کەوتبوونە ژێر دەستییەوە نەیدەتوانی بە تەواوی چاو لە توانا و لێوەشاوەیی (مەوالی) بپۆشێ و پشتگوێیان خا. بۆیە بەناچاری باڵاتربوونی (مەوالی) زوو یا دەرەنگ دەرکەوت.

هەوەنتە نییە کە خەلیفەیەکی خۆپەرستی فیزلێدەری بەرزە فڕی ئەمەوی ناچار بوو ئەو رستە ناودارە دەربڕێ کە: (سەرم لەو ئێرانە سوڕماوە، هەزار ساڵ حکوومەتیان کرد و سەعاتێك پێویستیان بە ئێمە نەبوو، و ئێمە سەد ساڵە حکوومەت دەکەین و ساتێك چییە بێ ئەوان نەمانتوانیوە هیچ بکەین.)

بەڵام سەرباری ئەوەیش کە کەسانێك نەیان دەتوانی ئەو مەوالیانە لە سەر پۆست و پلەو پایە حکومییەکان ببینن، زۆری پێنەچوو کە ئێرانییەکان لە بوارەکانی ئایین و زانستدا پێگە و شوێنێکی شایستەیان بۆ خۆیان بە دەست هێنا.

وەك چۆن لە کۆتایی سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەمەویدا زۆربەی زانایانی ئایینی و زۆربەی دۆزگەرەکان و تەنانەت ژمارەیەکی زۆر لە بەڕێوەبەر و هەڵسوڕێنەرانی دەزگاکانی حکوومەت لە(مەوالی)یەکان بوون. مەوالی لە هەموو کاروبارەکانی حکوومەتدا دەستی باڵایان هەبوو.

بەم شێوەیە هۆش و توانا و زرنگی مەوالییەکان وردە وردە کارەکانی خستنە ژێر دەستی خۆیەوە، بەڵام عارەبەکان بەبێ کێشمە کێشی توند ئامادەنەبوون مل بۆ بەرز و باڵاتربوونی کۆیلە بە درەم نەکڕاوەکانی خۆیان، بدەن. ئێرانییەکان لەو کێشمە کێشانە دەرفەتێکیان بۆ ڕەخسا کە بەرزتر بوونی مەعنەوی و ماددی خۆیان بە سەر غەزووکارە سەرکەوتووەکاندا بسەپێنن. ئەوان نەك سەرەڕای ئەفسانەی (سیادەتی عارەب) لە بواری کاروبارە کارگێڕییەکاندا باڵاتربوونی خۆیان بە سەر غەزووکارەکاندا دەرخست، بەڵکو لە قەڵەمڕەوی جەنگ و سیاسەتیشدا باڵا دەستی خۆیان سەلماند.

بەڵام هەر لە سەرەتایی هاتنی ئیسلامەوە، خەڵکی ئێران نەفرەت و کینەی توندی خۆیان بەرامبەر دوژمنان و باج ستێنەکانی خۆیان ئاشکرا کرد. نەك هەر ئەوەی کە ئێرانییەك ساڵی ٢٣ی کۆچی ٦٤٤ ز عومەری کوڕی خەتابی خەلیفەی دووەمی بە خەنجەر کوشت، بەڵکو لەوە بە دواوەش هەر سەرهەڵدان و ئاشوبێك کە لە جیهانی ئیسلامدا ڕووی دابا، ئێرانییەکان لایەنی سەرەکی دەبوون تیایدا. نەفرەت لە عارەب و نارەزایی لە بەرامبەر بەد ڕەفتاری و دەمارگیریەتی بەنی ئومەییە ئەوانی ناچار دەکرد کە لە ڕاپەڕینی دژی خەلافەتدا بە شداری بکەن. وەك چۆن بیست هەزار کەس لەوانەی کە بەناوی (حەمرا)ی دیلەم لە کوفەدا دەژیان، ساڵی (٦٤ ك/٦٨٤ز) بانگهێشتی (موختار)یان بە بەڵێ وەڵام دایەوە کە دژی بەنی ئومەییە ڕاپەڕینی کرد.

ڕاپەڕینەکەی موختار بەلای ئێرانییەکانەوە دەرفەتێکی گونجاو بوو بۆ وەدەرنانی بەنی ئومەییە و عارەبەکان. لەو سەردەمەدا کوفە بە مەڵبەندێکی گرنگی ئێرانییەکان و شیعەکانی عەلی کە دوژمنایەتییەکی توندیان لەگەڵ بەنی ئومەییەدا هەبوو، دەژمێردرا. ئەو شارە مەڵبەندی خەلافەتی عەلی بوو، بۆیە ژمارەیەکی زۆر لە شوێنکەوتووان و هەوادارانی ئەوی تێدا نیشتەجێ ببوون. ژمارەیەکی زۆری سوپاییەکانی ئێرانیش لە پاشماوەکانی (سەربازانی شاهنشا) دوای شکستی جەنگی قادسییە لەو شارەدا مابوونەوە. ئەوانە ئەو دیلەمیانە بوون کە لە نێو سوپای ئێراندا خزمەتیان دەکرد و دوای جەنگی قادسییە ئیسلامیان قبوڵ کرد بوو، لە کوفەدا جێگیر ببوون.[٦٦] جگە لەوە کوفە لە نزیك حیرەدا بنیات نرابوو، وەك ئاشکرایە ئەو هەرێمە لە کۆنەوە لە ژێر چاودێری پادشاکانی ساسانیدا بوو. یادەوەری کۆشکی (خوەرنەق) و بەسەر هاتی نوعمان و مونزر هێشتا لە دڵی ئەو ئێرانیانەی کە لە دەوروبەری کوفەدا دەژیان هەر گەرم و

---

٦٦- بلاذري، فتوح اللبدان، ل٣٨٠.

زیندوو بوو. لەبەر ئەوە کوفە بۆ پێکهێنانی (مەڵبەندێکی یاخیبوون) دژی عارەبەکان بە شوێنێکی لەبار دەبینرا.

چەند ساڵێك دوای کارەساتی کەربەلا، ژمارەیەك لە شیعەکانی کوفە بە سەرۆکایەتی (سلێمان کوڕی سورەدی خوزاعی) و (موسەییب کوڕی نجبە ئەلفزاری) لە شوێنێکدا بە ناوی (عەین ئەلوەرد) بۆ تۆڵەکردنەوەی خوێنی (حوسێن کوڕی عەلی) ڕاپەڕین و لەو تەقسیرەی دەرهەق بە یارمەتی دانی ئیمام حوسێن کردبوویان تۆبەیان کرد و خۆیان بە (تەوابین) تۆبەکاران ناوەزد کرد. بەڵام کارێکیان پێنەکراو بە دەستی (عەبدوللای کوڕی زیاد) (٦٧ ك/ ٦٨٦ ز) پەرت و بڵاو کران و لە نێو بران.

## سەرهەڵدانی موختار

لەو سەر و بەندەدا (موختار کوڕی عوبەید سەقەفی) دەرکەوت. (تۆبەکاران )ی کە بە هۆی شکستی پێشوویان پەراگەندە ببوون، کۆکردنەدەو و جارێکی تر داوای تۆڵەی خوێنی حوسێنی کوڕی عەلی کردەوە. لەو هەنگاو و ئامانجەشدا سەرکەوت، چونکە بە زیرەکی و ژیرییێکی کەم وێنەوە توانی خەلکی نارەزا لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە. بە ماوەیەکی کەم دواتر زۆربەی بکوژانی ئیمام حوسێنی کوشتن و دەستی بە سەر کوفەدا گرت و تا سنووری موسڵی خستە ژێر قەڵەمڕەوی خۆیەوە. لێرەوە بوو کە عوبەیدوڵڵای کوڕی زیادی شکاند. عەبەیدوڵڵا لە شەڕێکدا کوژرا و سەری براویان بردەوە کوفە و لە وێشەوە ناردیانەوە مەدینە.

بەم شێوەیە موختار لە ژێر سێبەری بانگ هێشتکردنی خانەدانی پێغەمبەردا، دەسەڵات و باڵادەستییێکی تەواوی وەرگرت. بەڵام لە ڕاستیدا لای خانەدانی پێغەمبەرەوە هێندە مایەی متمانە نەبوو. عەلی کوڕی حوسێن نەفرەتی کرد و رازی نەبوو بە ناوی ئەوەوە بانگشە و دەعوەت بکات. (موحەمەد حەنەفییە)ش لە بانگەشەی ئەو پەشیمان بووەوە، بەڵام لە ترسی ئەوەی نەوەك بە تەنها بمێنێتەوە بکەوێتە داوی (ئیبن زوبیر) خۆی لە نەفرەت کردن و ڕەتکردنەوەی بوارد، کە لە دڵی خۆیدا بڕیاری لێدا بوو.[٦٧] بەڵێ هەنگاوەکەی موختار لە سایەی بانگەشەکردن بۆ خانەدانی پێغەمبەر و یارمەتیدانی (مەوالی)، وردە وردە پەرەی سەندو دارایی و خەڵکێکی زۆری کۆکردەوە. خەڵك ڕوویان تێکرد و هەریەکەیانی بە جۆرێکی تایبەت بانگ کرد. هەندێکی

---

٦٧- مسعودی: مروج الذهب، ب٣، ل٩٨-٩٩.

بۆ(ئیمامەت)ی محەمەدی کوڕی حەنەفییە بانگ دەکرد و لای هەندێکی تر بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە بۆ خودی خۆی فریشتەیەك دادەبەزێ و سروشی بۆ دێنێ.[٦٨] تەنانەت سەرچاوەکان نووسیویانە کە لە نامەیەکی دا بۆ (ئەحنەف) نووسیویەتی: (بیستوومە من بە درۆزن ناو دەبەن، بەر لە من هەموو پێغەمبەران ئاوا بە درۆزن زانراون خۆ من لەوان باشتر نیم.[٦٩] ئەو جۆرە بانگەشانە بوونە مایەی ئەوەی کە موسڵمانان رووی لێ وەربگێڕن و روو بکەنە ئیبن زوبێر و ئەوانی ترو تەنانەت شیعەکانیش وردە وردە لە دەوری تەکینەوە و بڵاوەیان لێکرد. ئەو موختار ناوە خۆی لە هەوادارانی پێغەمبەر دادەنا. باوکی لە جەنگ لەگەڵ ئێرانییەکاندا کوژرا بوو. (سەعد کوڕی مەسعود)ی مامی کە لە سەردەمی خەلافەتی عەلیدا ماوەیەك حوکمڕانی مەدائینی لە دەستدا بووە، گەورەی کرد بوو. هەروەها ئەو کاتەی کە ئەو لە جەنگی (خەوارج) چووە یارمەتیدانی عەلی، ماوەیەك مەدائین لە دەستی موختاردا بوو. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێ ئیمام حەسەن دەستی لە جەنگ کردن لەگەڵ (معاویە) هەڵگرت و هاتە لای سەعدی کوڕی مەسعود، موختار پێشنیازی ئەوەی کرد کە بینێرنە لای معاویە و رادەستی ئەوی بکەن،[٧٠] ئەوە بووە بیانوویەك کە شیعەکان دوای ئەوە هەمیشە موختار سەرکۆنە بکەن. بەهەر حاڵ لە هەموو سەردەمی خەلافەتی بەنی ئومەییەدا، موختار عیلاقە و لایەنداریێکی بۆ ئەوان لە خۆنیشان نەدا. لە ڕووداوی هاتنی (موسلیم کوڕی عەقیل)دا بۆ کوفە، تا ئامادەکاری بکا بۆ بە خەلافەت گەیشتنی حسێن کوڕی عەلی و دواتر گیران و کوژرانی ناوبراو، موختار دژی بەنی ئومەییە ڕاوەستا و گیرا و خرایە زیندانەوە. لە ڕووداوی کەربەلاشدا ئەو لە زینداندا بوو. کە لە زیندان ئازاد بوو، چووە مەککە و لەگەڵ ئیبن زوبێر کە بەتەمای بەرەنگاربوونەوەی ئەمەوییەکان بوو، ئاشنا بوو. دواتر چووە (تائف)ی زێدی خۆی. ساڵێك زیاتر لەوێ نەمایەوە و دیسان خۆی گەیاندەوە ئیبن زوبێر. لە ڕووداوی گەمارۆدانی مەککەشدا کە لە ساڵی ٦٤ ك / ٦٨٤ ز دا ڕوویدا یارمەتی ئیبن زوبێری دا، بەڵام ماوەیەك دواتر، دیسان ئیبن زوبێری بە جێهێشت و چووە کوفە و کەوتە هەوڵی ئەنجامدانی بەرنامەیەکی تازە. لەو کاتەدا کە ڕەمەزانی ساڵی ٦٤ بوو، شیعەکانی کوفە لە دەوری [(سلێمان کوڕی سورەد خوزاعی) مردووە لە (٦٥ ك/ ٦٨٥ ز)] بوون، بەڵام

---

٦٨- مسعودي: مروج الذهب، ب٢، ل٩٩.

٦٩- عقد الفرية، ب٦، ل٢٥٠، متبعة قاهرة.

٧٠- طبري رووداوی ساڵی ٤٠ك.

کارەکەیان هیچ پێشکەوتنێکی پێوە دیار نەبوو، عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد باش سەرکوتی کرد بوون. موختار نەیدەویست مل بۆ فەرمانی سەرکردەکانی شیعە کەچ بکات، بانگەشەیەکی تازەی دەست دایێ و خۆی بە نێردراو و نوێنەری (محەمەدی کوڕی حەنەفییەی کوڕی عەلی) ناساند. زمان پاراویی و دەربڕینی پوختە و گوفتاری جوانی ئەو، کە وەك کاهینە کۆنەکان بە پاڵفتەیی قسەی دەکرد، بووە هۆی بڵاوبوونەوەی بانگەشە و پەرەسەندنی نفووز و دەسەڵاتەکەی. لە بەر ئەوە ماوەیەك والی کوفە لە لایەن ئیبن زوبێرەوە کرابووە والی ئەوێ، ئەوی گرت، بەڵام کە ئازاد کرا هەوڵی دا دۆستایەتی لەگەڵ (ئیبراهیم کوڕی ئەلئەشتەر) کە یەکێ لە سەرانی شیعە بوو دروست بکات. ئیبراهیم یەکەم جار قبوڵی نەکرد، بەڵام موختار نامەیەکی بۆ نارد کە گوایە نامەکە نامەیەکی دروستکراوە و ناڕاست بوو و تیایدا محەمەد حەنەفییە داوای هاوکاری و یارمەتی لێ کرد بوو و موختاری بە متمانەدار و وەزیری خۆی ناساند بوو. ئیبراهیم کە ئەو نامەیەی خوێندەوە پێشنیازەکەی موختاری قبوڵ کرد و رازی بوو لەسەر هاوکاری کردنی ئەو. گەورە پیاوانی کوفە کە لە ژێرەوە مەیلیان بەلای ئیبن زوبێردا بوو، لە بەرامبەر شۆڕ و حەماسەتی مەوالی و (حمراء)ی دیلەمدا، کە هاوەڵ و پەیڕەوکارانی ئیبراهیم ئەشتەر بوون، بە پەسەندیان نەزانی دژی ڕاوەستن و هەنگاو و کاری ڕاپەڕینەکەی موختار پەرەی سەند، هێواش هێواش بێجگە لە کوفە، وڵاتی عێراق و ئازەربایگان و رەی و ئیسفەهان و چەند شاری تریش کەوتنە ژێر فەرمانی ئەو و هەژدە مانگ باج و خەراجی لەو وڵاتە وەرگرت. گەورە گەورەکانی کوفەش بە ناچاری، رەگەڵی کەوتن، بەڵام نە متمانەیان بەو کرد و نە لەبەر ئەوەی مەوالییەکانی هێنابووە نێوەوە لێی خۆش بوون، بەڵام موختار کە دەسەڵات و شکۆی خۆی لە یارمەتیدانی مەوالییەکان دەزانی گوێی نەدایە سکاڵا و ناڕەزایەتی گەورە گەورەکانی کوفە. جارێکیش ئەو کاتەی کە ئیبراهیم و لەشکرەکەی بۆ ڕاماڵینی لەشکرییەکانی شام چوو بوون، گەورە پیاوانی کوفە هەوڵیان دا دژی موختار ڕاپەڕن، بەڵام موختار ئاشتییەکی گورگانەی لەگەڵدا کردن و بە دزییەوە داوای ئیبراهیمی کردەوە. کە ئیبراهیم گەڕایەوە، گەورەکانی کوفە هەموویان کەوتنە سەردەست و پێی موختار و لەسەرجێی خۆیان دامرکان. دوای ئەوە موختار کەوتە سزادانی بکوژانی ئیمام حوسێن و ئەو کەسانەشی کە خۆیان لە هاوکاری کردنی ئەو بوارد بوو، تەمێ کردن. فەرمانی دا کە خانوو سەراکانیان وێران بکەن و بیانکوژن و لە نێویان بەن. ئەو ماڵ و سامانەش کە پێشتر دەدرایە ئەوان فەرمانی دا لەمەو دوا بدرێتە مەوالییەکان کە هاوەڵانی خۆی

بوون. ئەوە بووە هۆی ئەوەی کە عارەبەکان وازی لێبێنن و لە دەوری بتەکێنەوە و بچنە پاڵ دوژمنەکانییەوە.

لە ڕاستیدا، موختار مەوالییەکانی کە بەتایبەت لە کوفە ژمارەیان زۆر بوو، زۆر زۆر دڵنەوایی دەکردن و ئەوانی کە لە سەردەمی باڵادەستی سەرانی بەنی ئومەییەدا زۆر ستەم و سووکایەتیان پێکرا بوو، کردنە لایەنگر و هەواداری خۆی. سەران و کاردارانی بەنی ئومەییە کە شۆڤینیەتێکی توندی عارەبیان هەبوو، پێشتر دەرهەق بەو مەوالیانە سووکایەتی و ناڕەوایەکی زۆریان کردبوو. ئەوان بەر لەوە مەوالییەکانیان بە پێی پیادە بۆ جەنگ دەبردن و لە دەستکەوتەکانی جەنگیش هەرگیز بەشیان نەدەدان. موختار بواری پێدان سواربن و دەستکەوتی شەڕیشی پێ دەدان. بۆیە ئەوان بوونە پاڵپشت و یارمەتیدەری موختار، وەك چۆن ژمارەی مەوالی لە سوپای ئەودا چەندین بەرامبەری ژمارەی عارەبەکان بوون و لە هەشت هەزار سەربازی ئەو کە لە کۆتایی شەڕدا تەسلیمی (موسعەبی کوڕی زوبێر) بوون، یەك لە دەشیان عارەب نەبوون. دەڵێن ئۆردوی ئیبراهیم ئەشتەر ئەوەندە پڕ بوو لە ئێرانییەکان کە کاتێ سەردارێکی شامی بۆ دانوستان لەگەڵ ناوبراو هاتە نێو ئوردووەکەی، لەو شوێنەی کە گەیشتە نێو ئۆردووەکە تا گەیشتە لای فەرماندەی ئۆردووەکە یەك وشەی عارەبی چییە لە سەربازەکانی نەبیست. کاتێ کە ئیبراهیم ئەشتەریان سەرکۆنە کرد کە لە بەرامبەر دلاوەرانی حیجاز و شامدا چما ئەو بیانیانەی قیت کردوونەتەوە، ناوبراو بە دەنگێکی دڵنیا و ڕەزامەندانەوە گوتی هیچ کەس لەنەبەرد و شەڕ دژی شامییەکان لەمانەی لەگەڵ مندان بە ئەزموونتر و ڕاهاتووتر نییە، ئەمانە ڕۆڵەی سوار و مەرزەوانە فارسەکانن و من خۆیشم کەسێکی شەڕکەر و جەنگاوەرم. سەرکەوتنیش لە خواوەیە،[71] کەوایە چ جێی ترس و نیگەرانییە. بەڵێ ئەوە ببووە مایەی ترس و نیگەرانی و نەفرەتی عارەبەکان لە موختار، کە زۆربەی ژمارەی سەربازەکانی نێو سوپاکەی مەوالییەکان بوون.

بە پێی قسەی تەبەری، سەرانی کوفە کۆبوونەوە و دەستیان بە بەدگۆیی و خراپ باسکردنی موختار کرد کە ئەم پیاوە خۆی بە میری ئێمە داناوە، لە کاتێکدا ئێمە لێی رازی نین، چونکە مەوالییەکانی لەگەڵ ئێمەدا یەکسان کردووە و کردوونی بە سواری ئەسپ و هێستران، رزق و ڕۆزی ئێمەیان دەداتێ، بۆیە ئەو کۆیلانەی ئێمە پەیڕەوی لە فەرمانەکانی ئێمە ناکەن و دارایی هێتیم و بێوەژنان بە تالآن دەبەن.

---

٧١- دینوری: اخبار الطوال، ص٣٥٨.

کاتێ سەرانی عارەب ئەو پەیامەی خۆیان بە موختار گەیاند کە (ئێمەت بە هێنانە پێشی مەوالییەکان ئازار داوە، ئەوانت بە پێچەوانەی داب و نەریت، سواری چوار پێیان کردووە و بەشی دەستکەوتەکانی جەنگت کە مافی ئێمەیە، پێداون؟) موختار وەڵامی داونەتەوە کە(ئەگەر من واز لە مەوالییەکان بێنم و دەستکەوتەکانی شەڕ بدەم بە ئێوە، ئایا دێنە پاڵ من و یارمەتیم دەدەن لە شەڕ دژی بەنی ئومەییە و ئیبن زوبێر و لەو بارەیەوە دەتوانن سوێندم بۆ بخۆن و پەیمان نەشکێنن؟) بەڵام ئەوان وەڵامی ئەخێریان دایەوە، هەر بۆیە موختار دواجار لە بەرامبەر ئیبن زوبێردا، کەسەرانی کوفە و پیاوانی عارەب هاودەست و پاڵپشتی بوون، شکستیخوارد و کوژرا. زۆر قسەی جۆراو جۆر سەبارەت بە موختار و راپەڕینەکەی ئەو گوتراون و داوەری کردنیش لە بارەیەوە ئاسان نییە. سەرانی عارەب چ شیعە و چ سوننی تێڕوانینی باشیان لە بارەی ئەو نەبوو و ئەو هەنگاوەی هێنانە پێشی مەوالییەکانیان لە لایەن ئەوەوە ناپەسەند و پێچەوانەی مروەت داوەتە قەڵەم و بۆیە ئەویان بە درۆزن و فێڵباز و خۆپەرست و وڕێنەگۆ داوەتە قەڵەم. راستە کە رەفتاری ناو براو لەگەڵ سەرانی کوفە دوو ڕووانە بووە و لە سوود وەرگرتن لە ناوی محەممەدی حەنەفییە زۆر زیادەڕۆیی کردووە، بەڵام لایەنگری کردنی ئەو لە مەوالییەکان دەرس و پەندێکی گەورە و پڕ بەها بوو، هەم بۆ مەوالییەکان کە دواتر زاتی ئەوەیان وەبەرهات دژی عارەبەکان ڕابوەستن و هەم بۆ عارەبەکانیش کە بێهوودە و لە خۆڕا شەرەف و پاراستنی ئیسلامیان تایبەت بە خۆ دەزانی.[٧٢]

بەم شێوەیە، راپەڕینی موختار بۆ ئێرانییەکان بیانوێك بوو بۆ ئێرانییەکان کە توانای خۆیان دژی عارەبەکان تاقی بکەنەوە و بوارێکی لە بار بوو بۆ تۆڵە کردنەوە لە بەنی ئومەییە، بەڵام عارەبەکان کە نەیاندەتوانی راپەڕینی ئێرانییەکان بەرگە بگرن هەوڵیان دا لەو ڕووداوەدا مەوالییەکان بە تاڵانکردنیماڵی یەتیم و بێوەژنان تۆمەت بار بکەن. وەلێ لە راستیدا ئەو تۆمەتە تۆمەتێکی ناڕەوا بوو. ئەوە عارەبەکان بوون کە ماڵی یەتیم و بێوەژنانیان تاڵان و تاراج دەکرد نەك خەڵکی تر. سەردار و فەرماندەکانی عارەبەکان بوون کە پێداویستییەکانی ڕووخانی دەوڵەتی بەنی ئومەییەیان فەراهەم کرد. کاری سەرەکیان غەزوو کردن و جیهاد بوو، بەڵام لەو کارەیاندا مەبەستیان پێشکەوتنی ئایین نەبوو. ئەو کارەیان تەنها بە مەبەستی تاڵان و سوودی ماددی گرتبووە پێش. زۆر لە سوپایی و کارگوزاران بە هۆی چاوچنۆکی سەرۆك و

---

٧٢- دائرة المعارف اسلام، ب٣، ل٦ ـ ٧٦٥.

فەرماندەکانیانەوە هەژار ببوون. کاتێك دانراوێکی تازە لە شوێنی یەکێکی کۆنتر دادەنرا، دانراوی لابراوی دەست بەسەر دەکرد و بە پێی سزاو ئازاردان، هەموو ماڵ و داراییەکەی لێ دەسەندەوە. بەو شێوەیە بوو کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی بەنی ئومەییەدا (حەجاج) عێراق و (قوتەیبە کوڕی موسلیم)یش خۆراسانی، ئاگر تێبەردا. رادەی باج و خەراجەکان رۆژانە زیادیان دەکرد و بێدادی و ستەمکاریی ئەرك دارەکان لە وەرگرتنی داراییەکاندا، رۆژانە زیاتر و ئاشکراتر دەبوو. زۆر چیرۆك و بە سەرهاتی سەیر سەیر لە بارەی دڵ ڕەقی و زەبرو زەنگی کاردارانی حەجاج لە کتێبە مێژووییەکاندا باس کراون. ئەمەی خوارەوە نموونەیەکیانە: نووسراوە کە خەڵکی ئیسفەهان چەند ساڵێك بۆیان نەکراوە باجی بڕیار لێدراو بدەن. حەجاج، عارەبێکی پێ پەتی کردە والی ئەوێ و داوای لێکرد کە باج و خەراجی ئەوێ کۆ بکاتەوە. عارەبی کەلەبۆر کە گەیشتە ئیسفەهان زەمانەتی لە چەند کەسێك وەرگرت و دە مانگ مۆڵەتی دانێ. کە لە وادەی دیاریکراو باجەکەیان نەدا هەموو ئەو چەند کەسەی گرتن و داوای باجەکەی لێکردن، بەڵام ئەوان دیسان بیانوویان هێنایەوە. عارەبی ناوبراو سوێندی خوارد کە ئەگەر ئەو باجە نەهێنن سەری هەموویان ببڕێ، یەکێ لەوانە چووە پێش و گوتی لە سەرم دەن، ئاوی لێ نەخواردەوە لە سەریان نووسی (فلانی کوڕی فلانی، قەرزەکەی خۆیدا) ئینجا بڕیاریدا کە سەرەکەی بە دەرگەیەك هەڵواسن و مۆری لێ بدەن. دووەمین کەسیشیان بە چارەنوسی وی برد. خەڵك چارەیەکیان بۆ نەمایەوە، هەر چۆنێبێ ئەو هەموو باجەیان کە بەسەریاندا سەپێندرا بوو کۆکردەوە و دایان.[٧٣]

## حەجاج

قۆناغی حکوومەتی خوێنڕێژ و تۆقێنەری حەجاج لە عێراقدا سەراپای بە کارەسات و ستەمکاری تێپەڕی، بە سەرهات و ڕووداوی وا ترسناکیان لە سەردەمی حکوومەت کردنی ئەودا باسکردووە کە مایەی نەفرەت و سەرسامی هەر مرۆڤێکە. دەڵێن: (لە زیندانی ئەودا چەند هەزار کەس بەند کراو هەبوون، فەرمانی دەرکرد بوو کە لە جیاتی ئاو، خوێاوی تێکەڵ لەگەڵ ئاهەك و لە جیاتی خواردن تەپاڵەی تێکەڵ لەگەڵ تەرسی گوێدرێژیان دەرخوارد بدەن)[٧٤] تەمەنی حکوومەتەکەی ئەو لە عێراقدا بیست ساڵ درێژەی کێشا. لەو ماوەیەدا ئەو کەسانەی کە ئەو

٧٣- مروج الذهب، ب٣، ل١٦٠.

٧٤- تجارب السلف، ل٧٥.

کوشتنی ئەگەر بشێ قسەی مێژوونووسەکان باوەڕ بکەین پتر لە سەد و بیست هەزار کەس بوون. ئەمە جگە لە وانەی کە لە شەڕەکانی ئەودا کوژراون. مێژوونووسان نووسیویانە کاتێ مرد پەنجا هەزار پیاو و سی هەزار ژن لە نێو زیندانەکانیدا هەبوون،[٧٥] بۆی هەیە ئەو ژمارەیە زێدەڕۆیی تێدابێ، بەڵام ئەوەندە هەیە، کە قۆناغی حکومەتی ناو براو لە عێراقدا بۆ هەموو خەڵك بە تایبەت بۆ مەوالییەکان، بەدبەختییەکی گەورە بوو.

زۆر بەسەرهات و ڕووداوی سەیر و ترسناکیان لە بارەی حەججاجەوە باسکردوون. نووسیویانە کاتێ کە لەدایك بوو، مەمکی دایکی نەگرت، بە ناچاری تا چوار ڕۆژ خوێنی گیاندارانیان دەڕشتە ناو دەمییەوە. بە دروست کردنی ئەو ئەفسانەیە لە کەسایەتی ئەو منداڵەی کە چارەنووس وای دانا ڕۆژێك ببێتە فەرمانڕەوایەکی سەرسەختی عێراق، ویستویانە ئەژدیهایەکی خوێنمژ دروست بکەن. ڕاستی ئەوەیە کە سەرەتاکانی ژیانی ئەو روون نییە، گوتویانە کە لە تەمەنی لاوێتیدا مامۆستای فێرگە بووە. لە جەنگێکدا کە لە نێوان (عەبدولمالیك مەروان) و (مەسعەب کوڕی زوبێر) لە عێراقدا ڕوویدا، پەیوەندی بە خەلیفەوە کرد و لە تەك ئەودا چووە شام، دواتر لە لایەن ئەوەوە ئەرکی گرتنی مەککەی پێدرا و ئەوێی گەمارۆدا، لە سەر چیای (ئەبو قبیس) بە مەنجەنیق بەردی بە سەر شاری مەککەدا باراند تا گرتی و ئیبن زوبێری، کە پەنای بردبووە نێو (حەرەم) گرت و کوشتی. دوو ساڵ دواتر، کردیانە فەرمانڕەوای حکومەتی عێراق و ناردیانە ئەوێ، عێراق لەو سەردەمەدا تاوێك لە ئاژاوە و فیتنەی (خەواریج) ئاسوودە نەبوو. نارەزاکان بە تایبەت مەوالییەکان هەمیشە لەگەڵ خەواریجەکاندا هاوکاریان کردووە. ئەو کەسانەی هێشتا بە چاوی ئاشتیخوازانە ئیسلامیان نەدەبینی، زۆر زوو بۆی هەبوو، فریوی بانگەشەی ئەوانە بخۆن کە خەلیفەکانیان بە ناهەق دەزانی و دانی باج و خەراجیان بە خەلیفە بە پاڵپشتکردن و بەهێز کردنی ئەو دەزانی، حکومڕانێتی حەججاج لە عێراقدا بە زەبر و زەنگ و دڵڕەقییێکی بێ وێنە بەڕێوە دەچوو، هەژموون و باڵادەستی ئەو بەسەر خەڵکیدا بۆ خۆی قەمچی و سزادان و ئەشکەنجە یەك بوو.[٧٦] لەگەڵ گەیشتنی بۆ بەسرە، وتارێکی خوێندەوە کە دەربڕی

---

٧٥- مسعودي: التبية الاشراف، ل٣٧٥.

٧٦- سەرەڕای هەموو ئەوانە هەندێك لە توێژەران وەکو ویلهاوزن (WELHAUSEN) و لامس (LAMMENS)( بگەڕێوە : دائره المعارف اسلام، ب١، ل٢١٥ــ٣١٧) هەوڵیان داوە و گوتویانە کە لە

دڵڕەقی و توندوتیژیی ئەو بوو. حەججاج لەگەڵ ئەوەشدا کە باش خەواریجی دەم شکێن کردن، کەچی بە هۆی ئەو هەموو بێدادی و ستەمەی دەیکرد، هەمیشە تووڕەیی و نەفرینی موسڵمانانی بە دواوەوە بوو. ئەو سیاسەتی سەختگیری و توندی و دەمارگیرانەی نەژادی بەنی ئومەییەی دژی مەوالییەکان لە ماوەی حکوومەت کردنی خۆیدا بەو پەڕی دڵڕقییەوە پیادە کرد. مێژوونووسەکان نووسیویانە و دەڵێن نامەی بۆ کارداری خۆی لە بەسرە نووسی کە (نەبەتی)یەکان لە بەسرە دوورکاتەوە، چونکە ئەوانە بوونەتە مایەی فەساد و چەپەڵکاریی دین و دنیا. کارداری ئەمەوی فەرمانەکەی بە جێگەیاند و وەڵامی نامەکەی دایەوە و گوتی هەموواانم وەدەرنان جگە لەوانەی کە قورئان خوێنن یا کاری دەرس دانەوەی ئایینیان هەیە. حەججاج بۆی نووسییەوە کە: (لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم نامەیە پزیشکەکان بانگی لای خۆت بکە، پێیان بڵێ با پشکنینێکی باشت بۆ بکەن، ئەگەر هاتوو ڕەگێکی (نەبەتی)ت تیا بوو، با ببڕن) ئا بەم شێوەیە حەججاج سیاسەتی ڕەگەز پەرستانەی بەنی ئومەییەی لە سووکایەتی و بچووك دانانی مەوالییەکان بەو پەڕی توندییەوە جێبەجێ دەکرد. ئەو هەڵسوکەوتانە بوونە مایەی نارەزایەتی فراوانی خەڵك لە دام و دەزگای حکومڕانی ئەو. ئەوەندە لە ڕشتنی خوێن و پارە بەخشینەوە بە سەر کەسانی خۆی شوولی لێ هەڵکێشا کە (عەبدولمەلیك) خەلیفەی ئەمەوی لە شامەوە نامەی بۆ نارد و لەو دوو کارەدا سەر زەنشتی کرد.[77] دەزگای حکومڕانی ئەو پتەوکردنی دەسەڵاتی بە پێویست دەزانی کە بەو پەڕی توندی و دڵ ڕەقییەوە بەرهەڵستکاران لە نێو ببات و دۆست و هەوادارانی خۆی بەهێز بکا و پشتیوانیان بێت. بۆ ئەو مەبەستە پێویست بوو کە دەست لە ڕشتنی خوێن و سووتاندنی ماڵ و دارایی بەرهەڵستکارەکانی نەپارێزێ، بۆیە لە کۆکردنەوەی باج و خەراج و جزیە، ئەو پەڕی توندی و سەخت گیری بەکاردەهێنا.[78] جزیەی داهاتی سەرانە و خەراجی داهاتی زەوی و زاری (زمە خاوەن کتێب)ییەکان مادامە کە نەبوونە موسڵمان دەبوا بە پێی یاساگەلێکی تایبەت بیان دابا. لەبەر ئەوەی وردە وردە بڕی ئەو باج و خەراجانە بەرەو سەرێ هەڵدەکشان و خەڵکی توانای دانی ئەو هەموو پارەیان نەبوو، (زمە)ییەکان بۆ ئەوەی کە لە دەستی ئەو باجە سەپێندراوانەدا

---

بارودۆخی ئەوکات چارەی نەبووە کە دەبوایە توندبێت، بەلام بە هیچ شێوە. دڵرەق و بێبەزەیی نەبووە. لە هەمان کاتیشدا خۆی خاو وخلچی لە لاوازی و دوور دەگرت.

٧٧- مروج الذهب، ب٣، ل١٣٦.

٧٨- ابن خلکان، ب٣، ل٣٧٧.

قوتاریان بێت دەبوونە موسڵمان و وازیان لە کێڵگەکانی خۆیان دەهێنا و روویان دەکردە شارەکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حەججاج هێشتا داوای جزیە و خەراجی لێ دەکردن. کاردارانی حەججاج بۆیان نووسی بوو کە (داهاتی باج و خەراج رووی لە کەمی داوە، چونکە (زممە)ییەکان بوونە موسڵمان و شارنشین) حەججاج بۆ ئەوەی کە (داهاتی بەیتولمالی ئیسلام) کەم نەکات، فەرمانی دا نەهێڵن هیچ کەس لە گوندەوە بۆ شار کۆچ بکات و هەروەها فەرمانی دا کە بە زۆری جزیە لە موسڵمانی تازە بستێنن. پیاوە ئایینەکانی بەسرە زۆر بەو رەفتار و هەڵسوکەوتەی حەججاج پەست و دڵگران بوون و بۆ حاڵی ئیسلام گریان، بەڵام نە هەموو ئەو توندوتیژی و رێوشوێنانەی حەججاج دەوڵەتی ئەمەویانی لە رووخان پاراست و نەگریە و نیگەرانی پیاوە ئایینییەکان رك و تووڕەیی و نەفرەتی مەوالییەکانی دامرکاند. ئەو فشار و ئەشکەنجانەی کە لە لایەن حەججاج و دارو دەستەکەیەوە دەرهەق بە مەوالییەکان دەکرا، ئەوانی بەرەو تۆڵە کردنەوە هان دەدا.[79]

لەو سەرو بەندەدا یاخیبوونەکەی (عەبدولرەحمان کوڕی محەمەدی کوڕی ئەشعەث) کە دژی ستەمکارییەکانی حەججاج رابوو ڕوویدا. مەواڵی و نا موسوڵمانەکان کە لە دەستی ستەم و بێدادی حەججاج وە تەنگ هات بوون، وەکۆڵانان دەکەوتن و دەگریان و هاواریان دەکرد (ئەی محەمەدا، ئەی محەمەدا)، نەیان دەزانی چی بکەن و بچنە کوێ. بە ناچاری لە دژی حەججاج ڕەگەڵ کوڕی ئەشعەث کەوتن و بوونە هاوەڵ و یارمەتیدەری ئەو.[80]

## عەبدولرەحمان

سەرچاوە مێژووییەکان بە درێژی بە سەرهاتی سەرهەڵدان و دەرکەوتنی (عەبدوالرەحمان کوڕی محەمەدی کوڕی ئەشعەث)مردووە لە (٨٥ ك/٧٠٤ ز)یان نووسیووە. ناو براو یەکێ لە ئەشرافەکانی (قەحتان)بوو و لە لایەن حەججاجەوە حوکمڕانێتی زابلی پێسپێردرا بوو، حەججاج خوشکەکەی ئەوی کە ناوی (مەیمونە) بوو، بۆ محەمەدی کوڕی خۆی هێنا بوو، کاتێ حەججاج نامەیەکی توندی بۆ نارد کە (باج و خەراج لە خەڵك بستێنە و پەلاماری هیند و سند بدە و سەری (عەبدوڵلا عامر)م لە نزیکترین کاتدا بۆ ڕەوانە بکە. عەبدوڵلا کە خۆی بە پیاوێکی مەزن دەزانی و لە بیانووی سەرکێشی دەگەڕا. ئەو داوایەی حەججاجی قبوڵ نەکرد (بە نامە وەڵامی

٧٩- الامامة والسياسة، ب٣، ل٣٨.

٨٠- تاريخ سيستان، ل١١٤.

حەججاجی دایەوە کە پەلامار و دەست درێژی بۆ هیند و سند ئەنجام دەدەم، بەڵام بە ناهەق باج لە کەس وەرناگرم و خوێنی کەس بە ناهەق نارێژم). دوای ئەوە عەبدولرەحمان لەگەڵ لەشکرەکەی خۆیدا کە خەڵکی عێراق و دوژمنی حەججاج بوون، بوونە هاو دەست و هاوبەندی یەکتر. حەججاجیان ڕەتکردەوە و بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و شەڕکردن لە دژیدا بەرەو عێراق کەوتنە ڕێ. لە نزیك شوشتەر حەججاج شکا و بەرەو بەسرە رای کرد و لە وێشەوە چووە کوفە. لە نزیك (دێر ئەلجەماجم) لە ماوەی سەد ڕۆژدا، لە نێو دوو لەشکر هەشتا نەبەرد و پێکدادان ڕوویدا. سەر ئەنجام عەبدولڕەحمان تێکشکا، سوپاکەی تەفرو تونا بوو، خۆیشی رایکرد بۆ خوراسان.

سەبارەت بە ئاکامی کاری ئەو عەبدولڕەحمانە سەرچاوەکان نووسیوویانە کە لە بەرامبەر حەججاج شکستی هێنا، ڕایکردووە لە ڕێگای بەسرەو فارس و کرمانەوە چووە سیستان و (خەڵك ڕێگەیان پێدا لە سیستان بێنێتەوە)[81] بەڵام موغەزەل کوڕی موهەب و (محەمەد کوڕی حەججاج))وە دوایکەوتن، بۆیە ناچار بوو سیستان بە جێبهێڵێ و پەنا بباتە بەر (زەنبیل)لە زابلستان. کە چووە ئەوێ هەواڵیان دا بە حەججاج و حەججاج (عەمارە کوڕی تەمیم ئەلقەیسی (یالخەمی) بە نوێنەری نارده لای زەنبیل و ناوبراو لەگەڵ زەنبیل خەڵوەتی کرد و ڕاسپاردەکەی حەججاجی پێیەگەیاندن کە: لەشکری من نایێتە وڵاتی تۆ و هیچ ماڵ و دارایت لێ داوا ناکەم و ئاشتی و دۆستایەتی لە نێوانماندا بەر قەرار دەبێ بەو مەرجەی کە عەبدولڕەحمان ئەشعەث و فلانە کەس لە هاوەڵانی بۆ لای من بنێری. بەم شێوەیە زەنبیل، عەبدولڕەحمان و کەسەکەی تری گرتن، زەنجیریان بە پێکانیانەوە کردن، لە سەربانێکی بڵند دانران. عەبدولڕەحمان گوتی دەبێ من لە سەر ڕۆخی بانەکە بم، هەر دووکیان بردنە سەر لێواری بانەکە، ئینجا عەبدولڕەحمان خۆی لە بانەکە فڕێدایە خوار و هەر دووکیان پەرت بوون و مردن، ئەو هاوەڵەی عەبدولڕەحمان ناوی (ئەبو لعەنبەر) بوو.

زۆربەی ئەو کەسانەی لەو سەرهەڵدانەدا دژی حەججاج یارمەتی (ئیبن ئەشعەث)یان دا بریتی بوون لە پیاوانی ئایینی و جەنگاوەران و مەوالییەکانی بەسرە و عێراق. حەججاج ئەوانەی زۆر بەتوندی سزادان. مەوالییەکانی پەرش و بڵاوکرد و هەریەکەیانی بۆ گوندەکەی خۆی ڕەوانە کرد و ناوی ئەو گوندەی کە کەسەکەی بۆ ڕەوانە دەکرد لە سەر دەستی کەسەکە هەڵ دەکەند، تەنانەت ئەو پیاوە ئایینی و زانایانەش کە لەو ڕووداوەدا دژی حەججاج ڕاوەستا بوون، سزادران. (سەعید

---

٨١- تاريخ سيستان، ل١١٧، بلاذري، ل٤٠٧.

کوڕی جوبەیر) یەکێك لەوانە بوو، ناوبراو بە کەسێکی پارێزکـار و دورستکاری ئـەو سـەردەمە دەژمێردرا بە رادەیەك مایەی رێز و خۆشەویستی خەڵك بوو کە ئەگەرچـی عـارەبیش نـەبوو، بـە پێچەوانەی رێ و شوێن و دابی باو نوێژیان لە دواوە دەکرد. دەڵێن کاتێ ناو براویان دەستگیر کـرد و بردیانە لای حەججاج، لێیپرسی کاتێ تۆ هاتیتە کوفە، لەگەڵ ئەوەشدا لە عارەبان بترازێ هـیچ کەس مافی پێش نوێژی کردنی نییە، مەگەر من مۆڵەتی پێشەوایی کردنم پێت نەدا؟ گـوتی: بـا، دات. لێیپرسی (مەگەر تۆم نەکردە قازی هەر چەندە هەموو خەڵکی کوفـە دەیـانگوت جگـە لـە عارەبان هیچ کەس شایستەی ئەوە نییە ببێتە قازی؟) گوتی، با کـردت. دیـسان لێیپرسـی (ئایـا من تۆم لە ریزی هاودەم و هاونیشینەکانی خۆم کە هەموویان لە گەورە گەورەکانی عـارەب بـوون دانەنا؟) گوتی: با داتنام. حەججاج گوتی (کەوایە هۆی یاخیبوونی تۆ لە بەرامبەر منـدا چـییە؟) فەرمانی دا سەری ببڕن و بەم شێوەیە زۆربەی ئەو کەسانەی سزادان کە شان بەشانی ئیبن ئەشعەث دژی ئەو راوەستا بوون و لەو کارەیدا ئەوەندە بێ بەزەیی و توندوتیـژی بـەکارهێنا کـە خەلیفـەی ئەمەوی لە دیمەشق ناڕەزایەتی دەربڕی. بە تایبەت مەوالییەکان لەو کارەساتەدا زیـانێکی زۆریـان پێگەیشت.

یەکێکی تر لەو کەسـانەی دژی حـەججاج بەشـداری لـە راپەڕینەکـەی (ئەشـعەث) دا کـرد، کەسێکی مەوالیی بوو، بە ناوی (فەیرۆز). ئازایەتی و چالاکی ئەو پیاوە، حەججاجی زۆر نیگەران دەکرد. حەججاج گوت بووی، هەر کەسێك سەری فەیرۆزم بۆ بێنێ دە هەزار دەرهەمی دەدەمـێ. فەیرۆزیش دەیگوت (هەر کەسێك سەری حەججاجم بۆ بـێنێ سـەد هـەزار دەرهـەمی دەدەمـێ). سەرئەنجام دوای تێکشکانی ئیبن ئەشعەث فەیرۆز رای کردە خوراسان و لەوێ کەوتە دەستی (ئـیبن موهەب). ئیبن موهەب ناوبراوی ناردە لای حەججاج و حەججاج بە ئەشکەنجە و ئازارێکی سەخت کوشتی).[٨٢]

ئەو خوێن رێژی و ستەم و بێدادیانە، ئێرانییەکانی زیاتر بۆ یاخیبوون و سەرهەڵدان هـان دەدا. دەسـتپێکی سـەدەی دووەمـی کۆچـی روخـانی ئەمەوییـەکانی خێـرا کـرد. ئـەو راپـەڕین و سەرهەڵدانانەی کە عەلەوییەکان و بیانییەکان لە گۆشە و کەناری وڵات ئەنجامیان دەدا، دەوڵـەتی سەرەڕۆ و ستەمکاری بەنی ئومەییەی بەرەو هەڵدێری نەمان برد.

---

٨٢- المعارف، ل١١٥.

## سەرهەڵدانی زەیدی کوڕی عەلی

یەکێ لە ریسواییە بێوێنەکانی ئەمەوییەکان لەو سەردەمەدا، ئەو دڵڕەقی و توندوتیژی بوو، کە لە دامرکانەوەی راپەڕینی (زەید کوڕی عەلی کوڕی حوسێن) مردووە لە ساڵی (١٢٢ ك/٧٤٠ز) و (یەحیا)ی کوڕیدا ئەنجامیاندا. ئەو (زەید کوڕی عەلی)یە یەکەمین کەسی بنەماڵەی عەلی بوو، کە دوای رووداوەکەی کەربەلا دژی بەنی ئومەییە راپەڕی و کەوتە هەوڵی وەدەستهێنانی خەلافەت. ناوبراو ماوەیەك بە نهێنی خەریکی ئامادەکارییەکانی راپەڕین بوو و زەمینەی شۆڕشی فەراهەم دەکرد. لەو ماوەیەدا زۆر جار حەشارگەی خۆی لە ترسی دوژمنەکانی دەگۆڕی. جگە لە کوفە کە زەمینەی ئامانجەکانی خۆی تێدا ئامادەکرد بوو، ماوەیەکیش چووە بەسرە و لەوێشدا کەوتە کۆکردنەوەی هاوەڵان و رێکخستنی هاودەستەکانی. لەگەڵ ئەوەیشدا کاتێ وەختی دەستپێکردنی راپەڕینەکە هات، والی کوفە، بە شێوەیەك ئامادەکاریی سەربازی لە بەرامبەریدا کرد بوو، کە هاوەڵانی زید توانای خۆڕاگریان نەما و لە دەوری تەکینەوە و پەرتەیان لێکرد. سەرچاوەکان سەبارەت بە سەرهەڵدانی ئەو نووسی بوویان (زەید بەردەوام خولیای خەلافەتی لە سەردا بوو، بەنی ئومەییە ئەوەیان دەزانی بۆیە (هشام)ی خەلیفەی ئەمەوی، زەیدی بە لایەنگری کردنی (خالد کوڕی عەبدڵڵای ئەلقەسری)، فەرمانڕەوای پێشووی کوفە کە هیشام دەست بەسەری کرد بوو، و (یوسف کوڕی عومەر)ی لە جێی ئەو دانا بوو)[83] تاوانبار کرد بوو، نامەی بۆ نارد کە بچێتە لای (یوسف کوڕی عومەر)ی فەرمانڕەوای کوفە، زەید چووە کوفە و یوسف لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کرد، زەید دانی بە تۆمەتەکە دانەنا، یوسف سوێندی داو ئیزنیدا. زەید کوفەی بەجێ هێشت و رێی مەدینەی گرتەبەر. کوفەییەکان چوونە پێشی و پێیان وت سەد هەزار پیاوی شمشێر بەدەستمان هەیە کە هەموویان ئامادەن گیانیان لە خزمەتی تۆدا ببەخشن، بوەستە تا بەیعەتت پێوە بکەین و بەنوی ئومەییە لێرە ژمارەیان کەمە و ئەگەر تەنها عەشیرەتی ئێمە بیەوێ دەتوانێ تەفر و تونایان بکات جا چ بگات بە هەموو عەشیرەتەکانی تر. زەید گوتی من لە بێوادەیی و غەدری ئێوە دەترسم، دەزانن چیتان لەگەڵ حسێنی باپیری مندا کرد، وازم لێبێنن من دەرەقەتی ئەو کارە نایەم. ئەوان سوێندیان بە خوای گەورە بۆ خوارد و وادە و پەیمانی راشکاوانەیان پێدا و زۆریان خۆ فش کردەوە و زیادەڕەوییان کرد. زەید هاتەوە کوفە و شیعەکان دەستە دەستە بەیعەتیان پێکرد جگە لە خەلکی مەداین و بەسرە و (واسط) و موسڵ و خوراسان.

---

٨٣- عیبارەتی نێوان دوو قولاب لە نێو کتێبی کە ئەسڵ لێی وەرگیراوە نییە بۆ روونکردنەوە و هاوپێچ کراوە.

که کارەکە تەواو بوو، ئینجا بانگەشەکەی خۆی ئاشکرا کرد. یوسف کوڕی عومەر کە لـە لایـەن بەنوی ئومەییە فەرمانڕەوای کوفە بـوو، لـە شـکرێکی کـۆکردەوە و شـەڕێکی گـەورەیان کـرد و سەرئەنجام لەشکری زەیـد شـکاو بـڵاوەی کـرد، ئـەو خـۆی لەگـەڵ ژمارەیـەکی کـەم مایـەوە و نەبەردێکی سەختی کرد، تا لـە پـڕ بـە تیرێـك کـە بـەر تـەوێڵی کـەوت، و کـوژرا هاوەڵـەکانی تەرمەکەیان ناشت و ئاویان بەردایە سەر شوێنی ناشتنەکە تا گۆڕەکەی نەدۆزنەوە و تەرمەکەی لە گۆڕ دەرنەهێنن. یوسف کوڕی عومەر هەوڵی دا تا گۆڕەکەی دۆزییەوە و تەرمەکەیان هێنایـە دەر و فەرمانیدا هەڵی بواسن، دواتر بە ئاگر سـووتاندیان و خۆڵەمێـشەکەیان فڕێدایـە نێـو ڕووبـاری فوڕات.[٨٤] دوای لە داردانەکەی سەریشیان بۆ دیمەشق و لەوێشەوە بۆ مەککە و مەدینە برد. یەکێ لەو هۆکارانەی کە بەنی ئومەییە بە ئاسانی توانیان هاوەڵانی زەید تێك بشکێنن ئەوە بوو، کە لە نێو پەیڕەوانی ئەودا یەکێتی وتە و بیرکردنەوە نەبوو، تەنانەت لە نێو ئەوانـدا کەسـانێکی زۆر لـە خەواریج و ئەوانەی هیچ مەبەستی یارمەتیـدانی ئـەویان نـەبوو هـەبوون، سـستی و لێبـوردەیی خەڵکی کوفە و وردبینی و زەبت و ڕەبتی جاسووس و پیاوەکانی بەنوی ئومەییـەش یـەکێکی تـر بوو لەو هۆکارانەی کە بووە مایەی شکستی زەید و سەرکەوتنی بەنوی ئومەییەکان.[٨٥]

## یەحیا کوڕی زەید

دوای زەید یەحیای کوڕی لە خوراسان ڕاپەڕی، بەڵام ئەویش وەکو باوکی کوژراو بە کوشـتنی ئەو جارێکی تر دەستی بەنی ئومەییە بە خوێنی بێتاوانێکی تر ئاڵودە بوو، ئەو یەحیایە هەر لـەو کاتەی باوکی بە هاوکاری کوفییەکان دژی بەنی ئومەییـە ڕاوەسـتا، گیـانی خـۆی لـە کوفـە لـە مەترسیدا بینی، بۆیە کەمێك دوای کوژرانی باوکی بە نهێنی لـە کوفـە هـەڵات و لەگـەڵ چـەند کەسێك لە هاوەڵەکانی چووە خوراسان. لـە (سـەرخەس)، خـەواریج کـە لەگـەڵ بـەنی ئومەییـە نێوانیان ناخۆش بوو، هەوڵیاندا لەگەڵی ڕێك بکەون و پێکەوە دژی بەنی ئومەییە ڕاپـەڕن، بـەڵام هاوەڵەکانی یەحیا لێ نەگەڕان هاوپەندی لەگەڵ ئەوانـدا بکـات و بـۆ بـەڵخ چـوو. لـەوێ کەوتـە

---

٨٤- تجارب السلف، ل٨١ـ٨٣.

٨٥- بۆ زانینی دەنگوباسی زەیدی کوڕی عەلی جگـە لـە یـەعقوبی، تەبـەری، مـەقریزی، مقاتـل الطـالبین، بگەڕێوە بۆ عمدة الطالب ل١٣٠، رازی: تبصره العوام، ل١٨٧. بغدادی: الفرق بین الفرق، ل٣٥. بیـان الادیـان، ل٣٤. الملل و النحل شهرستانی، ل١١٦، چاپی کورتن و چەندین کتێبی تر.

ڕێکخستنی کاروبارەکانی خۆی و لایەنگرەکانی لە دەوری کۆبوونەوە. یوسف کوڕی عومەر کە زەیدی کوشت بوو، لە یەحیا دەترسا، کە دیتی یەحیا لە خوراسان جموجوڵی هەیە و کارەکەی پەرەی سەندووە نامەی بۆ والی خوراسان کە ئەو دەم (نەسر کوڕی سەییار) بوو، نارد کە یەحیا بگرێ. نەسر داوای لە فەرمانڕەوای بەڵخ کرد و ئەویش یەحیای گرت و بۆی نارد. نەسر کوڕی سەییار، یەحیای لە (مەرو) خستە زیندان، بەڵام (وەلید کوڕی یەزید)ی خەلیفەی ئەمەوی کە لە شوێنی هیشام ببووە خەلیفە، نامەیەکی بۆ نەسر نارد و فەرمانی پێدا کە یەحیا ئازار نەدا و ئازادی بکات. نەسر ئازادی کرد و دڵنەوایی دا، بۆ لای خەلیفەی بەڕێ کرد، بەڵام لە ژێرەوە فەرمانی بە حوکمڕانەکانی ویلایەتی خوراسان کە بریتی بوون لە سەرخەس، گوس و ئەبەرشەهر (نیشاپور)دا، ئازادی نەکەن و هەر لە خوراسان بمێنێتەوە. کە یەحیا گەیشتە (بەیهەق) لە ترسی یوسف کوڕی عومەر، وای بە چاك زانی نەچێتە عێراق و هەر لە خوراسان بمێنێتەوە، هەر لە وێش مایەوە و دەستی بە خەبات و بانگەشەکاری خۆی کردەوە. سەد و بیست کەس بەیعەتیان پێوە کرد. بەو ژمارە کەمە بە سەر ئەبەر شەهری دادا و بەسەر عەمرو کوڕی زرارەدا کە فەرمانڕەوای ئەو شارە بوو سەرکەوت. دوای ئەوە چووە (هەرات) و (جوزجانان) و لەوێ ژمارەیەکی تر لە خەڵکی خوراسان پەیوەندیان پێوە کرد، بەڵام ماوەیەك دواتر لەگەڵ ئەو لەشکرەی کە نەسر کوڕی سەییار بۆ نەهێشتنی ئەو نارد بووی ڕووبەڕووبوونەوە. شەڕێکی سەخت و خوێناوی ڕوویداو یەحیا و هاوەڵەکانی کوژران (ڕەمەزانی ساڵی ١٢٥ کۆچی) سەری براویان بۆ دیمەشق برد و لاشەکەشیان بە دەروازەی شاری جۆزجاناندا هەڵواسی. تا ئەو ڕۆژەی کە هاوەڵانی [(ئەبو موسلیم) مردووە لە (١٣٧ ك/٧٥٥ ز)] دەستیان بەسەر خوراسان داگرت، تەرمەکەی هەر بە دارەوە بوو، کوشتنی یەحیا کە پێدەچێ ئەو کات، تەمەنی لە هەژدە ساڵ زیاتر نەبووبێ و ڕەفتاری نامرۆڤانەیان کە بەرامبەر تەرمەکەیان کرد، شیعەکانی خوراسانی زۆر دڵگران کرد،[86] بۆیە (ئەبو موسلیم)ی ڕێبەری ڕاپەڕین زۆر سوودی لەوە وەرگرت و بەڵێنی بەو کەسانە دەدا کە بەیعەتیان پێوە دەکرد، تۆڵەی خوێنی یەحیا لە بکوژەکانی بسێنێتەوە. لە ڕاستیدا خوێنی یەحیا وەکو خوێنی (ئیرەج) و (سیاوەش) بووە بیانوو بۆ شەڕەکان و زۆر لە خەڵکی خوراسانی بۆ رك و تۆڵە سەندنەوە دژی بەنی

---

٨٦-لە بارەی یەحیا کوڕی زەید و ڕاپەڕینەکەی جگە لە تەبەری مەسعودی، یەعقوبی مقاتل الطالبین ابوالفرج اصفهانی و تاریخ گزیدەء حمدالله مستوفی سەیر بکرێ. بۆ توێژینەوە ڕۆژئاواییەکان بگەڕێوە بۆ وتاری ( C ) Ban Arendonkلە دائرە المعارف اسلام، ب٤.

ئومەییە یەکخست، کاتێ کە ئەبو موسلیم دەستی بەسەر جۆزجانان داگرت، بکوژەکانی یەحیای کوشتن و تەرمی یەحیای لە سەر دار هێنایە خوار و ناشتی. خەڵکی خوراسان حەفت ڕۆژ پرسەیان بۆدانا و لەو ساڵەدا وەك (مەسعودی)باسی کردووە، هیچ منداڵێك لە خوراسان لە دایك نەبوو، کە ناوی یەحیا یان زەیدی لێ نەنرێ.[87] ئەو هەموو ستەمکارییەی کە بەنی ئومەییە و داروودەستەکەیان ئەنجامیان داوە. موسوڵمانان بە تایبەت مەوالییەکانی لەوان پەست و دوور دەخستەوە، بەڵام ئەوەی کە ئەوانی بەرەو ڕۆخی هەڵدێری نەمان ڕاکێشا، ئەو دەمارگیری و ناکۆکییە توندە بوو، کە لە دێرزەمانەوە کەوتبووە نێوان یەمەنی و موزەرییەکان و لە دوایین ڕۆژگاری تەمەنی بەنی ئومەییەدا شەڕ و پێکدادانی بنەماڵەیی لە نێو خەڵکدا لێکەوتبووەوە. دوژمنایەتی نێوان دوو خێڵ لە مێژووی عارەبدا پێشینەیەکی درێژی هەیە، بەڵام بێ ئەقڵی و سەرەڕۆیی وەلیدی کوڕی یەزیدی خەلیفەی ئومەییەکان لەو کاتەدا ئەو دوژمنایەتییەی نوێ کردەوە. خالیدی کوڕی عەبدوڵڵای قەسری کە کەسێکی یەمەنی بوو لە سەردەمی یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیك و هیشامی برایدا ماوەیەك لە عێراقدا فەرمانڕەوایی کرد بوو. یوسف کوڕی عومەری سەقەفی کە دوای ئەو کرا بە فەرمانڕەوای عێراق، هەوڵی دا کە دەست بەسەری بکات و ماڵ و داراییەکەی بە زۆری لێ بستێنێ، بەڵام هیشام ئەگەرچی لە خالید بەد گومان بوو، کەچی ڕازی نەبوو یوسف ئازار بدات. کە نۆبەتی خەلافەت بە وەلید گەیشت، خالیدی سپاردە یوسف و خالید ئەوی بۆ کوفە برد، بە ئەشکەنجە و ئازارەوە کوشتی. یەمەنییەکان خڕبوونەوە و بەگژ وەلید داچوونەوە. وەلید موزەرییەکانی بۆ بە گژداچوونەوەی ئەوان ڕێکخستن. لە شەڕێکدا کە لە نێوان هەردوولا هەڵگیرسا، موزەرییەکان شکان. یەمەنییەکان چوونە دیمەشق و محەمەدی کوڕی خالیدیان ئازاد کرد، کە وەلید گرت بووی، دواتر یەزید کوڕی وەلیدی ئامۆزای وەلیدی خەلیفەیان لە شوێنی ئەو دانا و وەلیدیان بە شێوەیەکی دەردناك کوشت.[88]

## ڕووخانی ئەمەوییەکان

بەم شێوەیە، کارو باری خەلافەت تووشی بێ سەر و بەری توندوتیژی و کێشمەکێشی نێوان یەمەنی و موزەرییەکان بوو، چونکە موزەرییەکانیش ماوەیەك دوای مردنی یەزید کە لە شەش

---

٨٧- مروج الذهب، ب٣، ل١٨٥.

٨٨- دینوری: اخبار الطوال، ل٣٩٨.

مانگان زیاتر خەلافەتیان نەکرد، مەروان کوڕی محەمەدیان کردە خەلیفە و جارێکی تر یەمەنییەکانی تووشی زەبوونی کردەوە.

ئەو سەروبەرییە بووە مایەی لاواز بوونی دەوڵەتی بەنی ئومەییە. بە تایبەت کە لە خوراسانی مەڵبەندی بانگەشەی عەبباسییەکان، لەبەر ئەو کێشمەکێش و ناکۆکییە ناوخۆییە، بەنی ئومەییە بواری سەرکوت کردنی دژبەرەکانی خۆیان نەبوو. دەنگی تەپڵ و شەیپوری سەرهەڵدان دەزرنگایەوە و دوژمنانی بەنی ئومەییە هەرچەند ساڵ جارێك لە گۆشە و کەناری وڵاتدا راپەڕین و سەرهەڵدانیان دەکرد. رووخانی بەنی ئومەییە پرسێکی حەتمی و بڕاوە بوو.

خوراسانی لانکی ئەفسانە قارەمانییەکانی ئێران، کە لە ناوەندی حکوومەتی عارەبی دوورتر بوو، لە هەموو شوێنێکی تر بۆ شۆڕش و ڕاپەڕینی ئێرانییەکان گونجاو تر بوو، بۆیە کاتێ هێز و دەسەڵاتی بەنی ئومەییە بەرەو نەمان دەچوو، بانگەشەی عەبباسییەکان لە وێدا لایەنگر و هەواداری زۆری بۆ خۆی راکێشا.

بانگەشەی ئەبو موسلیم لەو هەرێمەدا، بە گەرم و گوڕی و حەماسەتێکی زۆرەوە پێشوازی لێکرا. کەسانێك کە لە دەستی زوڵم و ستەمی عارەباندا وەتەنگ هات بوون، ئەو ڕاپەڕینەیان بە مژدەی ئازادبوونی خۆیان لێکدایەوە. نەسری کوڕی سەییار کە لە خوراساندا ئەو بارودۆخەو ڕەوشەی بە چاوی خۆی دەبینی، لە پەراوێزی نامەیەکیدا کە بۆ مەروانی دوایین خەلیفەی ئومەییەکانی نارد، بە روون و ئاشکرا نیگەرانی خۆی سەبارەت بە پەرەسەندنی ڕاپەڕینەکەی ئەبو موسلیم دەربڕی و بە تووڕەبوون و حیرسەوە دەنووسێ: (من تروسکەی ئاگرێك لە نێو خۆڵەمێشدا بە چاوی خۆم دەبینم و ئەو پروشانەی ئاگر بە زووی گڕ دەگرن، دوو چڵە دار، ئاگرێك دادە گیرسێنن و هەمیشە قسەیە کە دەبێتە پێشەکی کردار. من بەو پەڕی سەرسوڕمانەوە هەمیشە لە دڵی خۆمدا دەڵێم خۆزگە دەمزانی داخۆ بەنی ئومەییە بە ئاگان یان خەوتوون؟)[89]، بەڵام بەنی ئومەییە لە خەودا بوون: خەوی خەفڵەت و لە خۆبایی بوون، کە هەمیشە دەوڵەتە ستەمکار و سەرەڕۆکان بەرەو هەڵدێری نەمان رادەکێشێ. ڕاپەڕینی ئەبو موسلیم بوو کە ئەوانی لەو خەوە خۆشەدا راچڵەکاند و بناغەی خەلافەتی ئەمەوی بۆ هەتا هەتایە پێچایەوە.

---

٨٩- تاریخ یعقوبي، ب٣، ل٧٩.

## نەوا دێرینەکان

ڕۆژگارانێك کە باربەد و نەکیسا بە دەنگوئاوازەکانی پەهلەوی و گۆرانی خەسـرەوانی، دەرو دیوارەکانی کۆشکی ساسانیان پڕکردبوو، زمـانی عـارەبی لـەدەروونی فـەرمانڕەوایانی بیابانـە وشك و برینگ و بێ ئاوەکان وشکترو بێ بەرتر و بێ سوودتربوو.

لەسەرانسەری ئەو بیابانە وشکانەدا ئەگەر دەنگ و هاوارێ هاتبایە، دەنگی سروودی شیرك و تالآن و ڕێگری و کوشتاربوو، ئەئامۆژگاری و پەندێك، ئەحیکمەت و داهێنانێك لـە زمانیـان دەردەچوو، ئەواژە و ئاوازێکی خۆشەویستی بەسەر لێوەکانیانەوە دیاردەبوو.

شیعرەکانیان تەنیا باسـی پـشکلی وشـتر بـوون، وتـار و گوفتارەکانیـشیان هـانی شـەڕ و کوشتاریان دەدا، ڕاست پێچەوانەی ئێران (گەلانی ئێرانی ئەوکات) کە زمانیان هـەمووی هـەر مانای زانستی و زانایی و ئامۆژگاری کردن و وشەکانیشیان دڵنەوازو دلگیر و کتێبە ئـایینی و سروودەکانی ئاسمانییەکانیان زەمزەمـەدەکرد، چیرۆکە شـیرینەکانی پاشـایانی ڕابردوویـان لـە (خوداینامە)کاندا دەخوێندەوەو، هەرچین و توێژێك زمـان و خـەتی تایبـەتی یـان هـەبوو، لـە دەرباری پاشاکانا زمانی خوزی، فارسی، دری هەرکام شوێن و جێگای خۆی هەبوو.[٩٠] سـروودە جوان و خۆش و دلگیرەکان ڕێزو پاداشتیان بەدواوەبوو. هەرچەندە شیعری عەرووزی بەوشـێوەی کە لە دوای ئیسلام ڕەواجی پەیاکرد، لەو کات و سەردەمدا باوی نەبوو، بەڵام سروود و هۆنراوە لە ئێرانی پێش ئیسلامدا لە شیعری (نەفامی، جاهلی) عارەب پوختـەتر ڕەوانـترە ، ناوبـانگی ئاوازخوێنانی بەناو و ناسراوی وەك (باربەد و نەکیسا) خوی لەخۆیـدا بـاس لەهـەبوونی شـیعر بەزمانی پەهلەوی دەکات.

هەڵبەتە هیچ ئاوازو مۆسیقایەك بەبێ شیعر نابێ و بەئەنجام ناگـات، بۆیـە دەتـوانین بڵـێین نەوا و لاواندنەوەی ئاوازخوێنان جورێك شیعر بوون، نموونەی ئەم جـۆرە شـیعرانە توێـژەران لـە

---

٩٠- لە هەندێ لە کتێبەکاندا لە زاری عەبدوڵلا بـن موقەنەعـەوە گێڕدراوەتـەوە کـە پادشـاکانی ئێـران لـە کۆڕەکانی خۆیاندا بە زمانی پەهلەوی قسەیان دەکرد، بەڵام کە تەنیا بوان لەگـەڵ گـەورە و سـەرانی وڵات بـە خوزی دەدوان. هەروەها دانیشتوانی دەڤەرەکانی مەدائن و ئەوانەی لە دەرباربوون زمانیان (دەری) بووە و موبد و پەیرەوکارانیان بە فارسی دەپەیڤین. بگەڕێوە: الفهرست، چاپی میسر ل١٩، یاقوت ب٤، وشەی (فـەهلو)یـان (پەهلەو) یان (فەیلی) حمزەی ئیسفەهانی: (التنبیة علی حدوث التصحیف).

پارچەکانی پەهلەوی بەناو (درەختی ئەسوریك، یادگاری زەریران) و هەندێك لەپەند نامەکانـدا، نیشان دراوە.

ئزا و سروودەکانی مانەوی کە ئەمڕو نموونەیان لەبەردەست دایە ئاسکترین نموونـەی شـیعرن لە ئێرانی پێش ئیسلامدا [٩١].

زمانی ئێران لەوکات و سەردەمدا جگە لە شیعر بەرهەمی فەلـسەفی و زانستیـشی هـەبووە، تەنانەت هەندێك لە کتێبە زانستییەکان لە یۆنانی و هیندییەوە وەرگێڕدرابوون، زمانی ئەو گەلـە زمانی شیعر و ئەدەب و زمانی چێژ و عەقڵ بوو، زمانی گەلێك بوو پڕ لە فەرهەنگ و ئـەدەب و لێوەشاوەیی و بەتێکڕا سوودمەندی لەسەر یەك ئەم گەلە بەسەد زمان قسەیان دەکرد، بەڵام کاتـێ لەگەڵ داگیرکەرە عارەبە موسڵمانەکاندا ڕووبەڕووبوونەوە هێزی شمشێر باڵادەستی خۆی سەلماند.

## پەیامی نوێ

زمانی عارەبی (تاژییەکان)* جگەلەوەی زمانی گەلێکی نیمچە کێوی بوو هـیچ ڕەوانـی و ئاسککارییەکی واشی تیا نەبوو، بەڵام کاتێـك بـانگی قورئـان و بـانگ ڕادێـران لەژێرسـایەی شمشێردا لە ئاسمانی ئێران زرنگایەوە، زمانی پەهلەوی لەبەرامبەریـدا پاشەکـشەی کـردو وردە وردە خەڵکی ئێران وازیان لە ئایینی خۆیان هێناو چوونە سەر ئایینی عارەبان، ئەوانەی کە بەو ئایینە و بەو حکوومەتە عارەبییەش ڕازی و دڵخۆش نەبوون، چەندین کۆت و بەندیان بە سەردا سەپێندراو ناویان نان (ئەهلی زیمە) و بۆیان نەبوو فزە بکـەن و دەمیـان هـەڵبڕن و سـکاڵا و ناڕەزایەتی دەربڕن. بەمشێوەیە بە درێژایی دوو سـەدە... جگەلـە چـەند هـاوارێکی کـورت و تاساو ورتەیەك لە هیچ لێوێك دەرنەدەچوو، زمانی فارسی کە لـە سـەردەمی دەسـەڵاتداریەتی ساسانییەکاندا پڕبوو لەشیرینی و وتـە و ڕەوانبێـژی لەسەرانـسەری ئـەو دوو سـەدەیەدا وەکـو لاڵەکان بەنەناسراوی و بێ بەرهەمی مابووەوە، ماوەیەکی زۆری برد تا ئێرانی توانی بەندی کپ و بێ دەنگی بپسێنێ و دەمی هەڵبڕێ و وەقسەبێت و بدوێت.

---

٩١- مانەوییەکان هۆگری مۆسیقا و شیعر، وەکو هونەرەجوانەکانی تر بوونە، کـە نموونـەی زۆر لـە ئزاکـان و سروودەکانی ئایینی ئەوان لە کاتی هەڵکەندنی تۆرفاندا دۆزراونەتەوە. بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ. (مـانی و دیناو) لە نووسـینی سید حسن تقی زادە . کە بەم دوایە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی.

* لە دەقە فارسییەکەدا زیاتر لە جێی عارەب وشەی (تازی) بەکار هێنراوە.

# زمانی ون بوو

پاش وردبووەنەوەمان لە مێژوو ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە عارەبەکان هەر لە سەرەتادا ڕەنگە زێتر لەبەر ئەوەی خۆیان بپارێزن و لە ئاسوودەییدا بژین و گیانیان پارێزراوبێ، کەوتنە ئەوەی کە ئەو زمان و دەربڕین و شێوەزار و زاراوانەی کە لە ئێراندا ڕەواجیان هەبوو لە ناوبەرن. چونکە مەترسی ئەوەشی لێدەکرا کە هەر ئەم زمانانە گەلان لە دژی ئەوان هان بدات و دەسەڵات و حکوومەتی ئەوان لە هەرێمە جیاجیاکان و دوورە دەستەکانی ئێران بخاتە مەترسییەوە. بەم هۆیەوە لە هەر شوێن و شارێك لە ئێران خەت و نووسین و کتێب و کتێبخانەیان بینیبوایە بە توندی دژی ڕادەوەستان. ئەو ڕەفتارەی کە عارەب لە خوارەزم لەگەڵ خەت وزمانی خەڵکی ئەوێیان کرد، خۆی بەڵگەیەکی بەهێزە. نووسیویانە کاتێ قوتەیبەی کوڕی موسلیم، سەرداری حەججاج کوڕی یوسف سەقەفی بوو، جاری دووەهەم کە چوو خوارەزمی گرتەوە، هەرکەسێك کە خەتی خوارەزمی بنووسیبوایە لە مێژوو و زانست، دەنگوباسی ڕابردووی زانی بوایە هەموویانی دەخستنە ژێر شمشێری تیژی خۆیەوە. زانایانی ئایینی (مۆبەدان، هێربۆدان)ی لە ناوبردن، کتێبەکانیشی سووتاندن تاکو وای لێهات خەڵك بەرەبەرە نەخوێندەوار مانەوە، خەت و کتێبیان نەما و لەناو چوو [92] ئەم ڕووداوە وانیشان دەدات کە عارەب خەت و زمانی گەلانی ئێرانی وەکو فاکتەرێك دەبینی کە ئەگەر دوژمنەکانییان بەردەوام بن لەسەری و لەبەردەستی یان دابێ لەوانەیە لە دژیان بوەستنەوە و بەربەرەکانی و شەڕیان لەگەڵدا بکەن.

لەبەر ئەوە جێی سەرسوڕمان نییە کە لە هەموو شارەکاندا بۆ لە ناوبردنی خەت و زمان زۆربە توندی هەوڵیان دابێ!. ڕەنگە بەهانەو هەنجەتی تر کە عارەب بۆ دژایەتی کردنی زمانو خەتی ئێرانییەکان هەیانبوو، ئەوەبێت کە خەت و زمانی زەردەشتی یان بە ڕێگر و بەربەستێك بۆ بڵاوبوونەوە و گەشەکردنی قورئان و پەیامی خۆیان زانیوە. لە ڕاستیدا ئێرانییەکان تەنانەت ئەوکەسانەش کە ببوونە موسڵمان و ئایینی ئیسلامیان وەرگرتبوو زمانی عارەبەکان فێر نەدەبوون، لە بەر ئەوە تا ئەو ئاستەی کە نەیان دەتوانی نوێژ و قورئانیش بە عارەبی بخوێنن، نووسیویانە کە ((خەڵکی بوخارا لە سەرەتای ئیسلامدا لە نوێژدا قورئانیان بە فارسی دەخوێندەوە، نەیان دەتوانی فێری عارەبی بن، کاتێ بۆ کڕنۆش و چوك دادان دەچوون مرۆڤێك

---

٩٢- بیرونی: اثار الباقیة، ل٣٦،٣٥، ٣٨ .

لە دواوە دەوەستا بە زمانی سوغدی هاواری دەکرد (بکنیتان کنیت) و کاتێ دەچوونە کڕنوش بردن (سەرچۆك) هاواریان دەکرد(نگوینا نگونی کنیت [٩٣]). بەمشێوەیە ئەم خۆشەویستییەی کە خەڵك بۆ زمانی خۆیان هەیانبوو جێی سەرسوورڕمان نییە! کە سەردارانی عارەب، زمان و خەتی ئێرانیان تا ڕادەیەکی زۆر بە دژی ئاین و حکوومەتی خۆیان بزانن و لە هەر شوێنێکدا بۆ لە ناوبردن و نەمانی خەت و زمانی فارسی هەوڵ بدەن.

## سووتاندنی کتێب

بەوشێوەیەی کە باسکرا هیچ گومانێك لەوەدا نییە، کە لەکاتی هێرشی عارەب زۆر لە کتێبەکان و کتێبخانەکان لە ناوبران و تووشی زەرەر و زیان هاتن. ئەمە لە مێژووەکاندا بە درێژی باسی لێوەکراوەو بەڵگەی زۆریش بۆ سەلماندنی ئەم گوتەیە هەیە، بەڵام هەندێك لە توێژەران لەم بارەیەوە بە گومانن لەکاتێکدا ئەمە گومانی ناوێت چونکە ئەو هەنگاوە گومان هەڵناگرێ، بۆ عارەب کە جگە لە قورئانی کەلامی خودا هیچ کتێب و پەیامێکی تر بەهای بۆ دانەدەنرا، کتێبەکانی زەردەشتی لای ئەوان بەهۆکاری گومڕابوون و تاریکی دادەنران، بۆچی بیان پارێزن؟ لە نێو موسڵماناندا ئەو کات کەسانی خوێندەوار زۆر کەم بوون، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم گەلە بایەخێکی ئەوتۆی بەکتێب و کتێبخانە نەداوە، تەواوی ئەم بەڵگە و بەرژەنگانە بۆمان دەسەلمێنن و وا نیشان دەدەن کە عارەبەکان سوودێکی وایان لەو کتێبانەی کە ئێستا لە ئەدەبی پەهلەوی پاشماوەیان ماون وەرنەگرتووە. هەر لێرەشەوە بۆمان دەردەکەوێ و گومان و دوودڵیش نامێنێ کە بە ڕێزەوە سەیری ئەو کتێبانەیان نەکردووە، جگە لەوانە لەو سەردەمەی کە زانست و هونەر لە دەستی زانایان وگەورە پیاوانی ئایینی و مۆبدان بووەو بە لە نێووچونی ئەو دوو چینە بمانەوێ یان نا ئەو کتێبانەش لە نێو دەچن. ئەوە بوو کەکاتی هێرشی عارەب، مۆبدان زیاتر لە هەموو چین وتوێژەکانی تر زەرەرمەندبوون و لێك پچڕان، بە کوشتن و بڵاوە پێکردنی ئەو چینە بۆمان دەردەکەوێ کە زانست و کتێبەکانیش لە لای عارەب سوود و بایەخێکی وایان نییە و بەکەڵکیان نایەت، بۆیە لەدیدگای ئەوانەوە هۆکار و پاڵنەرێك نامێنی کە بیان پارێزن و بمێننەوە.

---

٩٣- نرشخی: تاریخ بخارا، ل٧٥، چاپ تهران .

ناوی زۆر لە کتێبەکانی سەردەمی ساسانی لە ناو کتێبە مێژووییەکاندا ماون کە هیچیان دیار نین، تەنانەت ئەوانەی لە سەردەمی سەرەتای عەبباسیشدا وەرگێڕدراون، لە ناو چوون. دیارە لە سۆنگەی موسڵمانانەوە کەش و هەوای مانەوەی ئەو جۆرە کتێبانە لەبار گونجاو نەبووە، هۆکاری لە ناوبردنیشیان هەر ئەوە بووە.

هەر لەو بەڵگە و نیشانانەوە بۆمان دەردەکەوێ کە لەکاتی هێرشی عارەبەکاندا زۆر لە کتێبە ئێرانییەکان لە ناوچوون، هەر وەکو گوتویانە کاتێ (سەعد کوڕی وەقاس) دەستی بە سەر شاری مەدائن داگرت لەوێ کتێبی زۆری بەرچاوکەوت، نامەیەکی بۆ خەلیفەی دووەم (عومەری کوڕی خەتتاب) نووسی و لە بارەی کتێبەکان داوای ڕێنمایی لێ کرد، عومەر لە وەڵامدا بۆی نووسیبووەوە کە هەموویان فڕێبداتە ناو ڕووباری دیجلەوە. چونکە ئەگەر ئەوەی لەو کتێبانەدا هەیە بۆ ڕێنمایی بێت ئەوە خودای گەورە قورئانی بۆ ناردووین کە لە وانە باشترو بە سوودترە، ئەگەریش گومراییان تێدابێ، خودا لە گومرایی ئەوان دووری کردووین، لەبەر ئەوە گشتیان بسووتێنە و بیانخەرە ناو ناوەوە.[٩٤] هەر چۆنێك بێت لەو کاتدا کە حکومەتی ئێران کەوتە دەستی عارەبەکان، زمانی ئێرانیش زەلیلی بندەستی تازییەکان بوو، زمانی ئێرانیش بووە زمانی عارەبان، ئیتر نە لە دامو دەزگاکانی حکومەتی بە کاردەهات، نە بۆ کاروباریی ئایینی. بۆ بڵاوبوونەوەشی هیچ بایەخێك نە دەدرا، ئەوە بوو کە ڕۆژ بە ڕۆژ بێ بایەختر دەبوو، زمانی پەهلەوی هێدی هێدی بووە زمانێکی تایبەت بە مۆبدان و (بەهدینان)، ئەو کتێبانەش کە نووسراون هەر بەو زمانە بوون، بەڵام چونکە خەتەکەی زەحمەت بوو و نووسینی نەسخ بوو، زمانەکانی سوغدی و خوارزمیش لە بەرامبەر توندوتیژی عارەبەکان بەرە بەرە کەم بایەخ تر دەبوونەوە، ئاثاری لەسەر پاتاری نەدەما، ئەم زمانانە نە لەگەڵ ئایینی تازی و نە لەگەڵ ژیانی نوێ نەدەگونجان و نەشتی نوێیان بە دوادا دەهات، لەبەر ئەوە کاتێ زمانی عارەبی دەنگی بەرزبووەوە، زمانەکانی ئێرانی ماوەیەکی زۆر خۆیان کپ و مت کرد، زمانی عارەبی کە زمانی ئاین و حکومەت بوو زمانی پەهلەوی، دری، سوغدی، خوارەزمی جگە لە ناو خەڵکی ئاسایی ئیدی بەکارنەدەهاتن، ڕاستە لە شار و گوندەکاندا خەڵك لەگەڵ یەکتری دەدوان، بەڵام ئەو زمانانە جگە لەوە سوودێکی تریان نەبوو، بەم هۆیە زمانی ئێرانی لەوسەردەمەی بێ دەنگی و بێ نەوایی دا کەوتە ژێر کاریگەریی زمانی عارەبی و تێکەڵی ئەو زمانەبوو. بە تایبەت کە بەرەبەرە زاراوە ئایینی و ئیدارییەکان هاتنە ناو زمانی فارسییەوە.

---

٩٤- ابن خلدون: مقدمە، ب١، چاپ، مصر، ل ٢٨٥، ٢٨٦.

## گواستنەوەی دیوان: بە عارەبیکردنی نووسین
## لە دام و دەزگا حکوومی و کارگێڕییەکان

گۆڕین و گواستنەوەی نووسینی کاروباری دەوڵەت (دیوان) لە فارسییەوە بۆ عارەبی کە لە ڕۆژگار و سەردەمی حەجاج[95] ئەنجامدرا یەکێك بوو لە هۆکارە سەرەکییەکانی لاوازی و شکستی زمانی ئێرانی.

دیوانی ئێراق تاکو ڕۆژگار و سەردەمی حەجاج بەخەت و زمانی فارسی بووە، نووسەران و ژمێریارانی فارسی ڕێکخستنی خەراج و داهاتی زەوی و زار و لەشکرییان ڕاگرتبوو، لەسەردەمی حەجاج دا سەرپەرشتی ئەو دیوانانە لە دەستی (زادان فەرۆخ) دابوو.

حەجاج گرنگی و بایەخێکی یەکجار زۆری بەخەراج دەدا، چونکە دوژمنایەتی زۆری لەگەڵ مەوالی و نەبەتییەکاندا هەبوو، بەنیاز بوو کاروباری دیوان لە دەستی ئەوان دەربهێنێ.

لە دیوانی (زادان فەرۆخ)دا پیاوێکی مەوالی تەمیم هەبوو بەناوی (صالح کوڕی عەبدولرەحمان) مردووە لەساڵی (٩٠ ك/٧١٠ ز) کە بەفارسی و عارەبی دەینووسی، ئەو پیاوە لە بەسرە لەدایك ببوو، باوکی ناوبراو لە دیلەکانی سیستان بوو، کاتێ حەجاج چاوی پێکەوت پەسەندی کردو خۆی لێ نزیك کردەوە، سالح کەیفی هات و دوای ماوەیەك لەگەڵ (زادان فەرۆخ)دا گفتوگوی دەکرد، وتی هۆکاری لەیەك نزیکبوونەوەی من و ئەمیر تۆبووی، بەلاّم واهەست دەکەم کە حەجاج لەگەڵ مندا بووەتە هاوڕێ، ڕۆژێك دادێ کە من لەم کاروبارەدا پێش بخات و تۆ لەسەر ئەم کارە لاببات.

(زادان فەرۆخ) پێی گوت خەمت نەبێ چونکە ئەو پێویستی زۆرتری بەمنە نەك من بە ئەو، جگە لە من ناتوانێ کەسێکی تر بدۆزێتەوە کە بتوانێ ژمێریاری دیوانی بۆ ڕابگرێت.

(سالح وتی): ئەگەر من بمەوێ ژمێریاری بۆ عارەبی بگوازمەوە دەتوانم. (زادان فەرۆخ) وتی: ئەگەر ڕاست دەکەی شتێك بگوازەوە تاکو من ببینم، (سالح) شتێکی وەرگێڕایە سەر زمانی عارەبی، کە (زادان فەرۆخ) پێی سەرسام بوو! بەنووسەرانی تری وت کە لە دیوان کاریان دەکرد، بۆ خۆتان کارێکی تر بدۆزنەوە، چونکە ئەم کارەمان لەدەست چوو، دوای ئەوە داوای لە سالح کرد کە خۆی نەخۆش بخات و ماوەیەك نەهێتە دیوان، سالح وای کردو ماوەیەك نەهاتە دیوان، حەجاج پرسیاری کرد؟ وتیان نەخۆشە ئەویش پزیشکی خۆی کە ناوی (تیادروس) بوو ناردە لای، پزیشك

95- لەسەردەمی عەبدولمەلیك کوڕی مەرواندا کە حەجاج کرا بە ئەمیری ئێراقەین (بەسرا ، کوفە) سالحی کوڕی عەبدولڕەحمان سیستانی نووسینی کاروباری دەوڵەتی وەرگێڕایە سەر زمانی عارەبی.

هیچ نەخۆشییەکی نەدۆزییەوە، کاتێ (زادان فەرۆخ) بەمەی زانی لە تووڕەبوونی حەججاج زۆر ترساو داوای لە سالح کرد کە تا زووە بگەڕێتەوە دیوان، سالح گەڕایەوە سەرکاری جاران....

دوای ماوەیەك کاتێ ئاشووبی (کوڕی ئەشعەس)[96] سەری هەڵدا و لە ئەنجامی ئەو ڕووداوەدا (زادان فەرۆخ) کوژرا، دوای کوژرانی ئەو، حەججاج سەرپەرشتی کاروباری دیوانی دایە دەست سالح و لەشوێنی ئەو دانیشت.

ڕۆژێك لە ڕۆژان لە کاتی گفتوگۆکردندا ئەوەی لە نێوان (سالح) و (زادان فەرۆخ)دا ڕوویدا بوو خستییە بەرباس، حەججاج بەوپەڕی دڵگەرمییەوە پێی وت و داوای لێ کرد کە هەوڵێکی کارا بدات بۆ ئەوەی دیوان لە فارسی وەرگێڕێتە سەر عارەبی، (سالح) ڕازی بوو و ئەنجامدانی پێشنیارەکەی حەججاجی قبوڵ کرد.

(زادان فەرۆخ )کوڕێکی هەبوو بەناوی (مەردان) شا، کاتێك لە مەبەستی سالح گەیشت پرسیاری لێ کرد کە ئایا دەتوانێ ئەو ئەرکە گرنگە بەئەنجام بگەیەنێ؟ سالح لەوەڵامدا ئامادەیی خۆی دەربڕی، مەردان شا لێی پرسی کاتێ ژمارەکان بە عارەبی دەنووسی چۆن یان دەنووسی بۆ نموونە ((دەهویە، بیستویە)) کە لە فارسیدا هەن؟ وتی (عشرونصف عشر) دەنووسم، پرسی لە شوێنی (وید) چ دەنووسی؟ وتی لە شوێنی (وید) ((ایضاً)) دەنووسم، مەردان شا بەتووڕەییەکی زۆرەوە وتی خوا لەناوت بەرێ کە ڕیشەی زمانی فارسیت هەڵتەکاند و لە ناوت برد، دەڵێن کە نووسەرانی ئێرانی سەدهەزار دەرهەم یان پێدا تاکو نەخۆشی بکاتە بەهانە و واز لەگواستنەوەی دیوان بۆ سەرزمانی عارەبی بهێنێ. سالح ئامادە نەبوو وکاروباری نووسینی دیوانی وەرگێڕا بۆ سەر زمانی عارەبی[97] دوای ئەوە دیوان کرا بە عارەبی و ئەو ئێرانییانەی کە ڕێزێکیان هەبوو

---

٩٦- عەبدولرەحمانی کوڕی ئەشعەس لەساڵی ٨٢ك ٧٠١ز لەدژی حەججاج و سەروەرەکەی عەبدولمەلیك کۆمەڵە خەڵکێکی کۆکردەوە، سەرەتا لە عێراقدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا و بەرەو شوشتەر بەڕێکەوت، حەججاج هێرشی کردەسەر بەڵام شکستی هێنا بەرەو بەسرا گەڕایەوە ، عەبدولمەلیك هێزێکی زوری ناردەسەر دوای چەند شەڕێك کوڕی ئەشعەس ڕووی لە سیستان کرد و چووە لای ڕوتەبل، بەڵام حەججاج داوای تەسلیم کردنی کرد، ئەویش بەپارەیەکی زۆر هەڵخەڵەتاو بەخیانەت تەسلیمی بکات، بەڵام کوڕی ئەشعەس ئامادەنەبوو خۆی بەدەستەوە بدات بەڵکو لە کۆشکەکە خوی فڕێداو مرد، حەججاج سەری بۆ لای عەبدولمەلیك نارد . وەرگێڕ: وەرگیراوە لە مقدسی: افرینش و تاریخ، ب٤، ٥، ل٩٩٢، ٩٩٣.

٩٧- بڕوانە، ابن ندیم: الفهرست ، ل ٣٣٨ . صولی: ادب الکا تب، ل ١٩٢. بلاذری: فتوح البلدان، ب١، ل ٣٠٠.

لەدەستیاندا و زمانی فارسیش کە تا ئەو کات لە دیواندا بە پێویستییەکی گرنگ دەژمێردرا ڕێـزی جارانی نەماو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لەویّ بەرەو کزی و دابەزین و گلۆڵەی لە لێژی بوو.

## دەستپێکی بێدەنگی

لەو بێدەنگی و تاریکییە پڕ ترس و خوێناوییەدا کە لەو ڕۆژگاردا، بۆ ماوەی دوو سەدە سێبەری خۆی بەرسەر وڵاتی ئێراندا کێـشابوو، توێـژەر هـەوڵ و مانـدوبوونی بـێ سـوودە ئەگـەر بـە دوای لاپەڕەیەك شیعری فارسیدا بگەڕێت، چونکە زەمینەیەکی لەبار بۆ پەروەردەکردنی شاعیری (فارسی زمان) و ئێرانی زمان نەبوو.

ئەوەی عارەب لەو کات و ساتەدا لە شیعر تێدەگەیشت قەسیدە بوو کە عـارەب لـە سـتایش و هەجوکردنی گەورەکانی ڕۆژگاری خۆیاندا دەیان گوت، یاخود ئەو پارچانەی پێیاندەگوترا ڕەجەز، کە پڕبوون لە جۆش و خرۆشی جەنگی، هەرچەند هیچ کام لەو دوو جورە شیعرە لەو کاتـدا لـە زمـانی فارسیدا بوارێکی وایان نەبوو کەسەر هەڵبـدەن، لـەو ڕۆژگارانـەدا کەگـەلانی ئێرانـی لەبەرامبـەر عـارەبەکاندا شکابوون، بۆ ئەوان جگەلە نەخشەی مردن و داڕمـان و ڕاکـردن هیـچی تـر لەبەرچـاو نەبوو، حەماسەی شەڕی نەبوو تاکو ڕەجەز دابنێن، هەروەها لەو کات و ساتەدا کـە لـە شـارەکانی ئێراندا عارەبەکان دەسەڵاتداربوون و خەلیفەش لەبەغدا و شامدا دادەنیشتن، عـارەب بـوون، ناچـار ئێرانی نەیدەتوانی ستایشی جێنشینیان کارگوزارو نوێنەری خەلیفە بەزمانی فارسی بکات.

چەمك و زاراوەگەلی ئایینی و ڕەوشتی نە لە شیعری ئەوکات ڕەواجی پێـدەدرا و نـە ئێرانییـە موسڵمانەکانیش ئەگەر بیرو ئەندێشەیەکی وایشیان لە مێشکدا هەبوایە ئەوا وەرگێڕانیان بـۆ سـەر زمانی فارسی بەپێویست نەدەزانی، ئێرانییە ناموسوڵمانەکانیش بوار و دەسـت بـەتاڵییان بـۆ ئـەم قسانە نەبوو، ستایش و پیاهەڵدانی ژن و شەراب و غەزەل کە هەمیشە کەرەستەیەکی لـە باربوو، لەلایەن عارەبەکانەوەبەدەست درێژی بۆ سەر حورمەت و پایەی موسـڵمانان دەژمێـردرا و هـەرگیز چاوپوشی لێنەدەکرا، سەرەرای هەموو ئەوانەی وتران ئەگەر باسێکی وا بەهۆی (زەنادقـە) و ئـازاد ئەندیـشەکانی ئەوکاتـەوە بگوترابـا، لەچـوار دیـواری ئەنجوومـەن و نێوکەسـوکار دەرنەدەچـوو و ڕەنگدانەوەی نەدەبوو، ڕەنگە لەبەر ئەوەبوبێت ئەگەر شتێك بەزمانی فارسی یـا تەنانـەت عـارەبی بگوترایە نەدەماو لەناودەچوو.

هەجوو( شیعری جنێو) و سکاڵاش کە گرنگترین دەست مایەی شیعرە، بواری پیّ نەدەدرا هـەر دژایەتی و سکاڵایەك کە لەو سەردەم بەسەر زمانی یەکێك لە ئێرانییەکانـدا هاتبایـە، بەتونـدترین

شێوە دەخنکێندرا، جێنشینەکان بەردەوام شاعیرەکان و قسەزانەکانیان کە بە زمانی عارەبی باسیان لەسەر بەرزی و مێژووی پڕ سام و شـکۆداری ئێـران و بـاب و بـاپیرانی ڕابـردووی خۆیـان دەکـرد، دەکەوتنە بەر ئازار و ئەشکەنجەی زۆرەوە[98].

## هاواری خامۆشەکان

لەم جۆرە قسەو باسانە ئەگەر شـتێکیش بگوترابـا ئـەوا کورتخایـەن دەبـوو، لەگـەڵ نووسـین و بەرهەمی دیکەی شعوبییەکاندا لەناو دەچوو و ئەگەر دەنگ و هـاوارێکی نارەزایـەتی و سـکاڵاش بەرز بوایەوە ڕەنگدانەوەیەکی وای نەدەبوو، و بەدرێژایی سەدەکان نەدەما. لەبەرامبەر ئەو جـەور و ستەمە بێ وێنەیەی کە عارەبەکان لە شار و گوندەکاندا بەسەر خەڵکیان دەهێنا بواری ڕەخنە گرتن نەبوو، هەرکەسێك لەبەرامبەر جەورو ستەمی عارەبەکان فزەو نووزەی لێوەهاتبـا بـەکافرو زەنـدیق دەژمێردراو خوێنی بە فیڕۆ دەچوو، شمشێری داگیرکـەرە پـەلاماردەرەکان و قامـچی دەسـەڵاتداران هەموو چەشنە ڕەخنە و هاوارو نارەزایەتێکیان کپ کردبوو، ئەگـەر دەنـگ و هـاوارێ بەرزبوایـەوە هاواری سۆزناك و لاوازی شاعیرێك بوو کە بۆ وێرانکردنی شارو لادێیەکەی خۆی شیوەن و گریـان و لاواندنەوەیەکی دەکرد، وەکو لەم چەند دێرە شیعرەی شـاعیری سـەمەرقەندی (ئـەبو ئەلیەنبـەغی) کوڕە میرێکی ناکام کە لەسەدەی سێیەمی کۆچیدا (نۆیەمی زایینی) لە پـەژارە و خـەم و کۆڤـانی وێرانکردنی شارەکەی (سەمەرقەند) دا گوتراوە پەژارە و سکاڵای خۆی بەم شێوەیە هۆنیوەتەوە:

((سمر قەند کند مند    بزینت کی اوفکند))
((از شاش[99] تەبهی    همیشە تە خهی[100]))

---

٩٨- بۆ نموونە بروانە: اغانی، ب٤، ل٤٢٣.

٩٩- شاش یەکێك لە ئاوەدانترین شارەکانی ئەو دیوی ڕووبار بووە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا ، ناوی کۆنی شاری تاشکەندە بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ ابن حوقل : سورە الارض، ل ٢٣٣ .

١٠٠- دەڵێن ئەم گۆرانییە ئەبو ئەلیەنبەغی عەباس کوڕی تەرخان لەگەڵ یەحیای بەرمەکی و کوڕەکانی فەزل جەعفەر هاوکات بووە .ئەم دوو بەیتییەی سەرەوەش لە کتێبی مـسالك و ممالك لە نووسینی ئیبن خردادبـە وەرگیراوە، ل٢٦. بۆ جاری یەکەم ئەم دوو بەیتی یە لەلایەن عەباسی ئیقبال لە وتارێکدا بڵاوکرایەوە. بگـەڕێوە بۆ مجلە مهر، سال اول، ژمارە ١٠. سەمەرقەندی ئاوەدان کی وای لی کردی کی وای بەسەر هێنای تۆ لە شـاش باشتری تۆ هەر باشی.

یاخود هاواری سۆزناکی زەردەشتییێکی ئێران دۆست بوو، کە لەژێر پاڵەپەستوی ڕەنج و ئەشکەنجەدا ئارەزووی دەکرد دەستێکی ئاهورایی لەنادیارەوە بێت و وڵاتەکەی لەدەست عارەبەکان ڕزگار بکات، لە چاوەڕوانی دەرکەوتنی فریادرەسێك، بەزمانی پەهلەوی هاواری کردووە ئاوای هۆنیوەتەوە:

((کی باشد که پیکی آید از هندوستان — که آمد آن شاه بهرام از دوده‌ء کیان
.............................. — ..............................هتد

کەی دەبێ پەیکێك لەهیندوستانەوە بێت و هاتنی بەهرام شای کیانی مان پێڕابگەیەنێ کەبەئالآی ئایینی خەسرەوانی بۆ لای سوپا سالار...

کە بچێتە لای هیندەکان و پێیان بڵێت عارەباکان چیان بەسەر هێناوین و چیمان بەسەر هات لەدەستیان، گروپێکی بچووك ئایینی خۆیان بڵاوکردەوە و پاشایەتیمان لەدەست دەرچوو، ئایینیان وەکو ئایینی دێوەکانە (نان دەخون وەك سەگ ئاسا) بەم شێوەیە ئەمانە پاشایەتی یان لەدەست خەسرەوان دەرهێنا. نەبە هونەر و کارزانی بەڵکو بەداخ و حەسرەت و بەجەور، ستاندیان، ژن و ماڵ و دارایی خەڵکیان بەتاڵان برد، خۆشەویستی باخ و بێستان جزیەیان بەسەردا سەپاندن و دابەشی سەرخۆیان کردن.

وەرگرتنی جزیەو خەراجیان دانایە سەر باخ و بێستانەکان و بەسەر خۆیاندا دابەشیان کردن، هەموو شتێکیان هەڵلوشی، سەیرکەن ئەو درۆیەی ئەوان چۆن بۆ هەموو جیهان روون بۆتەوە، درۆیەك کە لە هەموو جیهاندا لە خراپیدا هاوتای نییە.[101]

## ئاوازی پارسی

بەم شێوەیە زمانی عارەبی بە پەیامێکی تازە کە لەبەهەشتەوە هێنابووی و بە هۆی شمشێرێکی هەڵکێشراو کە خوێنی لێ دەتکا، هەر جۆرە سەرپێچی کردنێکی بەدۆزەخ دەترساند، زمانی پاشاکان و گەورە پیاوانی ئایینی (مۆبدەکان) و ئامۆژگاری کەران و ئاوازخوێنە ڕەسەنەکانی خستە

---

۱۰۱- بۆ دەقی پەهلەوی ئەم چامە هۆنراوەیە بگەڕێوە بۆ (جاماسپ اسانا) Jamasp – Asana، Pahiavi Texts بەهار لە گۆڤاری مهر ساڵی پێنجەم و گۆڤاری سخن ساڵی دووەم، صادق هدایت ئەم دەقەیان بڵاوکردۆتەوە، وەرگێرانی ئەم دەقە بە هۆی مامۆستا بیلی بەئینگلیزی کراوە. Bailey; .Zoroastrian Probiems in the Ninth-centry Books . P۱۹۵

نێو کونجی تاریکی و بێدەنگییەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەرچەند ئاوازەکانی خەسرەوان و ئاوازی موغەکان لە بەرامبەر ئاوازو بانگی قورئان کپ و بێدەنگ بوون، بەڵام ئاوازە دڵرفێنەکانی فارسی هێدی هێدی بەسەر ئاوازە لاوازەکانی عارەبەکاندا زاڵبوون، مۆسیقا و ئاوازی فارسی بەماوەیەکی زۆر کەم پانتایی بیابانەکانی عارەبی پڕکردبوو، لەسەردەمی دەسەڵاتی ئەمەوییەکاندا لە مەککەو مەدینە، شام و ئێراق زور لە جارییە ئاواز خوێنەکان و زۆر لە غولامە گۆرانی بێژەکان بە دەنگی فارسی ئاوازیان دەچڕی و پەنایان بۆ ئاوازی فارسی دەبرد.

لە کتێبی (اغانی اصفهانی)دا باسی چیرۆککگەلێك هەیە کە دەری دەخەن عارەبەکان زۆر شەیدای گۆرانییە دڵرفێنەکانی فارسی بوون، لە بارەی (سعید ابن مسجح) کە کۆنترین ئاواز خوێنی عارەبە لەسەردەمی مەعاوییەدا، دەگێڕدرێتەوەکە ئاوازەکانی خۆی لەسەر ئاهەنگ و ئاوازەکانی ئێران و شێوەی ئەوانەوە دادەنان. بۆ نموونە نووسیویانە کە جارێك لە جاران لەلای هەندێك لەو کرێکارە ئێرانییانەی لە کەعبەدا کاریان دەکرد تێدەپەڕێ، گوێبیستی ئاوازەکانیان دەبێ کە لەکاتی کارکردندا دەیان چڕی، دواتر شتێك لەو جۆرەی ئەوانی بە زمانی عارەبی دانا کە لە لایەن عارەبەکانەوە زۆر دڵگیر و خۆش بوو. هەروەها دەگێڕنەوە کە کوڕی (سەعید مسجح) سەرەتا غولامێك بوو ڕۆژێك گۆرانییەکی خۆشی گوت، خاوەنەکەی گوێبیستی بوو پەسەندی کرد، لێی پرسی لەکوێ فێری بووی؟ وەڵامی دایەوە ئەم گۆرانییە فارسییەو من بیستومە و وەرمگێراوە بۆ سەر زمانی عارەبی، خاوەنەکەی زۆر خوشحاڵ بوو و ئازادی کرد، ئەویش لە مەککە مایەوەو بەردەوام بوو لەسەر گۆرانی گوتن.

چیرۆکیتریش لەم بارەیەوە هەن کە لە کتێبەکاندا هاتوون، بەتێکرایی واپێدەچێت کە ئاواز و گۆرانی فارسی لە سەرەتای کاریدا سەرنجی عارەبی بۆ لای خۆی ڕاکێشابێ[١٠٢].

هەڵبەتە حەزکردنی عەرەکان لە ئاواز و گۆرانی فارسی ئەوانی بۆ حەزکردن لە زمانی فارسیش هان دەدا، هێدی هێدی لە نێو ئەو ئاواز و گۆرانیانەی کە شاعیرانی عارەبی دەیان هۆنییەوە، وشەو زاراوەی تەنانەت رستەو کۆپلەی فارسی دووپات دەبوونەوە. لە وتەکانی (ئەبوو نەواس) و ئەو شیعرانەی کە هاوچەرخەکانی ئەو وتویانە، ئەو کۆپلە فارسییانە زۆرن، ئەمەی خوارەوە نموونەیەکی کورتە: ...

---

١٠٢- فجر اسلام: ب١، ل ١٤٣.

( یاغسل الطرجهار للخند ریس العقار
یانرجس و بهاری بده مرا یکباری )[١٠٣]

ئەم جۆرە شیعرە کورت و سادەیە زیاتر بۆ بەزم و هەرا دەوترا و هەروەها باس لەچۆنیەتی بڵاوبوونەوە و ڕەواجی مۆسیقا و ئاوازی فارسی لەکۆڕ و دانیشتنەکانی عارەبەکان دەکات، لەو فارسییانەدا دەردەکەوێ کە زمانی فارسی بەو ئاواز و گۆرانییە هەڵبەستوێنانەی کە هەمیشە شان بەشانی زمانەکە بوون، لەلایەن کۆڕ و دانیشتنەکانی ئەهلی بەزم و خۆشیدا مایەی پەسەند بووە. سەرەڕای ئەمانە، هیچ گومانی تێدانییە کە سروودو گۆرانی فارسی وەکو سەردەمانی پێشتر باو و ڕەواجی خۆی هەر هەبووە ، ئەگەر زمانەکانی پەهلەوی و سوغدی و دری و خوارزمی لە دەزگای ئایین و دەسەڵاتدا لەبەرامبەر زمانی عارەبی نوشستیان هێنابێ، ئەوا لەلای هەمووان و زۆرینەی خەڵکیدا هەر برەوی جارانیان هەبووە، لەهەر شارێکدا زۆرینەی خەڵك بەهەمان زمانی کۆن و دێرین دەپەیڤین، گۆرانی و دیلان و ستران و سروود و چیرۆك و ئەفسانە و مەتەڵ هەمان کۆنەکان بوون.

لە کتێبە مێژووییەکاندا لەو جۆرە ئاوازانە نموونەگەلێکی زۆر هەن. نووسیویانە کاتێ کە (سەعید کوڕی عوسمان) لەلایەن معاوییەوە کرایە فەرمانڕەوای خوراسان، چووەتە ئەو بەری ڕووباری جەیحون و شاری بوخارای گرت لەگەڵ خاتوونەکەی بوخارا کە هەموو کارەکانی بەڕێوەبردنی شاری لەدەستدا بوو، ئاشتی کرد و لە نێوانیاندا دۆستایەتی بەهێز دروست بوو، خاتوونەکە عاشقی ئەوعارەبە ببوو کە خەڵکی بوخارا لەم بارەیەوە هۆنراوەی زۆریان بەزمانی بوخارایی هۆنیوەتەوە کە بەداخەوە نموونەی ئەم هۆنراوانە کە باسی پەیوەندی (سەعیدو خاتوونی بوخارا) دەکەن ئێستا لەبەر دەستدا نییە[١٠٤] ، بەڵام یەك دوو نموونەی ئەو قسەو وتانە ماون، لەوانە گۆرانییەکانی یەزید بن مفەرەغ و حەرارەی منداڵانی شاری بەڵخ جێگەی باسن.

## گۆرانییەك لەبەسرە

بەسەرهاتی یەزید بن مفەرەغ مردووە لە (٦٩ ك/٦٨٩ ز) و گۆرانییەکی هەجو ئامێزی کە دژی (ئیبن زیاد) گوتوویە سرنجڕاکێشە. سەرچاوەکان نووسیویانە کاتێ (عەباد بن زیاد) برای

---

١٠٣- طرجهار: بادی شراب درباب فارسیات ابوونواس، بگەڕێوە بۆ وتاری مجتەبا مینەوی، گۆڤاری کۆلێژی ئەدەبیات، تاران، ساڵی یەکەم؟، هەژمار ٣.

١٠٤- تاریخ بخارا: ل ٤٨. وتاری نووسەر لە گۆڤاری یەغما ساڵی ١١، ژمارە ٧.

عوبەیدوڵڵای ناسراو لە ڕۆژگاری خەلافەتی یەزیدی کوڕی معاوییە کرایە فەرمانڕەوای سیستان، (یەزید بن مفەرەغ)ی شاعیری ناسراوی لەگەڵدا دەبێت، بەڵام لە سیستان (عەباد) گرنگی وای پێنادات و وەکو پێویست ڕێزی ناگرێ، یەزید دڵی دەرەنجێ و بەئاشکرا و نهێنی دەست دەکا بە سەرکۆنە کردن و جنێو پێدانی، (عەباد) دەیگرێ و دەیخاتە زیندانەوە، کاتێ یەزید لەزیندان ڕادەکا، دەچێتە عێراق و شام. لەو هەرێمەدا بگەیشتبایە هەر شوێنێك سەرکۆنەی کوڕەکانی زیادی دەکرد و تانە و تەشەری لە بنەچەو شەرەفی ئەوان دەدا.

(عوبەیدوڵڵا) دەیگرێ و دەیخاتە بەندیخانەوە و بەتوندترین شێواز هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکات، ڕۆژێك فەرمانی دا مەی لەگەڵ گیای، شبرم، کە جۆرە گیایێکە لە کاروباری پزیشکیدا سوودی لێوەردەگیرێت و مرۆڤ تووشی سك چوون دەکات پێی بدەن، ئەوانیش دەر خواردیان دا تاکو سەرخۆش و لەخۆ بێ ئاگابوو، دوای ئەوە پشیلەیەك و بەرازێك و سەگێکیان لەگەڵ کرد و لە ناو شەقام و کوڵانەکان و بازاڕی شاری بەسرا دەیان سووڕاندەوە، منداڵانی شار کەوتبوونە شوێنی و بەفارسی هاواریان دەکرد ئەی شێت؟ ئەویش بەفارسی دەیووت :

«آبست و نبیذست   عصارات زبیب است»

((ئاوە و شەرابە گوشراوەی ترێی ڕەزانە))

ودنبه فربه پی است  وسمیه روسبیذست[105] .

((دونگی گەورەیە و گوشتینە و کەفەڵ پانە (وەسمیەش) سۆزانییە)) وەسیمە دایکی زیادە، گوایە لە سەردەمی (جاهلی) دا سۆزانی بووە.

ئەو گۆرانییە نموونەیەکە لەو کات و ڕۆژگارەدا کە منداڵانی بەسرا دەیانگوت، سەرەڕای ئەوەی خوێنەر و بێژەرەکە خۆشی عارەبە، پێدەچێ بە هۆی مانەوەی زۆری لە ئێراندا فێری زمانی فارسی بووە.

هەرچۆنێك بێت ئەم چەند واژەیە نموونەیەکن لە گۆرانی خەڵکی بەسرا، ئەو سەردەمانەی کە هێشتا تەنها چل ساڵ بەسەر شکان و ڕوخانی مەدائن تێپەڕیبوو، بۆیە لە مێژووی زمانی ئێراندا گرنگییەکی تایبەتی هەیە.

---

١٠٥- بڕوانە  مؤلف مجهول: تاریخ سیستان، ل ٩٦. ابن قتیبە: طبقات الشعراء، ل ٢١٠.اصفهانی: اغانی، ب١٧-طبری : سلسلە ٢، ل ٣ -١٩٢. هەروەها وتاری ((قزوینی: قدیمترین شعر فارسی، مقالە، ب١، چ تهران، ل٣٤)). ئەم چیرۆکە بۆ یەکەمین جار لەلایەن خوالێخوشبوو قەزوینییەوە بلاوکراوەتەوە .

## سروودێك له بەڵخ

ستراني مندالانى بەڵخ چيروكێكى ترە، سالى ١١٩/ك ٧٣٧ز سەردارى عارەب (ئەسەد كورِى عەبدوللا قەسرى) له خوراسان بۆ شەڕى خەتلان دەچوو، بەلام هيچى پێنەكراو دواى ماندوبوونێكى زۆر و ڕەنجێكى زۆر كەكێشابووى، شكستيخواردو بەناكامى گەڕايەوە، كاتێ لەو گەڕانەوەيەدا گەيشتە شارى بەڵخ، خەڵك بەگاڵتە جاڕى و توانج و پەلار تێگرتن پێيان هەڵدەگوت و بە زمانى فارسى گۆرانى تانە ئامێز و ناشرينيان بەسەردا هەڵدا، مندالان هاوارِيان دەكرد و گۆرانييان دەگوت، ئەو گۆرانييانە كۆنترين گۆرانى مندالانن كە لە كتێبە مێژووييەكاندا باسيان كراوە كە بەم شێوەيەى خوارەوەن :-

(ازختلان آمديه　　　برو تباه آمديه

آباره باز آمديه　　　خشك و نزار آمديه )

(( لەخەتلان هاتووه　　　بەڕووڕەشى هاتووه [١٠٦]

ئاوارە ديسان هاتەوە　　　وشك و كەساس هاتەوە ))

لەوكات بەدواوە ئيتر تا كۆتايى سەدەى دواتر، هيچ دەنگێك لەو تاريكى و خامۆشييەدا ڕەنگى نەدايەوەو هيچ گۆرانى و سروودێك (زمزمە و گم گم)يش ئەو بێدەنگييە سارد و وشك و برينگەى نەشكاند. زمانى خەلكى ئاسايى ئێران (درى) بوو. بەنهێنى و ژێربەژێريش كتێبى ئايينى وگوتارى كەلامى بە پەهلەوى دەنووسران، بەلام بەئاشكرا كەس بەزمانى درى نەيدەتوانى گۆرانى و شيعر بلێت و هيچ نووسەرێكيش نەيدەتوانى كتێبێك بنووسێ، ديسان تا يەك سەدە چاوەڕوانى پێويست بوو كە زەوق و سەليقەى كپ كراو و كوژاوەى ئێرانى بتوانێ زمانى ون بووى خۆى بدوزێتەوە و بەهۆيەوە ئاواز و سترانە شيرين و دلڕفێن و نەمرەكانى خۆى دەست پێبكاتەوە.

---

١٠٦- طبرى، ڕووداوى سالى ١٠٨. هەروەها بگەڕێوە: كۆنترين شعرى فارسى له بيست مەقالەى قەزوينى كە چيرۆكى سەرەوە لەوێ وەرگيراوە .

## بەرە بەیانی هەڵسانەوە

دەتوانین دەرکەوتن و سەرهەڵدانی ڕەشپۆشەکانی ئەبو موسلیم بەسەرەتاو دەستپێکی هەڵسانەوەی ئێران دابنێین، بزووتنەوەی ڕەشپۆشەکان کەزادەی ڕك و نەفرەتی خەڵکی بوو دژبە عارەبە مەروانییەکان، ئەگەر خۆشەویستی نیشتمان و هەستی نەتەوایەتی بزوێنەری ئەو گەلە نەبوایە، مەحاڵ بوو نەفرەت لە ستەمکارە عارەبەکان ئەو ڕاپەڕین و سەرهەڵدانەی لێکەوتبایەوە. سەرهەڵدانی ئالی عەباس کە لەدوا دواییەکانی فەرمانڕەوایی بەنی ئومەیە ئارەزووی خەلافەتیان لە سەردابوو سوودێکی زۆریان لەو هەستەو هێزە ناڕازییە ڕق لە دڵەی خوراسانییەکان سەبارەت بەعارەب وەرگرت، ئەوانیان دژ بە خەلافەتی مەروانییەکان هاندا، لەبەر ئەوەبوو کە دەڵێن : (ئیبراهیم ئیمام) کاتێ ئەبو موسلیمی بەرە و خوراسان بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەشەکەیان دەنارد، بۆی نووسی: لەخوراساندا تاکو دەتوانی هەرکەسێك بە زمانی عارەبی قسە بکات بکوژە و کەسێك لە عارەبە موزیرییەکان مەهێڵە.

لەو وتەیەدا بۆمان دەردەکەوێت کە بزوێنەری سەرەکی ئەو ڕەشپۆشانەی ئەبو موسلیم دوژمنایەتی بوو لە هەمبەر ستەمکارانی عارەب و ( ئیبراهیم ئیمام) و ئەوانی تریش لە بنەماڵەی عەبباسی هەر لەو ڕێگەیەدا ئەوانیان بۆ لای خۆیان ڕاکێشا، بەڵام ئەوەی کە لەو بزوتنەوەیەدا بانگەشەی ئایینی، کاریگەرییەکی بەهێزی هەبووبێ زۆر بەعەقڵدا ناچێ.

بەهەرحاڵ روونە کە (ئەبو موسلیم) و لایەنگرانی، لە پشتگیری کردنی عەباسییەکاندا جگە لە لەناوبردنی مەروانییەکان مەبەستێکی تریان نەبووە، هەروەها زەحمەت بوو کە ئەگەر (ئەبو موسلیم) نەکوژرا بوایەو ڕەشپۆشەکان بواریان بۆ رەخسابوا، دەوڵەت و خەلافەتیان بۆ بنەماڵەی عەبباسی جێهێشتبا. هەرچۆنێك بێت ئامانج و مەبەستی ئەبو موسلیم بەدروستی لە دەستنووسە مێژووییەکاندا دیار نییە، لەبەر ئەوە لە بارەی ئەوەوە لە نێو مێژوونووسەکاندا ناکۆکییەکی زۆر هەیە، هەندێك هەوڵیانداوە ناوبراو بە شیعەی (عەلی) ناوزەد بکەن، نێوان ساردیشی لەگەڵ مەنسوری عەباسی هەر لەوەوە دەزانرێ کە بووە هۆی لەناوبردنیشی.

بەڵام ئەوەی ئەو هەمووگومانانە ڕەت دەکاتەوە ڕەزامەندی ئەبو موسلیمە لەسەر کوشتنی (ئەبو سەلەمەی خەلالی هەمەدانی) کە گومانی شیعەبوونی لەسەر بووە، هەر ئەوەش گریمانەی شیعە بوونی ئەو لاواز دەکات.

ئایا ئەبو موسلیم لایەنگیری زەردەشتی بووە؟ ئەوە جێگەی لێوردبوونەوەیە. سەرەڕای ئەوەی کە لە بارەی ڕەچەڵەك و بنەچە و ڕەسەنی ئەوەوە ناکۆکی زۆر هەیە، هەندێك بەکورد و

هەندێکی تر بەعارەبیان ناوزەد کردووە، لە ناوەڕۆکی ئەوگێڕانەوە و ڕیوایەتانەدا دەردەکەوێ کە کەسێکی ئێرانی بووە و ناوی (بەهزادان و باوکیشی وەنداد هورمزد) بووە، ئەو ڕەچەڵەك نامەیەی کە بۆیان دروست کردووە، بردوویانەتەوە سەر (شیدوشی کوڕی گودەرز) یا (ڕەهامی کوڕی گودەرز) و هەندێکی تر بەکوڕی (بزرگ مهری بەختەگان) ناویان بردووە، ژیانی منداڵی وی پڕە لە ئەفسانە، ئەفسانەکان ڕەچەڵەکیان بردۆتەوە بۆ سەر (عیسا کوڕی موعەقەل) لەوانەیە بۆچوونی شیعەبوونیشی کە دراوەتە پاڵ هەر لەو خاڵەوە سەرچاوەی گرتبێت. لە ئەبو موسلیمنامەکانی موسڵمانەکانی سەردەمی سەفەویدا گەڕاندوینەتەوە بۆ نەوەکانی (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)، بەڵام لەڕاستیدا ئەوانە هەموویان دەستکردن و دروستکراون و فڕیان بەسەر ڕاستییەوە نییە.

ئەوەی لێرە بەرچاو دەکەوێ ئەوەیە دڵبەستەگی و خۆشویستنی ئایینی ئێران، هەروەك لە قسەوکردارەکاندا دەردەکەوێ، هەموو ئەو قسەو باسانە ڕەت دەکاتەوە کە دەیانەوێ ڕەچەڵەکی بگەڕێننەوە بۆ عارەبەکان. هەوڵەکانی ئەو بۆ لە ناوبردنی (بەهئافەرید) و لایەنگرانی، پێدەچێت سوودی زیاتری بۆ زەردەشتییەکان هەبوو بێت تاکو موسڵمانان، هەروەها هاودەردی لەگەڵ (سەنباد) و ڕووداوەکانی نەیشابور دژ بە عارەب لەحەز و دڵبەستەگی ئەو بۆ ئایینی زەردەشتییەوە دێت.

ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینانەیش کە کەسانێکی وەکو (سەنباد)،(ئیسحاق تورك) دوای کوژرانی بۆ تۆڵەسەندنەوەی ئەو ئەنجامیان دا هەندێك بە گەواهی ئەو ڕاستییەی دەزانن کە (ئەبوموسلیم) پەیوەندی و مەیلی بۆ ئایینی زەردەشتی هەبوبێ.

## پشێویی بارودۆخ

هەرچۆنێك بێت ئەبو موسلیم ئێرانی بووەو ڕەنگە هەر پابەندی ئایینی دێرینی خۆی واتە ئایینی (زەردەشتی) بووبێت، بەڵام لە وڵاتی خۆیدا لە هەموو لایەکدا لەگەڵ زوڵم و زۆرداری و ئازاری مەروانییەکان ڕووبەڕوودەبێ. خوراسان و ئێراقی وڵاتی باپیرانی دەدیت کە بە هۆی زوڵم و ستەمی عارەبەکان بووەتە مەیدانی پشێوی و شەپرزەیی، ڕۆژگارێکی دەبینی کە خەڵکانێکی هیچ و پووچ و ناپەسەند هێز و توانا و دەسەڵاتێکی ڕەها و خودایی یانەیان هەیە و خەمی دەخوارد، نائومێدی و ناکامی خەڵکی ئێرانی کە هەر ڕۆژ لە پێناو ڕزگاربوون تووشی کارەساتێك دەبوون، بەچاوی خۆیەوە دەبینی و حەسرەتی دەخوارد، ڕاستییەکەی ئەوەیەکە

مێژووی سەردەمەکەی، مێژوویەکی پڕ لە پشێوی و ناکامی و هەروەها پڕ لە درۆ و فرت و فێڵ بوو، جیهانێ کە ئەو تیایدا دەژیا پڕبوو لە ئاشووب و دەرد و ئازار. ئارەزووە پیرۆزەکان مردبوون، ڕاو بیروباوەڕەکان لە هەموو جێگاکاندا ڕەنگی فێڵ و ڕیاکاری یان گرتبوو، ئایین تەنها بیانو و دەساوێژێك بوو بۆ کۆمەڵێك خەڵك کە بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاریان دەهێنا. ئەو سادەیی و ئازادییەکە سەرەتا ئایینی ئیسلام وەکو دیاریەك هێنابووی لە دەوڵەتی مەروانییدا جێگەی خۆی دایە جەور و ستەم و فراوانخوازی ، هەر ڕۆژ لە ئێراق و خوراسان ولە شوێنەکانی تر...دەستەو گروپی نوێ سەریان هەڵدەداو بانگەشەی نوێ دەستی پێدەکرد.

کیسانییەکان چاوەڕوانی دەرکەوتنی پێشەوای خۆیان بوون کە باوەڕیان وابوو لە چیای (ڕەزەوی)دا زیندووە و سەرهەڵدەدا. خەواریج یا (هەڵگەڕاوەکان، شوراتەکان) بە هۆی شمشێرەکانیانەوە نەك هەر کارگوزارانی حکوومەت بەڵکو بەردەوام هەڕەشەش بوون بۆ سەر دارایی و سەر و ماڵی خەڵکی. (مورجئە یا مەرجەئە) بە هۆی ڕێزگرتنیان لە لایەن خەلیفەکانەوە بەندی بێدەنگی و کشوماتیان لەزار درابوو، بەچاوی گومانەوە سەیری سکالای خەڵکیان دەکرد و لەئاست هەموو ستەم و بێدادی ستەمکارانەوە بێدەنگ بوون، دەوڵەتی بەنی ئومەیە کە بە هۆی دڵڕەقی و دوژمنایەتی دێرینەیان و ناکۆکی هاتبووە ئارا، بەرە و کزی و کوژانەوە دەچوو. هەموو ئەو دەستەو گروپانەی لەو کات پێکهاتبوون و پێکدەهاتن جگە لەوەدەست هێنانی خەلافەت هیچ بیرێکی تریان نەبوو، خەلافەت گرنگترین بابەت بوو لەوکاتداو لە هەموو شوێن ببووە وێردی سەرزاران، شیعەکان خەلافەتیان بەمافی ڕۆڵەکانی عەلی دەزانی، خەواریجیش لەو باوەڕەدابوون کە هەر موسڵمانێکی پارێزکار دەتوانێ ببێتە خەلیفە، لەو ڕۆژانەش لەگۆشە و کەناری وڵاتی ئیسلامیدا لەو جۆرە موسڵمانە پارێزکارانە سەریان هەڵدەدا و دروست دەبوون.

## ئەبو موسلیم

لە ڕۆژگارێکی وادابوو کە ئەبو موسلیم دەرفەتی بۆ ڕەخسا ڕاپەڕینەکەی دەست پێبکات، بەڵام ئەبو موسلیم کێ بوو؟ سەبارەت بە ئەو قسەو باسی جۆرا و جۆر کراوە، پێشتریش سەبارەت بەئەو باسمان کردووە و ئاماژەمان پێداوە. ئەوەی هەیە سەبارەت بەبنەچەو ڕەچەڵەکی ئەو لە نێوان مێژوونوسان هاودەنگی نییە، هەروەها لە بارەی زێدکەشییەوە بۆچوونی جیاواز هەن. هەندێك شاری (مەرو) وهەندێکی تر (ئەسفەهان) و بەشێکی تر شوێنەکانی تر...

دادەنێن، بەهەرحاڵ عارەبەکان و عەباسییەکان وەك دیارە ئەوکات لە مەوالییەکانیان ژماردووە، گوتراوە لە (کوفە) لەگەڵ بنەماڵەی (عەجەلی)ەکاندا پەیوەندی هەبووە، هەر لەوێش لەگەڵ هەندێ لە هەڵگەڕاوەکان (غلاة) یەکتریان ناسیووە و زانیاری سەبارەت بە بیروباوەڕی ئەوان پەیداکردووە. سەبارەت بە سەرەتای ژیانیشی لە نووسراوە مێژووییەکاندا ئەفسانەی زۆر هاتوون کە ڕاستییەکانیان شێواندووە و بەسەختی و دژواری ڕاستییەکان دەدۆزرێنەوە، هەرچۆنێك بێت بەگوتەی هەندێك، لە سەردەمی منداڵی و هەرەتی گەنجایەتی دا پیشەی دروستکردنی زین فێر بووە و زەنگوڵی ئەسپی دروست دەکرد.

گوتەیەکی تر ئەوەیە کە لە گوندێك خزمەتکاری بنەماڵەی (عەجەلی)ەکانی دەکرد و لەوێ دەژیا، جارجاریش بەهێستر هاتوچۆی گوندەکانی دەکرد، هەر چەند لە بارەی سەرەتای ژیانی ئەبو موسلیم زانیاری زۆرمان لە بەردەست نییە، بەڵام ئەوەندە دیارە کە لە ساڵی ١٣٤/ك٧٥١ز لایەنگرانی عەبباسی کە لە خوراسان هاتبوونە کوفە، مەبەستیان بوو بچنە مەککە، لە بەندیخانەدا چاویان پێکەوتووە و کاتێ ڕزگاری بووە دەچێتە لای (ئیبراهیم ئیمام) کە لە عەباسییەکان بوو، ئەو کاتە ئارەزووی خەلافەتی لەسەردابوو، کە ئەبو موسلیمی دیت تاقیکردەوە و کەوتە بەردڵی و پەسەندی کرد و ڕەوانەی خوراسانی کرد تاکو کار بۆ بانگەشەی ئەوان بکات و سەرپەرشتی کردنی کاروبارەکانی ئەوان لەوێ بگرێتە دەست، کە ماوەیەك بوو لەوێ دەستی پێکردبوو، ئەوەبوو ڕێگەی خوراسانی گرتە بەر.

گوایە تەمەنی ئەوکات ١٩ ساڵان بووە، بەپێی گێڕانەوەی گێڕدراوەکان، کاتێ دەچێتە خوراسان لە نەیشابور لە کاروان سەرایەك دادەبەزێت و بۆ کارێك دەردەچێت، لەوکات هەندێك لەگەنجە بەرەڵڵاکانی نەیشابور گوێچکەی گوێ درێژکەی دەبڕن، کاتێ ئەبو موسلیم گەڕایەوە پرسیاری کرد ئەم شوێنە ناوی چییە؟ پێیان وت ( بۆیاباد )– ئەو گوتی ئەگەر ئەم بۆیابادە نەکەم بە (گەنداباد) ئەبو موسلیم نیم!.

دوای ئەوەی دەستی بەسەر خوراسان داگرت، ئەوەی ئەنجام دا کەگوتبووی...

هەروەها گوتراوە کە لەم سەفەرەیدا ڕۆژێك لە بەردەرگەی ماڵی یەکێك لەگەورەکانی خوراسان بەناوی (فازوسبان) تێپەڕی کە مەرزبانی ئەسفەهان بوو و، پەیامێکی بەجێهێشت و وتی بەخاوەنی ئەو ماڵە بڵێن پیاوێك هاتووە داوای شمشێرێك و هەزار دینار دەکات.

(فاذوسبان) کە ئەو پەیامەی بیست لەو بارەیەوە لەگەڵ هاوسەرەکەی کە ژنێکی هۆشیار و ژیر و تێگەیشتوو بوو ڕاوێژی کرد، ژنەکە پێی وت ئەگەر ئەو پیاوە پشتی گەرم نەبوایە بەو

شێوەیە دلێر و بوێرانە پەیامی بۆ تۆ نەدەنارد، ئـەوەبوو (فاذوسـبان) داواکاریەکـەی جێبـەجێ کرد، پاشان کە ئەبو موسلیم دەستی بەسەر خوراسان داگرت پاداشتێکی یەکجار زۆری دایەوە.

سەرەتا ئەبو موسلیم لـە خوراسـان دەسـتی (سـولێمان کـوڕی کەسـیر) و لایـەنگرانی کـە ڕکابەری ئەو بوون کورت کردەوە، دوایی دەستی کـرد بەبڵاوکردنـەوەی بانگەشـەکەی، کـە لـە خوراساندا پێشکەوتنێکی یەکجار زۆری وەدەست هێنا، ڕەفتـارە نابەجێیـەکان و سـتەمی بـێ وێنەی مەڕوانییەکان، خوراسانیان لەهەر شوێنێکی تر بۆ سەرکەوتنی بانگەشەی عەباسییەکان باشتر ئامادەکردبوو.

ئەو نوێنەرانەی کە پێشتر لەلایەن ئیمامی عەباسییەوە ڕەوانەی خوراسان کرابـوون بـەجل و بەرگ و بەناوی بازرگانانەوە شار و لادێکان دەگەڕان و خەلکیان بۆ لای خۆڕادەکێشا.

توندوتیژی سەردارە عارەبـەکان کـە لەلایـەن مەروانییەکانـەوە لـە خوراسـان دانرابـوون و لایەنگرانی بـەنی عەباسـییان بەتونـدی ئـازارو ئەشـکەنجە دەدان، سـوودێکی وای نـەبوو لـە ماوەیەکی کورتدا لە شارەکانی مـەرو، بوخـارا، سـەمەرقەند، کـش، نەخـشەب، چـەغانیان، خەتلان، مەرو رود، تالەقان، تاهێرات، پەشەنگ و سیستان هەموو ئەو کەسانەی کە لەجەور و سـتەمی نوێنـەرانی بـەنی ئومەییـەیان کێـشابوو، بانگەشـەی نێـردراوان و نوێنـەرانی عەباسییەکانیان بەگیان و دڵ وەردەگرت و لەوناوەدا کە ئەبو موسلیم بـە گیـانێکی دلێرانـە و ماندونەناسانە و تولەسێنەرانە، گەیشتە خوراسان و دەستیکرد بە بڵاوکردنەوەی بانگەشەکەی.

## لاوازی عارەب

لە خوراساندا کاروبار و هەواڵەکانی ئەو پێشکەوتنێکی زۆریان وەدەست هێنا. لە ماوەێکی کورتدا هەموو ناڕازییەکان و ئازاردیتوەکان، هەموو فریودراوەکان و لەخـشتەبراوەکان لـە ژێـر ئالآی داکۆیبوونەوە. لەبەر ئەوەی ئاکامی ڕەفتارە خرابەکانی نوێنەران و کـارگوزارانی عـارەب هەموویانی لە دەسەڵاتی حکوومەتی مەڕوانییەکان وەتەنگ خستبوون، جگـە لـەوە لـە نێـوان عارەبەکانیش شەڕو دووبەرەکێیەکی توند دەستی پێ کردبوو. لەو کاتدا خوراسان بە شێك بووە لە بەسرە و والی ئەوێ لەو هەرێمەدا فەرمانڕەوایی دەکرد، ئەو عارەبانەی کە کاتی داگیرکـاری و غەزووی ئیسلام هاتبوونە ئەو شوێنانە و هـەرتیرە و تایفەیـەکیان لـە ناوچـەیەك نیـشتەجێ ببوون، لە نێوانیاندا ناکۆکییەکانی قووڵی سەردەمی جاهلی و نەفامی هەر مابوون، وەکو بەنی (تەمیم) لە تیرەی (موزڕی) بوون لە سەرەتای داگیرکاری ئێران هاتبوونە خوراسـان و بـەردەوام

لەگەڵ (ئەزودیە)کان کە (یەمانی) بوون و درەنگتر هاتبوون، لـە شـەڕدا بـوون. هاوکـات لـەو ماوانەدا بوو کە یەمانی و موزری لێکیان داو خوراسان نقومی ئاگری دووبەرەکی ببـوو، هـەرکام لەو دوو تیرانـە کـە جڵـەوی دەسـەڵاتیان دەکەوتـە دەسـت، تـەنیا ڕێزیـان بـۆ تیرەکـەی خۆیـان دادەنا...ئەو ماوەیەی کە (موهەلەب بن ابی صفیرە) و منداڵەکانی لە خوراسـاندا حکوومـەتیان لەدەست دابوو، یەمانییەکان لە بەرزترین پلەی هێزدابوون. کاتێك (قوتەیبەی کـوڕی موسـلیم) و (نەسری کوڕی سەیار) بە هاتنە سەرکاری موزرییـەکان بەرزبوونـەوە، ئـەم ناکۆکییـەی نێوانیـان (یەمانی، موزری) لە زیادبوون دابوو، دەسەڵات کەوتبوایە دەست هەر کامیان ئـەویتری زەلیـل و ناکام و ڕیسوا دەکرد. لە شام و ئێراق و شوێنەکانی تریش هاوکات دەمـارگیری و نـاکۆکی کـۆنی عارەبی، نوێ و دووبـارەدەبووەوە، خەلیفـەکانی دیمەشـقیش کەوتبوونـە داوی ئـەو دووبـەرەکی و ناکۆکییەوە. لە خوراساندا (نەسرکوڕی سەیار) کە خۆیشی لـە بـارێکی نالـەباردا بـوو، هـەروەها داشنەمەزرابوو، دژایەتییەکی زۆر دەکرا، کاتێ ئاژاوە و گێرەشێوێنی یەکەی (بـەنی تـەمیم) کـە بەهۆی (حارث کوڕی سەبیح)وە هەڵایسا بوو، دامرکایەوە، گیرۆدەی ئاژاوەیەکی تربوو کە ئـەویش ئاژاوەی کرمانی بوو، ئەو ناکۆکییانە زۆریان خایاند کـە کـەس توانـای دامرکـان و کـپ کردنـی نەبوو، ئەوە بوو (ئەبو موسلیم) دەرفـەتێکی بـاش و لـە بـاری ڕەخسـاند، لـە ڕۆژگارێکـدا کـە عارەبەکانی خوراسان تێك بەربوون و کەسـێك توانـای بـەڕێوە بردنـی کاروبارەکـانی خەلافـەتی نەبوو، دەستی بە ڕاپەڕین و سەرهەڵدانی خـۆی کـرد. لـە کاتێکـدا کـە خەلیفـەی ئەمـەوی لـە خەوێکی خافڵەت و نائاگایی و لە خۆبایی بوون دابوو و سەرخۆشی خـەون و خەیاڵـە زێڕینـەکانی بوو، عارەبەکانی خوراسان سەرگەرمی شەڕ و دوژمنداری خێڵەکی خۆیان بوون، (ئـەبو موسـلیم) ڕاپەڕی.

هاوکات لەگەڵ ڕاپەڕینی ئەودا (نەسری کوڕی سەیار) هەوڵیدا عارەبەکانی موزری و یەمانی ئاشت بکاتەوە و ناکۆکیی نێوانیان نەهێڵێ، بەڵام ئیتر درەنگ بوو و کات بەسەر چوبوو. بلیمـەتی و کارزانی و شارەزایی (ئەبو موسلیم) مۆڵەتی نەدا کە نێوانیـان چـاك ببێتـەوە و ڕێـك بکـەون. هێشتا عارەبەکان هەر خەریکی دووبەرەکی نێوان خۆیان بوون کە ڕاپەڕینەکەی بە ئەنجام گەیشت.

ئەبو موسلیم سەرەتا بێ ئەوەی ناوی هیچ ئیمامێکی تایبەت بهێنێ خەڵکی خوراسانی بـۆ یەکێك لە (بەنی هاشم) بانگێشت دەکرد[١٠٧].

---

١٠٧ - ابن خلکان: وفات الاعیان، ب١، ل ١٠٤.

ئەم شێوازە بانگێشتکردنە لەوکات و سەردەمدا پێیدەگوترا بانگهێشتکردنی ڕەزامەندانەو خەڵکەکەش پەیڕەویان لێ دەکرد، کە لەگەڵ هەر کەسێك لە (بەنی هاشم) بە تێکرایی لە سەری ڕێك دەکەوتن و دەبوونە هاوڕا. لەو بارەیەوە قسەیەکی خۆش و هەیە کـە دەکـرێ باسـی لێـوە بکەین، نووسراوە، لەو ڕەچەڵەکنامـە دەست کردو دروست کراوەی کە (ئەبو موسلیم) بـۆ خـۆی دروستی کرد بوو، خۆی بە بنەماڵەی بەنی (عەبباس) و ڕۆڵـەکانی (سـەلیت کـوڕی عبداللـە) ناساندووە، یەکێك لـەو تاوانانـەی کـە (مەنـسوری عەباسـی) مـردووە لـە (١٥٨ ك/٧٧٥ ز) کردییە بیانوو بۆ کوشتنی (ئەبو موسلیم)، ئەو ڕەچەڵەك نامەیەبوو. (ئەبو موسلیم) بۆچی ئەو ڕەچەڵەك نامەیەی دروست کردووە؟ جێگەی پرسیارە، ڕەنگە بۆ ئەوە بووبێ کە ئەگەر هەڵی بـۆ ڕەخسا ڕێگەی گەیشتن بە (جێنشینی) (خەلافەت)ی لە ڕوودا دانەخرابێ. ئایـا دەتـوانرێ بـیرو هزری ئەوەی کە سەرۆکی ڕەشپۆشەکان لەکاتێکـدا کـە ڕەچـەڵەك نامـەی خـۆی گەیاندووتـەوە (سەلیت کـوڕی عبداللـە) بـەو شـێوەیە بانگهێـشتی نهێنی خـۆی بـە بانگهێـشتی ڕەزا بـۆ پێشڤەچوونی کارەکانی خۆی بوبێت؟ دوورنییە کە (ئەبو موسلیم) بۆ تۆڵەکردنـەوە لـە عـارەب جارێکی تر زیندووکردنەوەی دەوڵەتی مەزنی ئێرانی بەباش نەزانیبێ، کە بـە نـاوی جێنـشینی دەسەڵات بگرێتە دەست، هەر ئەوەش بوو کە (مەنسور) خەلیفەی زیـرەك و وریـای عەبباسـی پێش ئەوەی جڵەوی دەسەڵات بگرێتە دەست نیگەرانی پلە خوازی و بـەرزەفڕیی (ئەبوموسـلیم) بووە، هەمیشە بیری لە نـاوبردنی کردۆتـەوە، ئینجـا هـەر چـۆنێك بـێ (ئـەبو موسـلیم) لـە ماوەیەکی کورتدا توانی هەموو ناڕازییەکان لـە خـۆی نزیـك بکاتـەوە و بیانخاتـە ژێـر ئـاڵای خۆیەوە، ڕاپەڕینی دژ بە ئەمەوییەکان کە پێشتر لە خوراساندا ڕەگی داکوتابوو بە هۆی ئەو لـە هەموو شوێنەکاندا بڵاوببووەوە. گوتراوە لە ڕۆژێکـدا شەسـت گونـد لـە گونـدەکانی دەڤـەری (مەرو) خۆیان گەیاندە لای (ئەبو موسلیم)، هەڵبەت هەوڵ و کۆشش و هیمەت و ڕاو تـەکبیری ئەو گەورەیە لە بڵاوبوونەوەی بانگەشەکەیدا کاریگەرییەکی زۆری بووە. خەڵك دەستە دەستە لە هەر لایەك ڕوویان تێ دەکرد، لەو ڕۆژە کە لە گوندی (سفیدەنج) لە ناوچەی مەرو ئاڵای ڕەشـی خۆی هەڵدا تاکو حەفت مانگ دوایـی کـە هـەموو ناڕازییـەکان بـەرەولای دەهـاتن خـەریکی ئامادەسازی و چاکردن و سازدانی سوپا بوو، لەو ماوەیەدا خەڵك لە هەموو شار و گونـدەکانی خوراسانەوە هاتنە هاوکاری و وەگەڵێ کەوتن، کاتێ لایەنگرانی (ئەبو موسـلیم) لـە خوراسـان خۆیەخت کەربوون و خۆیان ساز دابوو، عارەب جگە لە شەڕو توورەیی دێرینی خۆیان بیریان لـە چیترنەدەکردەوە. لە زستانی ساڵی (١٢٩ك ٧٤٧ز) دا بانگەشەکەی خۆی ئاشکرا کرد و تەواوی

دوژمنانی بەنی ئومەییە روویان تێکردو تەنانەت یەمەنییەکانیش لە دژی موزرییەکان بوونە هاوکاری، بەڵام دوایی کە راپەڕینی ڕەشپۆشەکان بەهێز بوو، ئەوانی وەلانا و زیاتر لە هەمووان مەوالی لایەنگری و پابەندی خۆیان بۆ راپەڕینە کە نیشان داو لە ماوەیەکی کورتدا خەڵك لە (هیرات و پوشەنگ و مەرو رود، تالەقان، مەرو، نەیشابور، سەرخەس، بەلخ، چەغانیە، تەخارستان، خەتلان و کش و نەخشەب ) هاتنەڕیزی سوپاکەیەوە [١٠٨].

## ڕەشپۆشەکان

ئەبو موسلیم فەرمانی بە دۆستان و لایەنگرانی خۆی و هەروەها شارەکانی خوراسانیشدا کە جلوبەرگی ڕەش لە بەر بکەن، چۆنکە ئێمە ڕەشمان پۆشیوەو، وا نزیکە دەسەڵاتی ئومەوییەکان لە ناو بچێ. خەڵکی نەسا، باوەرود، مەرورود، تالَقان... هەموویان بەفەرمانی ئەبو موسلیم جلوبەرگی ڕەشیان پۆشی، (مەدائینی) لەم بارەیەوە دەڵێ : لەبەر ئەوە رەشیان پۆشی چونکە لە پرسەی زەیدی کوڕی عەلی و یەحیای کوڕی دابوون، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە بەنی ئومەییە جلوبەرگی سەوزیان دەپۆشی و ئاڵای سەوزیان هەڵدەدا، بۆیە ئەبو موسلیم ویستی ئەم نەریتە بگۆڕێ، ئەوە بوو لەماڵەوە غولامێکی هێنا لەهەر ڕەنگ جلوبەرگی کردەبەر کۆفی لەسەر دەبەست تاکو دوایین جار ڕەشی پۆشی و کۆفیەی ڕەشی لەسەر بەست، ئەبو موسلیم وتی هیچ ڕەنگێك لەڕەش بەترس و سام و هەیبەتتر نییە، بۆیە فەرمانی دا کە جلوبەرگ و ئاڵاکان ڕەش بکەن [١٠٩]. یارانی ئەبو موسلیم بەو پۆشاکە، لەگشت لایەك لە دەوری کۆبوونەوە و بە هۆی ئەمانە بوو کەتوانی شاری مەرو لە چەنگی عارەب ڕزگار بکات.

سوپای ئەبو موسلیم لە هەموو شوێنێکدا، ڕەش پۆش بوون و دارێکی ڕەشیان لەدەست دابوو کە (کافرکوت)یان پێدەگوت، (خرفسترگن)ی زەردەشتییەکانی وە بیردینایەوە کە بۆ

---

١٠٨- تاریخ بلعمي، نسخة خطی.

١٠٩- دینوری: اخبار الطوال ، ل ٣٠٧.

*- خرفستر، بە گیانلەبەرێکی زیانمەند وەکو مار و دووپشك دەگوترێ پەیڕەوانی ئایینی زەردەشتی لەگەڵ مۆغەکاندا لە چەند ڕۆژێك لە وەرزی هاوییندا دەبووایە بۆ لە ناوبردنی ئەو جانەوەرانەی زیان بەخشن، کۆشش بکەن. بەدرێژی لە کتێبی یشتها لە نووسینی پورداود باسکراوە. ل٣٥٦ (وەرگێڕان).

نەهیشتنی پەلاماری عارەبان بەکاریان دەهێنا. ئەو ڕەشپۆشـانە هەنـدێکیان سـواری ئەسـپ و هەندێکی تر سواری کەر دەبوون، ئەوانەی سواری کەر دەبوون پێیان دەگوترا (مەروان)، چـونکە مەروان کوڕی محەمەد کە خەلیفەی دیمەشق بوو نازناوی ((حمار-کەر)) لێ نرابوو، بـەم شـێوەیە ئەبو موسلیم بە سوپایەکی بەجەرگ و نـەترس و لـەخۆبوردە و سـەرکەوتوانە گەیـشتە مـەرو، عارەبیش لەوێ خەریکی شەڕە بێ ئاکامەکانی خۆیان بوون، نەیانتوانی دەرەقـەتی بـێن، ئـەوە بوو سوپای ئەبو موسلیم هێدی هێدی لە هەموو شوێنەکان بلاوبوونەوە و مەروانییـەکانیان ڕاو دەنـان، ڕەشپۆشـەکان ڕێگـەی ئێراقیـان گرتەبـەر و سـەرئەنجام سـەرەڕای بـەرگری زۆری مەروانییەکان، کوفە تەسلیم بوو، و پەیمان و بەڵێنیان دایە ئەبو لعەباس سەفاح وەکو یەکـەمین خەلیفەی عەبباسی.

## ڕووداوی زێ

مەروان، دوایین خەلیفە هەموو هێزی خۆی لەسەر زێ لە هەرێمی موسـڵ کـۆکردەوە، ڕەش پۆشەکان هێرشیان کردەسەر و شەڕی ترسناك و بەسام دەستپێکرد، مەروان ڕای کرد و زۆر لـە سەربازەکانی کوژران، نووسراوەکە لەو شـەڕەدا سـەد هـەزار شمـشێر بەدەسـت لەگـەڵ مـەروان دابوون، بەلام سەرەڕای ئەوەش نەیانتوانی بەرگرییەکی ئەوتۆ لـە خۆیـان و دەسـەلاتی خەلیفـە بکەن، ئاشکرایە مەروان بە سوپایەکی ئاوا هیچی پێ ناکرێ! بۆیە ڕایـان کـرد، بـەلام لـەکاتی ڕاکردندا (موسلاوییەکان پردیان تێکدا تاکو مەروان نەتوانێ لەزێ بپەڕێتەوە)[110].

سەرەڕای ئەوە ناوبراو لەناو پەڕییەوە و خۆی گەیاندە دیمەشق و میسر و لەوێ کوژرا. بـەڵێ ڕووداوی زێ، شکان و کۆتایی مەروان بوو، حکوومەتی بەنی ئومەییە لـە ڕۆژهـەلات کۆتـایی پێهات، بەم شـێوەیە لێـواری زێ لـە سـاڵی ١٣٢ک/٧٥٠ز نەتـەنیا شـاهیدی ڕوخـانی بـەنی ئەمەوییە بەڵکو دوای سەدەیەك سەرکەوتنی ئێرانییـەکانی لەسـەر عـارەب تـاقیکردەوە، لـەو شەڕە و شەڕەکانی تر کە پێشتر لە ئێراق و شام ڕویان دابوو، ئەبو موسلیم خۆی بەشـدار نـەبوو چونکە بە پێویستی دەزانی خوراسان لە دەست نەدات، کاتێ خەلافەتی عەباسی لە شاری کوفە لەسەر وێرانییەکانی دەوڵەتی ئەمەوی دروست دەکرا ئەبو موسلیم، سەرداری ڕەشپۆشـەکان لـە خوراسان بوو، خۆشەویستی نیشتمان و ئایینی باوباپیران ئەویان لەوێ هێشتەوە. هێز و توانـای

---

١١٠- تجارب السلف، ل٩١.

ئەو لە خوراسان بێ وێنەبوو، لە شارەکانی مەرو و سەمەرقەنددا مزگەوت و شـوورەگەلی زۆری دروستکردن، لە شوێنەکانی تری نزیك تورکستان و چینیش هەندێ پێشڕەوی کردو سـەرکەوتنی وەدەست هێنا. کێ دەزانێ لەو ماوەیەدا چ بیرو ئەندێشەیەکی لەسـەر دابـووە و زەمینـەی بـۆ چکار و ڕێگایەك خۆش دەکرد؟ ئەوەی هەیە ئەوەیە کە هەم لە شیعە بـوونی گومـان دەکـرێ و هەم سونی بوونی — لە بەسەرهاتی چیرۆکی بێهئافەریـد دا دیـارە کـە بـۆ پاراسـتنی ئـایینی زەردەشتی بە لایەنی کەمەوە ئەوەندەی ئایینی ئیسلام تێکۆشاوە.

## بێهئافەرید

هاوکات لەگەڵ کۆتایی هاتنی دەوڵەتی ئەمەوی لـە خوراسـان، بـۆ ڕزگـاربوون لـە دەسـت عارەب بەهاوکاری (ئەبو موسلیم) ڕاپەڕینی بێهئافەرید دەسـتیپێکرد، لـە بـارەی بیروبـاوەڕی ناوبراو ئەوەی لە سەرچاوەکان دەردەکەوێ زانیارییەکی ئەوتۆنییە.

نووسیویانە کە (بێهئافەرید) کوڕی (ماه فەروەردین) خەڵکی (زەوزەن) بووە، لـە سـەرەتای کاریدا ماوەیەك ون بووە و چووتە چین و بۆ ماوەی حەوت ساڵ لەوێ ماوەتەوە، کاتێ گەڕایـەوە لە دیارییەکانی ئەوێ پارچەیەك قوماشی سەوزی هێناوە کە کاتێك دەیپێچایەوە لە نێو دەستدا خڕدەبووەوە، (بێهئافەرید) کاتێك لە چین گەڕایەوە لە گوندی (سیراوەند) یەکێ لـە گونـدەکانی خەوافی نیشابور نیشتەجێ بوو و ئایینێکی تازەی هێنا. لەوێ شـەوانە دەچـووە سـەرگردێك و بەیانی دادەبەزی، پیاوێکی جووتیار لەمەزرای خۆی، جارێك دەیبینێ و بێهئافەرید ناوبراوی بۆ ئایینی خوی بانگێشت کـرد و وتـی مـن تائێـستا لـە ئاسمـان بـووم، بەهەشـت و دۆزەخیـان نیشانداوم، خواش وەحی بۆناردووم، ئەم قوماشە سەوزەی لە بەر کـردووم و بـۆ زەوی نـاردووم! جووتیارەکەش باوەڕی پێکرد و خـەڵکێکی زۆر لـە دەوری کۆبـووەوە[١١١] ئـەم گێڕانەوەیـە کـە (ئەبورەیحانی بیرونی) سەبارەت بە دەسپێکی ئەو باسیکردووە لە ئەفسانەو چیرۆك بەدوور نییە، لەوانە زیاتر، شتێك لەدەست نووسەکانەوە بەدەست نایەت، لە بارەی بیروبـاوەڕ و بۆچوونیـشی

١١١- ابوریحان بیرونی: اثار الباقیة، ل ٢١٠. چاپ، لایپ زیك. داستانی بە ئافەرید لە جـەوامع ئـەلحکایاتی عەوفیدا بەدرێژی هاتووە، لەتەبایع ئەلحەیوان، شەرف ئەلزەمان، مەروزی ئەم داستانە بـووە لـە بـارەی چـین و تورك و هیندەوە کە مینۆرسکی لە وەرگێڕنە ئینگلیزیەکەدا ئاماژەی پێداوە، ل ٣ وە ل ٤٥. هەروەها بگەڕێوە بۆ Turkestan.

ناكۆكی هەیە، هەندێك پێیانوایە بۆ سەر ئـاییـنی ئیـسلام داوەت كـراوە و پەسـەندی كـردووە، بەڵام چونكە (كاهنی) كـردووە، موسـڵمانییەتییەكەی ڕەتكراوەتـەوە[112]، بـەڵام لـە قـسەكانی (ئەبوریحان) وادەردەكەوێت كە (بێهئافەریـد) لـە هـەوڵی ئـەوەدابووە كـە ئـاییـنی زەردەشـتی چاكسازی بكات و ڕەنگە ویستبێتی لە نێوان زەردەشتی و ئیـسلامدا ئاشـتییەك بـەرپابكات. لەبەرئەوە ئاییـنی زەردەشتی پەسەند كردو ڕازی بوو، بـەڵام لـە زۆر حـوكمی شـەرعیدا لەگـەڵ زەردەشتی دژایەتی كرد. بۆ لایەنگرانی خۆی كتێبێكـی بەفارسـی دانـا كـە تێیـدا فـەرمان و بڕیاری ئایینی خۆی باسكردووە، ئەوەی ئەبورەیحان لە بارەی ڕێنوێنی و ڕێسا و بڕیارەكانییـەوە باسـیان دەكـات ڕەنگـە بـەدەر لـە هەڵـە و نادروسـتی نـەبێ، بـەڵام سـەرنج ڕاكێـشن. لـە نووسـراوەكانیدا دەردەكـەوێ كـە بێهئافەریـد داهێنـانێكی نوێـێ لـە ئـاییـنی زەردەشـتی هێنابێتەكایەوە، ڕەنگە هۆكاری سەرەكی كـورتی مـەتی بزاڤەكـەی بـۆ ئـەوە بگەڕێتـەوە كـە زەردەوشتی و موسڵمان هەردووكیان لە ڕاپەڕینەكەی ئەو توورە و نـاڕازی بـوون. دەڵـێن كاتـێ ئەبو موسلیم گەیشتە نەیشابور مۆبدان و هێربودان كە مامۆستای زانـستی ئـاییـنی و دادوەری زەردەشتی بوون لە دەوری كۆبوونەوە و سكاڵایان دژبە بێهئافەریـد پێـشكەشكرد و پێیـانگوت ئیسلام و زەردەشتی تێكداوە، ئەبو موسلیم (عەبـدوڵڵای كـوڕی شـوعبەی) ناردەسـەری و لـە چیاكانی بادغیس وەچەنكی كەوت و بردییە لای ئەبو موسـلیم، ئـەویش بڕیـاری كوشـتنی دا، هەركام لەیارانی كە دۆزرانەوە، كوژران[113]، بەمشێوەیە لایەنگرانی كە چاوەڕوانی هاتنـەوەیان دەكرد لای موسڵمانان بەكافرو لای زەردەشتییەكانیش بە ئەهلی بیدعەت ژمێردران، لەبەرئەوە زۆر بەسەختی كەوتنەبەر ئازار و ئەشكەنجە و ڕاوەدوونانی هـەر دوولا، نووسـەرانی كتێبـەكانی ملل والنحل ڕێبازی بێهئافەریدیان بەیەكێك لە چوار ئایین زای زەردەشتی ژماردووە كە بریتـی بوون لە (زەرڤانییە)، (خورەمییە)، (مەسخییە)، (بێهئافەریدی)[114] بەباوەڕی ئـەو نووسـەرانە سەرەڕای ئەوەی كـە گوتـاری (بێهئافەریـد) لـەگوتاری زەردەشـتییە ڕەسـەنەكان پەسـەندترە،

---

١١٢- ابن نديم : الفهرست ،ل ٤٨٣.

١١٣- بيرونى، اثارالباقية ، ل ٢١١.

١١٤- ئەم چوارفرقەیە لەئایین زایەكانی زەردەشتین كە شافعی گوتویەتی خواردنی گۆشتی كە بەدەستی ئـەوان كوژرابێتەوە و پەیوەندی ژن و مێردایەتی لەگەڵیان حەرامە. بغدادی: الفرق بين الفـرق، ل ٢٥٧. هاشـم رضـى: زروان درقلمرو دين و اساطير، انتشارات فروهر، ١٣٥٩، ل ١٢.

جزیەیان لێوەرناگیرێت[115] چونکە ئایینی ئەوان بیدعەتێك بوو لەسەردەمی ئیسلامیدا سەری هەڵدا. مسۆگەر لەبەر ئەو هۆیەبوو کە ئایینی ئەو بەئەنقەست پشتگوێ خرا، ڕووداوی (بێهئافەرید) وانیشان دەدات کە ئەبو موسلیم بۆ ڕاکێشانی زەردەشتییەکانی خوراسان چەند هەوڵی داوە، لە چیرۆکی سەنباد دەتوانین پاڵپشتێکی تر بۆ ئەم گریمانەیە دابنێین. ڕق ئەستووری دژی عارەب و خۆشویستی بۆ ئایین و نەژادی ئێرانی پاڵنەرێکی گرنگ بوون بوێ، بەهەرحاڵ ئەو ئاماژەو نیشانانەی کە سەبارەت بە دەسەڵاتخوازییەکانی ئەو دەردەکەوتن، هەمیشە مایەی ترس و دڵەڕاوکێی عەبباسییەکان بوون.

## نیگەرانی مەنسور

هەر دوابەدوای رووخانی مەروان کە خەلافەت کەوتە دەست عەبباسییەکان (ئەبو جەعفەری مەنسور) برای (سەفاح) بە بەردەوامی چاودێری هەڵسوکەوت و رەوشی (ئەبو موسلیم) بوو.

ئەبو موسلیمیش بەوئازایەتی و لە خۆبایی بوونە تایبەتەی کە هەیبوو هیچ گرنگی بەوبرا زیرەك و فێڵ باز و زانەخرۆیەی خەلیفە نەدەدا، بەم شێوەیە ناکۆکییەکی نهێنی و سەخت لە نێوان ئەو دوو لایەنە دژبەرەی یەکتر هەبوو، مەنسور هەمیشە سەفاحی برای دژی (ئەبو موسلیم) و کوشتنی هان دەدا.

گێڕدراوەکان دەڵێن کاتێ کە (سەفاح)، مەنسوری برای ناردە خوراسان تاکو داوا لە ئەبو موسلیم بکات (ئەبوسەلەمەی خەلال) کە بە لایەنگری و دۆستایەتی عەلەوییەکان تۆمەتبار بوو لەناو ببات. ((ئەبو موسلیم سولێمانی کوڕی کەسیر کەسەردەستەی گەردەن کێشەکان بوو و مرۆڤێکی گەورە بوو)) بەو قسەی کە لێیان گێڕابووەوە بڕیاری دا تاکو لە پێش چاوی مەنسور بیکوژن، (مەنسور) لەو ڕەفتارەی (ئەبو موسلیم) زۆر تووڕبوو و دڵی ڕەنجا کاتێ گەڕایەوە لای (سەفاح) رقی ئەبو موسلیمی لەدڵ گرت، وتی ئەو مرۆڤە بەم دام و دەزگایە کە هەیەتی، گەر نیازی بێ دەتوانێ کارەکانمان لەدەست دەربهێنێ و بیداتە یەکێکی تر و ئەم بابەتەشی بۆ (سەفاح) گێڕایەوە، لەژێرەوە دەیشێلا و هەوڵی دەدا هانی (سەفاح) بدا بۆ پەلکێشردنی (ئەبو موسلیم) یاکوشتنی بۆ ئەوەی کارەکانیان بکەوێتە سەریەك[116].

---

١١٥- بغدادي: الفرق بين الفرق، ل ٢١٥.

١١٦- مولف مجهول: مجمل التواريخ والقصص، ل ٣٢٣.

مردنی لە ناکاوی (سەفاح) ترس و نیگەرانی (مەنسور)ی زیاتر کرد، دوای مردنی (سەفاح) عەبدوللای کوڕی عەلی مامی بۆ گرتنەدەستی خەلافەت هەلسایە سەرپێ و کۆمەلێکیش پشتیوانیان لێ دەکرد، ئەبو جەعفەری مەنسور زۆر نیگەران بوو، ناچار بوو پەنا بۆ (ئەبو موسلیم) ببات تاکو چارەسەرییەك بدۆزێتەوە، هەرچەندە (ئەبو موسلیم) بەدوای بیانو دەگەڕا چونکە حەزی لەو شەڕەنەبوو، بۆیە پێی وت کاری (عەبدوللا) لە شام زۆر گرنگ نییە پێویستە زیاتر نیگەرانی خوراسان بی، بەو بیانویە (ئەبو موسلیم) ویستی خۆی دوور بکات لەم کێشەیە و بچێتە خوراسان، ئایا لەم بارەیەوە ئەبو موسلیم بیر و ئەندێشەی سەربەخۆیی خوراسانی هەبووە؟ ئایا ئەویش وەکو عەبدوللا کوڕی عەلی کە خوازیاری خەلافەت بوو لە خوراسان جاڕی سەربەخۆیی بدات و خۆی بە بنەمالەی عەباسییەکان بناسێنێت؟ ڕەنگە وابێ، بەلام مێژوونووسەکان نووسیویانە ئەو بەنیازبووە مەیدان بۆ ئەو دوو ڕکابەرە چۆل بکات کە هەر کامیان سەرکەوتن ئەوبێتە خەلیفە، بەلام ئەو کارەش ڕێگەنەدرا، دەرئەنجام و لەکۆتاییدا (ئەبو موسلیم) ناچارکرا بەپالپشتی (مەنسور) بەشداری لەشەڕ بکات دژی (عەبدوللا)، لەو شەڕەدا توندییەکی ئەوتۆی بەکارنەهێناو خۆی نیشان نەدا. تاکو کاتێ کە عەبدوللا ڕای کرد، ئەبو موسلیم نەکەوتە شوێنی، بە پێچەوانەی چاوەڕوانی مەنسور. (عەبدوللا) چوو بۆ بەسرا و لای سولێمانی برای کە والی بوو خۆی حەشاردا، (مەنسور) خەلکێکی تری نارد تاکو ئەو دەستکەوتانەی کەوتبوونە دەست (ئەبو موسلیم) لەو شەڕەدا سەرژمێری بکەن، کاتێ ئەو نوێنەرانە گەیشتنە لای ئەبو موسلیم سەرداری ڕەشپۆشەکان زۆر تووڕەبوو، هاواری کرد و بەهەڕەشەو شەڕەوە پێی وتن ((من لەخوێن ڕشتنی موسلمانناندا ئەمینم، بەلام بەمالیان ئەمین نیم))؟ ئینجا چەند جنێوێکی پیسی حەوالەی (مەنسور) کردن. کاتێ (مەنسور) ئەو هەوالەی پێگەیشت ڕقی زیاتر لە ئەبو موسلیم هەستاو زۆر لێی نیگەران بوو لەوەی کە هێز و شکۆی ئەو لە خوراسان خەلافەتەکەی کز و بێڕەنگ بکەن، عارەبەکانیش کە ڕق و کینەیەکی زۆریان لە ئەبو موسلیم لە دل نابوو، زیاتر رقی مەنسوریان دژی هاندەداو بێ باوەڕی زیاتریان دەخستە ناودلییەوە.

وەکو نووسراوە مەنسور ((ڕۆژێك بە موسلیمی کوڕی قوتەیبەی گوت: چۆن لە کاروباری ئەبو موسلیم دەڕوانی؟ وەڵامی دایەوە ﴿لوکان فیهما الهه الاالله لفسدتا﴾ ( مەنسور) وتی بەسە ئەم قسەیەت بەگوێچکەی کەسێکدا دا، کە لەگوێی دەگرێت[117].

## ئاکامی ئەبو موسلیم

هەروەکو لە سەرچاوە مێژوویەکاندا هاتووە، ئاکامی ڕق و تووڕەیی مەنسور بەرامبەر بە ئەبو موسلیم، تۆڕێکی فرت و فێڵی بۆ نایەوە و کوشتی. مێژوونووسان بەم شێوەیە لەو بارەیەوە نووسیویانە کە مەنسور ئەبو موسلیمی بانگهێشت کردووە یا باشتر بڵێین پەلکێشی کردووە. ئەبو موسلیم ((کە گەیشتەلای مەنسور ڕێزی گرت. ئینجا وتی بگەڕێوە ئەمڕۆ پشوو بدە تاکو بەیانی پێك بگەینەوە، ئەبو موسلیم گەڕایەوە. ئەو ڕۆژە پشووی دا، مەنسور ڕۆژی دواتر چەند کەسێکی شارد بووەوە و لە ژوورەکەی خۆی ئاگاداری کردبوون کاتێك من دەستم لێك دا ئێوە وەرن ئەبو موسلیم کە هیچ چەکێکی لا نەبوو بکوژن. ئەوەبوو ناردی بەدوای ئەبو موسلیم و ئامادە بوو مەنسور وتی ئەو شمشێرەی کە لە لەشکری (عەبدوڵلا) دۆزیتەوە لە کوێیە؟ ئەبو موسلیم شمشێری لە دەستی بوو نیشانی داو وتی ئەوەیە مەنسور شمشێرەکەی لێوەرگرت و خستییە ژێر ڕاخەرەکەی خۆی و دەستی بە قسەکردن کرد، بە قسەی زۆر ناشیرین و یەك لەدوای یەك تاوانەکانی دەژماردن، ئەبو موسلیمیش داوای لێبووردنی دەخواست و بۆ هەرکام وەڵامێکی دێنایەوە، لە کۆتاییدا وتی یا ئەمیر لموئمنین وێڕای ئەو زەحمەت و ماندووبوونەی کە بۆ دەوڵەتەکەتان کێشاومە ئاوام قسە لەگەڵ دەکەی؟ مەنسور بە تووڕەییێکی زۆرەوە جنێوی پێداو وتی ئەوەی تۆ کردووتە بە کەنیزێکی ڕەش پێستیش دەکرا. ئەبوموسلیم وتی واز لەو قسانە بهینە و بزانە کە من جگە لە خودا لە کەسی تر ناترسم، مەنسور دەستەکانی لێك داو ئەو کۆمەڵە پیاوە دەرکەوتن و بە شمشێر کەوتنە گیانی ئەبو موسلیم[118]، بەمشێوەیە بوو ئاکامی ئەبوموسلیم، ئاکامی مرۆڤێك کە خەلافەت و حکوومەتی گەورەی (بەنی ئومەییەی) ڕوخاند. پێش ئەوەی بتوانێ ئەو دەوڵەت و پاشایەتییەی کە خۆی ئارەزووی بوو دابمەزرێنێ، بەهۆی غەدر و خیانەت کوژرا، لە بارەی ناوبراو گوتراوە مرۆڤێکی کورتە باڵا،

---

١١٧- ابن خلكان: وفيات الاعيان: ب٢، ل ٣٢٩. دينوري: اخبار الطوال، ل ٣١٨.

١١٨ -تجارب السلف: ل ١١٤.

قژو و مووی گەنمی خاوێن و جوان و چاوڕەش و نێوچاوان بەرین و ڕیش و قژی درێژی بووە، بەزمانەکانی ئێرانی و هەروەها عارەبی بەباشی قسەی دەکرد، زمانێکی شیرین و قسەخۆش، شیعری زۆری دەزانی، لە کارەکانی دا زانا و شارەزا بووە، جگە لەکاتی خۆی و پێویست نەبوا پێنەدەکەنی و ڕووی ترش نەدەکرد و لە حاڵەتی خۆی دەرنەدەچوو[119]، لەگەڵ دوژمنانی ئەوەندە توندبوو بەزەیی بە پێر نەدەهاتەوە، هەروەك خۆی گوتویەتی زیاتر لەسەد هەزار کەسی کوشتووە[120]. ئەبو موسلیم مەبەستی چی بووە چ شتێکی لەسەردابووە؟ ئەوە لە سەرچاوەکان و بەڵگەنامەکانی ئەمڕۆ ناتوانرێ وەدەست بخرێ، ئاشکرایە ترس و نیگەرانی منسوری عەباسی لەجێی خۆی بووە، هەر چۆنێك بێت دەشێ دەرکەوتنی ئەو بە سەرەتاو دەستپێکی هەڵسانەوەی ئێران بژمێردرێ، لە ڕاستیدا ئەبو موسلیم بە لەناوبردنی دەسەڵاتی ستەمکاری ئومەوی، دیدی خۆ بە بەرزتربینینی عارەبی خستە لاوە و بواری تازە بۆ بەرجەستە بوون و دەرکەوتنی زەوق و هزر و داهێنانی ئێرانی لە نێو دام و دەزگا و دامەزراوە سیاسی وکۆمەڵایەتییەکانی ئیسلامدا، هاتە کایەوە. بەم شێوەیە ئەگەرچی هەموو ئارەزووە دێرین و باڵاکانی ئەبو موسلیم نەهاتنە دی، بەڵام بەشی زۆریان جێبەجێ بوون. ئایا دەتوانین بڵێین تۆڵەی شکانی (نەهاوەند) لەلای ئێرانییەکان لە زابدا کرایەوە؟ پرسیارێکی جوانە، لە ڕاستیدا شکانی (مەروانی حەمار) لە زاب بنیاد و بناغەی بنچینەیی دەوڵەتی جەور و ستەمی بەنی ئومەیەی نەهێشت، کەئەوە ئارەزوویەکی شاراوەی ئەبو موسلیم بوو، زۆری نەخایاند لە نزیك وێرانەکانی شاری تیسفون، بەغدا دروست کراو، خەلافەتی نوێ لەسەردەستی ئێرانییەکان هاتە سەر دەسەڵات و لە وێدا هەموو شتێك یادەوەری سەردەمی گەورەیی و شکۆ و شایی و لوغان و کەیف سەفای ساسانی بوو، بەڵام ئارەزوویەك کە ئەبو موسلیم لەم بارەیەوە هەیبوو پێدەچێت لەوە زیاتر بووبێ، هەرچۆنێك بێت ئەو خەلیفانەی بەغدا بەوتەی (دار میستەتێر) : ساسانیانێك بوون کە خوێنی عارەبییان لە دەماردابوو[121]، لەگەڵ ئەوەشدا ساسانییە (عارەب نەژادەکان) لە کاتێکدا کە خۆیان بە زەلیلی هێز و توانای مەعنەوی ئێران و قەرزداری پیاوەتی و مێرخاسی ئێرانییەکان دەزانی، لەو هێزە ڕەگداکوتاوە، ناڕازی بوون. لەبەر ئەوە، بۆ ڕزگاری خۆیان هەر دەرفەتێکیان

---

١١٩- ابن خلکان: ب٢، ل ٣٢٦.

١٢٠- براون: تاریخ ادبی ایران، ترجمة علی پاشا صالح، ل ٣٥٨. وەرگێراو لەیەعقوبی.

121- Darmesteter، Coupdoeil P39.

بۆ هەڵکەوتبا، درێغیان نەدەکرد و هەوڵی خۆیان دەدا. ئەو فیڵ و تەڵەیەی مەنسور کە بە داوەتکردنی ئەبو موسلیم، ناوبراوی خستەداو کوشتی نموونەیەکە لەو هەوڵە نارەوایانە.(کوژرانی ئەبو سەلەمەی خەلالی هەمەدانی)ی وەزیری ئالی موحەممەد و[122] لە ناو بردنی بنەماڵەی بەرمەکییەکان نموونەیەکی ترە لەو نەخشە گلاوەی ئەو (بەنی عەبباس) یانە.

## تۆڵەی ئەبو موسلیم

هەرچەندە ئەبو موسلیم کەوتە داوی تەماع و ئیرەیی بردنی عارەبان، بەڵام لە نێو دڵ و یاد و یادەوەریی ئێرانییەکاندا وەکو بیرەوەرییێکی زۆر پیرۆز، هەتا هەتایە مایەوە. بیر و ئەندێشەی زیندووکردنەوەی داب و نەریتە ئایینییە کۆنەکانی ئێران، بەردەوام دۆست و لایەنگرەکانی ئەوی یان دژی عارەبان هان دەدا.

لەبەر ئەوە ئەو راپەڕینانەی کە لە دوای کوشتنی (ئەبو موسلیم) بۆ تۆڵەکردنەوەی خوێنی ئەو ئەنجام دران، رەنگ و بۆی ئایینی یان پێوە بوو. (سەنباد) مەبەستی وێرانکردنی (کەعبە) بوو. (ئوستادسیس) داوای پێغەمبەرایەتی دەکرد، (موقەنەع) داوایی خودایی. هەموو ئەو راپەڕینانە هەر دروشمێك هەیان بوایە گشتیان یەك ئامانجیان هەبوو کە ئەویش رزگاربوون بوو لەکۆت و بەندێکی گران و دەردناك، کە هەموو جۆرە زەبوونی و چەوساندنەوەیەکی بەسەر ئێرانییەکاندا دەسەپاند و ئەوەش گەورەترین پاڵنەر بوو کە رۆڵە ستەملێکراو و فریودراو و داخ لەدڵەکانی، لەدژی ستەمکارە فریودەرەکان لە دەوری سەردارو فەرمانسدە ئازاکانی خۆیان کۆدەکردەوە.

ناوەندی ئەو راپەڕینانە خوراسان بوو، چونکە خوراسان شوێنی پەروەردەکردنی پاڵەوانانو لانکی بیرەوەری و چیرۆکە ئەفسانەییەکان بوو. دلاوەرەکانی هێشتا رۆژانی رابردۆیان لە

---

122- ئەم ئەبو سەلەمەکە لە دەوڵەمەندەکانی شاری کوفە بوو، لە کردنەوەی بانگێشتی عەباسیدا لە سەرەتاوە بایەخی پێدراوە، کاتێك ئەمەوییەکان ئیبراهیم ئیمامیان گرت براکانی (ابولعباس) سەفاح و ئەبو جەعفەر مەنسور رایان کرد ئەو لە کوفە پەنای پێدان، کاتێك سەفاح هاتە سەر کار کردییە وەزیر لەبەرئەوە پێیان گوتووە وزیری ئالی موحەممەد، بەڵام بە هۆی شك و گومان دەرئەنجام بە رەزامەندی ئەبوموسلیم بە شەو لە کۆڵان کوژرا. بۆ زیاتر زانیاری بگەرێوە بۆ تجارب السلف، ل ٩٧ تا ١٠٠ و دستور الوزراء، میر خواند، ل ٢٥ چاپ تهران — و کتێبە مێژووییەکان.

بیرنەچووبووەوە. لە زۆربەی راپەڕینەکان خوێنی ئەبو موسلیم بیانوویەك بوو. ئەو سەردارە ناودارە خوراسانیە لەلای هەموو خەڵکی ناوچەکە جێگەی ڕێزبوو و دەیان پەرست. پێدەچێت زۆربەی ئێرانییە موسڵمانەکان ئەویان بەپێشەوای ڕاستەقینەی خۆیان زانیبێ و پلەوپایەی ئەویان وەکو لە ئاستی مەهدەویەت، تەنانەت خودایی دادەنا. بۆیە کە کوژرا دۆستان و لایەنگرانی لە دورماندۆری شارەکانەوە بڵاوەیان کرد و خەڵکیان بە ناوی ئەوەوە بانگێشت دەکرد. هەر وەکو یەکێك لەوانە چووتە ئەوبەری ڕووبار (ماورالنهر) و لەوێ خەڵکی بۆ ئەبو موسلیم بانگێشت کردووە، دەیانگوت ئەبو موسلیم لە چیاکانی (رەی) دا خۆی پەنای گرتووە کاتێ کە سەرهەڵدان کاتی داهات، دێتەوە.

خۆشەویستی ئێرانییەکان بۆ ئەبو موسلیم بێ وێنەبووە. ماوەیەك دوای ئەو هەندێکیان هەر بە زیندوویان دەزانی و لەو باوەڕە دابوون کە لە ئەرکەکانیاندا هیچ شتێکیان لە ناسینی ئەبو موسلیم بە پێویست ترو ئەرکتر نەدەزانی، ئەم هەوێنەی خۆشەیستییە هێزێك بوو کە هەموو دەم دەتوانێ هەڕەشە لە دەزگای خەلافەتی عەبباسی بکات. لەبەر ئەوە بوو کە بزاڤە (شعوبی) ئێرانییەکان لەگەڵ یادی ئەو سەردارەدا، تێك بەستراونەتەوە.

## راوەندییەکان

سەرنج ڕاکێشتر لە هەموو ئەو بزووتنەوانە راپەڕینی (راوەندی)یەکانە، کە بەئاشکرا وایان نیشان دەدا، کە دۆستی مەنسورن، بەڵام لەڕاستیدا بەتایبەت دوای ڕووداوی ئەبو موسلیم ئامانجیان لەناوبردنی مەنسور بوو، ئەوەی ڕاستی بێت ئەوەیە کە ئەو بزاڤە هەوڵدانێك بوو بۆ خافڵگیرکردنی مەنسور، هەر وەکو ئەو ئەبو موسلیمی خافڵگیرکردبوو و بەفرت و فێڵ لە ناوی بردبوو، ئەوانیش بەهەمان شێوە لە ناوی ببەن.

بەسەرهاتی ئەو ڕووداوە هەر وەکو لە مێژووەکاندا هاتووە بەو شێوەیەیە کە: ئەم کۆمەڵە خەڵکی خوراسان بوون و وایان پێشان دەدا گوایە مەنسور خوداوەندی ئەوانە. هەموویان چوونە شاری مەنسور کە لە دەوروبەری کوفەبوو و ناوی هاشمییە بوو، لەچوار دەوری کۆشکی ئەو دەسووڕانەوە و هاواریان دەکرد و دەیان وت ئەوە کۆشکی پەروەردگاری ئێمەیە، مەنسور گەورەکانی لێگرتن و زیندانی کردن، ئەوانی تر هێرشیان بۆ کردو هەڵیان کوتایە سەر و لە هەموولایەك کۆبوونەوە و بەندیخانەیان شکاند و بەندکراوەکانیان ئازادکردن، بەرە و لای

مەنسور ڕویشتن، مەنسور هاتە مەیدان و شەڕی لەگەڵدا کردن[123] ، هەرچەند ئەمانە کۆمەڵێك بوون باوەڕیان بە دونایدون (تەناسوخ) هەبوو، بەڵام لەسەرەوە خۆیان بەدۆستی عەباسییەکان نیشان دەدا[124] ، بەڵام زۆر زۆر هۆگری ئەبو موسلیم بوون، کوشتنی ئەبو موسلیم سەرەڕای ئەو هەموو خزمەتەی کە بەدەزگای خەلافەتی گەیاندبوو ببووە هۆی مەترسی و نیگەرانی یان، لەبەر ئەوە لە بارەی کوشتنی ئەوەوە ڕاوبۆچوونی زۆر هەیە.

ڕاستی بۆچوونی بانگەشەکەیان ڕوون نییە، وادەردەکەوێ کە لە هەوڵی لاوازکردنی خەلافەتی مەنسور دابوونە و ویستویانە تۆڵەی خوێنی ئەبو موسلیمی لێ بکەنەوە .

## سەنباد

بەڵام لە هەموو ئەو ڕاپەڕینانە گەرمتر و بەتین تر کە دۆستانی ئەبو موسلیم بۆ تۆڵەی خوێنی ڕاپەڕیبوون، سەنبادی زەردەشتی بوو، بەڵام سەنباد کێ بوو؟ ئەگەر ئەوەی مێژوو نووسانی موسڵمان لە بارەیان نووسیووە و بە هەرحاڵ بێگومان دوور لە لاگیری موسڵمانی نییە، ئەوا ڕاپەڕینەکەی لە ڕاپەڕینێکی یاخیگەریانە بترازێ شتێکی تری لێ بەدی ناکرێ، بەڵام بە قووڵبوونەوە لە هۆکارو ئاکامەکانی ڕووداوەکە ئەم خاڵەی تیادا بەرجەستە دەبێت کە ڕاپەڕینەکەی ئەو زۆر لەوە گەورەتر بووە کە مێژوونووسەکان باسیانکردووە و نووسیویانە. بێ زاری لە جەور و ستەمی زۆرداران، پتر لە هەستی تۆڵەکردنەوە ئەو قارەمانەی هان داوە و پشتگیری کردووە. ڕاپەڕینە گەرم و خوێناوییەکەی (سەنباد) کە زیاتر لە حەفتا ڕۆژی نەخایاند بۆ ئەو کەسانەی دوای وی، کە دژی ستەمی عەبباسییەکان ڕاپەڕینیان ئەنجامدا سەر مەشقێکی زیندوو بوو.لە مێژووەکاندا پێش ئەو ڕووداوە باسێك لە بارەی ئەوەوە نەکراوە و ناوی نەهێنراوە، سەرچاوەکان نووسیویانە کە ناوبراو زەردەشتی بووە و لە یەکێك لە گوندەکانی نەیشابوور بە ناوی (ئاهەن) نیشتەجێ بووە و لەوێ سەروەت و سامانێکی زۆری هەبووە و بە

---

١٢٣- هندوشا: تجارب السف، ل ١٠٥.

١٢٤- لە بارەی بیروباوەڕی ( ڕاوەندی)یەوە وەکو دیار و ئاشکرایە هەندێك لەوان ئیمامەتیان بەمیراتگری محەمەد مامی عەباس و منداڵەکانی دەزانی.

رازی: تبصرة العوام، ل ١٧٨. ابن حزم، ملل والنحل، ب٤ ، ل ١٨٧. اشعری: مقالات اشعری، ل ٢١. خوارزمی: مفاتیح، ل ٢٢.

یەکێك لە دۆستان و لایەنگرانی ئەبو موسلیم ناسراوە و سەبارەت بە چۆنیەتی یەکترناسینیان چیرۆك و سەربردەیان نووسیووە. هەروەکو ((ئەو کاتە ئیبراهیم ئیمام ئەبو موسلیمی ناردبوو بۆ خوراسان، لە ڕێگەی نەیشابوور تێپەڕدەبێ، لە ماڵی سەنباد دادەبەزێ لە ناکاو بۆ کارێك دەردەچێت، گوێدرێژەکەی لەبەر دەرگای ماڵی سەنباد بەستۆتەوە دەرگاکەی هەڵکەندووە، کاتێ ئەبو موسلیم گەڕایەوە ئەوانەی لەوێ بوون داوایان لە ئەبو موسلیم کرد کە دەبێ دەرگاکەیان چابکاتەوە دەنگەدەنگ و هەرا کەوتەوە، ئەو دەنگە دەنگو هەرایە گەیشتە سەنباد، هاتەدەرەوە کاتێك سەیری ئەبو موسلیمی کرد تێگەیشت کە ئەو پیاوە پیاوێکی هەڵکەوتووە و پلەو پایەی بەرزدەبێتەوە. ئەوانەی ئەبو موسلیمیان هەراسان کردبوو، ئازاری دان و ئەبو موسلیمی بردەوە ماڵی خۆیان. چەند ڕۆژێك مێواندارییێکی باشی کرد، دوایی پرسیاری لە مەبەستی ئەبو موسلیم کرد، وەڵامی نەدایەوە سەنباد داوای لێکرد لەگەڵی ڕاست بێ و دڵنیابێ کە نهێنییەکەی دەپارێزێ. ئەبو موسلیم کەمێکی بۆ باسکرد. سەنباد وتی دووربینی من و پێشبینی من ئەوەیە کە تۆ ئەم جیهانە ئاوەژوو دەکەیتەوە و عارەب لە ڕێ و ڕەچەڵەك دەردەهێنی و ئەم جیهانە دەگۆڕی، پێشبینییەکانی من هیچ کات بە هەڵە نەڕۆیشتوون. ئەبو موسلیم زۆر شاد بوو و لەوێ ڕۆیشت))[125] یەکێکی تر لە مێژوونووسان بەم شێوەیە دەگێڕێتەوە: ((سەنباد لە ئاگر پەرستانی نەیشابوور بوو، وەکو دەڵێن پیاوێکی دەست ڕۆیشتوو بووە، ئەو ڕۆژەی کە ئەبو موسلیم لەلای ئیبراهیم ئیمامەوە بەرەو مەرو دەرچوو دیتی و نیشانەی پیاوەتی و گەورەیی لە نێو چاوانی خوێندەوە و بردی بۆ ماڵەوە و مێواندارییێکی چاکی کرد، پرسیاری لە بارەی کرد ئەبو موسلیم هەوڵیدا نهێنی خۆی بپارێزی. سەنباد وتی باسی خۆتم بۆ بکە من نهێنی پارێزم و هیچ نهێنییەکی تۆ نادرکێنم و ئاشکرای ناکەم، ئەبو موسلیم بە ئاماژە کردنێك قسەی دڵی خۆی بۆ کرد. سەنباد وتی من لە پێشبینی خۆم بەم ئەنجامە گەیشتم کە تۆ جیهان سەراوبن دەکەی و زۆر لە گەورە پیاوانی عارەب و سەرانی عەجەم دەکوژی. ئەبو موسلیم زۆر دڵی خۆش بوو، ئیزنی خواست و بەرەو نەیشابوور بەڕێ کەوت[126]. جێگەی وەبیر هێنانەوەیە کە ئەو بەسەرهاتە لە سەرچاوە کۆنەکاندا نییە و پێدەچێت لە سەرچاوە تازەترەکانیشدا ئەفسانە و بەسەرهاتی لەو جۆرە نووسرابن. بەهەرحاڵ ئەو

---

١٢٥- حافظ برو: زبدة التواريخ نسخة خطي مجلس.

١٢٦- ميرخواند: روضة الصفا، ب٣ .

گێڕانەوەیەش لە هەمان ئەو جۆرە سەرچاوانەدا هاتووەو دەڵێت: ((ڕێکەوت وابوو کە سەنباد کوڕێکی بچووکی هەبووە و لەگەڵ یەکێك لە منداڵە عارەبەکاندا لە قوتابخانەی گەڕەکی (بۆی ئاباد)ی نەیشابوور کە چوار سەد ٤٠٠ کەس عارەبی لێ بوون، ڕۆژێك کوڕی سەنباد لەگەڵ کوڕە عارەبێك دەبێتە شەڕیان، کوڕی سەنباد سەری کوڕە عارەبەکەی شکاند و خوێن بەسەر و چاویدا هاتەخوار، گەڕایەوە ماڵ لای باوکی ئەویش بە کوڕەکەی گوت قسە مەکە و لەگەڵی ببە برادەر و هاوڕێ، پاشان کە بوونە برادەر، کوڕەکەی سەنبادی بردەوە ماڵ، کەسێکی ناردە لای باوکی کە کوڕەکەت لێرەیە و وەرە بیبەوە سەنبادیش دەچێتە ماڵی کابرای عارەب. عارەبی کەلەبۆر پێشتر کوڕەکەی سەنبادی کوشتبوو و کردبوویە برِیانی و ئەندامێکی بۆ سەنباد لەسەر سفرە دانا. دوای کۆکردنەوەی سفرەکە عارەبەکە لە سەنبادی پرسی تامی بریانی چۆن بوو؟ سەنباد وتی باش بوو، عارەب پێی گوت ئەوە گۆشتی کوڕەکەت بوو خواردت. سەنباد لە هۆش خۆی چوو و کاتێ بە خۆی هاتەوە لە ماڵی عارەبە کە دەرکەوت و چوو بۆ لای برای و ئەم داستانەی گێڕایەوە و پێیگوت ئەم تۆڵەیە مەگەر پیاوە (مرۆزییە) کە بیکاتەوە کە ئێستا ڕاپەڕیوە و کاتێ کە لێرە تیپەڕ دەبوو من ڕێزێکی زۆرم لێنا. ئەوە بوو هەردوو برا پێکەوە چوونە لای ئەبو موسلیم و داستانەکەیان بۆ گێڕایەوە. ئەبو موسلیم سوێندی خوارد کە ئەو (بۆی ئاباد)ە بکات بە (گەند ئاباد) ئەم چیرۆکە ئەفسانەییە لە چیرۆکی ئەبو موسلیمدا بە شێوازێکی تر هاتووە، سەرئەنجام دوو هەزار پیاوی لەگەڵ دووبرا کە ڕەوانە کردن و ئەوانیشی کردە سەرکردە و سەرداری لەشکر و پێی وتن هەر عارەبێك لەو گوندە هەبێ هەموویان بکوژن و لاشەکانیشیان لەسەر ڕێگا فڕێ بدەن. ئەوانیش چوونە گوندەکە و ئەو چوار سەد عارەبەی ئەوێیان کوشت و فڕێیان دان و لاشەکانیان مانەوە تاکو بۆگەنی بوون. ئەوانیش بۆ لای ئەبو موسلیم گەڕانەوە و لە نزیکەکانی ئەبو موسلیم دەژمێردران. سەنباد سەرەڕای ئەوەی کە (زەردەشتی) بوو، جل و بەرگی ڕەشی لەبەر دەکرد و شمشێری هەڵدەگرت و پێ بەپێی ئەبو موسلیم بەشداری چالاکانەی لە شەڕەکان دا دەکرد[١٢٧]. لەوانەیە ئەم گێڕانەوەیە کە عارەب گۆشتی کوڕی سەنبادیان دەرخواردی دابێ ئەفسانە و دروستکراوبێ، بەڵام هەر چۆنێك بێت ئەو ئەفسانەیە بۆ هاندانی دوژمنایەتی و ڕق و کینەی ئێرانییە ناشتیخوازەکان کە لە شار و لادێیەکانی خۆیاندا لەگەڵ عارەبەکان پێکەوە دەژیان دەتوانرێ بەهانە و دەستاوێژێکی باش

---

١٢٧- زبدة التواريخ ، نسخة خطي

بێت. سەرچاوە کۆنەکان بە گشتی باس لە دۆستایەتی نێوان سەنباد و ئەبو موسلیم دەکەن. تەبەری و ئەوانی تر ناوبراو بە پەروەردەکراو و ڕاهێنراوەکانی ئەبو موسلیم دادەنێن، (خواجە نیزام ئەلملوك) مردووە لە (٤٨٥ ك/١٠٩٢ ز) لە (سیاسەت نامە) دا لەم بارەیەوە نووسیویەتی ((سەرۆکێ بوو لە نەیشابوور، زەردەشتی، بە ناوی سەنباد و لەگەڵ ئەبو موسلیمدا پێشتر دۆستایەتی هەبووە هەر ئەویش ڕێنوێنی و ئامادەی کردووەو بە سوپاسالاری خۆی داناوە ))[128] بە گشتی لە کتێبەکاندا بە ڕوونی دەردەکەوێ کە سەنباد پێش ئەوەی بۆ تۆڵە سەندنەوەی ئەبو موسلیم ڕاپەڕێ زەمینەیێکی دۆستایەتی پێشینەی هەبووە لەگەڵ ئەودا تەنانەت ئەوکاتەی کە ئەبو موسلیم لە ڕۆژانی کۆتایی تەمەنیدا بۆ مردن دەچێتە لای مەنسور، سەنباد لە شوێنی خۆی دادەنێ و خەزێنە و دارایی شاری (ڕەی) دەخاتە ژێردەستی.[129] لەبەر ئەوە سەیرنییە دوای کوشتنی ئەبو موسلیم ئەو بە شێوازێکی وابە گەرمی و سۆزەوە بۆ تۆڵە سەندنەوەی ئەبو موسلیم ڕاپەڕیوە. سەرەڕای هەموو ئەوانە تۆڵەی ئەبو موسلیم لەو بزاڤەدا هەنجەتێك بوو. سەنبادیش هەوڵیدا بە بڵاو کردنەوەی بنەما و بنچینەی (غلاة)[130] باوەڕهێنان بە دونایدۆن (تەناسوخ) و بیروباوەڕی دلاوەرانی کۆن، لە ناو دڵی زۆر لێکراو و تۆڵەسێنەران زیندوو ڕابگرێ و، نەفرەت و بێزاری و دوژمنایەتی لەگەڵ عارەبەکان لەناو خەڵکدا بڵاو بکاتەوە و لەمبارەیەوە بە بڵاوکردنەوەی هەندێ بیروباوەڕی نوێ هەوڵیدا ئێرانییە نارازییەکان لە هەموو بیروباوەڕ و گروپێك لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە و بۆ شۆڕش و خەبات لە دژی دەزگای خەلافەت هەموویان لەگەڵ خۆی ڕێك بخات. سەرچاوەکان دەنووسن کە سەنباد: ((کاتێك بە هێز بوو داوای تۆڵەی خوێنی ئەبو موسلیمی کردوو وای نیشان دا کە نێردراوی ئەبو موسلیمە بۆ خەڵکی ئێراق کە ئەبو موسلیم نەکوژراوە، بەڵام کاتێك مەنسور ویستی ئەو سەردارە بەناوبانگە بکوژێ ناوی (مهین) خودای گەورەی هێناو، بووە کۆترێکی سپی و فریە ناو حەسارێك کە لە مس دورست کراوەو لەوێ لەگەڵ مەهدی و مەزدەك دانیشتووە. ئێستا هەر سێکیان پێکەوە دەردەکەونەوە و دێنەوە و سەرەتا لە پێش هەموویان ئەبو موسلیم دەردەکەوێ و مەزدەك وەزیریەتی. کەسێك

---

١٢٨- سیاست نامە، ل، ١٥٦.

١٢٩- مولف مجهول: تاريخ طبرستان، ب ١، ل١٧٤.

١٣٠- ئەو کەسانەی کە لە بارەی ئیمامی عەلییەوە ڕێگەی زێدەڕۆیی یان گرتەبەرو مەرتەبەی خوایی یان بۆ دانا، واتە غولویان کردووە کە بەزۆری لە کرماشان و ئازەربایگان دادەنیشن.

هات و نامەی ئەبو موسلیمی بۆ هێنام. کاتێ رافزییەکان ناوی مەهدی و مەزدەکیان بیست کۆبوونەوە و کەوتنە دوای و لەماوەیەکی کوورتدا ناوبانگی بڵاوبووە و راپەڕینەکەی پەرەی سەند، بە جۆرێك کە ژمارەی ئەوانەی لەگەڵیدا بوون گەیشتە زیاتر لە سەد هەزار پیاو هەرکات لەگەڵ زەردەشتییەکان دانیشتبوایە دەی گوت: من لە کتێبدا خوێندوومەتەوە و لە کتێبەکانی ساسانیدا هاتووە کە من ناگەڕێمەوە تاکو (کەعبە) وێران نەکەم، چونکە ئەو کەعبەیان لە بەرامبەر خۆر دروست کردووە. ئێمە دەبێ هەمیشە هەر خۆر بەرووگەی دڵی خومان بزانین هەروەك لە کۆنەوە واهاتووە. بەخورەم دینییەکانی دەگوت مەزدەك شیعەیە پێتان دەڵێت دەست لەگەڵ شیعە تێکەڵ بکەن و تۆڵەی خوێنی ئەبوموسلیم بکەنەوە، بە زەردەشتییەکانیشی دەگوت لەگەڵ شیعەکان و خوڕەمدینان نزیك بکەونەوە، بەمشێوەیە هەرسێ گروپی رێك دەخست[١٣١]. رەنگبێت ئەو گوتن و بیروباوەڕانە کە دانەری کتێبی سیاسەتنامە لە بارەی سەنباد دەریخستووە لەلایەنگری بەدوور نەبێت، بەڵام هەرچۆنێك بێ بیروباوەڕی سەنباد لەگەڵ بیروباوەڕ و بۆچوونی گروپی ئەبو موسلیم و گروپێك لە ڕاوەندییەکان جیاوازییەکی وای تیانییە، چیرۆکی راپەڕینە کورت و خوێناوییەکەی کە تەبەری مێژوونووس بەکورتی نووسیویەتی و دەڵێت: (زۆربەی لایەنگرانی سەنباد خەڵکی کوێستان بوون، ئەبو جەعفەری مەنسور، جەهوری کوڕی مەراری عەجەلی لەگەڵ دە هەزار کەس ناردنە سەریان کە لە نێوان (هەمەدان) و(رەی) لە بیابانێك پێك گەیشتن شەر روویدا، سەنباد شکستی خوارد و نزیك لە شەست هەزار لە لایەنگرانی لەم شکستەدا کوژران، ژن و منداڵەکانیشیان بەدیل گیران، سەرئەنجام سەنباد لە نێوان تەبەرستان و کۆمەش بەدەستی (لونان)، کە تەبەری بوو کوژرا[١٣٢] سەرچاوەکانی دوایی لەم بارەیەوە بەدرێژتر باسیان کردووە، هەروەکو گێڕانەوەیەك هەیە دەڵێت: کاتێ ئەبو موسلیم کوژرا سەنباد زەردەشتییەکانی (رەی) و (تەبەرستان)ی بۆ تولەکردنەوەی خوێنی ئەبو موسلیم بانگێشت کرد کە هەموویان لەمبارەیەوە لەگەڵ ئەو هاوبیرو هاوڕابوون و بیریان لەگرتنی شاری (قەزوین) کردەوە. فەرمانڕەوای (قەزوین) بە شەو هێرشی کردنە سەر و زەردەشتییەکانی هەموو گرتن شکستی پێهێنان و خستنیە ژێر دەستی خۆی و رەوانەی لای والی (رەی) کە (ئەبو عوبەیدە) بووکردن، ئەبو عوبەیدە لەبەر ئەوەی پێشتر ناسیاری و ئاشنایی لەگەڵ سەنباد

---

١٣١- نیزام الملك: سیاستنامە، ل ١٦٥.

١٣٢- طبری، ب٦.

دا هەبوو دەستی لەسەر هەڵگرت و پێی گوت تۆ چ پەیوەندییەکت بەم کارانەوە هەیە؟ دوای چەند ڕۆژێك بەسەندبادی وت تۆ لەگەڵ هەڤاڵەکانت لە خواروی ڕەی نیشتەجێ ببەو لەوێ سەنباد لە خەڵکەکە نزیك بووەوە و بۆ لای خۆی ڕاکێشان و بوونە هاودەنگ، ئینجا هێزی ناردە سەر (ئەبو عوبەیدە) و کومەڵێك لە سەربازەکانی (ئەبو عوبەیدە) ش هاودەستی ئەو بوون ، ئەبو عوبەیدە لە مەترسییەکە گەیشت و لەترسی ئەوەی نەوەك بیگرن و بیدەنە دەستی دوژمن لە شاری (ڕەی) خۆی پەنادا، سەندبادیش گەمارۆی شاری ڕەی دا و پاش چەند ڕۆژ گرتی ئەبو عوبەیدەی کوشت و کەل و پەلەکانی ئەبو موسلیم لەچەك و شتی تر کە لەرەی بوون دەستی بەسەرداگرتن و لەشکری کۆکردەوە، ئینجا بۆ ماوەیەکی کورت سوپای سەنبادی زەردەشتی گەیشتە سەد هەزار و لەرەی تاکو نیشابووری خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی، بەکورتی کاتی سەنبادی زەردەشتی سەرکەوت و پەرەی سەند بەوخەڵکە موسڵمانەی وت کە لەگەڵی دابوون، کاتێ ئەبو جەعفەری مەنسور ویستی ئەبو موسلیم بکوژێ، بوو بە باڵندەیەك و فڕی، ئێستا لەناو فلان قەڵا دایە و هاودەمی مەهدییە، منی ناردووە تاکو جیهان لە دووڕووەکان پاك بکەمەوە. ئەو کۆمەڵەیەش هۆگری بوون و باوەڕیان پێهێنا قۆڵیان بۆ خزمەتکردنی هەڵاڵی و بوونە فەرمانبەرداری، بەڵام کاتێ باسی سەرهەڵدانی سەنباد بەگوێچکەی ئەبو جەعفەر گەیشت (جەهوری کوڕی مەراری) بە لەشکرێکی زۆرەوە نارد تاکو لەناوی بەرن، کاتێ جەهور گەیشتە دەوروبەری ساوە سەنباد بەسەد هەزار لەشکری ئامادە بەرەو ڕووی هاتن و ژن و منداڵی موسڵمانانیان بەدیل گرتبوون و سواری وشتری عارەبی کردن و لەریزی پێشەوەی لەشکری دانان، کاتێ هەر دوولا پێك گەیشتن و تێك ئاڵان دیلە موسڵمانەکان هاواریان دەکرد یا موحەمەدا لە کوێی کەموسڵمانان لە بارێکی زۆرخراپ و ناهەمەوارداین و خەریکە بە یەکجاری لەنێو دەچین و دەبڕێنەوە، جەهور کاتێ هاوارو قیژە و فریادی موسڵمانەکانی بیست فەرمانیدا وشترەکانیان بڕەوێننەوە، ئەوەبوو وشتران ڕوویان لە سەنباد کرد و کۆمەڵێکی لەشکرەکەیان پەرێشان کرد، سەنباد نەیدەزانی کەچی بووە، واقی و ڕمابوو ڕای کرد[133] دەگێڕنەوە لەم شەڕەدا لە یارانی سەنباد ئەوەندە کوژران کە تا ساڵی ٣٠٠ ك ٩١٣ز پاشماوەی کوژراوەکان لەو شوێنەدا مابوون.[134] بەمشێوەیە بوو کە بە توندوتیژییەکی بێ وێنە بزافەکەی

---

١٣٣- قاض احمد تتوی: تاریخ الفی، نسخة خطی مجلس

١٣٤- تاریخ طبرستان ، ج١ ل ١٧٤.

سەنباد کوژایەوە، سەنبادیش دوای ئەم شکستە بەرەو (تەبەرستان) ڕای کرد و داوای لە (سپەبۆد خورشید) شازادەی تەبەرستان کرد کە یارمەتی و پەنای بدات، دەڵێن ئەویش کوڕی مامی خۆی کەناوی (توس) بوو بە دیاری و ئەسپ و پێداویستی زۆرەوە نارده پێشوازی، کاتی (توس) گەیشتە لای سەنباد لە ئەسپ دابەزی و سڵاوی کرد، (سەنباد) لە ئەسپ دانەبەزی و هەر بەسواری ئەسپەوە وەڵامی سڵاوی دایەوە. (توس) زۆر تووڕەبوو و رقی هەستا، سەرزەنشتی (سەنباد)ی کردو وتی من کوڕی مامی (سپەهبۆد)م، منی بۆ ڕێزلێنان لە تۆ ڕەوانە کردووە، ئەم شێوازە بێڕێزیە ڕەوا نییە. (سەنباد) لە وەڵامیدا قسەی توندی گوت. (توس) سواری ئەسپ بووەوە و خۆی ئامادەکرد و لە سەنباد نزیك کەوتەوە و شمشێرێکی لە ملی سەنباد داو کوشتی، ئەوکات هەموو ئەو ماڵ و سامانەی پێی بوو هەڵی گرتوو هێنایە لای (سپەهبۆد) شازادەی تەبەرستانیش لەو پێشهاتە دڵگران و دەردمەند بوو، نەفرەتی لە (توس) کرد، بەڵام دواتر سەری (سەنباد)ی بە هۆی نێردراوێکەوە بۆ خەلیفە نارد، بەمشێوەیە بوو کۆتایی ڕۆژگاری سەنبادو ڕاپەڕینە کورت و خوێنایەکەی دامرکایەوە. ئەو دامرکا، بەڵام ئەوگڕ و بڵێسەیەی کە ئەو هەڵی کردبوو، زوو بووە ئاگرێکی بەگڕ و کڵپەو بڵێسەدارو گڕەکەی کۆشکی بێدادو ستەمی خەلیفەی سەدەکانی دەسووتاند.

## ئوستادسیس

هێشتان بزاڤە کورت و ترسناك و خوێناوییەکەی سەنباد لە هزری ئێرانییەکاندا هەر بەگەرمی و زیندویی مابوو، کە ئوستادسیس سەری هەڵدا. هەرچەندە ئەو ڕاپەڕینەی (ئوستادسیس) پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە تۆڵەسەندنەوەی خوێنی ئەبو موسلیم نەبوو، ڕەنگە وەکو ڕاپەڕینی (بەه ئافەرید) بۆ نوێ کردنەوەو چاکسازی لە ئایینی زەردەشتی بووبێ، ڕاپەڕینەکەی ئەو لە ساڵی ١٥٠ك -٧٦٧ز لەخوراسان بۆ ماوەیەکی کورت درێژەی بوو، هەروەکو مێژوونووسانی (وەك تەبەری و ئیبن ئەسیر) و ئەوانی تریش نوسیویانە سێ سەدهەزار پیاوی وەگەڵ کەوتن و بوونە هاوکارو یارمەتیدەری. نوسیویانە: (ئەو باپیری مەئموونی خەلیفەی عەباسی و باوکی (موراجل)ی دایکی مەئموون بووە و (غالب)ی کوڕی کە دەکاتە خاڵی مەئموون، ئەو کەسەیە کە بەهاوکاری ئەو فەزل کوڕی سەهل (ذوالریاستین) کوژرا)[١٣٥].

---

١٣٥- تاريخ كامل، حوادث، سال ١٥٠ .

سەبارەت بەژیانی ئەو پێش سالّی ۱۵۰ك کە سالّی ڕاپەڕینەکەیە زانیارییەکی ئەوتۆ نییە، تەنیا لەگێڕانەوەی هەندێك لە مێژوونوساندا دەردەکەوێ کە ناوبراو لە خوراساندا ئیمارەتێکی هەبووەو پێدەچێت لەکاربەدەستان و فەرمانڕەوا بەهێز و خاوەن دەسەڵاتەکانی ئەو دەڤەرە بووبێ. تەنانەت بەقسەی (یەعقوبی) ئامادە نەبووە کە مەهدی بکرێتە جێنشینی (مەنسور)ی عەباسی و سەرپێچی کردووە، لە گێڕانەوەکاندا دەردەکەوێ کە پێش سەرهەڵدان و دەرکەوتنیشی لە نێو خەڵکی خوراساندا، ئەوکاتەی کە لەژێر فەرمانی (ئەبو موسلیم)دا بوون ئەو پیاوێکی بە نفووز و خاوەن کاریگەریی بووە و لە ماوەیەکی کورتدا دەیتوانی لەشکرێکی گەورە لەدژی خەلیفەکان ئامادە بکات. باس و بەسەرهاتی شەڕ و نەبەردەکانی ئەو زیاتر لە کتێبی تەبەریدا وەرگیراون، ناوبراو لە بارەی ڕووداوی سالّی ۱۵۰ك دا دەنووسیت ((یەکێ لەڕووداوەکانی ئەو سالّە دەرکەوتنی ئوستادسیس و خەڵکی هێرات، بادغێس، سیستان و شارەکانی تری خوراسان بوو. دەڵێن نزیك بە سەدهەزار شەڕڤانی لەگەڵدا بووە و کاتێ دەستی بەسەر خوراساندا گرتووە، بەرەو شاری مەرو رود چووە)).

(ئەجسەمی مەرو رودی) لێیان هاتە دەست و شەڕێکی سەختی لەگەڵدا کردوون، ئەجسەم کوژرا و زۆربەی خەڵکی مەروورودیش کوژران و هەندێك لەسەردارەکانیان ڕایان کردوو، (مەنسور) کە ئەوکات لە (برزان)* نیشتەجێ بوو، (خازمی کوڕی خوزەیمە)ی ڕەوانەی لای مەهدی کرد (والی خوراسان)و مەهدی هاندا بەشەڕکردن دژی ئوستادسیس و زور لە سەردارەکانیشی لەگەڵ نارد. دەڵێن (معاویەی کوڕی عەبدوڵلا )ی وەزیری مەهدی کاری خازمی بەکەم هەڵدەگرت. ئەوکات کە مەهدی لە نەیشابوور بوو معاوییە نامەی بۆ خازم و سەردارەکانی تر دەنارد و فەرمانی پێدەکردن، خازم لە لەشکرگاوە چووە لای مەهدی و ویستی بەتەنیا وتووێژی لەگەڵدا بکات. (ئەبو عەبدوڵلا) لای مەهدی بوو و، پێیگوت مەترسە ئەگەر قسەیەکت هەیە بیلێ. خازم کرو بێدەنگ بوو، و هیچی نەگوت، تاوەکو ئەبو عەبدوڵلا هەستاو ڕۆیشت، کە چۆڵ بوو سکاڵای لە معاوییەی کوڕی عەبدوڵلا کردو پێی ڕاگەیاند کە ئامادەنابێ شەڕ لەگەڵ (ئوستادسیس)دا بکات، تا ئەوکاتەی کارەکە هەمووی نەدرێتە دەستی ئەو و ئالا لەدەست خۆیدا نەبێ. داوای لە خەلیفە کرد فەرمانبدات کە ئەوانی تریش بخرێنە ژێر فەرمانی ئەو و هەرکەسێکی پێ شایستە و باش بێت دایبنێ و هەر کەسێکیش پێی باش نەبوو

---

* گوندێکی نزیك شاری ماربین سەر بەپارێزگای ئەسفەهانە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی بەنداوی زایەندەرود.

لایبیات. له لەشکرەکەدا ئەوانەی رایانکردبوو گەڕاندنیەوەو لایەنگرانی زۆربوون، بەڵام ئەوانی لەپشتەوەو دواوەی سوپا دانان. بەهۆی ئەو ترسەی کەلە راکردنەوە کەوتبووە نێو دڵیانەوە لە ریزی پێشەوەی دانەنان. دوایی بڕیاری شەڕی دا و خەندەقێکی لێدا، هەیسەمی کوڕی شوعبەی زەهیری کردە دەستەی هێرشبەری لای راست، (ئەهاری کوڕی حەسینی سوغدی) خستەلای چەپ، (بەکاری کوڕی موسلیم عەقیلی) بردە پێشەوە، (ئەترار خودایی) کەلە پاشازادەکانی خوراسان بوو لەگەڵ خۆی دانا. ئاڵای تایبەتی ئەو لەلای زبرقان بوو، ئاڵای لەشکریش لەلای غولامێك بوو بەناوی بەسام، ئینجا دەستیکرد بەفێڵ و تاکتیکی شەڕ و لە شوێنێك بۆ شوێنێکی تر، لە خەندەقێك بۆ خەندەقێکی تر دەچوو، ئینجا گەیشتە شوێنێك و دابەزی، لە چواردەوری سوپاکەیدا خەندەقێکی لێدا، خەندەقەکەی چوار دەروازەی هەبوو، بۆ هەرکام لە دەروازەکان چوارهەزار کەس لە یاوەرانی خۆی هەڵبژاردبوون و دانینان، (بەکار) کە جڵەودار بوو دووهەزار کەسی بۆ زیاتر کرد تاکۆی گشتی گەیشتە هەژدەهەزارکەس. هێزی لایەکەی تر کە لایەنگرانی ئوستادسیس بوون بەبێڵ و تەور و دەستەبەر هاتنە پێش تاکو خەندەقەکان پر بکەنەوەو بەسەریاندا تێبپەڕن، بەرەو ئەو دەروازەیەی کە بەکاریان لەسەر دانابوو هێرشیان برد. بە شێوەیەکی وا کە بەکارو یاوەرانی توانای بەرگری کردنیان نەبوو، ناچار رایانکردو هەڵاتن. کاتێ بەکار ئەم پشێوییەی دیت خۆی دابەزی و قیژاندی بەسەریانداو هاواری کرد: ناپیاوان ئەتانەوێ ئەوانە لەو دەروازەیەی کە بەمن سپێردراوە بەسەر موسڵمانەکاندا زاڵ بن. نزیك بە پەنجاکەس لە کەسوکاری کە لەگەڵیدا بوون دابەزین و بەرگرییان لە دەروازەکە کرد تاکو دوژمنەکانیان لەوێ دوورکردەوە. دواتر پیاوێکی (سگزی) کەلە یارانی ئوستادسیس بوو، ناوی (حەریش) و تەگبیرکەر و راوێژکاریان بوو بەرەو ئەو دەروازەیەی کە خازمی لە سەر دانرا بوو هێرشی برد، کە خازم ئەوانی دیت کەسێکی ناردە لای هەیسەم کوڕی شوعبە کە لەلای چەپی سوپا بوو و پێی راگەیاند کە تۆ لە دەروازەکەت دەرکەوە و رێگەیەکی تر جگە لەو رێگەیە کە تۆ بەرەو دەروازەی (بەکار) ببات بڕۆ.

ئەوانە سەرگەرمی جەنگ و چوونە پێشەوەن کاتێ دوورکەوتیتەوە و لەبەر چاویان ون بووی لە دواوەیان هەڵگەڕێوە، سوپای عارەبەکان خۆی لەوان رۆژانەدا چاوەڕێی گەیشتنی هێزەکانی (ئەبی عەون) و (عومەری کوڕی سەلەم) کوڕی قوتەیبەیان دەکرد کەلە تەخارستانەوە بۆ یارمەتیدانیان بێت. خازم چووە لای بەکار ئەویش کەسێکی نارد کە ئاڵای (هەیسەم)تان بەدواوەی خۆتان بینی، هاواربکەن کە ئەوە سوپای تەخارستان گەیشتن، ئەوانیش وایان کرد...

خازم رووبەڕووی (حەریش)ی سگزی بووەوەو بە شمشێر پەلاماری یەکتریان دا. لەو کاتەدا ئاڵاکانی (هەیسەم) و یاوەرانیان دیت و لەناو خۆیاندا هاواریان کرد کە ئەوە هێزی تەخارستان گەیشتن، کاتێ کە یارانی حەریشیان ئاوا بەتەنیا خستە نێو خۆیان لە هەموو لاوە پەلاماریان دان، هێزەکانی خازم هێرشێکی توندیان کردنە سەر، پیاوەکانی هەیسەم بە نەیزەو تیروکەوان لەبەردەمیان قیت بوونەوە و لێیان هاتنە دەست، (نەهاری کوڕی حەسین) و یاوەرەکانی لەلای ڕاستەوە (بەکار کوڕی موسلیم) بە سوپاوە لە شوێنی خۆیان هێرشیان بۆ بردن و تێکیان شکاندن و دواییش بە شمشێر کەوتنە گیانیان، زۆر لە هێزەکانی (حەریش) کە نزیك بە هەفتا هەزار کەس مەزەندە کراون لەو جەنگە خوێناوییەدا لەناو چووبوون و چواردەهەزاریشیان بەدیل گیران.

ئوستادسیس و هەندێکی تر لە یاوەرەکانی بەرەو کەژ و کێوەکان پەنایان برد، ئینجا ئەو چواردە هەزار کەسە دیلەیان هێنایە لای (خازم) و فەرمانی دا ملیان پەڕاندن... خۆشی کەوتە دوای ئوستادسیس و تاکو گەیشتە ئەو چیایەی کە لەوێ خۆی حەشار دابوو، سەرئەنجام ئوستادسیس و یاوەرەکانی گەمارۆ دران و تاکو لەسەر داوەریکردنی ئەبی عەون ڕازیبوون، ئینجا هاتنە خوارەوە.

کە لەسەر داوەری و حوکمی (ئەبی عەون) ڕازی بوون و دابەزین (ئەبی عەون) بریاری دا ئوستادسیس و منداڵەکانی زیندانی بکرێن و ئەوانی تریش ئازاد بکەن، کە ژمارەیان سێ هەزارکەس دەبوون، خازم ئەوەی (حەکەم ئەبی عەون)ی بەجێ گەیاند، هەر پیاوێك لەوانە دوو دەست جل و بەرگی پێدان و نامەی بۆ مەهدی نووسی کە خودا سەری خستووە و دوژمنیشی لەناو بردووە. (مەهدی)ش ئەو هەواڵەی گەیاندە (مەنسور)ی ئەمیری موسڵمانان. بەڵام محەمەدی کوڕی عومەر وای هێناوەتەوە کە دەرکەوتنی ئوستادسیس لەساڵی ١٥٠ کۆچیدا بووە و لە ١٥١ کۆچیشدا ڕای کردووە[١٣٦]، هەرئەم ریوایەتە کە تەبەری لەبارەی فرت و فێڵی خازمییەوە هێناویەتەوە دوای ئەویش کەسانێکی تر وەکو ئیبن ئەسیرو[١٣٧] ئیبن خەلدون[١٣٨] بێ کەم و زیاد وەریان گێڕاوە. بەڵام سەرەڕایی ئەوانەش ئاکامی کارو ژیانی نادیارە. لەو

---

١٣٦- طبری، ب٦، ل ٢٨٨، چاپی مصر.

١٣٧- کامل ، ج٥ ، چاپی مصر.

١٣٨- کتاب العبر، ب٣ ل ١٩٨، چاپی بولاق.

دەربڕینەی تەبەری دا کە دەڵێت: ((خازم نامەی بۆ مەهدی نووسی کە خودا سەری خستووەو دوژمنی شکاندووە)) وا دەردەکەوێ کە دوای ئەوەی لەسەر خۆبەدەستەوەدان ڕێککەوتوون ئەوی کوشتووە، بەڵام ئەو مێژوونووسانەی کە نووسینەکەی تەبەرییان وەرگرتووە هیچ ئاماژەیەکیشیان لەو بارەیەوە نییە کە ئەو خۆی کوشتبێتی. گوایە ئەوی لەگەڵ منداڵەکان ناردۆتە بەغدا، و لەوێ لەناویان بردووە.

باس و گێڕانەوە پەرش و بڵاوەکان کە لە کتێبەکانی تری عارەبی، فارسی هاتوون شتێکی تازە و نوێیان نەخستوتە سەر ئەوەی تەبەری و ئیبن ئەسیر. ئەوەی مسۆگەرە ئەوەیە کە بزاڤی ئوستادسیس هەر وەکو ڕاپەڕینی سەنباد هەردوو لایەنی ئایینی و ڕامیاری هەبووە.

ئەوەی کە نووسیویانە داوای پێغەمبەرایەتی کردووە و یاوەرەکانیشی بە ئاشکرا کوفر و فەسادیان دەکرد، نیشاندەدات کەلە هاتنیدا فاکتەری ئایین بەهێزترین پاڵنەر بووە. هەندێك لە توێژەران ویستۆیانە ئەوە بە یەکێك لە فریادڕەس و ڕزگاری دەرەکان کە لە سروودەکانی زەردەشتیدا چاوەڕوانی دەکەن بژمێردرێت[139]، دەڵێن خۆشی ئەو بانگەشەی هەبووە، بۆیە خەڵکیش بەو چاوە سەیریان کردووە، ئەمە جێگەی شك و گومانە، لەڕاستیدا لە وڵاتی سیستان نیشتمانی هاتنی فریادڕەسەکانی مەزدی یەسنان کە هەموویان لەوێ سەریان هەڵداوە، زۆر لایەنگری هەبووە، لەوێش وەکو هەموو شوێنێکی تر داواکارییەکەی وەڵامدرایەوە، هەمانساڵ کە ئەو لە خوراسان ڕاپەڕی، لە بوستیش* پیاوێك بەناوی (محەمەد کوڕی شەداد ئارویە)ی زەردەشتی لەگەڵ گروپێکی زۆر بەهانایەوە دەچن و هاوکاری دەکەن، کاتێ بەهێز بوو ڕووی کردە سیستان[140]، هەروەها ئەو ئاڕادەیەك لە کۆتایی هەزارەیەك کەلە سەرهەڵدانی گروپ و لایەنەکاندا تێپەڕدەبوو، ڕاپەڕیوە، سەرەڕای ئەمانە بەدوور دەزانرێ ئێرانییەکانی ئەوکات لەگەڵ ئەو تایبەتمەندییەش کەلە ئایینی زەردەشتیدا لە بارەی ڕزگاریدەر و فریادڕەسەوە، وەك ئەو فریادڕەسەکە هەیە، ئەویان وەك ئەو فریادڕەسەی کە بەڵێندراوە بگەڕێتەوە لە شوێنی (هوشیدەر) و (هوشیدەرمە) و (سوشیان) زانیبێ.

---

١٣٩- بگەڕێوە بۆ، دائرة المعارف اسلام، ب٣ ل ١٠٧٣.

* شارێکە لە نێوان سەرجستان و غەزنیم و هیرات، شارێکی گەرم سێرە زۆر لە زانایانی گەورە لەوێ سەریان هەڵداوە، باغچە و بێستانی زۆرە. مراه البلدان : ب١، ل ٣٣٦.

١٤٠- مؤلف مجهول: تاريخ سيستان، ل ١٤٢، ١٤٣.

## له هەموو شوێن شۆڕش و ئاشووب

بەڵام بەهەر شێوەیەك بێ ئەو بێزاری و رقـەی ئێرانییـەكان كەلـە عـارەب هـەیان بـوو بەشداریان لە هەر دەنگێكی نارەزایەتی دژی خەلیفەكاندا دەكرد. بزاڤی ئوستادسیس لەناو گۆمێكی لافاوی خوێندا دامركێندرایەوە، بەڵام هاوكات لەو كاتـەوە خـەڵكی (تاڵـەقان) و (دەماوەنـد) سـەریان بـەرزكردەوە. خەلیفـە بـۆ سـەركوتكردنی ئـەوان سـەرداریەتی دایـە (عومەری كوڕی عـەلا)، ئـەو شۆڕشـگێڕەكانی سـەركوتكردن و شـارەكانی لـێ سـتاندن، خەڵكی زۆر لە (دیلەم) لەو رووداوەدا بە دیلگیران. پێش ئەو رێكەوتە و دوایـیش چـەندین جاری تر خەڵكی تەبەرستان لە بەرامبەر جەور و ستەمی عارەبان ڕاپەڕیبوون، لـەو بـزاڤ و سەرهەڵدانانەدا نەك هەر نەتـەوەی عـارەب دۆڕانـدی و نوشوسـتی هێنـا، بـەڵكو ئـایینی ئیسلامیش كەوتە بەر رك و كینەی خەڵكی. مێژوونووس و قسەكەرێكی ئیسلامی دەڵێت؟ ((ئێرانییەكان بە هۆی فراوانی وڵاتیان و دەسەڵاتی زۆریان لەسـەر هـەموو گـەلان لـەرووی گەورەیی و هێزەوە، بە شێوەیێكی وابوون كە خۆیان بە كەسانی ئازاد و ئـەوانی تریـان بـە خوڵامانی خۆیان دەزانی، كاتێ دەوڵەتەكەیان كەوتە دەستی عارەب چـونكە عارەبیـان بـە نزمترین میللەت دەزانی زۆریان لەلا گران بـوو، ئـێش وئـازاری دەروونیـان چـەند بەرابـەر دەبوو. لەبەرئەوە چەندین جار ڕاپەڕین، بەڵكو بە شەڕ بتوانن لـە چـەنگی ئیـسلام خۆیـان رزگار بكەن[141] بەو شـێوەیە زۆربـەی ئـەو شۆڕشـانە ڕەنگـی دژی ئایینیـان هـەبووە. لـە تەبەرستاندا ساڵی (١٤١ ك /٧٥٩ ز) جارێك سپەهبۆد خورشید فـەرمانی دا كـە هـەموو عارەبەكان و تەنانەت هەموو ئەو ئێرانیانەش كە چوونە ئەسـەر ئـایینی عـارەبی بكـوژن. ڕاپەڕینێكی توند دژ بە عارەب دەستپێكرد كە عارەبەكان بە شێوەیەكی زۆر بێ بەزەییانە دایان مركاند. سپەهبۆد خورشیدیش كە خۆی بە شكەست خورادوو دیـت ژەهـری خـوارد و خۆی كوشت. بەم هەموو دڵڕەقی و توندوتیژییەی كە عارەب لـە نەهێـشتنی شۆڕشـەكاندا نیشانیاندەدا نەیانتوانی ئێرانییەكان و ئیرادەیان لە ئامانجی خۆیان دوور بكەنـەوە. ئـازار و كوشتن و زیندانی كردن و ڕاگواسـتن، تـەنیا ئـیرادەی بـەهێز دەكـردن و بـاوەڕی بـەتین تـر

---

١٤١- ابن حزم: الفصل جزء الثانی، ل ٩١ چاپ مصر.

دەکردن، تەنانەت ئەو ڕاپەڕین و سەرهەڵدانانەی کە تورکەکان و عارەبەکان خۆشیان دژی دەزگای خەلافەت ئەنجامیان دەدا ئەوان، واتە ئێرانییەکان پشتیوانیان لێدەکردن. کاتێ (یوسفی کوڕی ئیبراهیم) ناسراو بە (بەرم) کە یەکێك بوو لە مەوالییەکانی (سەقیف) لە بوخارا ڕاپەڕی لە نێو خەڵکی خوراساندا دۆست و یاوەرانێکی زۆری لێکۆبوونەوە و شۆڕش و ڕاپەڕینی گەیاندە (سوغد و فەرغانەش)

## (ماوراء النهر - ئەودیوی رووبار)

لەو کاتەی کە لە پای تاوانەکەی ناشەوانی شاری (مەرو) دوایین چرای زنجیرەی پاشایەتی ساسانی کوژایەوە، [(ماهوی سووری) مردووە لە (٦٥١ ز)] بەو خیانەتەی کە دەرهەق بە گەورەی خۆی کردی چاوی لە پێگەی پاشایەتی بوو. رەنگە لە شارەکانی تیسفون، شوشتەر، نەهاوەند، ئیستخر، رەی و شوێنەکانی تری ولاَت کەسانێك لە ئێرانییەکان هەبووبن کە چاوی ئومێدیان بڕی بووبێتە ئەو لایەی مەرو کە دەیڕوانییە ئەو شارانەی کە لەو دیوی ئامووییەبوون و لەوێ رۆژانە چاوەڕوانی باس و هەواڵێکی تازەیان دەکرد، خودی (یەزدی گورد)یش پێش ئەوەی بە هۆی پیلانی (ماهوی سووری) ببێتە نێچیری ئاشەوانێکی بێ ناونیشانی شاری مەرۆ، رەنگبێ ئومێدیکی زۆری بە ئەودیوی چەمی ئامووییە هەبووبێ، پێدەچێ لەبەرئەوە بووبێ کە بە هۆی تەتەرەکانەوە نامەو دیارییەکی زۆری رەوانەی چین کرد بوو، بەو هیوایەی بە هاوکاری خاقانی چین و هاودەستی خەڵك و پاشاکانی ئەودیوی چەم، جارێکی تر بتوانێ ناوەکە بخاتەوە سەر جۆگەی خۆیەوە و، ئەوەی لە تیسفون و نەهاوەند دوڕاندبووی لەمەرو و ئامووییە ڕەنگە بوخاراو سەمەرقەند لە دوژمن وەربیگرێتەوە، لەڕاستیدا ئەودیوی ئامووییە کە ولاَتی ئەودیوو رووبار بوو، زۆرتری شارو گوندەکانی سیمای ئێرانی یان پێوە دیار بوو،هەر چەند بوخارا و شار و دێیەکانی دەوروبەری تورکیان تێدا بوون، بەلاَم ئەو شارانەی کە لە کەناری خوراسان بوون بە نیشتمانی ئێران دەژمێردران، ئەو شارەی کە لە کەناری (زەرئەفشان)ەوە بوو ناوی (سوغد) بوو، خەلکی ئەوێ بەزمانی دری دەپەیڤین[١٤٢]. ناوی خوداکانیشیان بخار خدادە بوو، بەلاَم واپێدەچێت کە لەو سەرزەمینەدا ئایینی زەردەشتی بە ئەندازەی خوراسان بلاَو نەبووە، هەروەکو لەو بتخانەیەی کە بوداییەکان لەو شارەدا هەیانبووە لە کتێبەکاندا باسکراوە و ناوی بوخاراش خۆی لە ((بەهار)) یا ((وەهار)) هاتووە، کە گوایە ناوی پەرستگاکانی بودایی بووە، بۆی هەیە هەر لەبەر ئەوەش بووبێ کە ئایینی بودایی لەو هەرێمەدا بەربلاَوبووە، ئەوەش وایکردوە لەو شارە و لە هەرێمی ئەودیوی ڕووباردا هیچ کەس بە هانای یەزد گوردی شای ئێرانەوە نەچووە.

سەمەرقەندیش وەکو بوخارا شارێکی ئێرانی بوو. ڕاستە کە هاوکات لەو ڕۆژگارانەدا تەرخانەکانی تورك فەرمانڕەواییان دەکرد، بەلاَم زمانیان دري بوو. بێگومان خەلکی سەمەرقەند بە

---

١٤٢- مقدسی: احسن التقاسیم، ل ٣٣٥.

زمانی دری دەپەیڤین، شێوە زاراوەی تایبەتی یان هەبوو، لادێکانیش زۆربەیان هەر بەو زمانە قسەیان دەکرد.

هەروەها لە هەرێمی ئەو دیوی ڕووباردا، شارەکانی (کش)، (نەخشەب)یش هەبوون کە بە نیشتمانی بەناوبانگی سوغدی یان دەژمێردران، ئەم سوغدی یانە کە سغدیشیان پێدەڵێن لە کۆنترین و دێرینترین ئیمارەتەکانی ئێران بوون، هەر وەکو لە ئاڤێستا، لە بەردە نووسەکانی داریوشدا ناوییان لە ڕیزی وڵاتی ئێران ژمێردراوە، ئەو وڵاتە و هەروەها وڵاتی فەرغانەش هەرچەندە لەو ڕۆژاگارانەدا خەڵك لەگەڵ تورکەکان و هەفتالییەکان تێکەڵ ببوون. بەڵام هەر بە زمان و نەتەوە و نیشتمان و مێژووی کۆنی خۆیان پەیوەست بوون، لە زۆربەی ئەو شارانەدا خەڵك، چیرۆکەکانی ڕابردووی ئێرانییان بە شور و شەوق و حەماسەتەوە دەگێڕانەوە، تەنانەت لە بارەی خوێنی (سیاوەش) یش کەبەدەستی تورکەکان ڕژا بوو، ئاواز و گۆرانی تایبەتیان هەبووە و کە لە شاری بوخارا و ڕەنگە شوێنەکانی تریشدا گوتبێتیان. لە ئەشروسنە، و خوارەزمیشدا زمانی ئێرانی باو بووە، لە هەموو ئەو ناوچانەدا، دیرۆك و باس و سەرهاتە ڕابردووەکانی گەلانی ئێرانی وێردی سەرزاران بووە. لەو ڕۆژگارەی کە هەموو شارەکانی ئێران و ئێراق و فارس و ئازەربایگان و شوش و نەهاوەند و ڕەی و خوراسان، بەر فەرمانی خەلیفەی عارەبان بوون، ئەو شارانەی (ماوەراء نەهر) ئەودیو ڕووبار کە هەر چۆنێك بێت بە بەشێك لە وڵاتی فارس دەژمێردران، لە دەستدرێژی عارەبان پارێزراو بوون، لە خوراساندا پێشتر عارەبەکان ئەو هەرێمەیان شێلا بوو، و زۆریان تاڵان و بڕۆ و بێدادی ئەنجامدابوو. بەڵام نەیانتوانی بوو دەستبەسەر ئەو دیوی ئاموویە دابگرن، هاوکات لە ساڵی (٥٣ ك ٦٧٣ ز)دا خوراسان لەدەست (عوبەیدوڵڵا کوڕی زیاد)دا بوو، کە بە پیاوێکی ستەمکار و دڵڕەق دەژمێردرا، لەوکاتەدا بوخارا خداد کە ئیمارەت و پاشایەتی کۆنی بوخارای لەژێر دەست بوو کۆچی دوایی کردبوو، منداڵێکی زراسکەی شیرخۆری لە پاش بەجێ مابوو بەناوی (اتوغشاد) کە(خاتوون)ی دایکی لە شوێنی ئەودا کاروباری کۆشکی پاشایەتی بەڕێوە دەبرد، لە سەردەمی ئەودا عارەبەکان چەندین جار هێرشیان کردە سەر بوخارا، هەرجار ئاشتی دەکرد و خەراجی پێدەدان، کاتێ عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد هاتە خوراسان و لە جەیحون پەڕییەوە، ڕووی کردە بوخارا.

هەندێك لە گوندە ئاوەدانەکانی بوخارا و لادێ و گەڕەکەکانی دەورویەرییان گرتن. لەگەڵ خاتووندا شەڕێکی سەخت و خوێناوییان ئەنجامدا، لەو شەڕانەدا عارەب باغچەکانیان تێکدان و لادێی لێ وێرانکردن و خەڵکێکی زۆر بەدیلگیراو دیسان عارەب غەنیمەیەکی یەکجار زۆری دەست کەوت.

## خاتوونی بوخارا[143]

ماوەیەك دواتر (سەعیدی كوڕی عوسمان) مردووە لە (٥٦ ك/٦٧٦ ز) لە شوێنی (عوبەیدوڵڵا) كرایە میری خوراسان. لە سوپای ئەودا جگە لە داگیركەران و جیهادكەران، ژمارەیەكی زۆریش لە ڕێگرو بەندكراو و پیاوكوژ هەبوون كە لە زیندان هاتبوونە دەرەوە، بەهیوای تالان و دەستكەوت، شانبەشانی ئەو ڕێگەی خوراسانیان گرتبووەبەر. ئەو لەگەڵ سوپایەكی وا تالان چی لەو بەری ئاموویەدا چەندین پەلامار و بەسەرداداتی ئەنجامدان و ماڵ و دیلی زۆری دەستكەوتن. بەڵام لە سەمەرقەند و بوخارا جگە لە ستاندنی باج و ئەوا هیچی تری پێنەكرا، لە بوخارا لەگەڵ خاتوونی شارەكەدا كە پادشای ئەو شوێنە بوو بە نەرمی و مێهرەبانییەوە جووڵایەوە، هەندێك گوتویانە لە نێوانیاندا خۆشەویستی و دۆستایەتی دروست بووە. دەڵێن: ((كاتێك سەعید لەگەڵ خاتوون ئاشتی كرد و گەیشتە بوخارا تووشی نەخۆشی بوو، خاتوون دەچێ بۆ سەردانی و كیسەیەكی پێبووە پڕ لەزێڕ دەستی بردە ناوكیسەكە و دوو شتی دەرهێنا و وتی ئەمەیان بۆ خۆم هەڵدەگرم، ئەگەر نەخۆش كەوتم بیخۆم، ئەوەی تر دەدەم بەتۆ تاكو بیخۆیت و تەندروستیت چاك بێتەوە.

سەعید واقی و ڕما! كە ئەوە چییە خاتوون ئاوا گرنگی پێدەدا، كە خاتوون چووەدەر، (سەعید) سەیری كرد خورمای كۆنە، فەرمانی دا پێنج وشتریان لە خورمای تازەباركزدن و بۆ لای خاتوونی ڕەوانە كردن، خاتوون جەواڵەكانی كردنەوە، خورمایەكی زۆری دیت، كیسەیەكی كردەوە و خورمای خۆی دەرهێنا لەگەڵ ئەوەی كە (سەعید) بۆی ناردبۆو بەراوردی كرد، هەر دووكیان یەك شت بوون! بەلێبوردن هاتەلای (سەعید) و وتی ئێمە لەم جۆرەمان زۆر نییە، ئەو دوو خورمایەم چەند ساڵە هەلگرتووە بۆ نەخۆشی)). دەگێڕنەوە كە ئەو خاتوونە ژنێكی شیرین زمان و چاكەكار بووە و (سەعید) دڵی پێوەبووە و خەڵكی بوخارا لەو بارەیەوە بە زمانی بوخاری هۆنراوە گەلێكی زۆریسان هۆنیوەتەوە[144].

## (قوتەیبە كوڕی موسلیم) مردووە لە (٩٦ ك/٧١٥ ز)

لەو هێرشانەی كە (عوبەیدوڵڵای زیاد) و( سەعیدی كوڕی عوسمان) كردیانت، هیچ ناوچەیەك نەكەوتەدەست موسڵمانان و هیچ سوودێكی بۆ ئیسلام تیانەبوو، ئەو عارەبانە بێ ئەوەی بتوانن

---

١٤٣- نەرشەفی: تاریخ بخارا، ل ٤٨.

١٤٤- تاریخ بخارا، ل ٤٨.

ئایینی خۆیان لەو بەری ئاموویەدا بڵاوبکەنەوە، کەوتنە تاڵان و برۆ و بەدیلگرتن و بێدادی و هەر بەوەندە دەستیان هەڵگرت و گەڕانەوە. (موسلیمی کوڕی زیاد) برای (عوبەیدوڵڵا) و چەندی تر کە کراون بە ئەمیری خوراسان هەرچەندە لەو بەری ئامووییشەوە جاروبار دەستیان وەشاندووە، بەڵام جگە لە تاڵان و برۆ و باج ستاندن کارێکی تریان پێنەکراوە، ئەو بەری ڕووبار سەرەڕای ئەوەی چەند ساڵ جارێك تووشی کارساتی تاڵان و کوشتار و ڕاوەدوونانی عارەبان دەهاتن، بەڵام یەکراست نەکەوتنە بن دەستی عارەبان، تاکو نۆرە گەیشتە (قوتەیبەی کوڕی موسلیمی باهلی) کە لە ساڵی (٨٦ ك/٧٠٥ ز) لەلایەن (حەججاج)ەوە کرا بە ئەمیری خوراسان، ئەو (قوتەیبە)یە وەك گەورەکەی خۆی (حەججاج) بێ بەزەیی ترین و سەرەڕۆترین سەرداری عارەب بووە، ئەوەی لە بێداد و کوشتار و تاراج لە خوارەزم، تەخارستان، ئەوبەری ڕووبار کردی، کەس نەیکردووە. کاتێك بڕیاری گرتنی بوخارای دا لە (بێکەند) کە گوندێکە لە گوندە ئاوەدانەکانی بوخارا مایەوە و ماوەیەك شاری گەمارۆدا تاکو گرتی و دواییش یەکێك لە خزمە نزیکەکانی خۆی لەوێ داناو ڕووی لە بوخارا کرد، (بێکەند)ییەکان لە دەستی زوڵم و دەستدرێژییەکانی عارەبان تەواو بێزار بوون. ئەوە بوو سەریان هەڵداو ڕاپەڕین، ئەمیرە عارەبەکەیان دابەزاند و هێنایانە خوارەوە و لەناویان برد. ئەو هەواڵە گەیشتە (قوتەیبە). فەرمانی دا و سوپای خۆی گەڕاندەوە بۆ بێکەند و تاڵان و کوشتن و خوێن و ماڵی خەڵکی حەڵاڵ کرد... عارەب دەستکەوتێکی زۆریان لەو تاڵانەو کوشت و کوشتارە کەوتەدەست. پەرستگەی (بێکەند)یان ڕوخاند، هەر شتێکی گرانبەها بوو دەستیان بەسەردا گرت و بردیان، بوخاراش بە شەڕ گیراو (قوتەیبە) لەگەڵ خەڵکی ئەوێ ئاشتی کرد، بەو پێیەی کە ساڵیانە دوو سەد هەزار دەرهەم بدەنە خەلیفە و دە هەزار دیناریش بۆ ئەمیری خوراسان و لە ماڵ و کشتوکاڵ و بەرهەمەکانی تریشیان نیوەی بدەن بە موسڵمانان. وڵاغەکانی موسڵمانانیش ئەوانەی لە دەرەوەی شارن ئالیکیان پێبدەن. بەو شێوەیە بوخارا کەوتە دەست عارەبان. عارەبە کان لە ناو ماڵی جووتیار و کشتکاراندا دا نیشتەجێ بوون و بوونە هاوماڵیان. ناچار ئەو کەسانەی ئامادە نەبوون پەسەندیان بکەن و پێیان شەرم بوو، لە شار دەرکەوتن و ماڵیان گواستەوە بۆ دەرەوەی شار و شاریان بەجێهێڵا بۆ عارەبەکان. بوخاراییەکان هاتنە سەر ئایینی ئیسلام. ئاتەشکەدەکان و بتکەدەکان وێرانکران و لە شوێنیاندا مزگەوت دروستکران. بازاڕی (ماخ) کە تا ئەوکات و هێشتا دارتاش و نیگارکێشەکان لەوێ بتیان دەتاشین و دەیان فرۆشتن لە برەو کەوت. لە کۆتاییدا قوتەیبە یەکێك لە یارانی خۆی لە بوخارا کردە ئەمیر و خۆی بەرە و شاری سەمەرقەند ڕۆیشت.

## گرتنی سەمەرقەند (غەزووی سەمەرقەند)

بەڵام گرتنی سەمەرقەند وا بە سانایی نەبوو. (قوتەیبە) ماوەیەك گەمارۆی دا و خەڵكی شار بەرگرییەكی زۆریان كرد. قوتەیبە بە سوپایەكی زۆرەوە بۆ ماوەیەكی درێژ لە بەردەم دەروازەی شاردا مایەوە. لە بارەی گرتنی سەمەرقەند كە بێگومان بە تاڵان و بڕۆ و كوشتار و بێدادییەكی زۆرەوە ئەنجامدرا، لە هەندێ لە سەرچاوە مێژووییەكاندا چیرۆكێك گێردراوەتەوە كە چیرۆكەكانی (هۆمیرۆس) (مردووە لە نزیك بە ٨٥٠ پێش زایین)[١٤٥] و شاری ( تروا)مان بە بیر دێنێتەوە. نووسیویانە كە كاتی قوتەیبە گەمارۆی سەمەرقەندی دا، بۆ ماوەیەك لە بەر دەرگای شار مایەوە، جووتیاری سەمەرقەند پەیامێكی بۆ نارد كە ئەگەر هەموو تەمەنی خۆی لەبەر دەرگای ئەم شارە بێنێتەوە ناتوانێ بیگرێ، چونكە لە كتێبەكانی باپیرانماندا هاتووە كە كەس ناتوانێ دەستبەسەر ئەم شارەدا بگرێ.

جگە لە پیاوێك كە ناوی (پالان)ە و ناوی تووش پالان نییە، ئەو شارەت پێناگیرێ. قوتەیبە كاتێ گوێی لەم قسەیە بوو هۆرای كێشاو یاوەرانیشی دەستیان كرد بەشادی و گوتیان سەمەرقەند لە سەردەستی ئێمە دەگیرێت، چونكە ئەمیرمان ناوی پالانی وشترە، (قوتەیبە واتە پالانی وشتر) كاتێك مانەوەی قوتەیبە لە دەروازەی شاری سەمەرقەند ماوەیەكی خایاند هاتەسەر ئەوە كە بە فرت و فێڵ دەست بەسەر شاردا بگرێت. ئەوە بوو فەرمانی دا سەندوق دروستبكەن و سەریشیان ببەسترێت و بكرێتەوە، لە ناو هەر سەندوقێكدا مرۆڤێكی شمشێر بەدەست دابنەرێت، پاشان تەتەرێكی ناردەلای جووتیاری سەرۆكی سەمەرقەند و ئاگاداری كرد كە من لەبەر دەرگای سەمەرقەند زۆر نامێنم و ئێرە جێدێڵم و مەبەستم چوونە بۆ چەغانیان، بەڵام هەندێك كەلوپەل و چەكم پێیە كە بردنیان مەیسەر نییە، ئەگەر ئەوانم بە ئەمانەت لێوەربگری هەموویان لە سەندوق دەنێم و، دەیانێرمە لای تۆ تاكو ئەگەر لەلای چەغانیان بەسەلامەتی گەڕامەوە هەروا پێماندەیتەوە. سەرۆكی سەمەرقەند فریوی خوارد ئەو فێڵەی قوتەیبە و داواكارییەكەی پەسەندكرد، قوتەیبەش فەرمانی دا بە پیاوەكانی كە بچنە ناو سەندوقەكانەوە و ئامۆژگاری كردن كاتێك شەو داهات سەندوقەكان بكەنەوە و لێیان دەركەون، دەروازەی شاری سەمەرقەند بۆ سوپای ئیسلام بكەنەوە تاكو بتوانین گرتنی ئەم شارە لە سەردەستی ئەوان ئەنجام بدرێ، قوتەیبە سەندوقەكانی ڕەوانەی لای

---

١٤٥- (هۆمیرۆس) Homeros گەورەترین شاعیری حیماسی دونیای كۆن دانەری دوو بەرهەمی گەورە و بەناوبانگ ئیلیادو ئۆدیسە.

سەرۆکی سەمەرقەندکرد، هەروەکو پێشتر رێککەوتبوون...کە شەوداهات و شار چۆڵ بوو ئەو پیاوانە لە سەندوقەکانیان دەرکەوتن، شمشێریان لە کالان دەرهێنا و هەرکەسێکیان کەوتبایە پێش دەیان کوشت تاکو گەیشتنە دەروازەی شار و دەروازەوانیان کوشتن و دەروازەی شاریان کردەوە، قوتەیبە لەگەڵ سوپای خۆی هاتنە ناوشار، سەرۆکی شار توانای بەرگری کردنی نەماو رای کرد، سەمەرقەندیش کەوتە دەست عارەبان[146]، ئەمو چیرۆکە لەبارەی گرتنی سەمەرقەند کە لە مێژووەکاندا هاتووە سەرنج راکێش و خەیالاوی یە! بەلام گومانی تێدانییە کە گرتنی شارێکی وابێ تالان و برۆو بێدادی و کوشتار و وێرانکاریی زۆرەوە نەبووە، هەرچۆنێك بێ رەنگە گرتنی شاری سەمەرقەند بەم شێوەیە نەبووبێت، یاخود ئەو گێرانەوەیە زێدەرۆیی و هاشوهوشی ئەفسانەیی تێدابێ، بەلام وەکو دیارە و جێی گومان نییە کە قوتەیبە سەمەرقەندی بە فێل و پێچەوانەی رێککەوتننامەی موسلمانان گرتووە، چونکە بەر لەوەی ئەو بهێتە خوراسان گوایە سەعید کوڕی عوسمان لەگەڵ جووتیاری سەمەرقەند دا ئاشتی کردووە، بەو پێیەی کە جووتیار ۷۰۰،۰۰۰حەفت سەد هەزار دەرهەم بەخەراج و ۱۰۰،۰۰۰سەد هەزار کەسیش ئەوا وەربگرێ. ئیتر عارەب کاریان بە سەمەرقەند و خەلکی و ئاییندەکەیان نەبێ، لە رۆژگاری ئیمارەتی سەعید کوڕی عوسمان تا ئەوکات کە قوتەیبەی کوڕی موسلیم هاتە خوراسان، سەرۆکی سەمەرقەند هەر لەسەر ئەو رێککەوتنە کاری دەکرد و عارەبەکان و سەمەرقەندییەکان هەردووکیان ئیشیان بەم پەیمانە دەکرد و بەردەوام بووە، قوتەیبە کوڕی مۆسلیم کە هاتە دەڤەری ئەودیو رووبار و بوخارای داگیرکرد و پەیمانی شکاند بەرە و سەمەرقەند رۆیشت و بە پێچەوانەی ئەو پەیمانەی کە عارەبەکان لەگەڵ سەرۆکی سەمەرقەند دا هەیان بوو، ئەو شارەی بەفێڵ گرت و رەنگە چیرۆکی سەندوقەکان کە لە مێژووەکاندا هاتووە و پێشتر باسمانکرد راستییەکی تیابێ، هەر چۆنێك بێ چونکە قوتەیبە پێچەوانەی پەیمانی نێوان موسلمانان و خەلکی، سەمەرقەندی بە فرت و فێڵ گرتووە، خەلکەکەشی لە ماڵەکانیانەوە دەرکردووە و سوپای خۆی لە شوێن داناون، دیارە کە رووداوێکی ئەوها تاچ رادەیەك ماڵ و سامانی خەلکی بەفیڕۆداوە و چ خوێنێك رژاوە؟ باسیان کردووە کە کاتێ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (مردووە لە ۹۹ ك/۷۱۷ ز) جلەوی خەلافەتی گرتە دەست خەلکی سەمەرقەند سکالایان بردۆتە لای و نالە و هاواریان بۆ بردووە کە قوتەیبە پەیمانی شکاندووە و بە جەور و ستەم شارەکەیانی گرتووە و خانووەکانی لێستاندون، عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیش فەرمانی بە دادوەرێك دا تاکو لەو داواکاریانەیان بڕوانێ و لەم بارەیەوە بەپێی ماف و دادگەرییەوە بریار بدات ، قازیش فەرمانی

---

۱٤٦- دینوری: اخبارالطوال، ل۲۸۲.

دا کە دەبێ عارەب و خەڵکی سەمەرقەند لە بەردەم دەروازەی شاری سەمەرقەند جارێکی تر شەڕ بکەنەوە، ئەگەر عارەب سەرکەوتن سەمەرقەند وەکو شارێکی کە بە شەڕ گیرابێ بژمێردرێت، ئەگەر نا جارێکی تر پەیمانێکی تازە ببەستن.

ڕاستە کە حوکمی قازی لە بارودۆخی خەڵکی سەمەرقەند کە هەر چۆنێك بێ شار و خانوو مڵك و ماڵیان بە فرت و فێڵ کەوتبووە دەستی عارەب هیچ شتێکی نەدەگۆڕی، بەڵام ئەوە نیشاندەدا کە هەر چۆنێك بێ داگیرکردنی ئەو شارە لە سەردەستی قوتەیبە وەکو فێڵێکی ناڕەوا ژمێردراوە[147].

ئەو فێڵەی کە قوتەیبە بۆ گرتنی شاری سەمەرقەند بەکاریهێناوە لەبەر ئەوە بووە تاکو شار بە شەڕ بگیرێت، بەو بیانووەوە خەڵکی شار بەدیل بگرێت و سەروەت و سامان و کەل و پەلیشیان وەکو دەسکەوتی شەڕ بخاتە بن دەستی خۆی. گرتنی سەمەرقەند کە بەو فێڵ و ڕیسواییەوە وەدەست هات، بێگومان وێرانی و پەرێشانی شاری بە دواداهات، وای لێهات کە جووتیار و گەورە پیاوانی شار لەسەر وێرانەکانی شار گریان و لاواندنەوەیان کردووە، مافی خۆشیان بووە کەوا بکەن! بەڵام قوتەیبە کە سەمەرقەندی گرت یەکێکی تری لە جێی خۆی داناو بەرە و شوێنێکی تری ئەو دیو ڕووبار ڕۆییشت (چەغانیان)ی خستە ژێردەستی خۆیەوە، هەروەها کش و نەخشەبیشی داگیرکرد.[1]

بەمشێوەیە زۆربەی شارەکانی ئەودیوی ئاموویە و هەرێمی خوارەزم و تەخارستانی گرتن و هەموو شوێنەکانی پێشێل و ژێرو ڕوو کرد و دەستی کرد بە بێدادی و تالانکاری، هەر چەندە خۆشی بە هۆی عارەبەکانەوە کوژرا، بەڵام هەرێمی ئەو دیوی ئاموویی کە ڕۆژگارانێك مایەی ئومێد و هیوای تالانکراو و ستەملێکراوەکانی تیسفون و نەهاوەند بوو لە سەردەستی ئەو تێکدران، ئیتر ئەو هیوایانەی کە لەناو دڵی خۆیاندا هەیانبوو نەما، لەوکات بەدواوە عارەبەکان لە سەرانسەری ڕۆژگاری مەروانییەکاندا دەسەڵاتیان بەسەر ئەو شارانەی ئەو دیوی ڕووباردا دەڕۆیشت، جوتیارەکان، ئەمیرەکان، ئەمیرزادەکانی ئەو وڵاتە کە زۆربەیان لەسەرەوە ببوونە موسڵمان و لە ژێرەوەش هەر لەسەر ئایینی خۆیان مابوونەوە، لە کۆکردنەوەی باج و خەراج و دادۆشینی بێدەسەڵاتەکاندا هاوکاری عارەبەکانیان دەکرد[148]، لەگەڵ یەکتریشدا بەردەوام لە شەڕدابوون. لە ڕاستیدا قوتەیبەی کوڕی موسلیم لە گرتنی شارەکانی ئەو دیوی ڕووباردا لەو ناکۆکی یانەی کە لە نێوان جووتیار و سەردارەکانی دا هەبوو، سوودی وەرگرت و کاری خۆی ڕێکخست، هەندێ جار لە نێوانیاندا تۆوی

---

١٤٧- کە ئەم بابەتەی لە کتێبی طبری وەرگرتووە، کتێبی ئەو لە گرنگترین توێژینەوەکانە کە لە بارەی بەنی ئومەیە و هۆکاری ڕووخانیان هاتووە Van vlten ;DominationArabe .

١٤٨- بگەڕێوە بۆ: کتێبی وان فلوتن، کە باسکرا شاهیدێکی چاکی لەمبارەیەوە هەیە.

دوو بەرەکی دەچاند تاکو بەمشێوەیە دەست لە کاروباری ناوخۆیان وەربدات. هەر وەکو کاتێك کە لە نێوان میری چەغانیان و میرەکانی هەندێك ناوچەی هاوسێ ناکۆکی ڕوویدا ئەو بەبیانوی لایـەنگری لە میری چەغانیان لەشکری بۆ ئەوێ برد و لە خوارەزمیش دا هاوکاری خوارەزم شای، کە ئـەوکات جووتیارەکانی خوارەزم لە دژی ڕاپەڕی بوون، کردە بیانوو و ئەو شـوێنەی گـرت و کەوتـە لێـدان و کوتـان و کوشـتار و وێرانکارییـەکی یـەکجار زۆر[149]. لـە سەرانـسەری سـەردەمی دەسـەڵاتی ئەمەوییەکاندا، عارەبەکان لە هەرێمی ئەو دیوی ڕووباردا هێزێکـی تـەواویان هـەبووە، سیاسـەتی توندوتیژی ئەمەوی کە لە هەموو شوێندا بە چاوی سووك لە مەوالی و ئێرانییەکانی دەڕوانـی. لـە وێشدا بێگومان مایەی ڕق و نارەزایەتی بوو و لە بەر ئەوە هەر بیانییـەك کـە لـەو ڕۆژگـارەدا لـە خوراسان و شوێنەکانی تر ڕاپەڕیبا، لەو دیوی چەمیش هاوکاری یان دەکرد و شوێنی دەکەوتن، هەر ئەوەش بوو کە بانگێشتی ئەبو موسلیم لە نێو ئەو خەلکەدا بە شێوەیەکی بەربلاو پـەرەی سـەند و زۆربەی خەلکی ئـەو شـوێنە لـە ژێـر ئـالای (ڕەشپۆشـەکان) دا کۆبوونـەوە. لـە سـەرەوە لەگـەڵ سەرهەڵدانی ئەبو موسلیم تۆزقالێك هیوا لە نێودڵی ئەو خەلکە جوولا کە بتوانرێ جارێکی تر تۆقی دیلی عارەبەکان لە ملی خۆیان بکەنەوە و ئازادی و سەربەخۆیی جارانیان وەدەست بێننەوە، لەبـەر ئەوە بوو کە کوشتنی ئەبو موسلیم بەو شێوە غـەدر و خیانـەت و ڕیـسوایی و ناڕەواییـەی ئـەوان، جارێکی تر ترس و نیگەرانی خستەوە و لە ماوەیەکی کورتدا هـەمووانی لـەژێر ئـالای ئیـسحاقی تورکدا کۆکردنەوە.

## ئیسحاق تورك

بە تەواوی دیار نییە ئەم ئیسحاق تورکە کێ بووە؟ گێڕانەوەیـەك هەیـە کـە دەڵێ لـە بنەچـەی (زێدی کوڕی عەلی) بووە، داوای ئیمامـەتی کردووە، گێڕانەوەیەکی تر هەیە کە مرۆڤێکـی ئاسـایی خەلکی ئەو دیوی ڕووبار بووە، کە لەگەڵ جنۆکەکاندا پەیوەندی بووە!. ئەوەی دیارە هۆکـاری دیـار نەبوونی ناونیشانی ڕاستی بە شاراوەیی بێنێتەوە، ئەوەیە کە لەگەڵ هـەر گـروپ و دەسـتەیەك بـە شێوازێك قسەی کردووە. بەرژەوەندیی کاتی بەو شێوەیە ڕەچاو کردووە، بە هەرحاڵ ئەو ئیسحاقە لە لایەنگران و دۆستانی ئەبو موسلیم بووە، بەپێی هەندێك لە گێڕانەوەکان لەبەرئەوەی پێیـان گوتـوە (تورك) چونکە ماوەیەك بە فەرمانی ئەبوموسلیم وەکو نوێنەر ڕەوانـەی لای تورکـەکان کـراوە[150]،

---

149- Barthold Turkestan ،P.185.

١٥٠- الفهرست، ل ٤٨٣.

بەڵێ نووسیویانە کاتێ ئەبو موسلیم کوژرا لایەنگر و هەوادار و یاوەرانی ڕایان کرد بۆ شوێنەکانی تری وڵات، ئەم ئیسحاقە کە یەکێك لە یاوەرانی ئەبو موسلیم بوو دەچێتە تورکستان و لەوێ بانگێشتی دەستپێکرد، خەڵکی ئەوێش لە دەوری کۆبوونەوە، گوتوویانە کە ئەو لەو دیوی ڕووباردا خەڵکی بۆلای خۆی بانگێشت دەکرد وای نیشاندەدا کە ئەو جێنشینی زەردەشتە و دەیگوت زەردەشت هەر زیندووە و جارێکی تر سەرهەڵدەداتەوە، تاکو ئایینی خۆی ئاشکرا بکات، بەو شێوەیە لە خوراساندا بانگێشتەکەی زۆر بە چاکی بڵاوبووەوە.

## نێردراوی ڕووبەنددار (پەیامبەری ڕووبەنددار)

لە هەرێمی ئەو دیوی ڕووباردا گرنگترین ڕوودا و کە بۆ تۆڵەی (ئەبو موسلیم) سەریهەڵدا، ڕووداوی سەرهەڵدان و پەیدابوونی ((موقەنەع ڕووبەنددار = دەمامکدەر)) مردووە لە ساڵی (١٦٩ ك/٧٨٥ ز) بوو، لە ڕاستیدا چەند ساڵ دوای ڕووداوی (ئوستادسیس) لە خوراسان، ئەو دیوی ڕووبار سەرهەڵدان و شۆڕشی (موقەنەع)ی بەخۆوەبینی، ئەو مرۆڤە خاوەن پەیام و ڕووبەنددارەی مەرۆ، بانگێشتی نوێ و مایەی سەرسۆڕمانی ڕاگەیاندووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە پشت ئەو هەموو گەردو تۆزەی، کە ئەفسانەکان کە ژیانی ئەویان داپۆشیوە زۆر سەختە بتوانین سیمای ڕاستەقینەی ئەو وێنا بکەین. ئەوەی مێژوونووس و نووسەری کتێبەکان لە بارەی ئەوەوە نووسیویانە، بێگومان دوور لە لاگیری نییە و نووسیویانە کە ((مرۆڤێك بوو خەڵکی یەکێك لە گوندەکانی مەرۆ بەناوی (کازە) و ناوی (هاشم کوڕی حەکیم) بووە لەسەرتا دا جل شۆری دەکرد، پاشان کەوتە دوای زانست و لە هەر بەشێك شتێکی لێ وەرگرت، فێری شوعبەدە و زانستی فێڵکردن و تەلەسمبازی بوو، زۆر باش شوعبەدەبازی دەزانی و بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد و یەگجار زیرەك بوو و کتێبی زانستەکانی کۆنی زۆر خوێندبوونەوە، لە جادوگەریدا زۆر کاردان و شارەزا بوو.[151] هەموو مێژوونوسان بەو شارەزاییە بێ وێنەیەی ئەویان لە زانستی فێڵکردندا هەڵگوتووە، مانگی دروستکراوی نەخشەب کە بەکاری سەرسوڕهێنەری ئەو ناونراوە! نموونەیەکی زیرەکی ئەو نیشاندەدا، کە لەبارەیەوە گوتوویانە لە خاکی نەخشەبدا لە وڵاتی ئەو دیوی ڕووبار چاڵێك هەبووە کە موقەنەع بە جادوو تەنێکی دروستکرد بە وێنەی ماسی، خەڵکی تەنیان بینیوە لە چاڵەکە هاتوتەدەرەوە. نەختێك بەرز بۆتەوە و دیسان چووەتە ناو چاڵەکەوە،[152] ئەو مانگە دەستکردە واتە نەخشەب

١٥١- نورشخی، تاریخ بخارا، ل ٧٧، چاپ تهران.

١٥٢- هیندوشا نخجوانی: تجارب السلف، ل ١٢١.

لەلایەن شاعیرانی ئێران و عارەبەوە بەردەوام لە شیعرەکانیاندا باسکراوە، بەڵام چۆنیەتییەکەی تاکو ئێستاش دیارنییە، نووسیویانە کاتێ موقەنەع ئەو مانگەی لە چاڵ هێنایەدەر خەڵك گومانیان لا دروستبوو کە ئەوکارە بە جادویی کراوە، بەڵام ئەو جادوییە لە ڕاستیدا بریتی بووە لە هەندێ ئامادەکاری و بەکارهێنانی هەندێك پرەنسیپی مەشقکاری باسیانکردووە کە دواتر لەبن چاڵەکەدا جامێکی گەورەی پڕ لە زیبەقیان دەرهێناوە[١٥٣]، جێی وەبیر هێنانەوەیە ئەو (هاشم کوڕی حەکیم)ە هەروەکو لە مێژووەکاندا هاتووە، لە ڕۆژگارانی ئەبو موسلیمدا یەکێك لە هەواڵانی نزیکی بووە، بێ ئەگەر نییە کاتێ کە بانگێشتی خۆی ئاشکرا کرد یادی ئەو سەردارە ڕەشپۆشەی خوراسان لە بیروبۆچوونیدا بە شێوەیەکی وا ڕوون ڕەنگی دایەوە. ئەو (ئەبو موسلیم)ی لە پێغەمبەر بە زیاتر و باڵاتر دەژمارد، تاکو گەیشتە ئەوەی کە پلەوپایەی (ئەبو موسلیم) لای ئەو گەیشتە ڕادەی خواوەند. دەڵێن کە وای نیشانداوە گیانی (ئەبو موسلیم) دۆنایدۆنی ئەو بووە و ئێستا ئەو خواوەندە.[١٥٤] سەبارەت بەوەی کە بە (موقەنەع / ڕووبەند دار) بەناوبانگ بووە، گوتراوە کە بەردەوام ڕوپۆشێکی لە زەرۆ، یا (پەرەند)ی سەوزی بەسەر خۆیدا دەکێشا تاکو کەس ڕووی نەبینێ، هاوەڵانی وایاندەزانی کە ئەو ڕووپۆشەی لەبەر ئەوە پۆشیوە تاکو ڕۆشنایی و تیشکی پڕشینگداری دیدە و بینایی خەڵك تێك نەدات، بەڵام دوژمنان و ناحەزانی دەیانگوت ئەو ڕووپۆشە لەبەر ئەوەیە تا وەکو ناشیرینی و ڕووگرژی خۆی پێ بشارێتەوە، گوتویانە کەوا پیاوێکی یەکچاو و زەن گیراو کورتە باڵاو کەچەڵ بووە، بەپێی گێڕانەوەی ئەبوریحانی بیرونی ((داوای خوایی کردووە و گوتویە لەبەرئەوە لە جەستەی مرۆڤدا دەرکەوتووم تاوەکو ببینرێم چونکە بەرلە ئێستا کەس نەیتوانی بوو ببینێ. دواتر، لە جەیحون دەرچوو گەیشتە دەوروبەری (کش) و (نەسف). نامەی بۆ خاقان نووسی و بانگێشتی کرد بۆسەر ئایینی خۆی، سپی پۆشەکان و تورکەکان لە دەوری کۆبوونەوە، ژن و دارایی خەڵکی بۆ حەڵاڵ کردن!، هەرکەسێك دژایەتی بکردبایە دەیکوشت، بۆ هەموو ئەوانەی ئایینی مەزدەکییان هەبوو، واژۆی ڕەزامەندی کرد. لەشکری مەهدی خەلیفەی عەباسی شکست داو چواردە ساڵی ڕەبەق حوکمی گێڕا[١٥٥])).

---

١٥٣- قزوینی: آثار البلاد، وەرگیراوە لە ادوارد براون: تاریخ ادبی ایران ب١.

١٥٤- تبصرة العوام، ل١٧٩.

١٥٥- آثارالباقیة، ل٢١٨. ئەم ماوەیە لە مێژووی بوخاراشدا هاتووە کە بەدەر لە زێدەڕۆیی نییە، لە مبارەیەوە بگەڕێوە بۆ توێژینەوەی د: غلامحسین صدیقی لە نامەی ئیجتهادی دا . Les Movements.Relgieux Iraniens

لەو ماوەیەدا زۆرینەی خەڵکی سوغد، بوخارا، نەخشەب، کش چوونە سەر ئاییینی ئەوەوە و بیروباوەرەکەیان پەسەند کرد و دژی خەلیفە هەستانە سەرپێ و بانگی نارەزایەتییان بەرز کردبووەوە. سەرچاوەکان نووسیویانە کاتێ کە لایەنگرانی دەچوونە بەرەکانی شەڕ لەکاتی تەنگاوی و نیگەرانیدا هەروەکو خوداوەند هاوکاری یان لێ داوادەکرد و دەیانگوت! ئەی هاشم دەهانامان وەرە[156]، ئەو سپی پۆشانەی (موقەنەع) رێگایان لە کاروانییەکان دەگرت و رووتیان دەکردنەوە، بەسەر شار و گوندەکانیان دادەدا. زۆر شوێنیان وێران و نابوود دەکرد. ژن و منداڵی دوژمنەکانی خۆیان بەدیل دەگرتن و مزگەوتەکانیشیان تێکدەدا و وێرانیان دەکردن، بانگبێژان و نوێژکەرانی موسڵمانیان دەخستەبەر دەمی شمشێرە تیژەکانیان[157].

نووسیویانە کە لە سەرەتای کاردا کاتێك دەنگوباسی (موقەنەع — روبەند دار) لە دەڤەری خوراسان بڵاوببووەوە و ئاشکرا کرا، (حەمیدی کوڕی قەحتەبە) کە ئەمیرێکی خوراسان بوو فەرمانی بەندکردنی دا، ئەویش ڕای کرد و لە گوندەکەیان خۆی حەشاردا، پاش ماوەیەك کە بۆی دەرکەوت لە وڵاتی ئەو دیوی ڕووباردا خەڵکی زۆر هاتوونەتە سەر ئایینەکەی و لە دەوری کۆبوونەتەوە و ئایینیان ئاشکرا کردووە، ئیدی بڕیاریدا لە جەیحون بپەڕێتەوە، ئەمیری خوراسان فەرمانی دابوو تاکو لە لێواری جەیحون پاسەوانەکان ڕێی لێ بگرن. بە بەردەوامی سەد سوارکار لە لێواری جەیحوندا هاتووچۆیان دەکرد تاکو ئەگەر تێبپەڕێت بیگرن. ئەو لەگەڵ سی و شەش کەس هاتە لێواری جەیحون و پاڵگەیەکی دروستکرد و بەرە و ویلایەتی کەش ڕۆیشت، خەڵکی ئەو شوێنە لەگەڵ ئەودا بوون و بەدڵ و بەگیان کەوتنە دوای. حەسارێك لە چیای سام هەبوو[158] گەلەك قاییم و بەرز، لەناویدا جۆگەلەی ئاودانی رووبار و کشتکار هەبوون و ئەویش فەرمانیدا حەسارێکی قاییمتر لەوە دروستبکرێ، کەلوپەلێکی لەڕادەبەدەری لەوێ کۆکردەوە و پاسەوانی بۆ دەستنیشانکرد، سپی پۆشەکان زۆربوون[159] ئینجا کارو بانگەوازی (موقەنەع-روبەند دار) و سپی پۆشەکان کە لەو ماوەیەدا بەرەبەرە ڕوو لە زیادبووندا بوون، بە شێوەیەکی ئەوتۆبوو کە پاشای بوخاراش (بنیات کوڕی تۆغشاد) وازی لە ئایینی ئیسلام هێناو هاتە سەر ئایینی ئەو، سپیپۆشەکان کە دەستیان

---

١٥٦- ابن اثير ، ب٥، ل ٥٢، چاپ مصر .

١٥٧- تاريخ بخارا، ل ٨٠، چاپ تهران .

١٥٨- ماکوارد، ل ٩٢ Wehrotund Arang دەڵێت قەلعەیەك بوو بەناوی سام کە ئەو لەوێدا دەژیا.

١٥٩- تاريخ بخارا، ل ٨٠

کرایەوە و پەرەیان سەند، خەلیفە زۆر نیگەران و پەریشان بوو،[160] سەرئەنجام عارەبەکان لە دەستی ئازایەتی و مێرخاسی و نەترسی ئەو سپیپۆشانە تەواو تەنگاوبوون. (موقەنەع) و یاوەرەکانی چەندین ساڵ لەبەرامبەری فەرماندە و سەرداره عارەبەکان کە خەلیفە بۆ شەڕی ئەوان دەی ناردن ڕاوەستان. باسو بە سەرهاتی ئەو شەڕانە لە کتێبە مێژووییەکاندا دەخوێنینەوە. لە کاری ئەوانەدا دەستەوەستان مابووەوە و گەلێك جار خەلیفە لە چەنگی ئەوان و ترس و نیگەرانی و زەبر وەشاندنی ئەوان کەوتۆتە گریان[161]. دواجار خەلیفە لە شکرێکی زۆری ڕەوانەی ئەو دیوی ڕووبارکرد و (موقەنەع) یان گەمارۆدا. سەرئەنجام کاتی (موقەنەع — ڕوبند دار) بۆی دەرکەوت کە نامێنێ و بە مسۆگەری لەنێو دەچێ، خۆی خستە ناو تەندورێك تاکو لە نێو تەندورەکەدا بسووتێ و جەستەی نەکەوێتە دەستی دووژمنەکانی، بەڵام کاتێ سوپای سەرکەوتوو دەستیان بەسەر قەڵا کە داگرت لە ناو تەندورەکەدا دۆزیانەوە و سەریان بری و ڕەوانەی لای (مەهدی) خەلیفەی عەباسی یان کرد، کە ئەوکات لە شاری (حەلەب) بوو. سەبارەت بە ئاکامی ئەو یەکێ لە وەرزێرەکانی خەڵکی کەش چیرۆکێکی سەیر و سەمەرەی باسکردووە کەلە مێژووی بخارادا لە زاری ئەو وەرزێرەوە ئاوا باسکراوە، ((گوتی: وەرزێرەکە ـ نەنکم یەکێك لە خاتوونەکان بوو، کە (موقەنەع) بردبوویە لای خۆی و لەنێو قەڵاکە بوو، نەنکم گوتی: ڕۆژێك (موقەنەع) ژنەکانی کۆکردنەوە و خواردن و خواردنەوەی بۆ دانان و هەندێ ژەهری کردە هەر پەرداخێك و هەر ژنە و پەرداخێکی دانە دەست و گوتی: کاتێ من پەرداخی خۆم خواردەوە، ئێوەش هی خۆتان بخۆنەوە و هەمووان پەرداخی خۆیان خواردەوە و تەنها من نەمخواردەوە و ڕژاندمە نێو کراسەکەم و ئەو ئاگای لێ نەبوو و ژنەکان هەموویان کەوتن و مردن، منیش خۆم خستە خوارەوە و وەکو ئەوان ڕاکشام، ئینجا هەستا و سەیری کرد، هەموو ژنەکان مردوون و لە پاسەوانەکەی خۆی نزیك بووەوە و شمشێرێکی لە ملیدا، بڕیاری دابوو سێ ڕۆژ پێشتر تەنووریان داخستبوو، بۆ لای تەنوورەکە چوو و جلەکانی خۆی داکەندن و خۆی فڕێ دایە نێو تەنوورەکە و من هەستامەوە و سەیرم کرد دووکەڵێك لە تەنوورەکە بەرز بووەوە و لە تەنوورەکە نزیك بوومەوەو هیچ ئاسەوارێکی ئەوم بەدی نەکرد و هیچ کەس لەنێو قەڵادا زیندوو نەبوو. هۆی خۆ سووتاندنی ئەو، ئەوە بوو کە هەمیشە دەیگوت: بەندەکانی من یاخی دەبن و دژم دەوەستن، دەچمە ئاسمان و فریشتەکان لەگەڵ خۆم دێنمە خواروو لە نێویاندا دەبم، ئەو بۆیە

---

١٦٠- هەمان سەرچاوە، ل ١٠

١٦١- تاریخ بلغمی، ل ٧٣٣ چاپ هند

خۆی سووتاند تا خەڵك بڵێن چووتەوە ئاسمان تا فریشتەکان لەگەڵ خۆی بێنێ و یارمەتی بدەن و ئایینەکەی لە جیهاندا پایەدار بمێنێتەوە، ئینجا ئەو ژنە دەرگای قەڵای کردەوە[١٦٢] ......))

ئەگەرچی ئەم گێڕانەوەیە دوور نییە لە ئەفسانە بەڵام زۆربەی مێژوونووسان باسی ئەم خاڵەیان کردووە کە پێش ئەوەی عارەبەکان بگەنە قەڵای موقەنەع و دەستی بە سەردا بگرن موقەنەع خۆی لەناو بردووە. بەڵێ بەمشێوەیە بوو کە ڕۆژگاری خواوەندی نەخشەب یاخود پەیامبەری ڕووبەند داری خوراسان کۆتایی پێهات[١٦٣]. مانگی نەخشەب کە بۆ ماوەیەك تیشکی خستبووە سەر ئاسمانی ئەودیوی ڕووبار هەر چەند دەرکەوتنی ڕووناکییەکەی زۆری نەخایاند، بەڵام بۆ ماوەیەکی کورت بووە جێگەی ئومێدی کەسانێك کەلە جەور و ستەم و بێدادیی عارەبەکان و بچووك سەیرکردنیان لەلایەن تازییەکانەوە ئەوانی هاندەدا کە دەست بە سەرهەڵدان بکەن و ڕێ نیشاندەر بوو بۆ نارەزایەتی دەربرین.

ئەو سپیپۆشانە دوای مردنی (موقەنەع) یش بۆ ماوەیەك لەودیوی ڕووبار لە سەر بیروباوەڕو ئایینی ئەوەوە مابوونەوە و نووسەری نەناسراوی کتێبی (حدود العالم) و بیرونی و مقدسی، هەروەها دانەری مێژووی بوخارا ئاماژەیان بە بوونی هەندێك لەوان لەو دیوی ڕووبار کردووە.[١٦٤] نورەدین عەوفی مردووە لە ساڵی (٦٣٥ ك ١٢٥٦ز) لە سەرەتای سەدەی هەفتەمی کۆچی دا دەڵێت ((ئەمڕۆ لە خاکی، ئەو دیوی ڕووباردا هەندێك لە لایەنگرانی ئەو هەن کە کاری کشتوکاڵ دەکەن وپێیان دەڵێن سپیپۆشان و مەزهەب و ئایین و بیروباوەڕی خۆیان دەشارنەوە و هیچ کەسێك پێی نەزانیوون و زانیاری لەبەردەستدا نییە کە ڕاستی ڕێبازیان چییە؟))[١٦٥] ئەم قسەیەی عوفی ئێستاش ڕاستە و لەڕاستیدا ئەوەی لە کتێبەکاندا لە بارەی ئەو سپیپۆشانە هاتووە ڕاستی ئایین و شێوازی ئەوان نیشان نادات و ناتوانرێ بناسرێن، لەبەر ئەوەیە کە نووسەرانی کتێب و وتار لە بارەی ئەوان یەك ڕانین، هەندێك لە ڕیزی زندیقەکان و کافرەکان دایان ناون، هەندێکی تر بە شیعە دەیان بەستنەوە، هەندێکی تر بە مەزدەکی دەیانژمێرن[١٦٦] لە کۆی ئەو قسانەی کە لەبارەیانەوە دەگۆترێن، ئەوەیە کە

---

١٦٢- تاریخ بخارا، ل ٨٨-٨٧.

١٦٣- تامس مور (th>moore)شاعیری ئینگلیزی (مردووە لە ساڵی ١٨٥٢ ز) لە چیرۆکی لالە روخ دا هێناوە.

١٦٤- بگەڕێوە بۆ، frye ترجمە تاریخ بخارا، ل ١٤٧ .

١٦٥- جوامع الحکایات، نسخە خطی کتیبخانەی مجلس.

١٦٦- بگەڕێوە بۆ رازی، تبصرە، ل ١٧٩. مقدسی، ل ٣٢٣. شەهرستانی، ل ١١٥، چاپ لندن.

لە ئایینی ئەواندا لە هەموو ئاییینەکان شتێکی تێدایە. لە بارەی جلوبەرگی سپی کە رەمز و دروشمی ئەو کۆمەڵەیە بووە، بۆچوونی زۆر ئەوەیە، کە پێچەوانەی عەبباسییەکان کە ((ڕەشپۆش)) بوون ئەوان جلی سپیان پۆشیوە، بەڵام ئەو جلو بەرگە سپیە لای هەندێك ئاینزا، جلی هاوبەشی زانایانی ئاییینی بووە و مانەوییەکانیش جلوبەرگیان سپی بووە[167]. جێگەی گومان نییە کە لەو سەردەمدا مانەوی لە سوغد و ئەو دیوی ڕووباردا زۆر بوونە[168]. کەواتە لەوانەیە ئەم جلوبەرگە سپیە لە نێوان لایەنگرانی موقەنەع لەبەر ئەو هۆیە ڕەواجی بووبێ کە ئایینەکەی لەگەڵ ئاییینی مانی یەك ڕەنگ بووبێ یا بەلانی کەمەوە ڕەنگە بتوانین بڵێین لەوانەیە ئەم گومانە لەلامان دروست ببێ کە موقەنەعیش بۆ پێشکەوتنی مەبەستەکانی و ئەو ئامانجانەی کە هەیبوون، گونجان و سازگارییەك دابنێ لە نێوان بیروباوەڕی مانەوی کە لە هەرێمی ئەودیوی ڕووبار زۆر بوونەو ئاییینی زەردەشتی و خوڕەمی. کەواتە بێ هۆ نییە کە خاوەن وتار و نووسینەکان ئەو و هاوەڵەکانی ئەویان سەر بەو ئاییینانە داونەتە قەڵەم.[169]

---

167- Pelliot،les traditions manic.

١٦٨- الفهرست، ل٣٣٧.

١٦٩- بۆ باسی موقەنەع جگە لەوەی باسمانکرد بگەڕێوە بۆ احوال اشعار رودکی، لە نووسینی سعید نەفیسی ب١، ل٢٩٣. وتاری ذبیح الله صفا مجلە مهر سالّ ٤-٥ بۆ توێژینەوەی ئەوروپایەکان بگەڕێوە بۆ پەراوێزەکانی فرای frye لەسەر وەرگێراوی ئینگلیزی تاریخ بخاری ل١٤٣.

## دروستکردنی بەغدا

لەو ڕۆژەی کە شاری کوفە بووە پایتەختی خەلافەتی (ئەبو لعەبباسی سەففاح) مردووە لە (١٣٦ ك/٧٥٤ ز)، ئیتر دیمەشق لە ڕەونەق و شکۆی دێرینەی کەوت. خوراسانییەکان خەلافەتیان هێنابووە کایە و پێویست بوو کە بارەگای خەلافەت لە وڵاتی ئەوان نزیکتر بێت. دیمەشق کە نزیکی سنووری ڕۆم بوو، لەو پەڕی مەملەکەتی ئیسلامی کە زۆر فراوان و بەربلاو بوو، زۆر دوور بوو. جگە لەوە، خەڵکی دیمەشقیش هەروا لە دڵەوە لایەنگریان لە (مەروانی) و (سەفیانی)یەکان دەکرد. بۆ ئەو خەلافەتەی کە تازە بە هەوڵ و پشتیوانی مەوالی و ئێرانییە ئازادەکانەوە پێکهاتبوو و هاتبووە ئارا، هیچ جێیەك لە عێراق گونجاوتر نەبوو، چونکە عێراق یەکەمین خاڵی تەماس و پێکگەیشتنی نێوان عارەب و ئێرانییەکان بوو. هەم لە هەرێمی خوراسان نزیك بوو و هەمیش لەگەڵ سەرزەمینی عارەب مەودایەکی ئەوتۆی نەبوو. بەڵام لە عێراقیشدا شارێك کە بشێ لە هەموو ڕووەوە شایستەی بارەگای خەلافەت بێ، نەبوو. کوفە زیاتر لاگری بنەماڵەی عەلی بوو و بەسرەش شوێنێکی زۆر دوور و لاپەڕگە بوو. پێویست بوو شارێکی تازە دروست بکەن. شارێك کە شایستەی ئەوەبێ بارەگای خەلافەتی عەبباسییەکانی لێ بێ. سەففاح — پێدەچێ هەر لەبەرئەوەبێ — لە نزیك کوفە، شارێکی تازەی دروستکرد و ناوی نا (هاشمیە) و ئەوێی کردە پایەگای خەلافەتی خۆی. ماوەیەك دواتر، ناوەندی خەلافەتی بۆ شارێکی تر بە ناوی (ئەنبار) گواستەوە. دوای ئەو (ئەبو جەعفەری مەنسوور)ی برای هاتە سەرتەختی خەلافەت و هەوڵی دا شوێنێکی لەبارتر بۆ بارەگای خەلافەت بدۆزێتەوە.

باسی بنیاتنانی ئەو شارەیان وا نووسیوە کە: مەنسوور دەستەیەك لە خەڵکی زانا و ئەندازیار و شارەزای ڕەوانە کرد کە شوێنێکی گونجاو و شیاو دیاری بکەن و ئەوان ئەم شوێنەیان کە ئێستا پێیدەگوترێت (بەغدا) هەڵبژارد و (مەنسوور)یش ئامادەبوو و ئەو جێیەی پەسەند کرد و شاری بنیات نا... یەکێ لە پیاوە ئاقڵەکانی مەسیحی بەخەلیفەی گوت ئەی میری خاوەن باوەڕان یەکێك لەلایەنە باشەکانی ئەو شوێنە ئەوەیە کە کەوتۆتە نێوان دیجلە و فورات و لەکاتی شەڕ و شۆڕدا ئەم دوو ڕووبارەی دجلە و فورات وەکو دوو خەندەقن بۆ شار. یەکێکی تر لە لایەنە باشەکانی ئەوەیە کە دانەوێڵە و خواردەمەنی لە دیاربەکر و (ئامەد)وە بە نێو ڕووباری دیجلەدا سەرەوژێر دەهێندرێتە شار و لە بەسراشەوە سەر و ژوور بەهەمان شێوە. لە لای شامەوە بە نێو ئاوی فورات و لە خوراسان و ئێرانیشدا بە نێو ڕووباری ئامرادا. لایەنێکی تری باشی ئەم شوێنە ئەوەیە چونکە کەوتۆتە نێوەڕاستەوە، ئەگەر پردەکە ڕووخێندرا ئیدی

دوژمن ناتوانێ بپەڕێتەوە. جگە لەوانەش ئەم شوێنە کە تۆتە نێوان بەسرە و واست و موسڵ و سارا و ئاو و چیای لێوە نزیکن. خەلیفە کاتێ گوێی لەو قسەیە بوو، زیاتر رشت بوو لەسەر دروستکردنی. نامەی بۆ دەوروبەر نارد کە وەستاکار و ئەندازیار و کرێکاران بێن و کاتێ بناغەی شوورەی شارەکەیان دانا، خۆی خشتی یەکەمی بەدەستی خۆی دانا... و فەرمانیدا کە پانایی شوورەکە پەنجا گەز و بەرزییەکەشی بیست گەزبێت و سەرای مەنسوور خۆیشی لە نێوەڕاستی شاردا بنیات نرا، بە شێوەیەك کە مەودای هەموو لایەنەکانی وەکو یەك یەکسان بێت. کاتێ کە حسێبیان کرد چوارهەزار و هەشت سەد و سی و سێ دەرهەم لە دروستکردنی کۆشك و تەلارەکە خەرج کرابوو[170].

## شاری هەزار و یەکشەوە

بەو شێوەیە بەغدا دروستکرا. خەلیفە ئەو شارەی کە تەقدیر وایکرد ڕۆژگارێکی دوور و درێژ بەسەر سەرانسەری وڵاتی ئیسلامیدا حوکمڕانی بکات، ناونا (مەدینەتولسەلام – واتە شاری ئاشتی). بەڵام ناوی (بەغداد)، کە ناوی یەکێك لە گوندەکانی ئەو دەوروبەرە بوو و خستبوویانە نێو سنووری شارەکەوە، هەروەك خۆی مایەوە و شارەکە ئەم ناوەی بەسەردا برا[171].
ئەم بەغدایە کە لە کەنار وێرانەکانی (تیسفۆن)ی کۆندا بنیات نرابوو، بووە میراتگری شارستانیەت و شکۆ و مەزنایەتی تیسفۆنیش و ئەو شارەی کە لەسەردەمی (ئەبو جەعفەر)دا دروستکرا، لە سەردەمی حوکمڕانیەتی هاروون و مەئموونداا فراوان بوو و بووە مەکۆی چیرۆك و داستان و شەنگ و شکۆی چیرۆکەکانی (هەزار و یەکشەوە)ی گرتنەخۆ. زۆر باخ و باخچە و سەیرانگای لێ دروستکران. کۆشك و سەرای بەرز و جوانی تێدا چێکران. چەندین گوند و شارە گوند کەوتنە نێو شارەکە. لەسەردەمی مەئمووندا شکۆ و پێگەی ئەم شارە گەیشتە ڕاددەیەك کە تیسفۆن و بابلی دێرینی دەهێنایەوە یاد. سەرچاوەکان نووسیویانە – و ڕەنگە زیادەڕۆیی تێدا بێ – کە لەو ڕۆژگارەدا نزیکەی شەست هەزار گەرماو و پتر لە سێسەد هەزار مزگەوت

---

١٧٠- هندوشا نخجوانی: تجارب السلف، ل ٨- ١٠٦.

١٧١- سەبارەت بەواژەی بەغدا بگەڕێوە بۆ؛ دائرە المعارف اسلام، ب١، هەروەها G: Lestrange Baghdad, p/١٠-١١. کە لە دووبەش ئێرانی "بغ" مانای خودا و "داد" وەرگیراوە.

لەو شارە ئەفسانەییەدا هەبوون[١٧٢]. بازرگانان و (سەوداگەرانی) هەموو شار و وڵاتان باریان لەو شارەدا دادەنا. کاروانسەراکانی هەمیشە پڕبوون لە بازرگانان و گەڕیدەکانی هەموو لایەکی دنیا.

دەرباری هاروون شکۆ و مەزنایەتییەکی ئەفسانە ئاسای هەبوو. نوێنەر و نێردراوانی فەرمانڕەوا و شاکانی جیهان لە هەموو شوێنەکانەوە دەهاتنە ئەو دەربارە شکۆدارە. تەنانەت شارلمانی ئیمپراتۆری گەورە و ناوداری فەرنگستانیش نوێنەرانی خۆی یان ڕەوانەی لای خەلیفەی بەغدا دەکردن. بەغدا، لەو ڕۆژگارەدا، چاوی بڕیبووە تەخت و بەختی قەیسەرانی ڕۆمو بەچاوێکی سووك سەیری (قستەنتەنییەی)ی دەکرد. ڕەفتارێك کە بەر لەوەش، لە ڕۆژگاری ساسانییەکاندا، تیسفۆن دەیکرد. (بسفۆر) لەو ڕۆژگارەدا زۆر لە بەغدا دەترسا و لە نێو ترس و نیگەرانییدا دەژیا، زۆرجار سوپای بەغدا تا دەروازەکانی شارە لە خۆبایی و سەرفراز و بەناوبانگەکەی قستەنتەنیە دەڕۆیشت و ئەو شەڕ و شۆڕ و لەشکر کێشیانە، چیرۆکە بە پێزەکانی هەزار و یەکشەوەی یان تژی شکۆ و مەزناهی دەکرد.

بەم شێوەیە شاری بەغدا، بووە شارێك کە لەو ڕۆژگارەدا لە هەموو جیهاندا بێ هاوتابوو. کۆشك و تەلاری خەلیفە و گەورە گەورەکانی شار، بە حەرەمسەرا و خواجە و کەنیزەکانییەوە کە تیایدا بوون، شکۆ و گەورەییەکی سەیری یان بەو شارە خەیاڵ ئەنگێزەی هەزار و یەکشەوە دەبەخشی. کۆشکەکانی خەلیفە، بەو هەموو فەرش و قاپ و هێربار و پەردە ناسکانەی کە هەیانبوو، یادگاری (ئەیوانی کیسرا)ی یان بە فەرشی بەهارستان و قاپ و هێرباری لە زێڕ و زێوەر دروستکراو، کە بەگیرانی مەدائین هەمووی بە تاڵان و بەرباد کەوتبوو، نوێ دەکردەوە، ڕێوڕەسم و جەژنەکانی دەرباری خەلیفە، لەگەڵ وەزیرانی ئێرانی و بە جلوبەرگ و کڵاوەزێڕ و زێوەرییە تایبەتیەکانی ئێرانییەکانەوە، جارێکی تر یاد و یادەوەرییە مردووەکانی سەردەمی شکۆمەندی و مەزناهی تیسفۆنی یان لە بەغدا زیندوو دەکردەوە.

## خەلیفەی بەغدا

ئەوە ئەو خێر و بێرە درەوشاوە و سەرسوڕهێنەرەبوو کە بەغدای لەو ڕۆژگارەدا کردبووە "ڕووگەی گەشتیاران" و "کابەی هیوا و ئاواتی بێگانان" بەغدا شارێك کە پێتەختی خەلیفە بوو، باج و خەراجی لە زۆربەی هەرە زۆری جیهانی ئیسلامی وەردەگرت و لە نێو زێڕ و خێر و

---

١٧٢- جرجي زيدان، تأريخ المتمدن الاسلامي، ب٣، ل ١٥٤.

بێرەکاندا دەخولایەوە. بەڵام داخۆ ئەو هەموو سامان و دارایییەی کە ئەم شارەی (هەزار و یەکشەوە)ی نقومی نێو جوانی و شکۆمەندی دەکرد لە کوێوە دەهات؟ لە تالانکردنی خەڵك، چونکە عەبباسییەکان ئەگەرچی وازیان لەو توندوتیژی و دەمارگیرییەی کە مەروانییەکان دەرهەق بە مەوالی هەیانبوو و هێنا، بەڵام لە کۆکردنەوەی پارە وماڵ و داراییدا، هەر وەك خەلیفەکانی شام، تابلێی چاوچنۆك و تەماعکار بوون. بەو تەرزە بوو کە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا ماڵ و سامانێکی زۆریان کۆکردەوە. وەك چۆن دەبینین کە (ئەبو لعەبباسی سەففاح) یەکەمین خەلیفەی عەبباسییەکان کاتێ مرد، لە نۆ جوببە و چوار کراس و پێنج شلوار و چوار عەبا و سێ کراسی ئاوریشمی زیاتری لەدوا بەجێ نەما. بەڵام مەنسوور کە لە جێی ئەودا دانیشت ئەوەندە لە کۆکردنەوەی پارە و ماڵ و داراییدا چاوچنۆکانە هەنگاوی ناکە دوای مەرگی، نزیکەی شەش سەدهەزار هەزار دیناری لە دوا بەجێماو لە کاتی سەرەمەرگدا بە مەهدی کوڕی خۆی گوت ئەوەندەم پارە و سامان لەم شارەدا بۆ کۆکردویەتیەوە کە ئەگەر دەساڵیش باج و خەراجت پێنەگا، دیسان بەشی خواردەمەنی سوپا و تێچوون و خەرجییەکانی وڵات دەکا و دەتوانی بە ئاسوودەیی کاروبارە دارایییەکانت هەڵسوڕێنی. پارە و سامانی هارونیش سنوور و ئەندازەیەکی نەبوو، وێڕای ئەو هەموو دەست بڵاوی و نۆشخۆری و پەرش و بڵاویەی کە لە کتێبەکاندا لێیان گێڕاوەتەوە، دوای مردنی پتر لە نۆسەد هەزار دەرهەمی لە دوای خۆی بەجێهێشتووە. باس و چیرۆکی واشیان لە بارەی ئەمین و مەئموون باسکردوون کە باس لە سامان و دارایییەکی ئەفسانە ئامێز دەکەن.

ئەو هەموو پارە و سامانە زۆرەی خەلیفەکان بێگومان بە لەبەرچاوگرتنی دادگەری و ویژدانەوە پێکەوە نەنرابوو، بۆ ئەو کارە، تالان و بڕۆی خەڵکی و بردن و رفاندنی ماڵ و سامانی گوند و شاران پێویست بوو. ئەو (مەهدی)یەی کە لە دوا دواییەکانی حوکمڕانی (بەنی ئومەییە)، بانگەشەکارانی خوراسان مژدەی دەرکەوتنیان بە خەڵکی تالانکراو و زۆرلێکراو دەدا، لەسەردەمی حوکمڕانی (بەنی عەبباس)دا، دەرکەوت، بەڵام هیچ لەو زوڵم و بێدادییەی کە جیهانی تەنیبووەوە، کەم نەکردەوە و ئەو هەموو هیوا و ئومێدەی کە خەڵکی ستەملێکراوی عێراق و خوراسان، کە بە (بەنی هاشم) هەیانبوو، بە هاتنە سەرکاری بەنی عەبباس هەمووی بەیەکجاری بەبا چوو. ئەو ئارەزووەی، کە دەوڵەتی بەنی هاشم لە نێو هەموو موسوڵماناندا، ئەو دادگەری و یەکسانیە دووبارە بەرقەرار دەکاتەوە کە بەنی ئومەییە لە نێویان بردبوو، بووە بلقی سەرئاو. چاوچنۆکی و تەماعکاری مەنسوور و هاروون، و بەرتیلخۆری و پێشێلکاری بەرپرس و

کاربەدەستەکانیان، دیسان ڕۆژگاری حەجاجی کوڕی یوسف و سەردەمی خەلیفە [(هیشام) مردووە لە ساڵی (١٣٥ك / ٧٤٣ز)] یان زیندووکردبووەوە. هەموو ئەو هیوا و ئاوات و ئومێد و ئارەزووانەی کە زۆر لێکراوانی سەردەمی حوکمڕانی بەنی ئومەییەی والێکردبوو بە قازانجی عەبباسییەکان و دژی بەنی ئومەییە ڕاپەڕن و شۆڕش بکەن، بە هۆی ئەو ستەم و بێدادی و چاوچنۆکییەی خەلیفەکانی بەغدا، بوونە بلقی سەر ئاو. لەسەردەمی (ئەبولعەبباس)دا لە (بوخارا) کاتێ (شەریکی کوڕی شێخولمهری) سەرکردایەتی ڕاپەڕینێکی کرد دەیگوت ئێمە هەرگیز بۆ ئەوە پەیڕەوی و پشتیوانیمان لە بنەماڵەی پێغەمبەر نەکرد کە تووشی ئەو هەموو خوێنڕێژی و بێدادیانە ببین. ئەو سەرکێشی و شۆڕش و بەرەنگاری و ڕاپەڕینە پەیاپەی و یەك لە داوی یەکانی کە لە لایەن کەسانی وەك سەنباد و ئوستادسیس و موقەننەع لە خوراسان و ئەو دیوی ڕووبار ئەنجام دەدران بە هۆی ئەو خوێنڕێژی و بێدادیانەوە بوون. سەرهەڵدانی (خەواریج - لەڕێ دەرچووەکان یا شوراتەکان) کە ماوە ماوە و لە گۆشە و کەنارێکی وڵاتەوە سەریان هەڵدەدا و ڕادەپەڕین و ڕاپەڕینی (یوسف ئەلبەرەم) کە وەك خۆی دەیگوت ئامانجەکەی بریتی بوو لە فەرمان بە چاکە و دووری لە خراپە (امر بە معروف و نهی از منکر)، هەموو ئەمانە ئەوەیان نیشان دەدا کە ئەو بێدادی و تاوانکاریانەی ڕۆژگاری بەنی مەروان هێشتا کۆتاییان نەهاتووە و لەو ڕۆژگارەدا دەیانگوت.[١٧٣]

" بریا بێدادی مەروانییەکان بگەڕابایەوە و خۆزگە دادی
عەبباسییەکان بۆ دۆزەخ چووبا. "

ئەمەش شتێکی سەیر نەبوو، چونکە لە هەموو جێیەك کاربەدەستەکانی خەلیفە، سیاسەتێکی توندوتیژانە و زۆردارانەیان پەیڕەو دەکرد کە بەردەوام ناڕەزایەتی خەڵکی زیاد دەکرد و لەو بارەیەوە بارودۆخەکە چ جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ سەردەمی حوکمڕانی بەنی ئومەییە نەبوو. فەرماندە و کاربەدەستان لە نێو شارەکاندا بازرگانان و خەڵکی خاوەن داراییان تاڵان دەکرد و ڕێگرەکانیش، کەهەر سەر بەو فەرمانەدەو کاربەدەستانە بوون لە دەرەوەی

---

١٧٣- مەبەستی Vanfloten ڤان فلوتن توێژەری ناسراوی هۆڵەندی لە کتێبی Recherches surla Domination arabe, p,٣ هەر ئەویش ئەم بەیتەی لە ئەغانی دا وەرگرتبوو.

یالیت جوربنی مروان عادلنا (بریا بێدادی مەروانییەکان بگەڕابووایەوە)
یالیت عدل بنی عباس فی النار (خۆزگە دادی عەبباسییەکان بۆ دۆزەخ چووبا)

شارەکان و لەڕێ و بان و گوزەرگاکاندا هەمان کاریان ئەنجام دەدا. وەرزێـران و دێهاتییـەکانیش ڕووت دەکرانەوە و لە شارەکاندا پیاوانی خەلیفە دایاندەدۆشـین. حـاڵی پیـشەوەران و تەنانـەت سوپاییەکانیش لەوە باشتر نەبوو. ئەوانیش لەلایەن وەزیـر و فەرمانـدە چاوبرسـییە بـێ بەنـدو بارەکانەوە دەچەوسێندرانەوە و بێدادیان لەگەڵ دەکرا و هاواری نارەزایەتی هیچ کـەس بـەگوێی خەلیفە دانەدەچوو. خەڵکی بۆ دابینکردنی خەرجیە لە حـساب نـەهاتووەکانی دەربـار کـە لـە ڕابواردن و ێڵخەرجیدا نقوم ببوو، ناچار بوون جۆرەها باج و خەراج بدەن. هەزاران خێزان دامـاو و پەرێشان دەبوون تاکو خەلیفە لە دوا شەوێکی مەستیدا بتـوانێ بـارانی جـەواهیرات و پـارە بەسەر شاعیران و سەماکەر و ساقی و گاڵتەچییەکانی خۆیدا ببارێنێ. خوێنی سـەدان بێتـاوان دەرژێندرا تاکو خزمەتکارانی خەلیفە بتوانن سفرەی ڕەنگاوڕەنگی خۆیان بە جۆرەها خـواردن و خواردنەوە برازێننەوە.

ئەو بەخشیشانەی کە لە خەلیفەکانەوە باسکراون زۆربەیان ئەوەنـدە لـە سـنوور و ئەنـدازە بەدەرن، کە مرۆ لە ڕاستی و دروستیان دوودڵ و سەرسام دەبێت. زۆرجار بووە تەنها لەبەر یـەك وشەی نەشاز و نابەجێ، ناودەمی شاعیرێکی گاڵتە بێژ پڕاپڕکراوە لەگەوهەر. زۆرجـار لـە پـای یەك تاکە دێڕە شیعری پیا هەڵدان ساز و بەرگ و نۆکەر و موڵك و زەوی و زار بە بێژەرە پەست و نزم و چاو لە دەستەکان بەخشراوە. خەلیفە (هادی)، "چوار سەد وشتری بارکراو لەزێڕ و جـل و بەرگ دەبەخشێتە خزمەتکارێکی خۆی، ڕەشـید چـوار سـەد دەسـت جلوبـەرگ و جلوبەرگـە تایبەتـەکانی خـۆی بـە شـاعیرێك دەبەخـشێ. وەزیرەکـانیش لـەو جـۆرە دەسـتبلاوی و بەباهەڵڕشتنانەدا، بێ بەش نەبوون. ئەو مەزن نواندن و پارە بەخشینەوانەی کـە دراونەتـە پـاڵ بەرمەکییەکان و بنەماڵەی (سەهل) مایەی سەرسوڕمان و هێدمەگرتنە و ئەو زیـڕ هەڵڕشـتن و پارە بەخشینەوانە نیشان دەدەن کە وەزیرەکانیش وەکو خەلیفە لە کۆکردنەوەی ماڵ و سامانـدا، هەرگیز نەیانتوانیوە پابەندی دادگەری و ویژدان بن.

## دەوڵەتی عەبباسییەکان

لە ڕاستیدا دەوڵەتی عەبباسییەکان، خۆی لە خۆیدا دەوڵەتی غەدر و خیانەت بوو. دەوڵەتی ئەو بنەماڵە عارەبە لە ئەنجامی هەوڵ و تێکۆشانی مەوالی و خوراسانیە ئازادەکانەوە هـاتبووە ئارا، بەڵام ئەوان هیچ کام لەو هاوڕێ و هاوکارە فیداکارانەی خۆیان پاداشت نەکرد و چـاکەیان نەك هەر بە چاکە نەدانەوە بەڵکو هەموو ئەو کەسانەیان کە لـە پێنـاوی ئەوانـدا فیـداکاری و

گیانبازیان کردبوو بەغەدر و خیانەت لە نێوبردن. (ئەبو سەلمە خەلال) سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵ و خەباتەی کە بۆ بلاوکردنەوە و پەرەپێدانی پەیام و بانگەشەی ئەوان نواندی کەچی بە هۆی بەدگومانی و دڵ کرمێبوونی خەلیفەوە، کوژرا. (ئەبو موسلیم)یش کە لە ڕاستیدا دەوڵەتی عەبباسی بەرهەم و داهێنانی ئەو بوو، نەیتوانی لە بەدگومانی و خیانەت و چەپەڵکاری ئەوان دەربازی ببێت. (بەرمەکی)یەکانیش هەمان چارەنووس و بنەماڵەی (سەهل)یش لە هەمان چارەنووسی شووم و خەمناك دەربازیان نەبووە.

ئەو ڕەفتارە نابەجێ و فێڵبازانەیەی کە عەبباسییەکان دەرهەق بەوانەی ئەوانیان پێگەیاند یا ئەوانەی بەرفەمانی ئەوان بوون، مایەی سەرسوڕمانە. خۆی هۆی سەرەکی ئەو هەموو ڕاکردن لە خەڵك و گوێ قولاغیەی خەلیفەکانی عەبباسی ئەوەی لێکەوتەوە کە ئەوپەڕی بەدبین بن بەرامبەر بە هەموان... و بۆ پاراستنی کورسی دەسەلاتی خۆیان لە ڕشتنی خوێنی دۆستە وەفادارەکانی خۆشیان نەپرینگێنەوە. ڕەنگە ئەو کار و ڕەفتارانەش تا ڕادەیەك لەبەرئەوە بوو بێ کە دەیانویست، بەو شێوەیە هەموو موسوڵمانان لە خۆیان ڕازی بکەن. چونکە موسوڵمانانی ڕاستەقینە لەو ڕۆژگارەدا لە بانگەشەکانی ئەبو سەلمە و ئەبو موسلیم کە تۆمەتی بیروباوەڕی (غلاة) و زەندیقە و (پەیڕەوکارانی دۆنایدۆن) یان لەسەربوو، ڕازی نەبوون. پایە و شکۆی بنەماڵەی بەرمەکییەکان و بنەماڵەی (سەهل)یش کە لە دەرباری خەلافەتدا زۆر لە ڕادەبەدەر توانا و دەسەلاتیان گرتبووە دەست، لەگەڵ مەیل و ڕەزامەندی ئەوان یەکی نەدەگرتەوە.

بەم شێوەیە، خەلیفەکانی عەبباسی — کە بە پێچەوانەی بەنی ئومەییە وازیان لە سیاسەتی پان عارەبی هێنابوو - ئەو ئێرانیانەشیان تاڕادەیەکی دیاریکراو دەهێشتنەوە و لەکاتی پێویست بەرکەناریان دەکردن تا بەو شێوەیە بتوانن متمانەی خەڵکە ڕەشۆکییەکەی خۆیان لە دەست نەدەن، کە هەرکاتێك هەڕەشە لە خەلافەت و دەوڵەتەکەیان بکات. بەهەرحاڵ، ئەگەرچی بەهاتنە سەرکاری دەوڵەتی عەبباسی، ئەفسانەی "دەوڵەتی عارەبی" کە ئەمەوییەکان هەوڵی دروستکردنیان دەدا، لەگەڵ دروستکردنی "شاری هەزار و یەك شەوە" وەکو خەون و خەیاڵەکانی "هەزار و یەك شەوە" لە نێو چوو، و لەبەرچاوان نەما، بەلام عەبباسییەکانیش ڕازی نەبوون کە دەوڵەتی بەغدا، یەکسەرە ببێتە دەوڵەتێکی خوراسانی. لەبەرئەوەش بوو کە وەزیران و پێگەیەنەرە ناودارە ئێرانییەکانی خۆشیان نەهێشتن چارەنووس و بەسەرهاتی بەرمەکییەکان گەواهی ئەو ڕاستییەیە.

## بەرمەکییەکان

ئەو بەرمەکیانە، لە گەورە و ناودارانی (بەلّخ) بوون. باپیرانی ئەوان، پەرستگەی (نەوبەهار) یان کە پەرستگایەکی بوودابییەکانی ئەو شارە بوو، بەڕێوەدەبرد. زەوی و زارێکی فراوانیش کە هی ئەو پەرستگایە بوو، لەبەردەستی ئەواندا بوو. تەنانەت دوای ئەوەیش کە باپیرانی ئەو ماڵباتە وازیان لە ئایینی بوودا هێنا و بوونە موسڵمان، دیسان ئەو زەویانە هەر لە دەستی ئەواندا مانەوە.

نەوبەهار، کە لە بەلّخ پەرستگای خەڵك بوو، هەڵبەت وەك چۆن لە ناوەکەیشیەوە دەردەکەوێ هی (بوودابییەکان) بووە. کەچی دواتر لە ئەفسانە و چیرۆکەکاندا هەوڵ دراوە، کە بە یەکێ لە ئاتەشگاکانی زەردەشتی بدەنە قەڵەم. لە کتێبەکاندا سەبارەت بە شکۆ و جوانی ئەو پەرستگایە وێنا و باسی سەرسوڕهێنەر نووسران، کە هەڵبەتە بێ زیادەڕەیی نین، بەڵام لە سەرجەم ئەو باس و وێناکردنانەدا، بە چاکی دەردەکەوێ کە ئەو پەرستگایە ئاتەشگای زەردەشتی نەبوو، بەڵکو پەرستگایەکی بودایی بووە.

بەڵێ، ئەو بەرمەکیانە، وەك لە چیرۆك و گێڕانەوە و ئەفسانەکاندا دەردەکەوێ لە دەوروبەری سەرەتاکانی سەدەی یەکەمی کۆچی هاتوونەتە سەر ئایینی ئیسلام. ماوەیەك دواتر پەیوەندیان لەگەڵ خەلیفەکانی ئەمەویدا گرێدا و سەبارەت بەو پەیوەندییەیان لەگەڵ خەلیفەکانی ئەمەوی، لە کتێبەکاندا باس و بەسەرهاتی سەیر و سەمەرە هاتوون کە سەرسوڕهێنەر و باوەڕنەکراون. بەهەرحاڵ، دوای روخانی ئەمەوییەکان، [(خالیدی کوڕی بەرمەك) مردووە لە (١٦٥ ك/٧١٧ ز)] یەکێ لە ناودرانی ئەو بنەماڵەیە، پەیوەندی بە (ئەبو لعەبباسی سەففاح)ەوە کرد و پۆستی وەزیری وەرگرت. لە قۆناغی حوکمڕانی (ئەبو جەعفەری مەنسوور)یش هەر لەو پۆستە مایەوە و کوڕەکانی لە دەرباری عەبباسەیەکاندا دەرکەوتن و هاتنە پێش و پلە و پایە و پۆستی دەوڵەتیان وەرگرت و هەموو کاروبارە گرنگەکان لەدەستی ئەواندا بوون. لەو نێوەدا، [(یەحیا کوڕی خالید) مردووە لە (١٩٠ ك/٨٠٦ ز)] کە پێگەیەنەری (هاروون) بوو، لەلای ئەو پێگە و شوێنگەیەکی تەواوی هەبوو. بە شێوەیەك کە وردە وردە هەموو کاروبارەکان بەدەستی ئەوەوە ڕایی دەکران و خەلیفە تەنها هەر ناو بوو و هیچی تر. کوڕەکانی، واتە (فەزل) و (جەعفەر)یش لە دەرگای خەلیفە هێز و دەسەڵاتێکی تەواویان وەدەست هێنا، بەچەشنێك گشت کارەکانیان گرتە دەست کە هەر کەسێك لە نێو دەزگای خەلافەتدا ئەگەر وابەستەی ئەوان نەبوا، هیچی بۆ نەدەکرا و هەر زوو لەسەر کار

لادەبرا. ئەو دەسەلات و گەورەییەی کە یەحیا و کوڕەکانی لە دەرباری هاروونـدا وەدەسـتیان هێنا، بتەویٚ یان نا ڕق و کینە و بەخیلی دەربارییەکانی دەوروژاند. بێبـاکی و نافەرمانیـە لـە ڕادەبەدەرەکانی فەزل و جەعفەریش بتەویٚ یان نا خەلیفـەیان تـەواو هەراسـان کردبـوو، ئیـدی ئەمانە هەموو بوونە هـۆی ئـەوەی کـە ناحـەز و بەخیلـەکان ڕۆژ دوای ڕۆژ زیـاتر شـوولی لیٚ هەلکێشن و بە کوفر و لە ئایین بەدەر و سەرپێچیکار و گەندەلکار تۆمەتباریان بکەن. شـکۆ و پیاوەتی ئەوانیش نەیدەتوانی زمانی ئەو ناحەز و بەد سروشتانە ببەستیٚ، بۆیە هۆ و هۆکارێکی واهاتنە ئارا کە بوونە مایەی ڕوخان و بەدبەختی ئەو بنەماڵەیە. لـە سـاڵی (١٨٧ك / ٨٠٣ز) جەعفەریان بە فەرمانی هاروون کوشت و زۆر لـە دۆسـت و یاوەرانیـشی خرانـە زینـدان و ژێـر ئەشکەنجەوە، تەنانەت،فەزڵ و یەحیاش ڕاپێـچی زینـدان کـران و تووشـی ئـازاری گیـانپڕوکێن بوونەوە. هەموو سامان و دارایە لە ژمار نەهاتووەکەشیان دەسـتی بەسـەردا گـیرا، بـەڵیٚ کـە سانێك کە ڕۆژگارێك ئەوپەڕی سامان و خێر و بێر و خۆشیان لەبەردەستدا بوو، ئەمڕۆکە ئیـدی بە حەسرەتی نانی شەو بوون.

ئەو ماڵوێرانی و تێشکانە سەرسـوڕهێنەرانەیە کـە خانـەدانی خـاوەن توانـا و دەسـەلاتدار و شکۆمـەندی بەرمەکیان ئاوا تووشی تەنگدەستی و ناکامی کرد، لەسەرانسەری دنیای ئیـسلامیدا دەنگ و سەدایەکی خەمناکیدایەوە و هەموو جیهانی خستە سەرسامبوون و واق وڕمانەوە.

بۆیە سەیر نییە کە چیرۆکزان و بەیت بێژەکان، سەبارەت بەو ڕووداوە سەرسوڕهێنەرە،.وەهـا ریوایەتی سەیر و ئەفسانە ئامێزیان هێناوەتەوە و هەر ئەوەشە کە دەبینین سەرانسەری مێژووی بەرمەکییەکان پڕاوپڕە لە چیرۆك و ئەفسانەگەلی سەیر و باوەڕنەکراو[١٧٤]. هەروەها زۆر چیرۆك و باس و بەسەرهاتی جوان و نایاب و دلگیریش لە بـارەی ئـەو ماڵباتـە لـە کتێـب و سەرچـاوە مێژووییە کۆنەکاندا ماونەتەوە. بە شێوەیەك کە لـە چـیرۆکەکانی "هـەزار و یـەك شـەوە" دا سیمای جەعفەری بەرمـەکی دیـمەنێکی تایبـەتی هەیـە. لـە زۆربـەی ئـەو چـیرۆکە دلگـیر و فریشتەییانەدا، جەعفەریش وەکو (مەسروور)ی خزمەتکار، لە هەموو جێیـەك شـان بەشـان و

---

١٧٤ – بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە بەرمەکییەکان بگـەڕێوە بـۆ تـأریخ برامکـە، پێـشەکی درێـژی بـەڕێز عەبدوئەلعەزیم قەریب گورگانی کـە زۆربـەی گێـڕاوە گرنگـەکانی تێـدا کۆکردۆتەتـەوە. هـەروەها بگـەڕێوە: Bovrat les Barmecides dapres les histreriesns Arabes et persanes paris ١٩١٢ توێژینەوەی بەم ناو نیشانە.

هەڤرکی خەلیفەوە وانیشان دراوە کە هەموو کاروبارەکانی دەزگای خەلافەت لە ژێر دەستی ئەو وەزیرە شکۆدار و دەسەڵاتدارە ئێرانیە دایە. لە هەموو ئەو شەونشین و عەشرەتبازیانەی کە هاروونی خەلیفە لەو شارەی "هەزار و یەك شەوە" لە کۆچە و کۆڵان و بازاڕ و کەناری دیجلە و نێو دارخورماکان و لە هەموو شوێنێکدا بەوپەڕی جۆش و خرۆشەوە ئەنجامی دەدان، جەعفەری بەرمەکی لە هەموو جێیەك هاوڕێیەتی دەکات. چیرۆك و باسی سامان و شکۆ و عەشرەتبازی و ڕابواردنی خەلیفە و وەزیر و دەربارییەکانی، لەو چیرۆکە دڵگیرانەی "هەزار و یەکشەوە"دا جیلوە و ڕەنگدانەوەیەکی دیار و بەرچاویان هەیە و ئاماژە گەلێکیش سەبارەت بە تێشکان و ماڵوێرانی بەرمەکییەکان لە چیرۆکەکانی ئەو کتێبەدا هاتوون[١٧٥].

بەڵێ، بنەماڵەی بەرمەکی لە دەوڵەتی عەبباسیدا دەسەڵات و بایەخێکی زۆریان هەبوو و ڕەنگە هەر لەبەرئەوەش بووبێ کە ناحەز و بەخێلەکانیش ئاوا کەوتوونەتە تا نەو تەشەر و جنێو و بەد زمانی دژیان و هەوڵیانداوە بەزەندیق و بێ دین ناوزڕاویان بکەن و کوفر و ئاگر پەرستیان بەسەردا ببڕن. ئەوەی کە باو و باپیرانی ئەمانە لەسەر ئایینی بوودایی بوونە هیچ گومانێك نییە، بەڵام مەیلیان بۆ زەردەشتی و زیندووکردنەوەی ئاگرپەرستی کە دراوە تەپاڵیان تەواو دوورە لە ڕاستی و ئەمە هەمووی دوژمنان و ناحەزەکانی ئەو ماڵباتە دروستیان کردوون و زۆریش لەو درۆ هەڵبەستراوانە دوای شکانی ئەوان دروست کراون تا ئەو هەنگاوەی هاروون سەبارەت بە کپکردن و لە نێو بردنیان بە هەنگاوێکی لە جێی خۆ و پاساودار بدەنە قەڵەم. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، گومانی تیانییە کە دەسەڵات و گەورەیی ئەوان هەر لە چوارچێوەی هەق و دادگەریدا نەبووە و لەو بارەیەوە دوور نییە ئەوەی کە سەبارەت بەو بێ بەند و باریانەی فەزلی کوڕی یەحیا و جەعفەر تۆمارکراون، ڕاست بن.

بەهەر حاڵ دەسەڵات و هێزی بەرمەکییەکان لە مێژووی ئەو ڕۆژگارەدا سەرنجڕاکێش و مایەی سەرسوڕمانە. سامانی بێ پایان و دەستبڵاوی و زێڕ بەشینەوەشیان وەك ئەفسانە دێتە بەرچاو.

واپێدەچێ باڵادەستی ئەوان بەسەر سامان و داراییەکاندا، هەندێ جار لە خەلیفەش زیاتر بووە، بە شێوەیەك دەسەڵاتیان بەسەر خەزانەی وڵاتدا هەبووە کە ئەگەر خەلیفە خۆیشی

---

١٧٥ - سەبارەت بە جەعفەر و بەرمەکییەکانی تر هەروەکو لە چیرۆکەکانی "هەزار و یەك شەوە" داهاتووە بگەڕێوە بۆ کتێبی Bouvrat کە باسکرا. ل ١٢٠ - ١٢١.

پێویستی بە بڕێك پارە هەبوایە، بەبێ وەرگرتنی فەرمان و ڕەزامەندی ئەوان نەیتوانیوە دەستی بۆ ببات.

هەڵبەتە، کاتێ خەلیفە دەیبینی ئەو بنەماڵە مەزن و دەسەڵاتدارە لە خودی ئەو زیاتر هەژموون و باڵا دەستیان بەسەر کاروبارەکانی وڵاتەوە هەیە، خۆی لە بەرامبەر دەسەڵات و هێزی ئەوان بە بچووك دەبینی و هەر ئەو هەستی خۆ بەلاواز و بچووك دیتنە وای لێکرد کە بکەوێتە دوژمنایەتی و ئازاردانیان.

(ئیبن خەلدون) ئەو خاڵەی باش پێکاوە کە دەڵێ: "هۆی شکان و لە نێوچوونی کاروباری بەرمەکییەکان ئەوەبوو کە ئەوان دەستیان بەسەر هەموو کاروبارەکانی وڵاتدا گرتبوو و هەموو پارە و داراییەکانی دەوڵەتیان لە ژێر دەست بوو. بەچەشنێك کە ئەگەر هاروون خۆی، شتێکی لە (بەیتولمال)" بویستبا بۆی جێبەجێ نەدەبوو. ئەوان بەسەر ئەودا زاڵ ببوون و لە فەرمانڕەواییکردندا وە پێش ئەو کەوتبوونەوە. بە شێوەیەك کە بەمانەوە و بوونی ئەوان خەلیفە بۆی نەبوو دەست لە کاروباری وڵات وەربدا. کاریگەریی ئەوان لە هی خەلیفە فراوانتر و ناو و ناوبانگیان زیاتر و بەربڵاوتر بوو. هەموو کار و بار و پۆستە دەوڵەتییەکانیان بەسەران و گەورە پیاوانی بنەماڵەی خۆیان پڕکردبووەوە و بناغە و پێگەی خۆیان بەمتەرزە دادەڕشت و جێگیر دەکرد. وەزارەت و ئەمارەت و فەرمانڕوایی و تەنانەت پاسەوانی و دەرگەوانیی خەلیفە و هەموو کاروبارە کارگێڕی و سەربازییەکان و هەرچییەك کە پەیوەست بوو بە شمشێر و قەڵەم، لە ژێر دەست و کۆنترۆڵی ئەواندا بوو[176].

بەڵام ئەو وەزیرە ژیرانە، تەنها هەر بەوەندە وازیان نەدەهێنا کە جڵەوی خەلافەت بگرنەدەست، بەڵکو گەرەکیان بوو ئایینی ئیسلامیش لەگەڵ ئەندێشە و لێکدانەوەکانی خۆیان جووت بکەن. دەڵێن، بەرمەکییەکان، هاروونە ڕەشیدیان ناچار کرد کە ئاگردانێك لە ناو (کەعبە)دا دابنێ کە بەردەوام ئاگری تیا دابگیرسێنن و داری عوودی تێدا بسوتێنن. ڕەشید زانی کە بەو ئاماژەیە گەرەکیانە بنیادی ئاگرپەرستی لە (کەعبە) دا دابنێن و لە ناو کەعبە دا ئاتەشگایەك دروست بکەن. ئەم لێکدانەوەیە یەکێك بوو لە هۆکارەکانی تێشکانی بەرمەکییەکان[177].

---

١٧٦ - ابن خلدون: مقدمه، ل٢٠، چاپ اروپا.

١٧٧ - بغدادي: الفرق بين الفرق، ل٥٨.

به لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە بەرمەکییەکان وەك دەبینین بوودایی بوون نەك زەردەشتی، ئەو ڕیوایەتە جێی باوەڕ نییە، تەنانەت لە قەڵەمڕەوی ئاییینیشدا ساتێك چییە بۆ جێگیر و مکومکردنی دەسەڵات و نفووزی خۆیان کەمتەرخەمیان نەکردووە[178].

## شکانی بەرمەکیەکان

مێژوونووس و چیرۆکناسەکان بە تین و تاوێکی شاعیرانەوە بەسەرهاتی شکان و ڕوخانی بەرمەکییەکانیان نووسیوەتەوە. چ ئاخ و کەسەری سارد و دەردەدڵی کەساسانە سەبارەت بە ماڵوێرانی و تێشکانی ئەو ماڵباتە، لەسەر زار و لێوە خامۆش و پڕ لە بریاکانی شاعیران و نووسەرانی ویژدان بە خرۆش، دەربڕاون، هەوڵیان داوە کە. ماڵوێرانی و شکستی ئەو بنەماڵەیە وەك کارەساتێکی گەورە بۆ مێژووی شکۆیی و بەخشندەیی بخەنە ڕوو.

لەم نێوەدا ئەوەی کە جێی گومان نییە ئەوەیە کە سامان و دارایی ئەفسانە ئامێزی ئەوان، چاوی هاروونی خەلیفەی پارەپەرست و عەشرەتبازی مۆڵەق کردووە و وایلێکردووە کە فەرمان و بڕیاری دەست بەسەردا گرتن و هەڵلوشینی داراییەکانیان دەر بکات.

ماڵبەخشی و دەستکراوەییە لە ڕادەبەدەر و تاکڕەویە بێ ئەندازەییەکانی کوڕەکانی یەحیاش بتەوێ یان نا بەخیلی و تەماع و غیرەتی خەلیفەیان جووڵاندووە.

بەرمەکییەکان، وەك لەو ڕیوایەت و گێڕانەوانەی سەبارەت بەوان گوتراون، دەردەکەوێ لە بەخشین و تەخشان و پەخشانکردنی پارەدا زۆر دەستبڵاویان کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو باس و گێڕانەوانەی سەبارەت بە بەخششە ئەفسانە ئامێزەکانی ئەوان گوتراون، پێوەنان و زیادە ڕۆیی شاعیرانەیان تێدایە، بەڵام دەتوانین بڵێین سامان و دارایی بێ هاوتای ئەوان بۆ بزواندن و هاندانی بەخیلیی بردنی خەلیفە بەس بووە، نەخاسمە کە دوژمنان و دڵڕەشان هەوڵیان داوە زەینی خەلیفە دەرهەق بەوان مژول و ئاڵۆز بکەن. لەو ڕووەوە لە میانەی ئەو چیرۆك و ڕیوایەتانەی، کە هەن دەتوانین نیشانەگەلێك بۆ پشت ڕاستکردنەوەی ئەو خاڵە بەدی بکەین.

---

178 - گومانی ئاگرپەرستی بەرمەکە بییەکان بێگومان هەڵەیە، نەك هەر تەنیا ناویان کە کاربەدەستانی نوبەهاری بوودابییەکانی بەلخ بووە شاهیدی ئەم وتەیە بەڵکو لە نێوبردنی دەسەڵاتداریێتی مەسمغان لەلایەن خالیدی بەرمەکی، کە روحانییێکی مەزن و بایەخداری دەماوەند بوو لە میرنشینی تەبەرستان، پاڵپشتێکی ترە بۆ ئەو راستیە . هەروەها بگەڕێوە بۆ ١٢٤ Marquart: Eranshahr, p.

(ئیبین ئەسیر) نووسیویە: کاتێ جەعفەری بەرمەکی کۆشکە گەورەکەی خۆی دروستکرد و بیست هەزار دەرهەمی لە دروستکردنی کۆشکەکە خەرج کرد، ناحەزان ئەو هەواڵەیان بە خەلیفە ڕاگەیاند و گوتیان کاتێك جەعفەر بۆ دروستکردنی خانوویێك بتوانێ ئەو هەموو پارەیە خەرج بکا، گەلۆ دەبێ خەرجی و تێچوونەکانی تری ئەو چۆن و تاچ ڕادەیەك بن؟ ئەو قسەیە زۆر کاری لە هاروونە ڕەشید کرد و ئەوەی بە شتێکی زۆر گرنگ و گەورە ژمارد[179].

لە گێڕانەوەکاندا بە ئاشکرا دەردەکەوێ کە هاروونە ڕەشید چاوی بەو هەموو سامان و داراییە لە بن نەهاتوو، و ناوناوبانگە کەم هاوتایەی ئەوان هەڵنەهاتووە. لە (ئیسحاق کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵلا عەبباس) دەگێڕنەوە کە گوتویە ڕۆژێك هاروون لە بارەی بەرمەکیەکان قسەی لەگەڵ دەکردم "پێمگوت ئەی ئەمیرلموئمنین، وا دیارە کە بەخیلی بە ماڵ و دارایی ئەوان دەبەیت، ئەوان هەر خۆت دروستت کردوون و بەو پایەت گەیاندوون، ئەوەی ئەوان دەیکەن لە سایەی بوونی تۆوەیە، ئەوان نۆکەر و غولامی تۆن، هەرچی بتەوێ سەبارەت بەوان دەتوانی بیکەیت. ڕەشید نکۆڵی کرد و گوتی وەك تۆ لێکیدەدەیتەوە وانییە. من ئێستا چاو لە دەستی ئەوانم... ئەو پارە و موڵك و ماڵەی ئەوان هەیانە هیچ یەك لە کوڕەکانی من نیایە، جا چۆن دەتوانم بەرامبەر بەوان دڵنەرم و گەشبین بم؟"[180].

ئەو ریوایەتە نیشان دەدات کە هاروون چۆن چەندین ماوە وەك ئاگری بن کا و لە دڵەوە بەرق و کینەوە، چاوی بڕیوەتە ماڵ و سامان و شکۆی ئەو بنەماڵەیە، (جەهشیاری، مردووە لە (۳۳۱ ك/۹٤۲ ز))یش باسێك دەگێڕێتەوە کە پاڵپشتی ئەو ڕاستییە دەکات و دەنووسێ: "کاتێ یەحیا بۆی ڕوون بووەوە کە هەڵوێستی هاروون بەرامبەر بەو گۆڕاوە، بیری کردەوە و چووە ماڵی یەکێ لە هاشمییەکان کە دۆستایەتی لەگەڵدا هەبوو و سەبارەت بە ڕەوشی خۆی پرس و ڕای پێکرد. کابرای هاشمی گوتی: خەلیفە زۆر حەزی لە کۆکردنەوەی پارە و پێکەوەنانی ماڵ و داراییە و خۆت دەزانی کە زۆر کوڕی هەن و دەیەوێ کە ئەوانیش ببنە ماخۆی زەوی و زار و خانووبەرە... وەك دەبینین خزم و کەسەکانی تۆ گشتیان خانووبەرە و زەوی و زارێکی زۆریان هەیە و ناحەزانی تۆ لای خەلیفە دژی ئەمانە باش تێهەڵدەشێلن. ئەگەر چاوێك بە ماڵ و دارایی ئەو خزمانەت دا بخشێنیتەوە و بیاندەیتە کوڕەکانی خەلیفە ئەوا بەو شێوەیە لە

---

۱۷۹ - ابن اثیر، الکامل فی التاریخ، ب٥، ل١١٤، چاپ مصر.

۱۸۰ - ابن عبدربە: العقد الفرید، ب٥، ل٦٦ چاپ مصر.

خەلیفە نزیك دەبییەوە و ڕێز و پایەت مكوم دەبێ و خۆت و كەس و كار و دۆستەكانت لە ئازار پێگەیاندن و ڕقی ئەو پارێزراو دەبن"[181].

لەم شتانەدا دیارە كە هۆی شكست و نەهامەتی بەرمەكییەكان جگە لەوە نەبووە كە هاروون ویستویە ماڵ و سامان و دارایی ئەوان دەست بەسەردا بگرێ، لە ڕاستیدا دەستبەرسەر داگرتنی داراییەكان لەوی سەردەمیدا زۆر باو بووە و خەلیفەكان زۆر لە ئەمیر و وەزیرەكانیان بە بیانووی بچووك بچووك خستۆتە زیندان و دەستیان بەسەر داراییەكانیاندا گرتووە. بەر لە بەرمەكییەكان و دوای ئەوانیش زۆرجار خەلیفەكان چاوی تەماعیان بڕیوەتە دارایی وەزیرەكانی خۆیان و لە پێناوی زیاتر كەڵەكەكردنی ماڵ و ساماندا ئەوانیان فڕێ داوەتە كونجی زیندان و ئازار و ئەشكەنجەیان بەدژ ئەنجام داون.

بەڵام وێڕای ئەمانەی باسكران، هەندێ لە مێژوونووسان هۆی شكان و نەهامەتی ئەو بنەماڵەیە دەگێڕنەوە بۆ چیرۆكێكی ئەڤینداری و لەو بارەیەوە ریوایەتێكی سەیر باسدەكەن و دەنووسن: "ڕەشید، عەبباسەی خوشكی و جەعفەری كوڕی یەحیای زۆر خۆش دەویستن، بەڵام ئەو دووانە زۆر بێ سەبر بوون و بێ ئەوەی بەڕەسمی ببنە هاوسەری یەكتر خۆیان دەگەیەننە یەكدی و ئەمەش شتێكی نەشیاو و نامەردانەیە. خەلیفە بەو مەرجە خوشكەكەی خۆی داوەتە جەعفەر كە توخنی یەكتر نەكەون، بەڵام كە هاروون لەوێ نەما ئەوان كە دوو گەنجی جوان و تا بڵێی ڕێك و پێك و لەبەردەڵان بوون، دەرفەتیان هێنا و خۆیان گەیاندە یەكتر و لە ئەنجامی ئەو پێكگەیشتنە عەبباسە كوڕێكی بوو و كوڕەكەیان ڕەوانەی (مەككە) كرد تاكو هاروونە ڕەشید پێینەزانێ، دوای ئەوە جارێكی تریش خۆیان گەیاندە یەكدی و ئەمجارەش كوڕێكی دیكەیان بوو و ئەویشیان بە هۆی باوەڕ پێكراوەكانی خۆیان ناردە لای براكەی. دەڵێن عەبباسە لەگەڵ كەنیزەیەك دەبێتە ناخۆشی و لێیدەدا، كە نیزەكە دەچێتە لای هاروون و هەموو شتێكی بۆ باس دەكات. هاروون ڕق و كینەیەكی زۆر لە دڵ دەگرێ و بڕیار دەدات بچێتە حەج و كاتێ دەگاتە مەككە، لەو مەسەلەیە دەكۆڵێتەوە و هەردوو زارۆی بۆ دێنن و بەچاوی خۆی دەیانبینێ، دوای ئەوە هەردووكیان فڕێ دەدەنە چاڵێك و بە خاك و خۆڵ چاڵەكە دادەپۆشن، كە لە حەج گەڕایەوە، بەرمەكییەكانی لەناو بردن"[182].

---

١٨١ - تأريخ الوزراء، ل١٧٩، طبع مصر ١٩٣٨.

١٨٢ - هندوشا نخجواني: تجارب السلف، ل ١٥١.

زۆر لە چیرۆکسازەکان ئەو چیرۆکە عەشقبازیەی نێوان عەبباسە و جەعفەری بەرمەکیان کردۆتە بابەت و کەرەسەی ئەفسانەکانی خۆیان، لە ڕاستیدا چیرۆکەکە پتر لە ئەفسانە دەچێ تا ڕاستی، لەبەرئەوەیە کە ئەفسانەی سەرنج ڕاکێشیان لەبارەوە پێکەوە ناون[١٨٣].

بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە، لە مێژوونووسە جێ باوەڕەکان هەرکەسێك کە ئەو ڕووداوەی باسکردووە بە هۆکاری سەرەکی نەهامەتی بەرمەکییەکانی دانەناوە، بەڵکو تەنها بە یەکێك لە هۆیەکانی تێشکان و نەهامەتی ئەو بنەماڵەی زانیوە. ئیبین خەلدون بە توندی لە ڕاستی ئەو ڕووداوە دوودڵە و بە ڕووداوێکی دروستکراو و ساختەی دەزانێ و پایەی هاروون لەو قسانە بەرزتر و هێژاتر دەداتە قەڵەم[١٨٤].

لەڕاستیدا، عەبباسەی خوشکی هاروون، وەك لە باس و گێڕانەوەکاندا دەرکەوتووە سێ جار شووی کرد و هەر سێ پیاوەکانیشی بەر لەخۆی مردوون و لەبەرئەوەش بووە کە (ئەبو نەواس) مردووە لە (٢٠٠ ك/٨١٥ ز)ی شاعیری ناسك و قسەخۆش، هەر بۆ خۆشی، شیعرێکی هەجوو ئامێز و دڵنشینی داناوە و تیایدا ئامۆژگاری (ئەمین)ی خەلیفە دەکات کە ئەگەر ویستی کەسێك لە نێو ببات، با عەبباسەی بداتێ. بەڵام ئەوانەی لە میانی شرۆڤەکردنی دیوانی شیعری ئەبو نەواس، ناوی مێردەکانی عەبباسەیان بردووە، ناوی جەعفەریان نەهێناوە، لەوەڕا دیارە ئەو گێڕانەوەیەی هاوسەرگیری جەعفەر و عەبباسەیان بەڕاست نەزانیوە[١٨٥].

بەهەرحاڵ، وەك دیارە ئەو چیرۆکە لە ڕەنگ و بۆی ئەفسانە خاڵی نییە. وا پێدەچێ کە دروستیان کردبێ تا هۆکاری شکان و نەهامەتی بنەماڵەی بەرمەکی لە چیرۆکێکی کە لەگەڵ ئەفسانە دڵنشینەکانی ئەو شارەی "هەزار و یەك شەوە"دا گونجاو بێ، بگێڕنەوە و باس بکەن، لەو ڕووەوە هەوێن و ناوەڕۆکی چیرۆکەکەیان لە بەسەرهاتی (جەدیمەی ئەبرەش) و خوشکەکەی وەرگرتووە.

---

١٨٣ - هەروەکو لە ساڵی ١٧٥٣ز، داستان بەزمانی فەرەنسی بەناوی Abbasa بڵاوکرایەوە لە ساڵی ١٩٠٤ز کتێبی بەناوی Les Nuits de Baghdad بەزمانی فەرانسەیی بڵاوکرایەوە جۆرجی زێدان نووسەری لوبنانی ئەم چیرۆکەی بە شێوازی داستانی تأریخ نووسیوە کە بەناویانگە (بگەڕێوە: وتاری Horovitz، لەچاپی نوێی دائرە المعارف اسلام، ب١).

١٨٤ - ابن خلدون: مقدمە، ل١٩.

١٨٥ - دیوانی ابو نواس، ل٥٣٠.

بەڵێ چیرۆکی عەبباسە، کە ئیبن خەلدونیش بەگومانە لە ڕاستبوونی، لە ئەفسانەیەك بەولاوە شتێك نییە. بۆ شکان و لە نێوبردنی بەرمەکییەکان هیچ پێویست نەبوو کە ئەوان تاوانێکی بچووك یا گەورەیان لێ ڕوودابێ، ئایا سامانی لە ژمار نەهاتوو و سەرسوڕهێنەری ئەوان کە چاوەکانی خەلیفەی نزکردبووەوە بەس نەبوو کە هەر ئەوە بە تاوانێکی گەورە بۆ ئەوان بدرێتە قەڵەم؟ بۆ هەمان ئەو تاوانە واتە تاوانی (ساماندار) نەبوو کە خەلیفە، جەعفەری کوشت و ساڵەهای ساڵ فەزل و یەحیای لە سیاچاڵەکانی زیندانـدا ئازار و ئەشکەنجەدان. لە ڕاستیدا کوشتنی جەعفەر و زیندانیکردنی باوك و براکەی بیانوویێك بوو بۆ ئەوەی کە ماڵ و سامانی ئەوان بکەوێتە ژێر دەستی خەلیفە، بەڵام لەبەرئەوەی وا بیردەکرایەوە کە هێشتا بڕێکی زۆر لە زێڕ و جەواهیراتی ئەوان ماوە کە بکەوێتە دەستیان، بۆیە پێویست بوو فەزل و یەحیا ساڵەها لە زینداندا بهێڵنەوە و بە گوشار و ئەشکەنجە ئەوەی کە پێیانوابوو شاردوویانەتەوە، لێیان بستێنن و دەستی بەسەردا بگرن. گێڕانەوەیەك لە کتێبەکاندا هاتووە کە ئەو ڕاستییەی سەرەوە پشت ڕاست دەکاتەوە. نووسراوە: خەلیل کوڕی هەیسەم کە هاروونە ڕەشید کردبوویە زیندانوانی یەحیا و فەزل، دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێك (مەسروور)ی نۆکەر لەگەڵ گروپێك لە خزمەتکارەکانی خەلیفە هاتنە لای من و یەکێ لە نۆکەرەکان مێزەرێکی بەسەرەوە بوو، وامزانی ڕەنگبێ خەلیفە لە بەرمەکییەکان خۆش بووبێ و ئەو پیاوەی ناردووە کە دڵنەواییان بکات. مەسروور پێیگوتم فەزلی کوڕی یەحیام بۆ بێننەدەرێ. کاتێ فەزل لە بەرامبەری ئەودا وەستا، ڕووی تێکرد و پێیگوت ئەمیرلمؤمنین دەڵێ پێمگوتبووی کە هەموو ماڵ و داراییەکانتان تەسلیم بکەن و لاموابوو کە ئەو کارەتان کردووە، بەڵام ئێستا بۆم ڕوون بۆتەوە کە پارە و سامانێکی زۆرتان بۆ خۆتان گل داوەتەوە. پێمگوت ئەگەر ئەو پارانەی شاردوونتەوە بۆ مەسرووریان ئاشکرا نەکەی دووسەد قامچیت لێدەدەم. فەزل گوتی ئەی (ئەبا هاشم) هەرچی پێیان ڕاسپاردووی و فەرمانیان پێداوی ئەنجام بدە. مەسروور گوتی ئەی (ئەبا عەبباس) وابە چاك دەبینم پارە لە گیان بە گرنگتر دانەنێی چونکە دەترسم ئەگەر ئەوەی پێیم سپێردراوە جێبەجێی بکەم، سەری تۆی تیا بچێت. فەزل سەری خۆی بەرزکردەوە و گوتی ئەی ئەبا هاشم من هەرگیز درۆم لەگەڵ خەلیفە نەکردووە و ئەگەر هەموو دنیا هی من، ئەوا لە نێوان هەموو دنیا و لێدانی تاکە قامچییەك لێدانی قامچییەکەم ڕەتدەکردەوە و دەستم لە هەموو دنیا هەڵدەگرت، خەلیفە ئەوە دەزانێ و تۆ خۆشت دەزانی کە ئێمە شکۆ و کەرامەتی خۆمان بە

بەخشینی ماڵ و سامانی خۆمان دەپاراست، ئێستا چۆن ماڵ و سامان بە بەهای کەرامەت و شەرەفی خۆمان دەپارێزین؟[186].

بەم پێیە دەبینین کە بەرمەکییەکان بوونە قوربانی بەرزە فڕی و لە خۆبایی بوونی خۆیان و بە خیلی پێبردن و چاوچنۆکی خەلیفە، ڕاست نییە پێمانوابێ چیرۆکی پەیوەندی و کەش و کوشی نێوان جەعفەر و عەبباسە بە هۆکاری سەرەکی نەهامەتی و تێچوونی ئەوان بزانین. ڕاستە کە ئەو چیرۆکە وەك دەبینین لە ڕووی چیرۆکی جەدیمەی ئەبرەش، یا چیرۆکی تری لەو چەشنەوە دروست کراوە، بەڵام گومانی تیا نییە کە ئەو کار و ڕەفتارانە لە مەزاج و خولق و خووی توند و بێ بەندوباری هاروون دوور نەبووە. بە تایبەتیش کە هەم لە چیرۆکەکانی "هەزار و یەکشەوە" و هەم لە کتێبە مێژووییەکان و گێڕانەوەکاندا زۆر لەو جۆرە بیانووگرتن و توندوتیژییە منداڵکارانە، لەو خەلیفەیە باسکراون.

## مەیموونەکەی زوبەیدە

بۆ نموونە دەگێڕنەوە کە هاروون پلەی (ئەمارەت)ی داوەتە (مەیموونە) یەك. بە شێوەیەك سی پیاو لە دەربارییەکانی ئەو دەبوا هاودەم و ڕکابداری ئەو مەیموونە بووان و بەفەرمانی خەلیفە شمشێریان لەقەدی گرێ داوە و سوارەکان هاوڕێیەتیان دەکرد. هەر کەسێك چووبایە بارەگای ئەو پێیدەگوت کە دەستی ئەو مەیموونە ماچ بکا و لە خزمەتی دابێ... ئەو مەیموونە چەند کچێکی لە کچێتی خستبوون[187]." چیرۆکی ئەو مەیموونە بەشێك لەو چیرۆك و ڕیوایەتانەمان وەبیردێنێتەوە کە لە بارەی دوو زۆرداری ڕۆمەوە (نیرۆن مردووە لە (٦٨ ز) و کالیگولا) باس کراون. ئەو مەیموونە هی زوبەیدەی خاتوونی خەلیفە بوو. لە ڕاستیدا ئەوەندە زیادەڕۆیی لە ئیکرام و ڕێزگرتنی ئەو ئاژەڵە دەکرا کە فەرماندە بەدەمارەکان نەیاندەتوانی بەرگەی ئەو سووکایەتییە بگرن، یەکێ لەو فەرماندانە بەناوی (یەزید کوڕی مەزیدی شەیبانی)مەیموونی ناوبراوی کوشت و مەرگی ئەو مەیموونە بۆ هاروون و زوبەیدە زۆر گران کەوت و شاعیران پرسە و ماتەمنامەیان بۆ زوبەیدە هۆنیەوەتەوە[188] و ئەمانەش هەموو

---

١٨٦ - مسعودی: مروج الذهب، چاپ پاریس ب٦، ل٩-٤-٨-٤٠.

١٨٧ - قیروانی: زهرالاداب، ب٤، ل ١٠٨ هەروەها بگەڕێوە، رسالە الغفران معری، ل ٣٩٢.

١٨٨ - ابن اسفندیار: تأریخ طبرستان، ب١، ل٩٢.

سروشتی ناپەسەند و توندی خەلیفە دەخەنە ڕوو کە بەپێچەوانەی ئەوەی ئیبن خەلدون باسیکردووە، لەو جۆرە هەوەسبازیە منداڵکارانە هیچ خۆی نەبواردوە. وێڕای ئەو هەموو بەدخوویی و لاساریە، سەرداران و سەرانی وڵات، فەرمانڕەوایەتی خەلیفەیان پەسەندکردووە و گوێڕایەڵ و بەرفەرمانی بوونە، ئاخر هەرچی پلە و پایە و ماڵ و سامانێکی هەیانبووە، لە سایەی بوونی ئەوەوە بووە؟ لە ڕاستیدا، ئەو فەرماندە و گەورە گەورانە، بۆ ڕەزامەندیی خەلیفە باکیان بە هیچ ڕیسوایی و شەرمەزارییەك نەبووە، کوشتنی دوژمنانی خەلیفە و تالانکردنی ماڵ و سامانی خەڵك، ئەگەر مایەی ڕەزامەندیی خەلیفە با، شتێکی ئاسایی بوو و ئەو هەموو نزمی و زەبوونیەیان بۆ نزیکبوونەوە لە خەلیفە بەرگە دەگرت، چونکە وەزارەت و ئەمارەت، ئەگەرچی تەمەنیان کورت بوو، بەلام لەوماوە کورتەشدا سامان و داراییەکی زۆر شۆڕی گیرفانەکانیان دەبووەوە و دەوڵەمەند دەبوون.

## بەرمەکییەکان و عەلەوییەکان

ئەو میر و کاربەدەستانە کاتێ دەبوونە میر و کاربەدەستی شوێنێك لە پێناوی کۆکردنەوەی پارە و سامان دەستیان لە هیچ تاوانێك نەدەپاراست. ئەمانە لە هەموو شوێنێك شوولیان لێ هەڵدەکێشا و ئەوپەڕی تاکڕەو و ستەمکاربوون و هەرچی بیانویستبا دەرهەق بە سەر و ماڵی خەڵك ئەنجامیان دەدا. لەبەرئەوە خەڵکیش لەهەر شوێنیکدا هەلیان بۆ ڕەخسابا ڕادەپەڕین. ئەو دەرفەت و بەهانانەش هەمیشە لە ئاکامی ناڕەزایەتییەکانەوە دروست دەبوون.

وەك چۆن خەڵکی دیلەم و تەبەرستان بۆ ڕزگاربوون لە ژێر زوڵم و ستەمکارییەکانی کاربەدەستانی خەلیفە، لە دەوری یەحیا کوڕی عەبدوڵڵای حەسەنی کۆبوونەوە و دژی پیاوەکانی خەلیفە راپەڕین. چیرۆکی ئەو یەحیایە وەکو بەسەرهاتی براکانی خەمناك و سەر سوڕهێنەر بوو.

کاتێ کە برایەکانی ئەو واتە محەمەد نەفس زەکیە و ئیبراهیم قەتیل بەسەر خۆشی کوژران "یەحیا ترسی لێنیشت و بۆ هەرێمی دیلەم و تەبەرستان ڕای کرد و خەڵکی ئەوێ کە کاروباری ئەویان بینی، گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە شایستەی پێشەوایەتییە، خەڵکی لە دەوری گردبوونەوە و هێز و دەسەڵاتێکی پێکەوەناو هاروونە ڕەشید بەوە دڵگران بوو. فەزلی کوڕی یەحیای کوڕی خالید کوڕی بەرمەکی لەگەڵ پەنجا پیاو ڕەوانەی تەبەرستان کرد و گورگان و تەبەرستانی پێبەخشی. کاتێ ناوبراو گەیشتە ئەوێ لەگەڵ یەحیای کوڕی عەبدوڵڵادا نەرمی نواند و کارەکە

گەیشتە ئەوەی کە یەحیا داوای ئەماننامەی دەستەخەتی خەلیفەی کرد بە شێوەیەك کە قازی و پیاوانی ئایینی و سەرانی بەنی هاشم گەواهیدەری ئەماننامەکەبن. ڕەشید ئەمەی بە شتێکی شیاو بینی و ئەماننامەیەکی بۆ نووسی، قازی و زانا و گەورە پیاوانی بەنی هاشمی کردنە شاهید و ئەماننامەکەی لەگەڵ دیاری و خەلاتدا، بۆ یەحیا نارد و ئینجا یەحیا لەگەڵ فەزل چوونە خزمەت هاروونە ڕەشید. خەلیفە یەکەمجار لە دانیشتنەکەدا ئیکرامی کرد و دواتریش ڕەوانەی زیندانی کرد و سەبارەت بە شکاندنی ئەماننامە، داوای فتوای لە پیاوانی ئایینی کرد. هەندێکیان بە شتێکی جایزیان زانی و بەشێکیش بەناجایز. سەرەنجام هاروونە ڕەشید، یەحیای کوڕی عەبدوڵڵای کوشت[189]." ئەو ڕووداوە بووە مایەی ئەوەی کە حکوومەتی تەبەرستان بۆ ماوەیەك لە ژێردەستی بەرمەکییەکاندا، بمێنێتەوە.

لە ڕاستیدا ڕەفتاری بەرمەکییەکان لەچاو وەزیر و ئەمیرەکانی تر، زیاتر دادگەرانە و بەویژدانانەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گومانی تیا نییە کە بەشێك لەو سامان و داراییە لە ژمارنەهاتووە ئەفسانە ئامێزەی ئەوانیش هەر لە هەمان ئەوڕێیەی تالان و ستەمکارییەدا کۆدەکرایەوە. وەك چۆن سەرچاوەکان نووسیویانە، هاروونە ڕەشید، ویلایەتی تەبەرستانی دایە محەمەدی کوڕی یەحیای کوڕی خالیدی بەرمەکی و موسای برای. ئەو دووانە موڵك و زەوی و زاری وەرزێرەکانیان بە زۆرداری دەکڕی و زۆر ستەم و ناڕەوایان دەرهەق دەکردن، لە هەر جێیەکدا کچێکی جوانیان بەرچاو بکەوتبا بە خورتی و زۆرداری داوایان دەکرد و "لە ترسی فەزل و جەعفەر هیچ کەس زاتی ئەوەی نەبوو کە ئەو زوڵم و زۆردارییەی ئەوان بە هاروون رابگەیەنێ."

## عەلی کوڕی عیسا

بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە خەلیفە لەو جۆرە تالانکاری و کارە ناڕەوایانە زۆر بێ ئاگا نەبوو. چونکە لە دەستکەوتی ئەو تالانکاری و بێدادیانەی کە وەزیر و ئەمیرەکان ئەنجامیان دەدا هەمیشە پشکێکیش بۆ خەلیفە دەنێردرا. وەك چۆن کاتێك کە فەزل کوڕی یەحیای بەرمەکی ماوەیەك حوکمڕانیەتی خوراسانی لە دەستدا بوو، بانگی کردەوە بەغدا و ویستی عەلی کوڕی عیسای کوڕی ماهان مردووە لە (١٩٥ ك/٨١٠ ز) بنێرێتە شوێنی ئەو "سەبارەت

١٨٩ - هندوشا: تجارب السلف، ل ١٣٨.

بەمە قسەی لەگەڵ یەحیای بەرمەکی) کرد و داوای لێکرد بۆچوونی خۆی دەرببڕێ. یەحیا گوتی عەلی پیاوێکی زۆردار و ستەمکارە و ناتوانێ فەرمانی بەڕێزتان جێبەجێ بکات... ڕەشید لە رکی یەحیا، عەلی کوڕی عیسای نارده خوراسان و عەلی پێی لێهەڵکرد و کەوتە ڕووتاندنەوەی خەڵك و هیچ کەسیش نەیدەوێرا سەرپێچی بکا، هەواڵنێران بە دزی نامەیان بۆ یەحیای بەرمەکی دەنووسی و ئەویش چاوەڕێی دەرفەتێکی دەکرد تا بەبیانوویێك ئەو ستەمکاریانە بەگوێی خەلیفە ڕابگەیەنێ و هەوڵی دا کە خۆی بگەیەنێتە خەلیفە هەڵبەتە ئەمە سوودێکی نەبوو چونکە دواجار ڕەشید سوێندی خوارد کە هەرکەسێك بە خراپە دژی عەلی زار هەڵببڕێ ئەوا دەینێرێتە لای ئەو (واتە لای عەلی) بۆیە یەحیا و هەموو ئەوانی تر بێدەنگ بوون. عەلی خوراسان و ئەودیو ڕووبار و ڕەی و کوێستان و گورگان و تەبەرستان و کرمان سپاهان و خوارەزم و نیمروز و سیستانی ژێر و ژوورەکردن و سووتاندنی و ئەوەندە بێ بەزەییانە ئەو وڵاتەی دادۆشی کە لە حەد و حساب دەرچوو. ئینجا، لەو ماڵ و دارایی و دەستکەوتانە، دیارییەکی بۆ ڕەشید ئامادەکرد کە نەپێش ئەو و نەدوای ئەو کەس شتی وای پێنەکرابوو و ناکرێ. دیارییەکە گەیشتە نزیك بەغدا، یەکەمجار نیشانی ڕەشید درا و زۆر خۆشحاڵ بوو و سەری سوڕما، فەزل کوڕی ڕەبیع کە پەردەداری گەورەی خەلیفە بوو، ئامادەبوو، ناوبراو دژی بنەماڵەی بەرمەك، ستایشی عەلی عیسای دەکرد. ڕەشید بەفەزلی کوڕی ڕەبیعی گوت سەبارەت بەو دیارییەی کە لە خوراسانەوە هاتووە چی بکەن باشە؟ فەزل گوتی گەورەمان با لە سەر سەکۆ دابنیشێ و یەحیا و کوڕەکانی و ئەوانی تر لەوێ دابنیشن و ڕابوەستن، ئینجا دیارییەکە بێننە پێشەوە تا دڵی ئالی بەرمەك شەق ببات و بۆ هەموو لایەك ڕوون بێتەوە کە چەندە خیانەتیان کردووە، ڕوون دەبێتەوە کاتێ کە فەزل کوڕی یەحیای بەر لە ئەودەمەی لە خوراسان بوو لە هەبوو خوارساندا هەر ئەوەندە دیاری بۆ خەلیفە هێنا کە کاربەدەستی شارێکیش بە تەنها دەتوانێ بیهێنێ. عەلیش دیارییەکی ئاوا بێ وێنە دێنێ. ڕەشید ئەم پێشنیازەی زۆر پێخۆش بوو چونکە دڵی لە بنەماڵەی بەرمەك نیگەران و پڕ ببوو و گەرەکی بوو بەیەکجاری کۆتایی بەدەسەڵاتیان بێنێت. ڕۆژی دواتر هاتە مەیدانی سەوز و وەك دانرابوو دانیشت و یەحیای بەرمەکی و هەردوو کوڕەکانیشی دانیشاند، فەزلی ڕەبیع و خەڵك و جەماوەرێکی تریش ڕاوەستان و ئەو دیاریانەیان هێنانە گۆڕەپانەکە کە بریتی بوون لە: هەزار غولامی تورك لە دەستی هەریەکێکیان دوو دەست جلی ڕەنگاوڕەنگی شوشتەری و سپاهانی و سەقلاتون و مەلحەمی دیباجی تورکی و دیداری کالا و شتومەکی تر، غولامەکان ڕاوەستان و

بەدوایاندا هەزار کەنیزەی تورك هاتن کە لە دەستی هەریەکێکیان جامێکی زێڕ یان زیوینی پڕ لە مسك و کافوور و عەنبەر و بۆن و بەرامە و شتی دەگمەن و نایابی شارەکان هەبوو، دوای ئەوان سەد غولامی هیندی و سەد کەنیزەی هیند، کە تابلێی جوان و لەبەردڵان بوون و هەریەکەیان (شار)ی گرانبەهای پۆشیبوو و غولامەکان تیغی هیندوویان پێبوو... و کەنیزەکان سەبەتەی باشتر لەوانەی لە قامیش دروست دەکرێن و پڕبوون لە شاری هیندی لە دەستیان گرتبوون هەروەها پێنج فیلی نێر و دووی مێیان بەدوادا هێنسان (بورگەستو = ڕووپۆش)ی ئاوریشمین و ئاوێنەی زێڕین و زیوین و مێیەکان لانکەی زێڕ و دەسبێنکە و کەمەربەندی بەدانەی جەوهەر و پیرۆزە و بەدەخشی چنراویان پێوەکرابوون و ڕازاندرابوونەوە، جا ئەسپی گیلی و دووسەد ئەسپی خوراسانی بە جلی دیبا و بیست باز و بیست شەهێن و هەزار وشتریان هێنان دووسەدیان بەپاڵان و ئەوساری ئاوریشمینی دیبا و پاڵان و چەواڵەکان زۆر جوان ڕازاندرابوونەوە و سێسەد وشتریش بەزین و لانکە، بیست بە لانکەی زێڕین و پێنج سەد هەزار و سێسەد پارچە بلووری هەمە چەشنە و سەد جووت مانگا و بیست ملوانکەی گەوهەوری زۆر بە نرخ و سێسەد هەزار مرواری و دووسەد دانە هیرباری چینی مەغفوری لە قاپ و کاسە و شتی تر کە هیچ یەك لەوانە لەسەرای هیچ پادشایەکدا نەبینرابوون و دووهەزار چینی فەغفوری تری لەگەن و کیسەی گەورە و کلدانی چینی گەورە و بچووك و جۆرەهای دیکە و سێسەد (شادەروان) و دووسەد فەرش و دووسەد مافوور. کە ئەو هەموو کەلوپەل و دیارە بێ وێنانە گەیشتنە کۆڕی خەلیفە و میدانەکە، دەنگی (تەکبیر)ی لەشکر بەرزبووەوە و دەهۆڵ و زوڕنایسان بە شێوەیەك لێدا کە کەس تائەوکاتە شتی وایان نەبیستبوو و نەبینیبوو و نەخوێندبووەوەو. هاروونە ڕەشید ڕووی کردە یەحیای بەرمەکی و پێیگوت لە ڕۆژگاری فەزلی کوڕت ئەم شتانە لە کوێ بوون؟ یەحیا گوتی ئەمیر تەمەن درێژبێ ئەم شتانە لەسەردەمی ئەمارەتی فەزلی کوڕم، لەشارەکانی عێراق و خوراسان لە ماڵی خاوەنەکانی خۆیان بوون. هاروونە ڕەشید بەو وەڵامەی یەحیا زۆر نیگەران و خەفەتبار بوو بە شێوەیەك دیارییەکەی لەبەرچاو تاریك بوو و بەڕووترشی هەستا و مەیدانەکەی بەجێهێشت[١٩٠].

ئەو وەڵامە جوانەی کە یەحیا دایەوە هەڵبەت بووە مایەی شەرم و تەریقبوونەوەی خەلیفە، بەڵام باشی دەزانێ کە ئەو عەلی کوڕی عیسایە لە خوراسان و عێراق و شارەکانی تر خەریکی

---

١٩٠ - ابوالفظل بیهقی: تأریخ بیهقی، چاپ دکتر فیاض، ٤١٨ - ٤١٦.

تالآن و برۆ و ڕووتاندنەوەیە. لێ خۆ هەر خەلیفە خۆی بوو کە دەستی عەلی وا ئـاوەلآ کردبـوو تا هەرچی گەرەکی بوو بیکات.

بەلآم خۆ هەر ئەو عەلی کوڕی عیسایە نەبوو کە مالّی خەلّکی وێران دەکـرد تـا خەزێنـەی سولّتان ئاوەدان و پڕبێ. زۆربەی کاربەدەست و ئەمیرەکان، مولّك و زەوی و زاریـان لـە خـەلّك دەستاند و مالّ و سامان و کەلوپەلی هاولآتیانیان بەتالآن دەبرد. ئەو کاردار و نێردراوانـە، لـە ڕاستیدا، پۆست و پلە و پایەی خۆیان لە خەلیفە بەکرێ دەگـرت و لـە مـاوەی حوکمڕانییـەتی خۆیاندا لە هیچ چەشنە بێدادی و ستەمکارییێك نەدەپرینگانەوە. خەلیفەش جگە لـەو کاتانـەی کە تەماعی دەکردە دەسـتڕەنج و مانـدووبوونی چـەپەلّکارییە چـەندین سـالّەکانیان و بـەناوی "دەستبەسەر داگرتن" لێی دەستاندن، دەنـا هـەرگیز لێینەدەپێـچانەوە و لـەپای ئـەو هـەموو زۆرداری و ستەمکاریانەیان سزای نـەدەدان. خـەلّك لـە ژێـر فـشاری سـتەم و چەوسـاندنەوەی کاربەدەستە زالّمەکاندا وردوخاش و مالّوێران دەبوو. هیچ تروسکاییەکی ئومێد بۆ ئەو خەلّکـە داماو و ستەمدیدەیە کە خەلیفە لە بەرامبەر نرخێکی کەم فرۆشتبوونی بەتاقمێك کاربەدەستی زۆرداری چاوچنۆك، نەمابوو. لەبەرئەوە بوو کە لە هەرجێیەکدا بانگەشـەکارێکی تـازە سـەری هەلّدەدا، خەلّکی بە پیرییەوە دەچوون و وەدوای دەکەوتن.

## حەمزە کوڕی ئازەرەك

وەك چۆن کاتێك کە [حەمزەی کـوڕی ئـازەرەك مـردووە لـە (٢١٣ ك/٨٢٨ ز)] دژی ئـەو بێدادیانە ڕاپەڕی کە ئەنجام دەدران و گوتی: "لێمەگەڕێن ئەم زالّمانـە چـیتر زولّـم لـە هـەژاران بکەن" خەلّکێکی زۆر لە چەوساوەکانی خوراسان و سیستان و کرمان بەدلّگەرمییـەوە وەلآمـی بانگەشە و پەیامەکەی ئەویان دایەوە. لە بارەی ئەو حەمزە و شەڕ و شـۆڕ و نەبەردەکانییـەوە، ئەوەی کە لە کتێبەکاندا باسکراوە، پچڕ پچڕ و سەیر و ئالّۆزە.

ئەو ئازایەتیانەی ئەو کە سالّەها دلّی خەلیفەیان پڕ کردبوو لە ترس و نیگەرانی، گوایە هەر ئەمانەن بوونەتە چـاوگ و کەرەسـتەی چـیرۆکی بـەناوبانگی "ئـەمیر حـەمزە". سەرچـاوەکان نووسیویانە کە لە نەوەکانی (زوبن تەهماسب) بووە[١٩١]. زۆربەی ئـەو کەسـانەش کـە لەگەلّیـدا بوون، ئێرانی بـوون. خـالّی سـەرنجڕاکێش ئەوەیـە کـە لـە ڕاپـەڕینی ئـەو (خـەوارج)ەدا لـەو

---

١٩١- مؤلف مجهول: تأريخ سيستان، ل ١٥٦.

ئێرانییانەی کە لە دەزگای خەلافەت ناڕازی بوون، لەگەڵ عارەبەکان دەبوونە هاوپەیمان و هاودەست و هەرگیز تێبینی ئەوە نەدەکرا کە کەس لەڕووی نەژادیەوە خۆی لە کەسێکی تر بەگەورەتر دابنێ. بەتایبەت کە زۆرترینی (خەوارج) بەپێویستیان نەدەزانی خەلیفەی موسوڵمانان عارەب و قورەیشی بێت، هەر ئەو پرسەش مایەی بڵاوبوونەوەی سەرەتاکان و ڕێنوێنییەکانی ئەوان بوو لە نێو ئێرانییەکاندا[192]. لە بارەی دەستپێکی کاری حەمزە شتێکی ڕوون لە کتێبە مێژووییەکاندا نییە، دەنووسن لەو سەردەمەی کە عەلی کوڕی عیسا حوکمڕانی خوراسان بوو، ئەو لە سیستان ڕاپەڕی. دەڵێن "یەکێ لە کاربەدەستانی ئەوێ ڕەفتارگەلێکی بێ ئەدەبانەی ئەنجامدا، حەمزە پیاوێکی زانا بوو، سزای شەرعی بەسەردا بڕی، کاربەدەستی باسکراو دەیویست لە نێوی ببات، بەڵام سەرەنجام کاربەدەستەکە کوژرا"[193]. فەرمانڕەوایەتی عەلی عیسا لە خوراسان زۆر زاڵمانە و دڵڕەقانە بوو. بۆیە لە هەموو گۆشە و کەنارێکی وڵات شۆڕش و ڕاپەڕینی لە دژدا بەرپابوون، بەڵام (خەوارج) چونکە ڕاپەڕین و بەرخۆدانیان دژی حکوومەتی ستەمکار بە ئەرکی سەرشانی خۆیان دەزانی، زۆر سەرسەختانە تر لە هەموو گروپەکانی دی دژایەتی خۆیان یان نیشان دەدا.

باسی شەڕەکانی حەمزە لە کتێبەکاندا بە درێژی هاتووە. کتێبەکان نووسیویانە کاتێ کە کارداری خەلیفە لە ترسان لە سیستان هەڵات، حەمزە "هەموو خەڵکی ڕەش و ڕووتی سیستانی بانگ کرد و پێیگوتن لەیەك دەرهەم زیاتر وەك باج و خەراج نەدەنە حوکمڕانی ئێرە چونکە ناتوانێ داکۆکیتان لێبکا و من خۆشم هیچم لە ئێوە ناوێ و هیچتان لێ ناستێنم چونکە

---

١٩٢- خەوارج لەسەردەمی بەنی ئومەیدا مەترسییەکی زۆریان بووە، بەڵام لە سەردەمی عەبباسییەکاندا جموجۆڵێکی ئەوتۆیان نەبووە. سەبارەت بەسەر هەڵدان و بنەچەی ئەم مەزهەبە لە نێوان توێژەراندا ناکۆکی هەیە لە هەر سەردەمێکدا سەبارەت بە خەلافەت بۆچوونی تایبەتیان هەبووە. کە لە شێوازی کۆماری خوازی دەچوو لە ڕووی بیروباوەڕیشەوە لە "پیوریتەین" و کرپارانی ئەو دونیا بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ عمر ابو النصر، الخوارج فی الاسلام طبع بیروت ١٩٤٩ – هەروەها بەشی یەکەم لە کێبی Wellhavsen: Die Reliogiospolitischen oppositionparrtein / ١٩٠١ هەروەها خەوارج وتاری خەوارج storter Encyclopedia of Islam opposition ١٩٠١ p ٢٤٦ کە تیایدا لەسەرچاوەی زێتریش باسکراوە. هەروەها بڕوانە مصطفی جلالی: شوراتەکان چاپی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا ١٩٨٦. (وەرگێڕ)

١٩٣- مؤلف مجهول: تأریخ سیستان، ل١٥٦.

من له هیچ شوێنێك دانانیشم"[193]. ئەگەرچی پیاوانی خەلیفە چەندین جار لەبەرامبەر ئەودا شكستیان خواردبوو و چۆكیان دادابوو، بەڵام بۆ ساتێكیش لە ترسی ئەو لەگیانی خۆیان دڵنیا نەبوون. زۆر شەڕ و نەبەرد ڕوویاندا و شارەكان چەندین جار دەستاو دەستیان كرد. هەردوو لای دژ بەیەك لەو جۆرە ڕووداوانەدا ئەوپەڕی سەرسەختی و توندوتیژیان بەكاردەهێنا. (خەواریج) واتە (شوراتەكان) لە شار و لادێكاندا بەزەییان بە هیچ كەسدا نەدەهاتەوە تەنانەت منداڵانی مەكتەبیشیان دەخستنە بەردەمی تیغەكانی خۆیان و پیاوانی دەوڵەتیش تۆڵەی سەختیان لێدەكردنەوە. هەندێ جار منداڵانیان لەگەڵ مامۆستاكانیان لە نێو مزگەوتدا گەمارۆ دەدان و مزگەوتیان بەسەر سەردا دەڕووخاندن[194]. لە هەندێ لە شوێنەكانیشدا ئاگریان لە ماڵەكان بەردەدا و پیاوێكیان لە دوو داران شەتەك دەدا و دواتر دارەكانیان لێكدەكردنەوە تا هەر پارچەیەكی بەدارێكەوە دەڕۆیشت...[195]. خەلیفە و یاوەرەكانی، نەك هەر ئەوان بەڵكو هەموو كەسێكیان كە بەحوكمی خەلیفە ڕازی نەبا بە شایستەی كوشتن دەزانی[196] و لەو ڕووەوە ئەو كەسانەی كەلە دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتی ستەمكارانەی عەلی كوڕی عیسا و كوڕەكانی ئەو لە خوراسان ناڕازی بوون، دایانە پاڵ حەمزە. كاتێك ڕاپەڕینەكەی خەوارج لە خوراسان پەرەی سەند و عەلی كوڕی عیسا ئیدی دەستەوەستان ما لەبەرامبەریان، ناچار نامەیەكی بۆ هاروونە ڕەشید نووسی و ئەوی "ئاگاداركردەوە كە پیاوێك لە خەوارجی سیستان ڕاپەڕیوە و بەردەوام بەسەر خوراسان و كرمان دادەدا و هەموو كاربەدەستەكانی ئەو ناوچانەی كوشتوون و داهاتی ئەو ناوچانەی بڕیوە و یەك دەرەم چییە لە خوراسان و سیستان و كرمان بەدەست نایەت"[197]. ڕاپەڕینی خەوارج لە خوراسان ئەوەندە بووە مایەی ترس و نیگەرانی خەلیفە كە بۆ دامركاندنەوەی، خۆی بەرەو ئەوێ بەڕێكەوت. لە، ڕەی عەلی كوڕی عیسا كە خەلیفە لێیناڕازی و دڵگران ببوو، بەپێدانی دیاری و شتگەلێكی دەگمەن دڵی خەلیفەی ڕازی كرد و ئەمارەتی خوراسانی بۆ خۆی پاراست. بەڵام ماوەیەك دواتر كاتێك كە كار لە كار ترازا بوو

---

١٩٣ - همانجا، ل ١٥٨.

١٩٤ - ابن اثير: كامل، ب٥، ل١-٢، چاپ مصر.

١٩٥ - اشعري: مقالات الشعري، ب١، ل١٦٥.

١٩٦ - مؤلف مجهول: تأريخ سيستان، ل١٦٠.

١٩٧ - مؤلف مجهول: تأريخ بيهقي، ل٤٥.

لەسەر کار لابرا. ستەم و بێدادی عەلی کوڕی عیسا خوراسانی وا شێواندبوو کە بەئاسانی ئارامی و ئۆقرەیی بەخۆوە نەدەگرت. ئەو شەپۆلە لافاو ئاسایەی رك و تووڕەیی و سەرکێشییەی خەڵك، کە لە خوراسان و سیستان و کرماندا جۆشی دەدا بە توندی هەڕەشەی لە بەغدا دەکرد و خەلیفە هۆکاری ئەو هەموو ناڕەزایەتیانەی کە دەرەنجامی ستەم و بێدادی فەرمانڕەوا و کاربەدەستانی خۆی بوون، دەزانی و نەیدەویست چارەسەرێکی ڕاست و دروستیان بۆ بدۆزێتەوە. دەتوانین ئەو ڕاستییە لەو نامانەوە کە لە گورگان وەکو ئەمانننامە و بیانووبڕین بۆ حەمزەی ناردن، بە باشی بەدی بکەین. ئەو وەڵامەیش کە حەمزە بۆ بەڵێن و هەڕەشەکانی خەلیفە دەیداتەوە نیشان دەدا کە رك و ناڕەزایەتی خەڵك دژی کاربەدەستانی خەلیفە تا چ ڕادەیەك مایەی ئەو جۆرە یاخیبوون و سەرکێشیانە بووە، بە تایبەت ئەوەی بەباشی دەرخستووە کە ئەو رك و ناڕەزایەتییەی خەڵك بۆ گروپگەلی وەکو خەوارج تا چ ئەندازەیەك خاڵی پشتگیری و پشت بەستن بووە. لەو نامەیەدا حەمزە ئاوا بۆ خەلیفە دەنووسی: "ئەوەی لە نەبەردەکانی من دژی کاردار و کاربەدەستەکانی تۆ بە تۆگەیشتووە، لەبەرئەوە نییە کە من لەسەر وڵات لەگەڵ تۆدا ململانێم هەبێ، یا دڵم بەدونیاوە خۆش بێ و ئاوات و ئارەزووی تایبەتیم هەبن کە بەو شێوەیە بەوێ وەدەستیان بێنم و پێیان بگەم، لەو کارەمدا بەدوای ناودەرکردن و ناوبانگیشەوە نیم. تەنانەت ئەوەی کە بەد ڕەفتاری پیاوەکانی تۆ بەرامبەر بەوانەی کە لە ژێر فەرمان و دەسەڵاتی ئەواندان بۆ هەموو لایەك ڕوون و ئاشکرایە و ئەوەی کە ئەوان لە ڕشتنی خوێن و تاڵانکردنی ماڵ و سامانی خەڵك و چەپەڵکاری و ناڕەواییەکانیاندا شوولیان لێ هەڵکێشاوە، لەکەس شاراوە نییە، لەگەڵ ئەو هەمووەش هێشتا من دەست پێشخەریم نەکردووە و پێموابێ ئەوەی سەبارەت بە ڕەوش و بارودۆخی خوراسان و سیستان و فارس و کرمان بە تۆ گەیشتووە، ئەم ڕاستییە پشت ڕاست دەکاتەوە و پێویست بەوەناکات من قسەی لێبکەم"[198]. لەو ماوەیەدا ئاگری رق و نەفرەتی خەڵك ئەوەندە پەرەی سەندبوو کە دامرکاندنەوەی کارێکی ئاسان نەبوو، بەمردنی خەلیفەش خوراسان هەروا لە نێو چرنووکی ئاشووب و نا ئارامیدا دەیناڵاند، هەر ڕۆژە و بۆ دەربڕینی ناڕەزایەتی خۆی بیانوێکی تازەی دەگرت. تەنانەت (رافع کوڕی لەیث) (٢٠٤ ك/٨١٩ ز) کە کابرایەکی عارەب بوو کاتێ لە سەمەرقەند دژی دەرباری خەلیفە هەڵگەڕایەوە

---

١٩٨ - مؤلف مجهول: تأريخ سيستان، ل١٦٦.

و دەستی بەراپەڕین کرد، خەڵك هاوکاریـان کـرد و چیرۆکی راپەڕینەکـەی ئـەو لـە مێـژوودا بەناوبانگە.

ئـەو رك و نائومێدییـەی کـە لـە سـەردەمی خەلافـەتی هـاروون بـەهۆی بـێ ڕەحمـی و خۆشگوزەرانی و لەزەتپەرستی ئەوەوە تادەهات پەرەی دەسەند، سەرەنجام ئێرانییەکانی والێکرد کە بکەونە دۆزینەوەی ڕێگا چارەی تازە. وەك بڵێـی ئـەو دەمـەی بەغـدا لـە نێـو تـاریکی و شەوەزەنگی (شەوەکانی عارەبستان)دا مەستی خەون و خەیاڵە شـیرین و لـە خۆباییبوونـەکانی خۆی بوو، لە خوراسان و سیستان و تەبەرسـتان و ئازەربایگاندا سپێدە لەکەل دەرکـەوتبوو. لـە پشت شووره بەرزەکانی (دارلخەلافە)وە ڕووداوەکانی "هەزار و یەکشەوە" ڕوویانـدەدا، ئـەمیر و وەزیرەکان شانازی دەست ماچکردنی مەیموونەکەی (ئەمیرلموئمینین)یـان پێـدەبرا و فەرمانـدە و گەورە پیاوان خۆیان بە خزمەتکردن و ملکەچکردنی نۆکەرەکانی خەلیفە هەڵدەکێشا. شاعیر و گاڵتەباز و ماستاوچی و درۆزنەکان بازاڕیان گەرم و گوڕبوو. ئەو زێڕ و ماڵ و سامانەی کـە لـە گۆشە و کەنارەکانی ولاّت وەکو باج و خەراج و دیاری و بەخشیش وەك لێـشاو دەڕژایـە بەغـدا وەك باران بەسەر سەماکەر و شاعیر و بەندبێژ و قۆشمەچی و عەییارەکانی شاردا دادەباری. لەو خوانە تالاّنییەی کە ستەم و زۆرداری خەلیفەکان لـە بەغـدا ڕایانخـستبوو، تـورك و عـارەب و جووتیار پشکداربوون لێی، بەڵێ لە پەنا چاوبرسییەکانی عارەبدا، چاوچـنۆکە ناعارەبـەکانیش بەدی دەکران، هەرکەسێك کە لە بەغدا بووا و پەیوەندی و کەش و کوشێکی لەگـەڵ دەربـارەی خەلیفەدا هەبووا، پشکێکی لەو تالاّن و بڕۆیەدا هەبوو.

## لە دەرباری خەلیفەدا

لەو میانەدا وەرزێڕ و میرزادە ئێرانییەکان بێئەوەی حەز و خۆشەویستی خۆیان سەبارەت بە ڕابردووی ئێران فەرامۆش بکەن، بەدوای پیادەکردنی ئامادەسـازی نەخـشەکانی خۆیـان بـوون. ئەمان کە زیاتر خولیا و عەلاقەمەندی "ئێـران" و "مێـژووی ئێـران" بـوون تـا "ئێرانـی" و "خەڵکی ئێران" دیسان خەونیان بـە "ژیاندنـەوەی شـکۆ و گـەورەیی" ڕابـردووی خۆیانـەوە دەبینی، بەڵام خەڵکی ئێران کـە چـەندین جـار ببوونـە قوربـانی هەوەسـبازییەکانی ئەمانـە، بێگومان ئەوەندە نەدەبوونە جێی بایەخ و سەرنجیان.

بەرمەکییەکان کە بە جوامێر و ڕێزدار ناوبانگیان دەرکـرد، بـۆ کۆکردنـەوە و پێکـەوەنانی سامانی زۆر و زەوەند و لە ژمار نەهاتوویان، خۆیان بە قەرزداری ڕنـج و تێکۆشـانی هاوڵاتیـە

ئێرانییەکانی خۆیـان دەزانـی، بـەڵام لـە کـاتی بەخـشش و پاداشـتکردنەکاندا، هـەرگیز ئێرانییەکانیان لە پێش خەڵکی تردا، دا نەدەنا. خالیدی بەرمەکی کە ماوەیـەك فـەرمانڕەوای تەبەرستان بوو کاتێ کە لەسەر کار لابـرا و لـە (ئـامول)ەوە بەمەبەسـتی گەڕانـەوە کەوتـەڕێ "بازاڕیی" لە لێواری (رودبار) ڕاوەستا بوو و گوتی سوپاس بۆ خوا لـە زوڵمـی تـۆ دەربازمـان بوو. ئەمەیان بە خالید ڕاگەیاند فەرمانیدا کە (بـازاڕی) بـۆ بێـنن. کـاتێ هێنایـان پێیگـوت منیان لە فەرنامڕەواییکردنی ئێوە لاداوە، بەڵام لە تۆڵەکردنەوە لە تۆ کەس لاینـەداوم و ڕێـی لێنەگرتووم، فەرمانی دا کە لە گەردنی بازاڕی بدەن"[199]. هەموو ئەو وەزیـر و ئەمیرانـەی کـە ملکـەچ و بەنـدەی خەلیفـە بـوون، لـەو کارەسـات و زوڵـم و سـتەمکاریانەدا بەشـداربوون، وەرزێڕەکانی ئێرانیش لەو بارەیەوە دەستی کـەمتریان لەسـەران و گـەورە گـەورەکانی عـارەب نەبوو. ئەوان ئەگەر لە پێناو بەرژەوەندییەکانی خەلیفە تێدەکۆشان، هاندەری ڕاستەقینە تـەنها بەرژەوەندییە تاکەکەسـییەکانی خۆیـان بـوو، ئـەوان هێـشتا ڕووداو و کارەسـاتەکانی زەمانـە ئارەزووی دروستکردنەوەی "دەوڵەتێکی شکۆداری وەکـو سـەردەمی ساسـانی"یـان لـە هـزردا بەتەواوی ڕەش نەببوەوە. لەبەرئەوە بوو کە لە هەر دەرفەتێکدا و جارناجار بۆ ئێـران و بـەناوی ئێرانییەکانەوە هەوڵ و تێکۆشانیان ئەنجام دەدا.

گرتنی بەغدا و کوشتنی (ئەمین) بەدەستی ئێرانییـەکان، نموونەیـەکی ئـەو جـۆرە هـەوڵ و کۆششانەبوو. لەو کاتەیدا کە هاروون، بەرمەکییەکانی لـە نێوبردبـوون، مـیرزادە ئێرانییـەکان دەسەڵات و ئوتۆریتەی خۆیان لەنێو دەوڵەتی ئیسلامیدا لەدەست دابوو.

یارمەتیدانی مەئموون و شەڕکردنیان دژی ئەمین لە ڕاستیدا بیانوێك بوو بۆ ئەوەی کە ئـەو میرزادە ئێرانیانە جارێکی تر دەسەڵات و نفووزی لەدەست چووی خۆیان لە دەزگـای خەلافەتـدا وەدەست بێننەوە.

## بنەماڵەی سەهل

سەرەڕای کوژرانی ئەمین بەدەستی تاهیر (کە کەسێکی ئێرانی بوو) هێشتا عارەب لـە خـۆ بەگەورەتر ببینن نەکەوتن و ئەو کوژرانەی ئەمین نا ئومێدی نەکردن. زۆری پێنەچوو کە لەگـەڵ دەستپێکردنی خەلافەتی مەئموونـدا ئاژاوە و شۆڕش هەموو قەڵەمڕەوی خەلافەتی تەنیەوە.

---

١٩٩ - ابن اسفندیار: تأریخ طبرستان، ب١، ل١٨٧.

ئەو نفووز و دەسەڵاتەی کە فەزلی کوڕی سەهل و حەسەنی بـرای لـە دەربـاری مەئموونـدا وەدەستیان هێنابوو، بەخیلی و رك و کینـەی ئەرسـتۆکراتە عارەبـەکانی دژی ئێرانییـەکان زۆر بەتوندی وروژاندبوو. لەوێدا مەئموون کوێرکوێرانە کەوتە ژێر کاریگـەریی نفـووز و باڵادەستی فەزل[200] و لە کاروباری بەغدا دەستەوەستان ما. هەژموونی بنەماڵەی سـەهل بەسـەر دەزگـای حکوومەتدا، عارەبەکانی زۆر نیگـەران و نـاڕازی دەکـردن. بەتایبـەت کـە بنەماڵـەی سـەهل بنەماڵەیەکی زەردەشتی تازە بەموسڵمان بوو و لە نێو ئیسلامدا ناو و پێشینەیەکیان نەبوو.

کاتێ مەئموون بەهاندان و پێداگری فەزل، حـوکمڕانی عێراقـی کـە دوای کـوژرانی ئـەمین دابووی بەتاهیر کوڕی حوسێنی داگیرکەری بەغدا، ستاندییەوە و دای بەحەسەن کـوڕی سـەهل، ناڕەزایەتی و نیگەرانی پەرەی سەند، لە بەغـدا وابڵاوبـوەوە کـە فـەزل کـوڕی سـەهل بەسـەر مەئموونـدا زاڵ بووە و لەیارولایەنگرەکانی جیاکردۆتەوە و لە خانووێکدا دەستبەسەری کردووە و ئێستا خۆی کاروبارەکانی گرتوونەتە دەست و بەڕاوبۆچوون و کەیفی خۆی حـوکمڕانی دەکـات. ئەو هزرە بەتایبەتی بووە مایەی ترس و نیگەرانی عەبباسییەکانی بەغـدا، چـونکە بنەماڵـەی سەهل بەشیعە بوون ناوبانگیان دەرکردبوو و عەبباسییەکانی بەغدا دەترسـان کە ئەمانە بـەفێڵ و لە ڕێگای هێزەوە خەلافەت لە بنەماڵـەی عـەبباس بـۆ بنەماڵـەی عـەلی بگوازنـەوە. ئـەو ڕیوایەتانەی کە سەرچاوە مێژووییەکان لەو بارەیەوە باسـیان کـردوون ئـەوە نیـشان دەدەن کـە خەڵك ئەو کارەیان لە بنەماڵەی سەهل بەدوور نەدەزانی. دەنووسن کە فەزل ڕۆژێك "بـە یـەکێ لە پیاوە دەوڵەتییەکانی مەئموونی گوت هەوڵی من لـەم دەوڵەتـەدا لەهـەوڵی ئـەبو موسـلیم کاریگەرترە، کابرا پێیگوت ئەبو موسلیم دەوڵەتی لە عەشیرەتێکەوە گۆڕی بۆ عەشیرەتێکی تر کەچی تۆ لەبراوە بۆ برات گۆڕی، فەزل پێگوت ئەگەر تەمەن یار بێ دەشیگەیەنمە عەشیرەت بۆ عەشیرەت."

## لە هەموو جێیەکدا شۆڕش

بەم شێوەیە لە عێراق زۆربەی خەڵکی لە فەمانڕەوایەتی حەسەن نیگەران و نـاڕازی بـوون و ئەو نیگەرانی و ناڕەزایەتیە بووە مایەی پشێوی و شۆڕش. بـەخێرایی لـە عێـراق و جـەزیرە و حیجاز و یەمەن دا شۆڕش و ئاشووبی هەمە لایەنە دروست بوون. میر و گەورە پیاوانی نسێبین

200- MAIR, CALIPHATE.P 495.

و میافارقین و ئازەربایگان و ئەرمەنستان دەستیان بە شۆڕش و ڕاپەڕین کرد، ئیبراهیم کوڕی موسا لە یەمەن ڕاپەڕی، محەمەد کوڕی جەعفەر دەستی بەسەر حیجازدا گرت، عەبباس کوڕی محەمەد بەسەر بەسرە و زەید کوڕی مەساش پەیوەندی پێوەکرد.[201]

لەو نێوەدا بارودۆخی (کوفە) لە هەموو شوێنەکانی تر نالەبارتر و ترسناکتر بوو. ئەو شارە ئانارامە پڕ لە ئاشوبە کە بەردەوام ئامادە و لەسەرپێ بوو بۆ ڕاپەڕین بە قازانجی بنەماڵەی عەلی[202] بەتەواوی کەوتە ژێر ڕکێف و دەسەڵاتی ڕێگرێك، کە ناوی (ئەبولسەرایا) بوو. ناوبراو کابرایەکی کە پێیاندەگوت (ئیبین تەباتەبا) بۆ ماوەیەك بۆ خەلافەت دیاری کرد و دواتر ژەهرخواردووی کرد و یەکێکی تری لە جێی ئەو داناو سەرنجام ئاژاوەکەی ئەو بە یارمەتی [(هەرثمە) مردووە لە (٢٠٠ ك/٨١٥ ز)] دامرکێندرایەوە و، بەڵام ماوەیەك دواتر بەغدا بووە مەیدانی ڕووداوگەلێکی خوێناوی تر.

## لە بەغدا

بە غدا ماوەیەك بوو، کە لە دەستی (عەییاران) جەردە و وێڵگەرد و سوپاییەکاندا بوو. ئەمانە وەکو یاریچەیەکی سووك و بێمایە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ حکوومەت و ویلایەتدا دەکرد: هەر ڕۆژە و بەیعەتیان بە کەسێك دەکرد و هەرساتێك دەتدی لێیڕا دەپەڕین. لاوازی و شەپرێوی حکوومەت، ئەمانەی زۆر بێباك و سەربەست کردبوون، بە شێوەیەك کە تەنانەت لە تالانکردن و ئازاردانی خەڵکیش نەدەسڵەمینەوە. کاری ڕێگری و چەپەڵکارانەیان واپەڕەی سەندبوو، منداڵ و ژنانیان بە ئاشکرا دەڕفاند، ئەگەر داوای پارەیەکی زۆر زۆریان لە هەرکەسێك کردبا وەك قەرز یا بەخشش ئەوا کابرای داماو نەیدەتوانی نەیدا. ئەگەر چووبانە ماڵی هەرکەسێك و بەزۆری زۆرداری ژن و منداڵیان بردبا، ئەوا نەیدەتوانی ڕێگەیان لێبگرێ و لەبەرامبەریان ڕابوەستێ. زۆر گوند و دێهاتیان تالانکردن و ماڵ و مالیات و شتی نایابی خەڵکیان لە بازاڕەکانی بەغدا دەفرۆشتن، باج و خەراجیان لە زۆر ڕێبوار و بازرگانان و کەشتییەکان دەستاند و بەناچاری دەبوا هەرچی داوایان لێدەکرا بیدەن وملی بۆ ڕاکێشن.

---

٢٠١ - یعقوبی: تأریخ یعقوبی، ب٣، ل١٧٣.

202- Mvir, catiphate, p 496.

ئا بەم شێوەیە بەغدا بەناڕەزایەتی و نیگەرانییەوە فەرمانڕەوایەتی حەسەنی کوڕی سەهلیان سەیر دەکرد. (تاهیر کوڕی حوسێن) مردووە لە (٢٠٧ ك/٨٢٢ ز)ی فەتحکەری بەغدا کە نفووز و دەسەلاتێکی زۆری لە نێو ڕیزەکانی سوپادا هەبوو لەو هەلبژاردنەی حەسەنی کوڕی سەهل ناڕازی بوو.

(هەرپەی کوڕی ئەعیەن)ی فەرماندەی عارەبیش کە لە گرتنی بەغدا هاوکاری و یارمەتی مەئموونی دا بوو، لە دژی ئەودا کەوتەجموجۆڵ. عەبباسییەکانی بەغدا ئەو هەلبژاردنەی حەسەنیان بەنیشانەی لاوازی مەئموون و بالادەستی فەزل دەزانی و عەلەوییەکان ئەو ناکۆکییەیان بە کارێکی گونجاو دەزانی بۆ ڕاپەڕینی خۆیان. حەسەن کوڕی سەهل کە عارەبەکانی بەغدا وەك سووکایەتی پێکردن بە "مەجووس زادە" ناویان دەهێنا، لەبەرئەوەی ئێرانی و شیعە بوو، بێگومان نەیتوانی متمانەی عارەبەکان بۆ خۆی ڕابکێشێ. بۆیە شەڕ و ئاژاوە و ئاشووبەکان ڕانەدەوەستان. زیندانیکردنی هەرثمە و مردنی لە خوراسان، ڕەوشی حکوومەتەکەی ئەوی تا ڕادەیەك مکوم و سەقامگیرکرد، بەلام سوپاییەکانی عارەبی زۆر ناڕازی کرد. هەلبژاردنی عەلی کوڕی عیسا بۆ جێنیشینایەتی مەئموون ناڕەزایەتی عەلەوییەکانی کەمکردووەوە، بەلام عەبباسییەکانی بەغدای تووڕە و هەراسان کرد. ئەمان لە ترسی ئەوەی نەوەك دەولەت و دەسەلاتی ئەوان لەنێوبچێ، (ئیبراهیم کوڕی مەهدی) یان بۆ خەلافەت دانا. شەڕ و ئاژاوەیەکی زۆر ولاتی گرتەوە، بەغدا دیسان بووەوە بە مەیدانی کوشتار و هەرج و مەرج و بەرەللایی.

بەلام لەگەڵ ئەوەشدا مەئموون هەر لە (مەرۆ) دەژیا و لەو ڕووداوانە بێئاگا بوو و بەرامبەر بەعارەبان کەمتەرخەمی و بایەخ پێنەدانێکی سەیری نیشان دەدا.

لە ڕاستیدا بەهۆی هێز و دەسەلاتی مبر و وەزیرە ئێرانییەکان، لەو ڕۆژگارەدا لاوازی عارەبەکان بەو پەڕی خۆی گەیشتبوو. زۆرجار دەتدی لە کۆچە و کۆلانەکاندا ڕێیان لە خەلیفە دەگرت و لەدەست ئەو بێ بایەخی و چاولێنەبوونەی ئەو ناڕەزایەتی و سکالایان دەردەبڕی. عارەبێکی شامی لە ڕێگا پێشی مەئموونی گرت و پێیگوت: "ئەی ئەمیرلموئمنین، چۆن سەیری ئێرانییەکانی خوراسان دەکەیت، ئاواش سەیری عارەبەکانی شام بکە " بەم تەرزە ڕەچاو نەگرتن و گوێنەدان بە عارەبەکان، شەپۆلی رك و تووڕەیی و ناڕەزایەتی ئەوانی دەورووژاند. بوونی (فەزل کوڕی سەهل)ی وەزیری خەلیفەش کە لە نەژادی خوسرەوان بوو و ڕەنگە نەخشە و ئەندێشەگەلێکی خۆی هەبووبن، ببووە مایەی نیگەرانی خەلکانی نزیك لە خەلیفە.

له بەغدا هەر ڕۆژە بیانوویەك بۆ ئاژاوە و ئاشووب دەكەوتە دەستی ڕاپەڕیو و شۆڕشگێڕەكان، بەڵام مەئموون لە هەموو ڕووداوەكان بێ ئاگا بوو. خەڵكی بەغدا بە فەرمانڕەوایەتی حەسەن ڕازی نەبوون و ئەو هەموو سەركێشی و فیتنە و ئاشووبانە لە پێناو لادان و دەركردنی ئەودا ئەنجام دەدران، بەڵام "هەر كێشە و ئاژاوەیەك ڕوویدەدا فەزلی كوڕی سەهل لە مەئموونی دەشاردەوە و دەیگوت ئەو ئاژاوە و پشێویانە لەلایەن عەلەوییەكانەوەن"[203].

## گەڕانەوە بۆ بەغدا

سەرەنجام مەئموون چاوی كرایەوە و سەیر ئەوەیە كە [عەلی كوڕی موسا (ئەلڕەزا) مردووە لە (٢٠٣ ك/٨١٨ ز) ] بوو ڕاستییەكانی بۆ ڕوونكردەوە و لە خراپی بارودۆخەكە ئاگاداری كردەوە. لە ڕاستیدا ڕەوشی عێراق خراپ تێكچووبوو، ئێستا جێنشین ناچاربوو خەلیفە ئاگادار بكاتەوە كە وەزیرەكەی (واتە فەزلی وەزیری دوو سەرۆكایەتی) زۆر لە ڕاستییەكانی لێ شاردۆتەوە، حەسەنی برای فەزل، عێراقی نوقمی نێو خوێن كردبوو و تاهیر كە بەغدای گرت و مەئموونی وەك خەلیفە جێگیركرد و لە هەموو كەسێك باشتر دەیتوانی ڕەوشەكە كۆنترۆڵ بكا، لە سووریە پشتگوێ خرابوو.

ئاگاداربوونەوە لەو ڕووداوانە مەئموونی یان هۆشیار و نیگەران كرد. كەمێك دواتر فەزلی وەزیر لە كاتێكدا لەگەڵ مەئموون بەرەو عێراق دەچوو، لە گەرماوی (سەرخەس) كوژرا و بكوژەكان ڕایانگرمانە كە مەئموون ئەوانی ناچاركردووە كە بیكوژن.

دوای ئەوە (عەلی ئەلڕەزا)ش لە (تووس) بەهۆی ئەو ترێیەی كە خواردبووی و گوایە ترێیەكە ژەهراوی كرابوو، گیانی لە دەستدا[204].

لە هەمان ئەو دەمانەدا ڕایگەیاند (حەسەن كوڕی سەهل)ی والی عێراقیش شێت بوو و بەزنجیر بەستیانەوە و لە ماڵەكەی خۆیدا دەستبەسەریان كرد[205]. خەلیفە دوای ئەوە گەڕایەوە بەغدا و بارودۆخەكەی كۆنترۆڵكرد. وەك دەردەكەوێ، مەئموون كە ماوەیەك بە پشتیوانی و داكۆكیكردنی

---

٢٠٣ - مستوفی قزوینی: تأریخ گزیده، ل ٣١٣.

٢٠٤ - مسعودی: مروج، ب٣، ل٣٣٣، چاپ مصر.

٢٠٥ - ابن خلكان: وفیات الاعیان، ب١، ل ١٩٩.

ئێرانییەکان بەتەواوی پەیوەندی لەگەڵ عارەبەکان پچڕاندبوو، ئێستا دووبارە لە ترسی ئێرانییەکان پەنای بۆ ئەوان بردبووەوە...

بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو. ئەو کاتەی کە خەلیفە دەیویست لەو مەترسییە تێبگا کە خەلافەتەکەی ئەوی خستبووە تەنگانەوە، خوراسان نزیکەی سەربەخۆ بوو بوو. چونکە، مەئموون، تاهیر کوڕی حوسێنی ڕەوانەی خوراسان کردبوو تا هەم بکوژی براکەی لەبەرچاوان دووربخاتەوە و هەمیش ڕەوش و باری نالەباری ئەوێ ئارام و سەقامگیر بکاتەوە. تاهیریش لەم کارەدا سەرکەوت، بەڵام داوای سەربەخۆیی کرد.

ئەو کە هەرچۆنێ بیگری خەلیفەی بەقەرزداری خۆی دەزانی، ڕۆژێك ناوی ئەوی لە خوتبەی هەینی نەهێنا و بەم شێوەیە سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند. ئەگەرچی ڕۆژی دواتر لە پڕ مرد، بەڵام خوراسان بەم شێوەیە لە ژێر چەنگی خەلیفە هاتەدەر و مەئموون بەناچاری دانی بە فەرمانڕەوایی کوڕەکانی تاهیر دانا و بەکردەوە فەرمانڕەوایەتی بنەماڵەی تاهیری بەسەر خوراساندا پشتڕاست کردەوە.

بەمتەرزە لە داوی دوو سەدە، ئێرانییەکان توانیان جارێکی تر دەوڵەتێکی تازە دروست بکەنەوە و بە ئاشکرا لە بەشێکی ئێراندا بە شێوەیەکی سەربەخۆ فەمانڕەوایی بکەن.

## هەستانەوەی ئێران

لەگەڵ کوژرانی ئەمین و دەستپێکردنی خەلافەتی مەئموون، عارەبەکان ئیدی ڕێز و شکۆی خۆیان لە دەستدا. دروستە کە لە سەرەتای دەستپێکردنی خەلافەتی عەبباسیدا عارەبەکان بایەخ و شکۆمەندییەکیان نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەو ماوەیەدا، خەلیفەکانی بەغدا، ئەوانیان بە تەواوی بە لاوە نەنابوو. لە هەندێ کاروباردا ڕاوێژیان پێدەکردن و هەندێ پۆستیان دەدانێ. ناکۆکیی نێوان ئەمین و مەئموون کە دەستی وەزیر و فەرماندەکانی عارەب و ئێرانی تیا بوو، سەرەنجام بەسەرکەوتنی مەئموون کۆتایی هات کە دایکی ئێرانی بوو و خوراسانییەکان یارمەتیان دەدا، دوای ئەوە ئیدی عارەبەکان لە دەرباری خەلافەتدا ڕێز و شکۆیەکیان بۆ نەمایەوە. ئیدی بەغدا کە میراتگری شکۆ و مەزنایەتی (تیسفۆن)ی کۆن بوو، وەکو خودی تیسفۆن، بە چاوی ڕێزەوە سەیری عارەبانی نەدەکرد. ئێرانی و تورکەکان، هێواش هێواش دەرکەوتبوون و شکۆ و پایە و مەزنایەتی عارەبەکانیان وەرگرتبوو. لە ڕۆژگاری مەئموون و جێنشینەکانیدا، بەغدا ئیدی بە شارێکی عارەبی نەدەژمێردرا. ئەو خۆ هەڵکێشان و فیز و خۆ بە زلزانییەی کە ((غەزووکەران)) دوو سەدەی پێشتر هەیانبوو، چیتر لەلای ((مەوالی))یەکانی بەغدا کڕیاری یان نەبوو. دەوڵەتی عارەبی لە ڕاستیدا نەمابوو و نۆبەتی فارسەکان داهاتبوو.

لە کۆتایی ئەو دوو سەدەیە کە وەکو شەوێکی درێژ و خامۆش، بەڵام پڕاوپڕی ستەم و تاوانکاری تەواو بوو، دواجار بانگی کەڵەشێر کەوتە بەرگوێ و بە دوای ئەو بانگەی کەڵەشێرە، سیمای سپێدەی بەرەبەیان لە ئاسۆی دەم کەلدا بە دەرکەوت. بەڵام ئەو ڕووناکییە، هەرچەندە لە کازیوەیەکی درۆزنانە زیاتر نەبوو، خەندەی بەیانی ڕاستەقینەی بە دواوە بوو. ئەو سپێدە درۆزنانەیە بریتی بوو لە دەرکەوتنی مازیار و بابەك کە لە وڵاتی تەبەرستان و ئازەربایگان و عێراقدا ئاڵای سەربەخۆییان بەرز دەکردەوە و ئەگەرچی ئامانجێکی ڕۆشنیان نەبوو و نەشگەیشتنە شتێك، بەڵام هەوڵ و هەنگاوی ئەوان بووە دەستپێکی هاتنەکایەی دەوڵەتی تاهیری (٢٠٥ – ٢٥٩ ك/٨١٩ – ٨٧١ ز) و سەفارییەکان، (٢٥٤ – ٢٩٠ ك/٨٦٨ – ٩٠٢ ز) و لەبەر ئەوەشە کە ڕابوونی ئەوان دەبێ بە بانگ و مژدەی هەستانەوەی ئێران بدەینە قەڵەم.

لەڕاستیدا لەو ڕۆژگارەی کە مەئموون لە خوراسان و بەغدا، شکۆ و دەسەڵاتی (هاروون)ی باوکی و ئەمینی برای بە میرات کەوتبووە ژێردەستەوە و لەو ((شاری هەزار و یەك شەو))ەدا دەمێك بە مەی خواردنەوە و ڕابواردن و دەمێکی تر بە باس و مشتومڕ و وتوویژەوە سەرقاڵ بوو، لە وڵاتی ئێراندا کەم و زۆر هەواڵی نیگەرانکەر دەگەیشت ولە زۆربەی هەرە زۆری ئەو

وڵاتەی ئێران، بیر و ئەندێشەی سەربەخۆخوازانە سەری هەڵدا بوو و سەرهەڵداوانی ئێرانی کەوتبوونە چالاکی و سەرهەڵبڕینەوە.

گەڕانەوەی مەئموون بۆ بەغدا بووە هۆی ئەوەی کە لە خوراساندا بواری تازە بکەوێتە دەستی سەربەخۆخوازەکان. واپێدەچێ کە شکستی کەسانی وەکو (سنباد) [مردووە لە ساڵی (١٣٧ ك/ ٧٥٥ ز] و (ئۆستادسیس) [مردووە لە ١٥١ ك/ ٧٦٨ ز] و (موقەنەع) ((مُقنّع)) مردووە لە [١٦٩ ك/٧٨٦ ز] کە پەیامەکەیان پەیامی ئایینی بوو، ئەو تێڕوانینەی هێنابێتە کایە هیچ هەوڵ و هەنگاوێك بۆ رزگار بوون لە کۆت و بەندی عارەبان کە بۆنی یەکێتی و یەکخستنەوەی وڵاتی تیا نەبوو و وەرزێر و پیاوە مەزنزادەکانی وڵات دەستیان تێدا نەبوو، مەیسەر و سوودمەند نابێ[٢٠٦] و ئێستا لەگەڵ سەرکەوتنی مەئموون بە سەر ئەمیندا، وەرزێرزادەکانی ئێران، ئەو بڕوایەیان بۆ دروست بووە کە هەلێکی گونجاو هاتۆتە کایە. لەگەڵ ئەو دەسەڵات و شکۆمەندییەی کە بنەماڵەی (تاهیر) لە خوراسان و بەغدا وە دەستیان هێنابوو، ئێستا ئیدی مەزن و مەزنزادەکانی ئێرانیش هەستیان کرد کە نۆرەی دەوڵەتی ئەوانیش هاتووە. بەمشێوەیە، لە هەرێمەکانی وەکو تەبەرستان و ئازەربایگان و خوراسان، شازادە و سەرداران، هێواش هێواش دەرفەتی فەرمانڕەواییان کەوتە دەست. بۆیە، لە دوا دواییەکانی ماوەی خەلافەتی هاروونەوە تا ڕۆژگاری (موعتەسەم) رەوش و بارودۆخی ئازەربایگان و تەبەرستان و خوراسان مایەی نیگەرانی خەلیفە بوو.

لە ڕاستیدا لەو کاتەی کە خەلیفەکان، بە وردی چاودێری بارودۆخی خوراسانیان دەکرد، مەڵبەندی بەرخۆدانی دوژمنانی خەلافەت گوازرایەوە. بۆ باکوور و و رۆژئاوای ئێران کێوە سەرکەشەکان و رێگا سەختەکانی ئەو دەڤەرانە، بیر و ئەندێشەی ئەو سەرهەڵدان و شۆڕشانەی لە نێو خەڵکی ئێراندا بەهێز دەکرد. بۆیە ماوەیەکی دوور و درێژ خەڵکی ئەو هەرێمانە لە بەرامبەر عارەبەکان و سوپا و سەربازەکانی خەلیفەکانی بەغدا راوەستان و ساڵەهای ساڵ نەبەردی سەخت و دژواریان لەگەڵ موسڵمانەکاندا کرد.

---

٢٠٦- بگەڕێوە بۆ Spuler: Iran in frueh – Islamischerzeit Zeit.

لەم کتێبەدا زانیاری سوودمەند لە بارەی بارودۆخی ئێران لە سەدەکانی سەرەتایی سەردەمی ئیسلام دەخرێتەڕوو.

له تەبەرستان، خەڵك نەفرەت و كینەیەكی تایبەتیان بەرامبەر عارەبان هەبوو. وەك چۆن لە ساڵی [١٦٠ك/٧٧٧ ز]دا، خەڵكی (ئومێدەواركۆ) لە ستەم و بێدادی پیاوانی خەلیفە وە تەنگ هاتن. فەرمانڕەواكانی ئەوان كە (ونداد و هورمز) و (سپەهبود شـەروین) ٧٩٧ ك/١٣٩٦ ز و (مەسمۆغان ولاش) [٢٥٠ ك/ ٨٦٤ ز] بوون ئـەو خەڵكـەیان لـە دژی عارەبـەكان هانـدا و لـە ماوەیەكی كەمدا شۆڕش و ئاشووبێكی گەورە دروست بوو. لە ڕۆژێكدا خەڵكی تەبەرسـتان لـە دژی عارەبەكان ڕاپەڕین و كوشتارێكی زۆریان لێكردن.

جگە لە عارەبەكان، ئەو ئێرانیانەش كـە ببوونـە موسـڵمان كەوتنـە بـەر ڕك و نـەفرەتی خەڵك. ئەو ڕك و نەفرەتە بەڕادەیەك بوو كە تەنانـەت ئـەو ژنـە ئێرانیانـەی كـە ببوونـە ژنـی عارەبەكان، ڕیشی مێردەكانی خۆیان دەگرت و لە ماڵا ڕایان دەكێشانە دەر و دەیاندانە دەستی پیاوانی ئێرانـی تـا بیـانكوژن[٢٠٧]، ئـەو سـەرهەڵدان و ڕاپەڕینانـە وایـانكرد كـە لـە هـەموو تەبەرستاندا عارەب و موسڵمانەكان بە یەكجاری تۆویان بڕایەوە. دواتر تۆڵـەی خەلیفـەش كـە هەرگیز نەیتوانی ئیرادەی ئەو خەڵكەی كە بە ئاشكرا دژی هەر شتێك كە پەیوەست بە عارەبان بوو خەباتی دەكرد، سست بكات. دواجار، ماوەیەكی زۆری نـەبرد كـە (یەزیـد بـن مەهلـەب) یەكێ لە فەرماندەكانی عارەب لە گۆرگان سوێندی خواردبوو كە ئاش بە خـوێنی ئێرانییـەكان هەڵسوڕێنێ، هەرواشی كرد و ئاشی بە خوێنی ئێرانییەكان هەڵسوڕاند و گەنمی بەو ئاشە كـردە ئارد و نانەكەشی خوارد. ئەو كەسانەی كە لەو وڵاتەدا هێـشتا ڕووداوێكـی لـەو جۆرەیـان لـە یادەوەریدا مابووەوە، هەڵبەتە نەیاندەتوانی دەست لەو ڕك و نەفرەتەی كـە بەرامبـەر عارەبـان هەیانبوو، هـەڵبگرن. ئـەو ڕك و نەفرەتـە تونـدەی خـەڵك بەرامبـەر بـە دەزگـای خەلافـەتی عارەبەكان بوو كە لە سەردەمی مەئموون و موعتەسـەمدا، (مازیـار)یـان خـستە سـەر بـیری سەربەخۆییەوە.

## خوڕەم دینان

بەڵام لە ئازەربایگان، بارودۆخەكە بە جۆرێكی تر بوو، (جاودان كوڕی سەهل) مـردووە لـە ساڵی [٢٠١ ك/٨١٦ ز] و (بابەك)، ئایینی (خوڕەم دینان)یـان تـازەكردبووە و ئـەو شۆڕشـەی خوڕەم دینان لەوێ نەك هـەر ئـایینی عارەبـان و دام و دەزگـای خەلیفـەكانی خـستبوونە ژێـر

---

٢٠٧- تاریخ طبرستان، ب١، ل ١٨٣.

هەرِەشەوە، بەڵکو بۆ شازادە و میر و سەردارە ئێرانییەکانیش کە هەمیشە بە بیانوی دینی زەردەشتەوە خەڵکیان دژی عارەبەکان و بە قازانجی خۆیان هان دەدا، مەترسییەکی گەورە بوو. ئەو ئایینەی خورەمی، کە وەك دیار بوو پاشماوەی ئایینی مەزدەك بوو هێشتا لە گۆرگان و دیلەمان و ئازەربایگان و ئەرمەنستان و هەمەدان و دینەوەر و رەی و ئیسفەهان ژمارەیەکی زۆر پەیرەوکاری هەبوون، لەگەڵ دید و ئەندێشەی (دێهقانزادە) و میرزادە جیهانخوازەکان کە خەونی ژیاندنەوەی دەوڵەتی ساسانیان دەبینی کۆك نەبوو. لەبەر ئەوە بوو کە ئەرستۆکرات و سەرانی ئێرانیش بۆ کپکردنەوە و دامرکاندنەوەی ئەو راپەرینە لەگەڵ خەلیفەی عارەبان هاودەست بوون، بە شێوەیەك کە بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو مەترسییە، ئەو ئێرانیانەی کە خۆشیان زۆر رکیان لە عارەبان دەبووەوە بێ دڵ لە دڵدان دۆستایەتیان لەگەڵ دوژمنە دێرینەکانی خۆیان کرد. جێی سەرسوڕمان نییە کە (ئەفشین)ی شازادەی (ئەشروسنە) بە دڵ و گیان فەرمانی خەلیفەی قبوڵ کرد بۆ تەفروتوناکردنی (خورەم دینان) و لەبەر ئەوەش بوو کە لە شازادەکانی تەبەرستان جگە لە مازیار هیچ کەسی تر یارمەتی (بابەك)یان نەدا و ئەویش جگە لە گفت و بەڵێن هیچ یارمەتی و هاوکارییەکی بابەکی نەکرد.

ماوەیەکی زۆر لە مێژ بوو کە خورەم دینان دژی عارەبان رابوون، بەڵام بەر لە سەر هەڵدانی بابەك، کاری خورەم دینان هەرگیز بە هەنگاوێکی دژوار و مەترسیدار لێکنەدرابووەوە. خورەم دینان وەك دیار بوو جێماوەی پەیرەوکارانی مەزدەك بوون کە لەبەر زەبر و زەنگ و توندوتیژی ئەنوشیرِوان رایانکردبوو و خوسە و پەروێز و جێنشینەکانیشی ئەوەندە سەرقاڵی گرفتارییەکانی خۆیان ببوون کە ئاگایان لە تەفر و تووناکردن و لەنێو بردنی ئەوان نەمابوو.

لە رۆژگاری ئیسلام و سەردەمی مەهدی، خەلیفەی عەبباسی، ئەو خورەم دینانە سەری خۆیان بەرزکردەوە و وەکو هەموو دەستە و گروپەکانی تریش، هەوڵیاندا خوێنی بە ناهەق رژاوی (ئەبو موسلیم) بکەنە بیانوی سەرهەڵدانی خۆیان. سەرچاوە مێژووییەکان نووسیویانە کە ((لە رۆژگاری خەلیفە مەهدی (باتنیەکان)ی گۆرگان کە پێیان دەگوترا (ئالاّ سوور) لەگەڵ خورەم دینان یەکیان گرت و گوتیان ئەبو موسلیم زیندووە و ئێمە ولات ئازاد دەکەین و (ئەبولغەرا)ی کوری ئەبو موسلیمیان کردە رابەری خۆیان و تا رەی چوونە پێش، حەلاڵ و

حەرامیان بەیەك دەزانی و ژنەکانیان (مباح)* دەکرد. مەهدی نامەی بۆ دەوروبەر و بۆ (عومەر بن ئەلەلاکە)ی والی تەبەرستان نووسی کە هاوکاری یەکتری بکەن و بچنە شەڕی راپەڕیوەکان. وایانکرد و ڕۆیشتن و ئەو کۆمەڵە پەراگەندە بوون و لەو سەردەمەیش کە هاروون ئەلڕەشید لە خوراسان بوو جارێکی تر خورەم دینان راپەڕین و لە هەرێمی ئیسفەهان، خەڵکێکی زۆری ڕەی و هەمەدان کۆبوونەوە و پەیوەندییان کرد کە ژمارەیان لەسەد هەزار کەس پتر دەبوو. هاروون، (عەبدوڵلا بن موبارەك)ی لە خوراسان بە بیست هەزار سوارەوە بۆ بەرنگاربوونەوەی ئەوان نارد. ئەوان ترسان و هەر کۆمەڵە و بۆ شوێنی خۆی گەڕایەوە.)) ئەگەر بشێ باوەڕ بکەین بەو ریوایەتەی کە کتێبی (سیاسەتنامە) گێڕاویەتیەوە ، خورەم دینان بەرلە دەرکەوتنی جاویدان و بابەکیش هەمیشە لە شارەکان و لادێکاندا بە ئاشکرا شۆڕش و راپەڕینیان کردووە و پەرەیان بە ئایینی خۆیان داوە[٢٠٨].

## جیاوازی لە ریوایەتەکان

ئایینی خورەمی چی بووە و تاچ ڕادەیەك پەیوەندی بە ئایینی مەزدەکەوە هەبووە؟ سەرچاوە بەردەستەکان لەو بارەیەوە ئەوەندە جیاوازییان هەیە کە زەحمەتە بتوانرێ وەڵامێکی ڕۆشنیان لێوەربگیرێ. بە تایەبەتیش کە گشت ئەو سەرچاوانە لەگەڵ مەبەستی تایبەتی و دەمارگیریی ئایینی و سیاسی تێکەڵکێش کراون. (مەقدیسی) مردووە لە (٣٢٤ ك/٩٣٦ ز) لە بارەی ئەوانەوە دەنووسێ کە ((لەو کاتانە بترازێ کە بڕیاری راپەڕین و سەرهەڵدان رادەگەیەنن، دەنا خۆیان لە ڕشتنی خوێن دەبوێرن. زۆر پابەندی پاکین، بە نەرمی و خۆش ڕەفتاری مامەڵە لەگەڵ خەڵکی تردا دەکەن و هاوبەشبوونی ژنان بە ڕەزامەندی خودی ئەوان بە شتێکی جایز و ڕێگەپێدراو دەزانن.))[٢٠٩]

(ئیبن ئەلنەدیم) خورەمییەکان بە پەیڕەوکارانی مەزدەك دەزانێ و دەڵێ مەزدەك فەرمانی بە پەیڕەوکارانی خۆی دابوو کە هەمیشە لە هەوڵی چێژ وەرگرتن دابن و خۆ لە خواردن و

---

* ئەم مباحکردنەی ژنان، تۆمەتێکە هەمیشە دراوەتە پاڵ ئەوانەی لەو سەردەمەدا بە مەبەستی ئازادی راپەڕیون، دەنا بە پێی لێکۆڵینەوە باوەڕپێکراوەکان دوورە لەڕاستی. (و.ك).

٢٠٨- سیاسەتنامە، ل ١٧٣، چاپ خلخالی.

٢٠٩- البدء و التاریخ، ب٤، ل ٣٠ — ٣١.

خواردنەوە نەبوێرن، خۆشەویستی و یارمەتیدان بکەنە پیشەی خۆیان و هەمیشە دژی ستەم و زۆرداری خەبات بکەن و ژنان و خێزانەکان بە هاوبەش بزانن. بە گشتی ئەوان کردار و ڕەفتاری چاك و پەسەندکراویان هەیە. بە دوای کوشتن و ئازاردانی هیچ کەسەوە نین. دواتر لە بارەی بابەکەوە دەڵێ، کە ئەو جەنگ و تالآن و کوشتن و کوشتاری لە نێو ئەواندا بردوپێدا و بەر لەو کاتە خورەم دینان لەگەڵ ئەو شتانە ئاشنا نەبوون[210].

[(خواجە نیزامولمولك) مردووە لە (٤٨٥ ك/١٠٩٢ ز)]ئەو کەسەی کە دەیەوێ (باتنیەکان)و خورەمییەکان بە یەکدابنێ، لە کتێبی (سیاسەتنامە)دا بە شێوەیەکی مەبەستدار دەنووسێ: ((بەلآم بنەمای مەزهەبەکەیان بریتییە لەوەی کە دەیانەوێ بە خۆشی و خۆشگوزەرانی بژین و تەرکی شەریعەتیان کردووە وەك نوێژ و ڕۆژوو زەکات و مەی و ماڵ و سامان و ژنی خەڵکی، یان حەلآڵ کردووە هەرچی کە بە سەر موسڵمانان فەرزکراوە، ئەوان لێی دوور بوون.))[211] [((بەلعەمی)) مردووە لە (٣٦٣ ك/٩٧٣ ز)] لەمەڕ هۆی بڵاوبوونەوەی ئایینی خورەمی لە نێو خەڵکی ئەو وڵاتەدا دەنووسێ: ((لاوان و وەرزێر و دەوڵەمەندەکان کە هیچ زانست و زانیارییێکیان نەبوو و موسڵمانەتیان لە نێو دڵدا نەبوو و یاسا و ڕێساکانی ئیسلام و ڕۆژو و حەج و قوربانی و غەسلی جەنابەتیان لەلا شتێکی گران بوو و نەیاندەتوانی دەست لەو شتانە هەڵگرن کە خوا نەهی کردوون، دەیاندی کە لە ئایینی بابەکدا ئەو شتانە گشتیان ئاسانن بە پیرییەوە چوون و بوونە لایەندار و پەیڕەوکاری.))٢١٢ (ئیبنولئەسیر) دەنووسێ کە: ((ئەوانە لقێکی (مەجوس)ن و پیاوەکانیان لەگەڵ دایك و خوشك و کچەکانی خۆیان زەماوەند دەکەن و باوەڕیان بە ئایینی دۆنادۆن هەیە و دەڵێن کە ڕۆح لە گیانێکەوە بۆ گیانێکی تر دەگوازرێتەوە))[213] باوەڕ بوون بە دۆنادۆن وەك چۆن لە زۆربەی سەرچاوەکاندا هاتووە یەکێکە لە کۆڵەگەکانی باوەڕی خورەم دینان.

سەیر لەوەدایە کە زۆربەی هەرەزۆری ئەو گروپانەی کە دوای هاتنی ئیسلام دژی عارەبەکان دەرکەوتن، باوەڕیان بە ئایینی دۆنادۆن هەبووە یان مەیلداری بوونە. (سەنباد) و (ئوستادسیس) و

---

٢١٠- الفهرست، ص ٤٧٩ – ٤٨٠.

٢١١- سیاسەتنامە، ص ١٧٧.

٢١٢- نسخە خطی بلعمی.

٢١٣- کامل ابن اپیر و داودی سالی ٢٠١.

(موقەنەع)یش باوەڕیان بە دۆنادۆن هەبوو. لە ڕاستیدا باوەڕی دۆنادۆن بیانووی دەستی هەموو ئەو کەسانە بوو کە دەیانویست خۆیان بە جێنشینی قارەمانانی ڕابردوو بدەنە قەڵەم و ناو و یادی دلاوەرانی دێرین زیندوو بکەنەوە، دۆست و پەیڕەوکارانی ئەبو موسلیم لەو ڕووەوە کە ڕۆحی ئەبو موسلیم چۆتە جەستەی (موقەنەع) لە دەوری ئەو کۆبوونەوە و پەیڕەوکار و یارانی (جاویدان کوڕی سەهل) بەو بڕوایەی کە گیانی ئەو چۆتە جەستەی بابەك، گیان لە سەردەستانە یارمەتی بابەکیان دا.

ئایا ئەو باوەڕی دۆنادۆنە ئامرازێك بووە کە ڕاپەڕینی بابەکیش وەکو ڕاپەڕینەکەی موقەنەع، لەگەڵ یادەوەری ئەبو موسلیمدا پەیوەست بکەن؟ دوور نییە. خواجە نیزام ئەلمولك دەڵێ: ((سەرەتا قسەی ئەوان ئەوە بوو کە نەفرەت بۆ بکوژی ئەبو موسلیم بنێرن و داخ بۆ کوشتنی بخۆن و درود بنێرن بۆ مەهدی فەیرۆز و هارونی کوڕی فاتیمەی کچی ئەبو موسلیم کە بە منداڵێکی زانا یا وەك بە زمانی عارەبی بە- الفتی العالم- ناویان دەهێنا.))[214] ئەوەی پەیوەندی ئەو گروپە بە ئەبو موسلیم پشت ڕاست دەکاتەوە بریتییە لە ریوایەتێك کە دینەوەری لە بارەی ڕەچەڵکی بابەك باسی دەکات. ناوبراو دەنووسێ: ((خەڵك سەبارەت بە ڕەچەڵەکی ئەو هەڵەیان کردووە. ئەوەی بەلای ئێمەوە بە ڕاست دەزانرێ ئەوەیە کە ئەو لە کوڕانی (موتەهەر کوڕی فاتیمە)ی کچی (ئەبو موسلیم)ە و فاتیمیەکان کە یەکێکن لە گروپەکانی خوڕەمی سەر بە هەمان ئەو فاتیمەیەی کچی ئەبو موسلیمن نەك فاتیمیەی کچی پێغەمبەر (د.خ)[215]

## بابەك

با بزانین ئەو بابەکە کێ بوو؟ زۆربەی ئەو سەرچاوانەی کە باسیان لەو کردووە، بە مەبەستی تایبەت و ئەفسانە ئامێز باسیان کردووە. بۆیە بە زەحمەت دەتوانین لە پشت تەم و مژی ئەفسانەکاندا سیمای ڕاستەقینەی ئەو ببینین. مێژوونووسانی موسڵمان هەوڵیان داوە یاد و یادگاری ئەو تاریك و پووچ کەن و لە ڕووی دەمارگیریی خۆیانەوە تێکۆشاون سیمای ئەو پیاوە دزێو و ناپەسەند نیشان بدەن. ڕاپەڕینەکەی ئەو وەك دەبینرێ لە نێو خەڵکە گشتییەکەدا

---

٢١٤- سیاسەتنامە، ل ١٧٧ لە بارەی جاویدان کوڕی سەهل و بەسەرهاتی هەروەها سەربردەو بەسەرهاتی بابەك خوڕەم دین بگەڕێوە بۆ کتێبی ((بابەك خوڕەم دین)) بە پێنووسی سەعید نەفیسی نووسراوە و تەواوی ریوایەت پەیوەندیدارەکان لەو کتێبەدا کۆکراونەتەوە.

٢١٥- اخبار الطوال، ل ٣٣٨.

لایەنگرانێکی هەبووە، بەڵام لە لایەن وەزیرو  و گەورەکانەوە وانەبووە، لەبەر ئەوەی ئەو لە هەوڵی زیندووکردنەوەی بیروباوەڕەکانی مەزدەکی بووە، بۆیە بە ناچاری موسڵمانانیش نەیاندەتوانی لە ئاستیدا بێدەنگ بن و بەرگەی بگرن.

ئەو ئەفسانانەی کە لە بارەی ئەوەوە دروستیان کردوون بە چاکی ئەوە نیشان دەدەن کە بە مەبەست و نییەتێکی تایبەت هەوڵیان داوە ناوی بابەك لەکەدار بکەن. بەمەچەشنە بەشێکی گرنگی مێژووی بابەك و خوڕەم دینان تا ڕۆشن و تەم و مژاوی ماوەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا لەوەندەی کە ماوەتەوە زۆر لایەنی سەرنجڕاکێش بەدی دەکرێن.

بیر و ڕاکان سەبارەت بە ڕەچەڵەك و نەژادی بابەك لێکجیان. دینەوەری مردووە لە (٢٨٢ ك/٨٩٥ ز) دانەری کتێبی ((اخبار الطوال)) بە شێوەیەك کە بە تەواوی دەتوانێ مرۆ دڵنیا بکاتەوە، ناوبراو بە کوڕی (موتەهەر)ی کچەزای ئەبو موسلیم دادەنێ. بەڵام دانەری کتێبی ((ئەلفەهرست)) لە زاری کەسێکەوە کە دەنگوباس و بەسەرهاتی بابەکی کۆکردۆتەوە، دەڵێ کە: ((باوکی پیاوێکی ڕۆن فرۆشی خەڵکی مەداین بوو. چۆتە ناوچەی ئازەربایگان و لە گوندێك بە ناوی (بلاد ئاباد) لە گوندەکانی (مەیمەد) نیشتەجێ بووە. ئەو پیاوە ڕۆنی لە هیزان دەکرد و بە پشتی خۆی دێ بە دێ دەگەڕا و دیفرۆشت...))[٢١٦] ناوی ئەو ڕۆنفرۆشە لە (ئەلفەهرست)دا نەهاتووە، بەڵام (سەمعانی) مردووە لە ساڵی (٥٦٢ ك/١١٦٧ ز) ناوی باوکی بابەکی بە (مەرداس)[٢١٧] نووسیوە. خاڵێك کە لە کتێبی ((ئەلفەهرست))دا مایەی سەرنجە، ئەو پێداگریەیە کە بۆ ریسواکردنی بابەك کراوە. باوکیان بە ((ڕۆنفرۆشێکی خەڵکی مەداین)) و دایکیان بە ((ژنێکی یەکچاو کە ماوەیەك لەگەڵ پیاوێکی ڕۆنفرۆش بە حەرامی تێکەڵ بووە)) پێناسە کردووە. لەو ریوایەتەدا ئاسەواری مەبەست خراپی و کینەی ئەوانەی ڕیوایەتەکەیان پێکهێناوە، روون و ئاشکرایە.

---

٢١٦- الفهرست، ل ٤٨٠.

٢١٧- ئەم ناوە لە دوو بەشی فارسی ((مرد)) و ((اس))پێك هاتووە، بە مانای خەڵك خۆر، کە ئەم ناوە لەلایەن ناحەزانی بابەکەوە، دەتوانرا لە باوکی ئەو بنرێ، باوکی زوحاکیش هەندێك بە مەرداس ناو یانبردووە. بگەڕێوە بۆ ZDMG ٤، ٤٢٣.

## ریوایەتە هەڵبستراوەکان

لە درێژەی ئەو ریوایەتەدا، چیرۆکێکی زۆر سەیری ئەفسانەئامێزیان لە سەردەمی منداڵی بابەك پێکەوە ناوە. دەنووسن کە: ((رۆژێـك دایکـی بابـەك چـۆتە دەر و بـە دوای کوڕەکەیـدا گەڕاوە، بابەك ئەوکات مانگاکانی خەڵکی دەبردە لـەوەڕگاکان، واتـە گـاوان بـوو. دایکەکـە، بابەکی لە ژێر درەختێك دۆزییەوە هیچی لەبەردا نەبوو و خەوتبوو، لە ژێر هەر تاڵە مـوویێکی سنگ و سەریدا خوێن دەچۆڕایەوە. کە بابەك لە خەو هەستا ئیدی شوێنەوارێکی لـە خوێنەکـە نەبینی، زانی کە زۆری پێناچێ کاروباری کوڕەکەی گەورە دەبـێ ...)) ئـەو ئەفـسانەیەش کـە ئەفسانەکانی وەکو ئـەوەی ((دانیـال و بەختولنەسـر)) وەبـیر دێننـەوە. وا پێدەچـێ بـۆ ئـەوە دروستکرابن کە بابەك وەکو دێوەزمەیەکی ((مرۆڤ خۆر)) و ((خوێنڕێـژ)) پێناسـە بکـەن. لـە چەند ریوایەتێکی تریشدا سەبارەت بەو کوشت و بڕ و خوێنڕێژییانـەی کـە کـراون بـەو پـەڕی زیادەڕۆیی و پێوەنانەوە، باس کراون.

مەسعوودی (مردووە لە (٣٤٢ ك/٩٥٦ ز) دەڵێ: ((لە ماوەی ئەو بیست و دوو ساڵەی کـە راپەڕینەکەی بابەکی تیا بەردەوام بوو ئەوەی بە لایەنی هەرەکەم باس کرابێ پێنج سـەد هـەزار کەس لە فەرماندە و سـەرۆك و چـینەکانی تـری خـەڵك کـوژراون.))[٢١٨] لـە کتێبـی (جوامـع ئەلحیکایات) لە مێژووی (مەقدەسی) گێڕدراوەتەوە کە ((ئەوانەی کە بە دەستی ئـەو کـوژراون ژماردوویانە، هەزار هەزار موسڵمانی کوشتبوون.))[٢١٩] نیزامولمولـك دەنووسـێ: ((یـەکێك لـە جەلادەکانی ئەو بە دیل گیرابوو لێیان پرسی تۆ چەند کەست کوشتووە؟ گوتی ئەو زۆر جەلادەی تری هەبوون، بەڵام ئەوەی کە من کوشتوومە سی و شەش هەزار موسڵمانن، ئەمە جگە لەوەی جەلادەکانی تر کوشتوویانن یان لە شەڕەکاندا کوژراون.))[٢٢٠]

لەو باسەی کە سەبارەت بە بابەك نووسیویانە ئـەو چـیرۆك و هەڵبەسـتراوانە زۆرن. زۆری و فراوانی ئەو جۆرە ریوایەت و هەڵبەستنانە ئەوە نیشان دەدا کە هاوکار و هاوەڵـەکانی خەلیفـە تا چ رادەیەك بۆ ریسواکردن و لە نێو بردنی راستییەکانی رەوشـی بابـەك هەوڵیانـداوە. روونـە ئەوەی کە لەو سەرچاوانەوە لەمەڕ راپەڕینەکەی بابەك دەردەکەوێ تاچ رادەیەك ئاڵۆز و تێکـەڵ

---

٢١٨- التینه و الاشراف، ص ١٧٧.

٢١٩- نسخه خطی مجلس.

٢٢٠- سیاسەتنامە، ل ١٧٧.

و پێکەڵی هەیە. ئەوەی جێی گومان نییە ئەوەیە کە ڕاپەڕینەکەی بابەك لە نێو دێنشین و جووتیارە چیانشینەکانی عێراق و ئازەربایگاندا لایەنگر و هەوادارانێکی زۆری هەبوون. هەروەها ئەو ڕاپەڕینە پێدەچێ ماوەیەك بەر لە دەرکەوتنی بابەك سەری هەڵدابێ و دوای ئەویش بۆ ماوەی چەندین سەدە هەر بەردەوام بوو.

بابەك تەنها فەرماندەیەکی ئازا و هۆشمەند و ژیر بوو کە ماوەیەکی زۆر شۆڕش و سەرهەڵدانەکانی مەزدەکی و خوڕەمدینانی ڕابەرایەتی کردووە. لەو کارەشیدا بابەك جێنشینی (جاودان کوڕی شەهرەك) مردووە لە (٢٠٠ ك/٨١٥ ز) بوو کە یەکێك بووە لە سەرکردەکانی خوڕەمییەکانی ئازەربایگان. سەرچاوەکان دەنووسن کە دوای مردنی جاویدان، ژنەکەی بە خوڕمییەکانی گوت کە ((جاویدان، بابەکی بە جێنشینی خۆی داناوە و وەسیەتی کردووە کە خەڵکی ئەم دەڤەرە پەیڕەوی لەو بکەن و ڕۆحی جاویدانی بۆ ئەو گواستۆتەوە و بەڵێنی بە ئێوە داوە کە لە ژێر دەستی ئەودا سەرکەوتن و پێشکەوتن وەدەست بێنن...))

## ڕاپەڕینی بابەك

بەو شێوەیە بوو کە بابەك ساڵی (٢٠٠ ك/ ٨١٥ ز) بەناوی ئایینی خوڕەم دینان و بۆ درێژەدان بە ڕاپەڕینی جاویدانی مەزدەکی ڕابوو. بە زوویی پەیڕەوکار و شوێنهەڵگرانێکی زۆری لە دەوری کۆبوونەوە و ژمارەیەکی زۆر لە وەرزێران و دێنشینەکان کەوتنە هاوکاری و یارمەتیدانی.

لەو ساڵانەدا مەئموونی خەلیفە سەرقاڵی گرفتارییەکانی خۆی بوو. کێشەی جێنشینایەتی عەلی بن موسا ئەلرەزا و ئەو پیلان و نەخشانەی کە ئێرانییەکان بە تایبەت (ئال سەهل) دژی خەلیفە ئامادەیان کردبوون، خەلیفەیان مژول و سەرقاڵ کردبوو. ئەو نارەزایەتییانەی عەبباسییەکانی بەغدا کە بتەوێ یان نا مەئموونیان بە خۆوە خەریك دەکرد، دەرفەتێکی گونجاو بوون بۆ بابەك. بۆیە ئەو لە ناوچە چیاییەکانی ئازەربایگاندا هێز و دەسەڵاتێکی وەدەستهێنا، تەنانەت بە قسەی بەلعەمی ((چەند جارێك سوپای خەلیفەی شکاندبوو، پەناگەی ئەو لە کێوەکانی ئەرمێنیا و ئازەربایگان بوو، ئەو شوێنە زۆر سەختانەی کە سوپا نەیدەتوانی پێیاندا بڕوا، بە چەشنێك کە سەد پیادەت ئەگەر لە گەردەنەیەك دانابا هەزار سواریان دەگێڕایەوە و چیاو دەربەندەکان زۆر عاسێ و سەخت بوون، پێکەوە بەسترابوونەوە، لە نێوان ئەو کێوانەدا پەناگەیەکی چێکردبوو و لەوێدا بێ ترس لێی دانیشتبوو، کە لەشکریان بهاتبایە سەر لەو

کێوانەدا بڵاو دەبوون و خۆیان لەبەرچاوی لەشکر ون دەکرد و ماوەیەك ئاوا دەمانەوە، هەرکە لەشکری عارەبان ترسی نەدەما، شەوێك بەسەر ئەو لەشکرەیان دادەدا و سوپای ئیسلامیان دەشکاند، تا جارێکی تر خەلیفە بە هەر هەوڵ و ماندووبوونێك بوایە سەر لەنوێ لەشکرێکی کۆدەکردەوە و دیسان دەیناردنەوە سەر، ئەو رەوشە بۆ ماوەی بیست ساڵ ئاوا مایەوە.))[221]

لە ماوەی ئەو بیست ساڵەدا مەئموون و موعتەسەم بۆ لە نێوبردنی بابەك زۆر هەوڵیاندا. زۆرجار لەشکریان ناردە سەر کە دەستگیری بکەن، بەڵام جگە لە نارەزایەتی خەڵکی کە نەیاندەویست جارێکی تر دەسەڵاتی عارەبان بگەڕێتەوە و بەرگەی داگیرکاریان نەدەگرت، تەنگەبەری و سەختی رێگاوبانەکان و سەرما و سۆڵەی ئەو هەرێمە، هەمیشە فەرماندە و سەردارانی موسڵمانی تووشی ناکامی دەکردەن. لە ساڵی ٢٢٠ك/٨٣٥ ز موعتەسەم، (خیدر کوڕی کاوس)ی میرزادەی ئەشروسنەی کە بە ئەفشین بەناوبانگ بوو، بۆ شەڕی بابەك نارد. ئەو ئەفشینە شازادەیەکی ئێرانی نەژاد بوو کە لە بەغدا بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئێرانی و لەنێوبردنی بنیات و دامودەزگای خەلافەتی عارەبان نەخشە و پیلانگێری دەکرد. هاوەڵەکانی خەلیفەش بە لایەنگر و هەواداری ئێرانییەکان و مەیلی زەردەشتییەت تۆمەتباریان دەکرد.

دەڵێن کە ئەو دۆستایەتی و هاوڕێیەتی لەگەڵ مازیار و بابەکدا هەبووە و بە نهێنی بۆ لە نێوبردنی خەلافەتی بەغدا هاوکاری ئەوانی دەکرد. چەند ساڵ دواتر کە مازیار دەستگیرکرا ئەو نەخشە و پیلانانەی بە ئاشکرا دان پێنابوو و گوتبووی کە: ((من و ئەفشین خیدر کوڕی کاوس و بابەك هەرسێکمان لە دێر زەمانەوە پەیمانمان پێکەوە بەستووە و بڕیارمان داوە کە دەوڵەت لە عارەبان بستێنینەوە و دەسەڵات بۆ بنەماڵەی کسرەوییەکان بگێڕینەوە.))[222] لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك لە لایەن خەلیفەوە پێشنیازی ئەوەی بۆ کرا کە بۆ لە نێوبردن و تەفروتوناکردنی بابەك بچێتە ئازەربایگان بێ دوو دڵی وەڕێ کەوت.

## ئەفشین و مازیار

هۆیەکەی ئاشکرایە، راپەڕینەکەی بابەك ئەگەرچی رەنگێکی ئێرانی هەبوو، بەڵام راپەڕینێك نەبوو کە هەرگیز بتوانێ خەونە زێڕینەکانی شازادەی ئەشروسنە بێنێتە دی. ئەو ئێرانیانەی کە بۆ

---

٢٢١- تاريخ بلعمی، نسخه خطی.

٢٢٢- تاريخ گبرستان، ج ١، ص ٢٢٠.

لەنێوبردنی دەزگای خەلافەت هاوکاری مازیار یان تەنانەت هاوکاری ئەفشینیان دەکرد، ئەو ئارەزووەیان هەبوو کە لەگەڵ لە نێوبردنی خەلیفەکان، پێدەچوو ئەوەی کە خۆیان پێیاندەگوت ئایینی سپی زیندوو بکەنەوە و دەوڵەتێکی وەکو دەوڵەتی ساسانی دابمەزرێنن. بەڵام راپەڕینی بابەك کە پەیڕەوی ئایینی مەزدەك بوو، بۆ ئەوان و بۆ ئەفشین و مازیاریش سوودێکی نەبوو. ئەو شازادانەی ئەشروسنە و تەبەرستان وەك دیار بوو جگە لە گەیشتن بە پۆست و پایەی بەرز ئامانجێکی تریان نەبوو. ئێران و ئێرانی بوون، بۆ ئەوان تەنها بیانوویێك بوو. ئەوان هەوڵیاندەدا، ئەو ئیمتیاز و سوودانەی کە ئیسلام لێی سەندبوون دووبارە وەدەست بێننەوە. بەم پێیە خەبات و هەوڵدانی ئەوان دژی دەزگای خەلافەت بۆ کۆکردنەوەی سامان و گەیشتن بە دەسەڵات و حکوومەت بوو. بەڵام بۆ گەیشتن بەو ئامانجە، مژدەیان دەدایە ئەو کەسانەی کە لە وڵاتی ئەوان لە ئیسلام و عارەبان نارازی بوون کە رزگاریان دەکەن و خۆیان دەگەڕێننەوە سەر دەسەڵات. مازیار بۆ گەیشتن بە دەسەڵات دەستی لە کوشتنی مامی خۆی کە بە ئەندازەی ئەو شانازی بە ئێران و ئێرانی بوون دەکرد، نەپاراست. ئەفشین بۆ سەرنجڕاکێشان و رازیکردنی دڵی خەلیفەی عارەب درێغی نەکرد لە پیلانگێڕی بۆ دەستگیرکردنی بابەك. هەمان ئەو ئەفشینە، هانی مازیاری دا بۆ ئەوەی دژی خەلیفە ڕاپەڕێ، بەو ئومێدەی کە خەلیفە ئەو بۆ دەستگیرکردنی مازیار رەوانە بکا و فەرمانڕەوایەتی خوراسان و هەرێمی چیا کە لە دەستی دژبەرەکانی ئەو واتە لە دەستی بنەماڵەی (تاهر) بوو، بستێنێتەوە و بەوی بسپێرێ. ئاشکرایە کە ((میرزادەکان)) دەیانتوانی هەموو شتێك بکەنە قوربانی سوود و بەرژەوەندییەکانی خۆیان.

پێویست بوو کە دەسەڵات و هێزی خەلیفەکانی عارەب لە نێو بچێ تاکو ئەوان بتوانن ئارەزووەکانی خۆیان بێننەدی. پێویست بوو کە ستەملێکراوان دژی عارەبەکان ڕاپەڕن تا دەسەڵاتی خەلیفەکان لە نێو بچێ. نارەزایەتی خەڵك بەرامبەر کار و رەفتاری عارەبەکان و خولیای ئەوان بەرامبەربە رێباز و ئایینی دێرینی خۆیان هەردەم دەیەتوانی ئێرانییەکان لە دەوری ئاڵای هەر ئێرانییەك کۆ بکاتەوە کە لە دژی دەزگای خەلافەت ڕاپەڕیبایە. کەوایە، بێگومان باشترین بیانوو کە بۆی هەبوو زۆرلێکراوانی نائومێدی ئێرانی هان بدا یارمەتی ئەو سەردارانە بدەن، زیندووکردنەوەی ئایینی نەتەوەیی بوو. فەرماندە و سەردارەکان جگە لە کۆکردنەوی سامان و دارایی کە بە تاکە ئامرازێکیان دەزانی بۆ گەیشتن بە دەسەڵات و فەرمانڕەوایی، ئەندێشە و خولیایەکی تریان لە مێشکدا نەبوو. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە ئەگەرچی بە رواڵەت هەموویان بۆ

((زیندووکردنەوەی شکۆ و سامی ئێران)) ڕادەپەڕین، کەچی دۆستایەتییێکی پایەداریان لە نێودا دروست نەدەبوو.

دەگێڕنەوە (سەنباد) کە لە ڕەی شکستی خوارد پەنای بردە تەبەرستان، بەڵام (ئەسپەهبۆد)ی تەبەرستان کە لەگەڵ عارەباندا دوژمنایەتیشی هەبوو، تەماعی چووە پارە و دارایی سەنباد و کوشتی. ئەو ڕووداوە ئەوە نیشان دەدا کە زیندووکردنەوەی گەورەیی و شکۆی دێرینی ڕابردووی ئێران لە ڕاستیدا لە بیانووێك بۆ فریودان و هەڵخەڵەتاندنی ستەملێکراوانی ئێرانی بترازێ شتێکی تر نەبووە. ئەو کەسانەی بەو قسە و بەڵێنە هەڵخەڵەتێنەرانە خەڵکیان لە دەوری خۆیان کۆدەکردەوە جگە لە گەیشتن بە سامان و دەسەڵات، خەمێکی تریان نەبوو.

بۆیە زۆرجار ئەگەر بە پێویستیان زانیبا باوەڕ و تێڕوانینی خۆشیان دەکردە قوربانی گەیشتن بە ئامانجی تایبەتی خۆیان. ئەمە نیشان دەدا کە چۆن چۆنی میرزادەی ئەشروسنە، کە لە بەغدا هەمیشە لافی پشتیوانیکردنی ئێرانییەکانی لێدەدا، لە ئازەربایگان بە فڕوفێڵ هەوڵی لە نێوبردن و کوشتنی دەدان، بەڵام هۆکارێکی تریش هەبوو کە شازادەی ئەشروسنەی بۆ لە نێوبردنی ((دوژمن)) دەکردە هاودەست و هاوپەیمانی خەلیفە.

## تورکانی بەغدا

ئەو ململانێ و ناکۆکییەی کە لە دەرباری (موعتەسەم) لە نێو نەژادەکانی ((تورك)) و ((عارەب)) و ((فارسەکان))دا دروست ببوو، فەرماندە و سەردارەکانی خەلیفەی بە توندی کردبوونە دوژمنی یەکتر. دەرباری موعتەسەم ببووە مەکۆی پیلان و نەخشەی دوژمنانەی فەرماندە و سەردارەکانی. ئەو دوژمنایەتی و ناکۆکیانەی نێوان ئەو سەردارانە بۆ موعتەسەمی خەلیفە شتێکی باش بوو. بۆیە خەلیفەش جارجارە ئاگری ئەو ناکۆکی و دوژمنایەتیانەی خۆش دەکرد.

لە سەرەتای قۆناغی خەلافەتی موعتەسەمدا بەغدا ببووە مەڵبەندی جۆش و خرۆش و چالاکی تورکەکان. ئەمانە لە ڕاستیدا بۆ ئەوە هێنرا بوونە بەغدا و خرابوونە ریزی خزمەتکردنەوە کە لە بەرامبەر هێزی سەربازەکانی خوراساندا، هاوکێشەیەك دروست بکەن. ساڵانە هەزاران نۆکەری ((مەملوك))یان لەوبەری ڕووباری (جەیحون)ەوە دەهێنان بۆ بەغدا. ئەو بەندە بە کرێگیراوانە بەو هەموو توندوتیژی و بێباکییەی کە هەیانبوو، بۆ خەلیفە وەك ((چەکێك)) بەکاردەهێنران. بۆیە هەمیشە بە چاوی بایەخەوە تەماشا دەکران و هەر زوو دەگەیشتنە پلە و

پایەی فەرماندەیی. تا توانا و دەسەلات و نوتوریتەی تورکەکان لە دەزگای خەلیفەدا زیاتر دەبوو، عارەبەکان دلّساردتر و نائومێدتر دەبوون.

ئێرانییەکان کە خاوەنی نفووز و توانای مەعنەوی و فەرهەنگی بوون، هەرگیز لەبەرامبەر تورکەکاندا مەیدانیان چۆڵ نەدەکرد. بەلاّم عارەبەکان، بتەویّ یان نا جێی خۆیان بۆ تورکەکان چۆڵ کرد و لەوە بەدواوە لە جیاتی ئەوەی وەکو جاران، کۆلەگەی خەلافەت بن مایەی هەرِەشە بوون بۆ سەر خەلافەت[۲۲۳]. تورکەکانی موعتەسەم کە جلوبەرگی دیبا و کەمەربەند و پشتێنی زێرینیان دەبەر دەکرد و دەبەست، بە هۆی ئەو جلوبەرگانەی خۆیان، لە هەموو سەربازەکانی تر جیادەکرانەوە و لە چاو ئەواندا دیاربوون و دەناسران. رەفتاری نابەجێ و توندوتیژانەشیان خەلّکی بەغدایان وەتەنگ هێنابوو. لە نێو بازاڕ و کۆلاّنە تەنگەبەرەکانی بەغدا بە سواری ئەسپ دەهاتن و دەچوون و تەراتێنیان دەکرد و منداڵ و خەلکی بێ دەسەلاّتیان ئازار دەدا.

ئەو باس و خواسەی کە سەبارەت بە مێژووی بەغدا دەگێڕدرێتەوە ئەوە نیشان دەدا کە رەفتاریان لەگەلّ خەلّکدا چۆن بووە: ((دەلّێن موعتەسەم رۆژێك لە سەرای مەئموون دەگەڕایەوە بۆ سەرای خۆی، لە ڕێگادا سەربازەکان لە هەموو لایەك خێوەتیان هەلّدابوو، موعتەسەم بە لای ژنێکدا تێپەری کە دەگریا و دەیگوت: کوڕەکەم کوڕەکەم! سەربازێك کوڕەکەی بردبوو. موعتەسەم ئەو سەربازەی بانگ کرد و پێیگوت: کوڕی ئەو ژنە بێنەوە لای دایکی، پیاوەکە ملی نەدا. موعتەسەم بۆلای خۆی هێنای و مەچەکی گرت و بایدا، دەنگی ئێسکی مەچەکی هات و

---

۲۲۳- Mvir،caliphate،p.518

کاتێ موعتەسەم بوو بە خەلیفە نامەی بۆ کارگوزارانی خۆی لە هەموو شارەکان نووسی کە ناوی عارەبەکان لە تۆماری بەخشیش و خەلاّت بسڕێتەوە — ئەوە بووە هۆی نارازی بوونی ئەوان و کەوتنە جموجوڵ، بەلاّم هەولّەکانیان بێ سوود بوو. لەو کات بە دواوە عارەبەکان لە دەرباری خەلیفەندا هێز و کاریگەرییەکی وایان نەما، لەبەر ئەوە ئەوانیش تەخسیریان نەکرد لە هەنجەتگرتن و کارشکێنی و ناژاوە نانەوە دوای مەرگی موعتەسەم واسق بوو بە خەلیفە، ئەویش بۆنی خێری لێنەدەهات، ئەوە بوو کە [دەعبەل مردووە لە سالّی (۲٤٦ ك/٨٦٠ ز)]شاعیری ناسراوی عارەب لە سەیمەرە هەوالّی مەرگی موعتەسەم و هاتنی واسقی بیست بەم چەند دێرە هەردووکیان (هەردوو خەلیفە)ی سەرکۆنە کردووە. الحمد لله لاصبر ولاجلدلل....ولاعزأ اذا اهل البلا وقدوا .....خليفة مات لم يحزن له احد ... وآخرجاء لم يفرح به أحد

پیاوەکە کەوتە بەرپێیان و ئینجا فەرمووی کوڕەکە بدەنەوە بە دایکی))[224] ئەو رەفتارەی تورکەکان، خەڵکی بەغدایان زۆر نیگەران و هەراسان کردبوو. زۆرجار کاتێك تورکێك ئازاری ژنێك یا منداڵێك یا پیرێك یا کوێرێکی دەدا خەڵکی تێیدەئالاَن و لە نێویان دەبرد.[225] سەرئەنجام خەڵك زۆر لە دەستی تورکەکان وەتەنگ هاتن. چوونە لای موعتەسەم و گوتیان ئەگەر لەشکری خۆت لە بەغدا نەبەیتە دەر، رووبەڕووت دەبینەوە و شەڕت بەدژ دەکەین، لێیپرسین چۆن شەڕ لەگەڵ مندا دەکەن، گوتیان بە تیری هەناسەی سپێدان، موعتەسەم گوتی من دەرەقەتی ئەمە نایەم[226] و ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە خەلیفە شاری (سەرڕەمەن رەئا)ی دروستکرد.

هەڵسوکەوت و رەفتاری سەربازەکانی خەلیفە لە بەغدا بەو شێوەیە بوو و لەوە دەردەکەوێ کە فەرماندە تورکەکان بەو دەسەڵات و کاریگەرییەی کە لە دەزگای خەلافەتدا هەیانبوو چۆن چۆنی مامەڵەیان لەگەڵ خەڵکدا دەکرد. کاری ئەوانە هێواش هێواش بەوە گەیشت کە هەندێ جار بە رۆژی رووناك دەتدی یەکێك لەو تورکانە ((عەبای ژنێکی گەنجی گرتووە و بە خورتی رایدەکێشێ و ژنەکە هاوار دەکا و دەڵێ ئەی موسڵمانان فریام کەون، من ژنێك نیم هی ئەو کارە بم، کچی فلانە کەسم و ماڵمان لە فلانە گەڕەکە و هەموو نێمە دەناسن و ئەو تورکە دەیەوێ بە خورتی لەگەڵ خۆیم ببا و فەسادم بکات ... و دەگریا و هیچ کەس نەیدەتوانی دەهانای ئەو ژنە بچێ، چونکە ئەو فەرماندەیە سەرکەش و زۆردار بوو و پێنج هەزار سواری هەبوون و کەس نەیدەتوانی قسەی لەگەڵدا بکات.))[227] سەرەڕایی هەموو ئەمانەش، موعتەسەم لە عارەب و ئێرانییەکان زیاتر متمانەی بەو تورکانە کە خزم و کەسوکاری دایکی بوون، هەبوو و لەسەر هەقیش بوو. ئەو موعتەسەمە خۆی لەو باوەڕەدا بوو کە ((هیچ میللەتێك لە تورکەکان باشتر خزمەت ناکات)) و لەبەر ئەوە فەرماندە تورکەکان لە هەموو فەرماندەکانی تر زیاتر مایەی بایەخ و گرنگی پێدانی ئەو بوون و ئەو بایەخدانەی موعتەسەم بە فەرماندە تورکەکان، رکابەری و ناکۆکییەکی زۆری خستبووە نێو فەرماندەکانییەوە.

---

٢٢٤- مروج الذهب: ب٣، ل ٣٤٦.

٢٢٥- مروج الذهب، ب ٢، ل ٢٥٦..

٢٢٦- سیوطی، تاریخ الخلفاءِ، ل ٢٢٣.

٢٢٧- سیاستنامە، ص ٤٠- ٤٢، هەروەها تجارب الامم، ج ٥ ص١٩. تجارب السلف، ص ١٩٤.

## ڕکابەرایەتی فەرماندەکان

فەرماندەکانی تریش هەوڵیاندەدا گوێڕایەڵی خۆیان نیشان بدەن تا لەو ڕێگەیەوە زیاتر دڵی خەلیفە بۆ خۆیان ڕابکێشن. ئەو شەڕانەش کە لەسەردەمی موعتەسەمدا ڕوویاندا، بواریان بۆ ئەو فەرماندانە ڕەخساند کە توانا سەربازییەکانی خۆیان دەربخەن.

لە ماوەی ئەو بیست ساڵەی کە بابەك سەرکردایەتی ڕاپەڕینی کردبوو، شەش لە فەرماندە گەورەکانی بەغدا لە بەرامبەر ئەو شکستیان خواردبوو، بۆیە دەزگای خەلافەت لە شکاندن و تەفروتوناکردنی خوڕەمییەکاندا تا دەهات نائومێد تر دەبوو. بۆیە داگیرکردنی ئازەربایگان دەبووە شانازییەکی مەزن بۆ ئەو فەرماندەیەی ئەنجامی بدابایە. ئەو کەسەی بیتوانیبا بەسەر بابەك و خوڕەم دینانـدا سەرکەوێ بەسەر هەموو فەرماندەکانی تردا باڵادەست دەبوو.

لەبەر ئەوە بوو کاتێ شەڕکردن لەگەڵ بابەکیان وەك پێشنیاز خستە بەردەم ئەفشین، لە قبوڵکردنیدا هیچ دوودڵی نەکرد. هۆیەکی تریش هەبوو، ئەویش ئەو چاو تێبڕینەی دەستکەوت و دارایی بوو کە ئەفشین پێیوابوو لەو جەنگەدا وەدەستیان دێنێ. چونکە دەبێ هەمیشە ئەو خاڵە لەبەر چاو بگرین و بزانین کە لەو ڕۆژگارەدا فەرماندەکانیش وەك سەربازەکانی تر هەمیشە بۆ وەدەستهێنانی سامان و دارایی نەبووایە، شەڕیان نەدەکرد.

ئەوان شەڕکەرانێکی بەکرێگیراو بوون کە دڵڕەقی و ئازایەتی خۆیان لەگەڵ بەخشش و دەستکەوتەکاندا سەودا پێدەکرد. تیغ و بازووی خۆیان وەکو ئازادی و هۆشی خۆیان دەفرۆشتە دەسەڵاتداران و بۆ وەدەستهێنانی پارە و زێڕ دەستیان لە ڕشتنی خوێنی هیچ کەس تەنانەت خوێنی خۆشیان نەدەپاراست، ئەو دەستکەوت و ماڵ و داراییانەی کە لەو شەڕانە لە باروبنەی دوژمن و هەندێ جار لە خەڵکی لاشەڕ و بێ دەست و پێی شار و دێهاتەکانیان تاڵان دەکرد، بۆ ئەوان سەرچاوەیەکی گەورەی داهات بوو. بۆیە هەمیشە بەو پەڕی ئامادەیی و دڵفراوانییەوە پێشنیازی شەڕیان قبوڵ دەکرد. بۆ ئەفشین، کە وەکو هەموو فەرماندە بەکرێگیراوەکانی تری خەلیفە، خۆی بە خزمەتگوزاری گیان لەسەر دەست و پارێزەری دەسەڵات و گەورەیی دەزانی، هیچ شتێك لە قبوڵکردنی ئەو پێشنیار و مەئموریەتە ئاسانتر و خۆشتر نەبوو.

لەو جەنگەدا ئەو پارە و دەستکەوتێکی زۆری کە بۆ هێنانەدی خەونەکانی ئەو پێویست بوو، وەدەست دەهێنا و هەروەها بەسەر هەڤڕکەکانی تردا زاڵ و باڵادەست دەبوو، بەڵام

وەلانان و لە ناوبردنی بابەك كارێكی ئاسان نەبوو. لە ماوەی بیست ساڵدا دەسەلات و ئوتوریتە و كاریگەریی بابەك رەگ و ریشەی مكومی داكوتابوو. بۆیە، ئەفشین جگە لە بەكارهێنانی فێڵ و هەڵخەڵەتاندن چارەیەكی تری بەدی نەدەكرد.

## دەربارەی بابەك و ئەفشین

ئەو دۆستایەتی و دڵنەوازیانەی كە ئەفشین، هەندێ جار بە نهێنی بەرامبەر بابەك دینواند، هەڵخەڵەتاندن و فریودانێك بوو. دواتر، دوای لە نێوبردنی بابەك كاتێ ئەفشین خۆیشی كەوتە بەر نەفرەت و بێزاری خەلیفە و توركەكان و بووە نێچیری ژێردەستیان، هەوڵیاندا كە بە هاوكاریكردن و یارمەتیدانی بابەك تاوانباری بكەن. گوتیان كە ئەو بە نهێنی لەگەڵ بابەك و مازیار هاودەست بووە، ئەگەر ئەو تۆمەتە ڕاست بێت رەنگە بتوانین بڵێین كە ئەفشین ئەو دوانەی هان داوە ڕاپەڕن و دەست بە ئاژاوە و سەركەشی بكەن تا بە لە نێوبردنی ئەوان بۆ خۆی شانازی و شكۆیەك لە لایەن خەلیفەوە وەدەست بێنێ. بەهەرحاڵ ئەفشین بۆ لە نێوبردنی بابەك كاریگەرترین چەكی خۆی بەكارهێنا: چەكی دۆستایەتی و بەمتەرزە بابەكی كردە قوربانی پلەوپایە و چاوچنۆكییەكانی خۆی.

هەوڵەكانی بابەك لە بەرامبەر ئەفشیندا یەكەمجار سەركەوتوانە و ئومێد بەخش بوون. بابەك لە قەڵا و حەشارگە سروشتییە سەختەكاندا لەخۆبوردوانە رووبەڕووی دوژمنان دەبوودوە.

## بیزەنتییە یا بیزانس

جگە لەوە، نەك هەر لە قەڵەمڕەوی حكوومەتی عەبباسی، بەڵكو لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی ئیسلامیشدا دژی خەلیفە تێدەكۆشا. پەیڕەوكارەكانی لە بیزەنتییەشدا ئیمپراتۆریای ڕۆمی ڕۆژهەڵاتیان بۆ جەنگ دژی خەلیفە هان دەدا.

خوڕەمییەكان لە شارەكانی بیزەنتییە پەناگەی گونجاویان بۆ خۆ بەدی دەكرد. چونكە قەیسەرەكانی بیزەنتییە، دژی خەلیفەكان هەوڵیان دەدا لایەنگر و پەیڕەوكارەكانی بابەك بەهێز بكەن. ماوەیەك پێشتر مەئموون توانیبووی ئاژاوەیەك لە بیزەنتییەدا بنێتەوە.

ئەو، تۆماس ناوێكی خەڵكی (سەقەلیە)ی لە ئاسیای بچووك لە هەمبەر قەیسەردا ڕاست كردبۆوەوە و یارمەتیدا بوو و دژی (تیوفیل) كە قەیسەری بیزەنتییە بوو بەهێزی كردبوو.

قەیسەریش بۆ ئەوەی مامەڵەیەكی وەكو ئەو بكات وڵاتی خۆی كردبووە پەناگەی خوڕەمییەكان و یارمەتی دەدان. مەئموون كە لە ساڵی ( ٢١٨ك/٨٣٣ ز) بە مەبەستی شەڕكردن دژی ڕۆم كەوتبووە ڕێ لە (تەرسووس) كۆچی دوایی كرد، بەڵام جموجۆڵ و پیلانگێڕییەكانی كە لە دەوروبەر و سنوورەكانی ڕۆمدا هەبوون، هەروا بەردەوام بوون.

بە پێی قسەی تەبەری، كاتێك ئەفشین تینی بۆ بابەك هێنا و بابەك ڕەوشی خۆی دژوار بینی و لە لە نێوچوونی خۆی دڵنیا بووەوە، زانی كە ناتوانێ لەگەڵ موعتەسەمدا ڕێك كەوێ بۆیە نامەی بۆ [(تیۆفیل كوڕی میخائیل) مردووە لە (٢٢٣ ك/٨٣١ ز)] ی پادشای ڕۆم نووسی كە پادشای عارەبان هەموو جەنگاوەرەكانی خۆی لە شەڕ دژی مندا لە دەستداون و ئێستا وای لێهاتووە كە بە ناچاری بەرگدوورەكەی خۆی (جەعفەری كوڕی دینار) و چێشتلێنەرەكەی خۆی (ئیتاخ) بۆ شەڕی من ناردوون و ئێستا ئەو كەسێكی نەماوە شەڕی بۆ بكا و پاسەوانی لێبكا ئەگەر دەتەوێ دەتوانی هەڵبكوتیتە سەری و لە نێوی ببەیت.

قەیسەر بە سەدهەزار و بە قسەیەكی تر بە حەفتا هەزار سەربازەوە بە سەر وڵاتی ئیسلامیدا دا، كۆمەڵێك لە ئاڵا (سوور)ەكانیشی لەگەڵ بوون كە فەرماندەكەیان ناوی (بارسیس) بوو و ئیمپراتۆری ڕۆم لە نێو سوپای خۆیدا وەریگرتبوون و خەرجی دەكێشان. كاتێك گەیشتنە قەڵەمڕەوی وڵاتی ئیسلامی، شاری (زەیتەرە)یان تاڵانكرد و خەڵكێكی زۆریان كوشت و ژن و منداڵێكی زۆریان بە دیل گرتن و شارەكەیان سووتاند...[٢٢٨]

كاتێك كە ئەو ڕووداوە ڕوویدا، ئەفشین بابەكی گرتبوو. بەڵام تەنانەت دوای بەدیلگرتن و كوشتنی بابەكیش ئاڵا سوورەكان و خوڕەمدینان تەسلیمی موسڵمانان نەبوون. ئەوان لە قوستەنتەنییە و لە لای ئیمپراتۆرەكانی بیزەنتییە پیلان و نەخشەیان دژی خەلیفەی بەغدا دەكێشا.

ئەوەی لێرەدا مایەی سەرنجە و دەبێ لە بیرمان بێ، ئەو دەسەڵات و كاریگەرییەیە كە ئێرانییە ئاوارەكان لە پایتەختی ئیمپراتۆریای بیزەنتیە وەدەستیان هێنابوو. لە قسەی مێژوو نووسە ڕۆژئاواییەكانەوە دەردەكەوێ كە ژمارەیەك لە ئێرانییەكان لە قوستەنتەنییەدا دەژیان.

---

٢٢٨- تەبەری: ڕووداوی ساڵی ٢٢٣.

## تیۆفوبوس

سەرچاوەکان نووسیویانە کە شازادەیەکی ئێرانی لە تۆرەمەی ساسانییەکان لە هەژاری و دوورخراوەیی لە قستەنتەنییەدا کۆچی دوایی کرد و لە دوای خۆی کوڕێکی بە ناوی ((تیۆفوبوس))[229] بەجێهێشت. لە تەمەنی دوازدە ساڵیدا، ئاشکرابوو کە لە بنەماڵەی پادشایەتییە. ناوبراو چووە سەر ئایینی مەسیحی و لە بیزەنتییەدا چووە خزمەتکردن لە ریزی سوپا. توانا و ئامادەییەکانی ئەو بوونە مایەی پێشکەوتنی بەخێرایی. سەرئەنجام خوشکی قەیسەری خواست و کرایە فەرمانذەی سێ هەزار ئێرانی ئاوارە کە وەکو باوکی لە دەستی موسڵمانەکان ڕایان کردبوو.[230] ئاشکرایە کە ئێرانییەکان لە لای قەیسەرەکانی بیزەنتییە مایەی سەرنج و بایەخ پێدان بوونە. سەبارەت بە ئاکامی کاری ئەو شازادە ئێرانیە باسێکی سەرنجڕاکێشیان گێڕاوەتەوە. نووسیویانە کە ئەو سێ هەزار ئێرانییەی ئەو فەرماندە و سەرکردەیان بوو، کەسانێکی نەژاد پەرست بوون، بۆیە لە تیوفیل هەڵگەڕانەوە و (تیۆفۆبوس)یان وەکو پێشەوای خۆیان ناوزەد کرد، تیوفیل بە هێزی سەربازی ڕۆمی و یۆنانی شۆڕش و سەرهەڵدانی ئەوانی دامرکاندەوە و تیۆفۆبوس دەستگیرکرا. قەیسەری بیزەنتییە لە سەرەمەرگدا بوو. فەرمانیدا کە سەری تیۆفۆبوس ببڕن و بیخەنە نێو تەشتێك و بیبەنەلای ئەو. کاتێ چاوی بە سەری بڕاوی شازادە کەوت گوتی: تۆ ئیدی تیۆفۆبوس نیت و بەم زووانە منیش تیوفیل نابم.

## شەڕەکانی بابەك

بەڵێ شەڕ و نەبەردەکانی بابەك لەگەڵ ئەفشین لە پەناگە سەخت و سروشتییەکانی چیا سەرکەشەکانی ئازەربایگان ماوەیەکی زۆر درێژەیان کێشا. مێژوونووسان بە درێژی چۆنیەتی ئەو شەڕانەیان تۆمارکردووە.

ئەو شەڕانە بۆ ماوەی سێ ساڵ واتە (٢٢٠ تا ٢٢٣ ك / ٨٣٥ تا ٨٣٨ ز) بەردەوام بوون. وەك لە ناوەڕۆکی قسەی تەبەری دەردەکەوێ، موعتەسەم بۆ کۆتایی پێهێنانی ئەو ئەرکە، زۆر خەڵات و بەخششی دابووە ئەفشین. جگە لە هەرێمی ئازەربایگان و ئەرمەنستان کە پێی

---

٢٢٩- Theophobus.

٢٣٠- بگەڕێوە بۆ گیبوون، ب ٤.

دابوون، سوپا و پێداویستی و ئامرازەکانی جەنگ و چوارپێی زۆریشی بۆ ناردبوو. بەر لە بەرێکەوتنی ئەفشین، (محەمەدی کوڕی یوسف) یش ڕاسپێردرابوو بچێتە ئازەربایگان و ئەو قەڵا و پەناگانەی کە بابەك وێرانی کردبوون، سەر لەنوێ چاك بکاتەوە. محەمەدی کوڕی یوسف لەو مەئموورییەتەدا ڕووبەڕووی سوپای بابەك بووەوە و ژمارەیەکی لە خوڕەمدینان کوشتبوون و کۆمەڵێکیشی لێ بە دیل گرتبوون. بەڵام کاتێ کە ئەفشین گەیشتە ئازەربایگان هەوڵیدا جگە لە بەکارهێنانی شمشێر بۆ لە نێوبردنی بابەك، فێڵ و فریودانیش بخاتەکار.

بەمشێوەیە، ئەو شەڕانەی کە ئەفشین دژی بابەك ئەنجامی دان لە سەرەتادا بە فێڵ و تەڵەکە دەستیان پێکرد. ئەفشین تازە گەیشتبووە ئازەربایگان کە (محەمەدی کوڕی بەعیس) فەرماندەیکی تری خەلیفە کە پەیمانی ئاشتەوایی لەگەڵ خوڕەمییەکان بەستبوو، پەیمانی خۆی شکاند و فێڵ و خیانەتی لەگەڵ سوپای بابەك کرد. دەڵێن کاتێ ئەفشین هاتە ئازەربایگان، سوپاسالاری بابەك ناوی (عیسمەت) بوو، چووە پەناگەی شاهی کە (کە محەمەدی کوڕی بەعیس) کوتوالی ئەو قەڵایە بوو.[231] محەمەدی کوڕی بەعیس، وەك ئەرك بوو لەسەری، دەبوو ئالیکی بۆ چوارپێیەکانی لەشکری عیسمەت بناردبا، کە شەو داهات عیسمەتی لەگەڵ دە کەسی تر بۆ میوانداری بانگ کردە لای خۆی، شەو کاتێ کە مەست بوون، (محەمەدی کوڕی بەعیس) دە کەسەکەی کوشتن و ئینجا دەستی عیسمەتی بەستن و پێیگوت یەك یەك بانگی فەرماندەکانی سوپای خۆت بکە تا بێنە دەر، ئەگەرنا تۆ دەکوژم. عیسمەت وایکرد و یەك یەك ئەفسەرەکانی خۆی بۆ هاتنەدەر لە قەڵا بانگ دەکرد و محەمەد دەیکوشتن، کاتێ کە ئەوانی تر لەوە ئاگاداربوونەوە هەموویان هەڵاتن. دوای ئەفشین پاسەوانی لە سەر هەموو ڕێگاکان دانان و سەربازی لە هەموو دەربەند و قەڵاکان جێگیر کردن.

## جەنگ و فێڵ

بەڵام بابەك لە پەناگە قایەکاندا بێ ترس بوو، حەوت مانگان لەو شوێنە خۆی قایم کرد و نەهاتەدەر و نەکەوتە شەڕو پێکدادان لەگەڵ سوپای ئەفشین. ئەفشین دڵتەنگ و مەلول بوو. کەوتە هەوڵی چارە و فێڵێك. نامەی بۆ موعتەسەم نووسیبوو و داوای پێداویستی و پارەی

---

٢٣١- تەبەری، ڕووداوی ساڵی ٢٢٠ك.

لێکردبوو. موعتەسەم سەد وشتر باری دەرهەم لەگەڵ سێ سەد غولامی تورك، و بە هاوڕێی لەگەڵ ((بوغای گەورە))ی ناردنە لای ئەو.

کە بوغا گەیشتە ئەو جێیەی کە تا ئوردوگای ئەفشین سێ ڕۆژە ڕێ بوو، ئەفشین نامەی بۆ نارد کە مانگێگ لەوێ بمێنێتەوە و وای بلاوبکەوە کە ئەم کەلوپەل و پارە و پێداویستیانە فلانە ڕۆژ دەبەمە لای ئەفشین، تاکو جاسووسەکانی بابەك ئەو هەواڵە بۆ بابەك ببەنەوە، بەڵکو هەوڵبدات بە مەبەستی دەست بەسەردا گرتنی کەلوپەلەکان لە پەناگەکەی خۆی بێتەدەر. ئەوان ئەو پیلانەیان ئەنجامدا و ڕۆژی دیاریکراو بابەك بە پێنج هەزار سوارەوە لە پەناگە هاتە دەر، بەڵام بوغا بە فەرمانی ئەفشین پارەکانی بە شەو بۆ شوێنێکی تر بردبوون و وشترە بێ بارەکانی لای خۆی بوون. ئەو فێڵەی کە ئەفشین دایانابوو سەری نەگرت و بابەك بێ ئەوەی کێشەیەکی ئەوتۆی بۆ دروست ببێ، بڕێك دەستکەوتی وەدەستهێنا و بۆی دەرچوو ... لەوە بە دواوە چەندین شەڕ لە نێوان سوپای بابەك و ئەفشیندا ڕوویاندا کە هەر جارەی لایەکیان سەردەکەوتن.

سەربازەکانی بابەك کە پەناگای قایمیان هەبوو، بەرگەی بەفر و سەرمای سەختیان دەگرت و ئازایانە خۆیان رادەگرت، بەڵام هاوەڵانی ئەفشین کە لەو سەرما سەختە و ڕێ و بانە ناخۆشانە ڕانەهاتبوون، وردە وردە لە خۆیان بێزار و کەوەڕێ دەبوون. دوو ساڵ ئاوا تێپەڕی. زۆر لە سەربازەکانی ئەفشین لە نێو چوون، بەڵام موعتەسەم بەردەوام سەربازی تازە و کەلوپەل و پێداویستی بێ ئەندازەی بۆ دەنارد.

سەرئەنجام ئەفشین بڕیاری گرتنی پەناگەکەی بابەکی دا. کە لە نزیکی یەك فرسەنگی پەناگەکە دابەزی، بابەك بە خەروار خواردەمەنی و میوەی لە پەناگەکەی خۆی بۆ سەربازەکانی ئەفشین نارد و گوتی ئێوە میوانی ئێمەن. لەو دە ڕۆژەی کە بەرەو لای پەناگەکەی ئێمە بەڕێوە بوونە خواردەمەنیتان دەست نەکەوتووە، ئێمە لەوە زیاترمان لانییە. ئەفشین گوێی نەدایە ئەو شتانە و وەڵامی بۆ ناردەوە و پەیامی تازەی پێدا کە ((ئێمە پێویستمان بە خواردنی تۆ نییە و دەزانم تۆ ئەم کارەت بۆ ئەوە کردووە بزانی سەربازەکانی ئێمە ژمارەیان چەندە. لە نێو ئەم لەشکرەدا سی هەزار پیاوی شەڕکەر هەیە و لەگەڵ (ئەمیرولموئمنین – مەبەستی خەلیفەیە –) دەکەنە سێ سەد هەزار موسڵمان کە گشتیان لەگەڵ ئەودا یەکدڵن و تا یەکێکیان تیا مابێ بێ باکانە شەڕی تۆ دەکەن. ئێستا تۆ خۆت باشتر دەزانی، دەتەوێ داوای پەنادان و لێبوردن بکە و ئاشتەوێ خۆت بۆ شەڕ سازکە.))

بابەك هەڵبەتە نەیدەویست پەنادانی خەلیفە هەڵبژێرێ بۆیـە شـەڕی هەڵبـژارد، دەرکـە و دەروازەکانی قەڵا و پەناگەی خۆی قایم کردن و لـەوێ مایـەوە. ئەفـشینیش لـە دەورانـدەوری قەڵاکە لەشکرگای دروستکرد و خەندەقی لێدان و لـەوێ لێیدانیـشت. بـە ڕۆژ لـە نێـو قـەڵای بابەکدا دەنگی بانگ لێدان و هەرا و هوریای چەنگ و ڕوود بەرز دەبـووەوە و وایاندەنوانـد کـە باکیان بە سوپای دوژمن نییە، بەڵام شەوان دەستەیەك سەربازیان بۆ هەڵکوتانە سەر دوژمن لە قەڵا دەناردنە دەر. ئەو بارودۆخەش ماوەیەك درێـژەی کێـشا. سـوپای ئەفـشین وێـڕای کـەمی ئازوقە و ئالف و دژواری کار، باش خۆیان ڕاگرت، شـەڕی خوێنـاوی و کوشـت و کوشـتارێکی سەخت ڕوویدا و زۆر لە سەربازەکانی بابەك لە نێو چوون.

سەرئەنجام بابەك پەکی کەوت. مانەوە لە نێو پەناگا شتێکی بە شـتێك نـەکرد و لەشـکری ئەفشین لە دەوری پەناگاکە دوور نەدەکەوتەوە. بۆیە کەوتـە بـیری ئـەوەی فێڵێـك لـە ئەفـشین بکات. چووە سەربانی قەڵا و بە دەنگێکی بەرز گوتی: ئەوە منم بابەك، بـە ئەفـشین بڵـێن بـا نزیکتر بێتەوە و قسەیەکی لەگەڵدا بکەم. ئەفـشین هاتـە ژێـر دیوارەکـە. بابـەك داوای پـەنا و (زینهار)ی خواست و گوتی کوڕە گەورەکەم وەك بارمتە دەنێرم و بـا لای خـۆت بـێ و لـە لای خەلیفە داوای پەنادان و زینهارم بۆ بکە. لە سەر ئەوە ڕێککەوتن و سـەربازەکانی ئەفـشین لـە دەوری قەڵاکە کشانەوە و گەڕانەوە دواوە، کـە شـەو داهـات بابـەك کـەس و کارەکـانی خـۆی کۆکردنەوە و لەگەڵ پەنجا پیاو کە لەگەڵ ئەودا لە قەڵاکە مابوونەوە قەڵاکەیان بەجێهێڵا و ملی چیاکانیان گرتنە بەر و لەوێشەوە بەرەو ئەرمەنستان ڕۆیشتن.

## گرفتاربوونی بابەك

دەڵێن کـە بابـەك لـە قـەڵا دەرچـوو جلوبـەرگی ڕێبـواران و بازرگانـانی پۆشـی و لەگـەڵ هاوەڵەکانی خۆی، خۆیان گەیاندە جێیەك لە ئەرمەنستان. مەڕێکی لە شوانێك، کـە خـەریکی لەوەڕاندنی پەزەکانی بوو، کڕی. شـوانەکە دوای ئـەوە چـووە لای (سـەهل کـوڕی سـنبات)ی مردووە لە (٢٣٠ ك/٨٤٥ ز) ئەمیری ئەرمەنستان و هەواڵی لێدان. زانیان کـە بابـەك هاتۆتـە ئەو ناوچەیە. ئەفشین پێشتر نامەی بۆ هەموو فەرمانڕەوا و ئەمیرەکانی ئازەربایگان و ئـەران و بیلقان و ئەرمەنستان ناردبوو و ڕایسپاردبوون کە لە گرتنی بابەکدا یارمەتی بدەن.[٢٣٢]

---

٢٣٢- مروج الذهب، ب٢، ل٣٥١.

سەهل کوڕی سنبات کاتێ لە هاتنی بابەك بۆ ئەرمەنستان دڵنیا بـووەوە، یەکـسەر چـووە دیداری و بە ڕێز و شکۆوە لە سەرای خۆیدا میوانداری لێکرد و نامەشی بۆ ئەفـشین نـارد کـە بابەك لەلای منە. ئەفشین زۆر دڵگەرمی و تەماعی وەبەرناو بڕیاریان لەسەر ئەوەدا کە لەگـەڵ بابەك بۆ راوبێنە شوێنێك و لەوێ بابەك لەو شوێنەی کە دیارییان کردبوو ڕادەسـتی پیاوەکـانی ئەفشین بکەن.

وایانکرد و کاتێ کـە بابـەك زانـی سـەهل بـە خیانـەت رادەسـتی دوژمنـی دەکـات، بـە وروژاوییەوە پێیگوت: ((منت بە هەرزان فرۆشتە ئەو بەرازانە، ئەگەر پارە و زێڕت گەرەك بوو، من زۆر زیاتر لەوەی ئەوان پێیان دای، دەمدایتێ))[٢٣٣]

بەمشێوەیە، ئەفشین بە غەدر و فێڵ و تەڵەکە بابەکی گرت و کۆت و بەندی خستە دەست. قەڵا و پەناگای ئاڵا سووران وێران بوون و ئەوان خۆشیان کوژران و پـەرش و بـڵاو بـوون، بـەڵام خەبات و تێکۆشانی ئەوان کۆتایی نەهات و لە دوای بابەکیش هەروا بەردەوام بوو.

ئەفشین بابەك و کەسوکارەکانی ئەوی هەڵگرتن و بەرەو سـامەڕا کەوتنـە ڕێ. خۆشـحاڵی خەلیفە سەبارەت بەو سەرکەوتنە لە ڕادەبـەدەر بـوو. زۆر دڵنـەوایی ئەفـشینی کـرد و ڕێـز و پاداشتێکی زۆری پێبەخشی. کە ئەفشین بابەکی هێنایە سامەڕا، (ئەحمـەد کـوڕی دەواد)٢٤٠ ك/ ٨٥٤ ز مردووە) کـە قـازی قازییـەکانی بەغـدا و لـە نـاودارانی (موعتەزیلـە) بـوو، بـە نەناسراوی چووە ئەو جێیەی کە بابەکی لێبوو، بابەکی بینی و قسەی لەگەڵدا کرد. روونـە کـە ترس و دەستپاچەیی خەلیفە سەبارەت بە بابەك تا چ ڕادەیەك بوو، بە شێوەیەك کە تـا بـەیانی ئۆقرەی نەگرت و دواتر بە پەستی چووە بارەگای ئەفشین و ئەویش بە شەو بابەکی بینی.

دەتگوت بەغدا نایەوێ باوەڕ بکا قارەمانێکی دلێر کە ساڵەهای ساڵ هەڕەشـەی لێـدەکرد، ئێستا لەوێدا لە نێو داو و لە یەخسیریدا بەسەر دەبات...

## ئاکامی بابەك

ڕۆژی دواتر موعتەسەم دانیشت و خەڵك لە دەروازەی (گشتی) تا (مەتیرە) ریزیان بەست. موعتەسەم دەیویست خەڵکی، بابەك بە ریسوایی و پەستی ببینن. لە پیاوەکانی خۆی پرسـی، لە سەرچی دابنرێ باشە؟ گوتیان هیچ شتێك لە فیـل باشـتر نییـە. فـەرمانی دا فیلێـك بێـنن و

---

٢٣٣- تەبەری، ڕووداوەکانی ساڵی ٢٢٢.

جلوبەرگێکی زۆر جوانیان کردە بەر بابەك و کڵاوێکی پێستی سمۆرەیان لە سەرنا و لەگەڵ خەڵکێکی زۆر بردیانە (دارولعامە)ی بارەگای (ئەمیرولمونمنین). موعتەسەم داوای سەربڕی کرد کە دەست و پێکانی ببڕێ. فەرمانی دا جەللاد کە ناوی (نود نود) بوو بێنن، ناوبراو لە دەرگای گشتی هاتە ژوور و خەلیفە بانگی کرد، کاتێ کە هاتە لای خەلیفە، خەلیفە فەرمانی پێدا کە هەردوو دەستەکانی بابەك ببڕێ. ئەو خوێنساردی و بێ باکیە ئازایانەیەی کە بابەك لە بەرامبەر مەرگدا نیشانی دا شایستەی قارەمانان بوو.

دەڵێن کاتێ بابەك هاتە لای موعتەسەم، براکەشی لەوێ بوو. براکەی پێیگوت: ((ئەی بابەك، کارێکت کرد کە کەس نەیکردووە ئێستاش خۆڕاگرییەك بکە کە کەسی دی نەیکردبێ))[٢٣٤] بابەك گوتی بە چاوی خۆت دەبینی کە چۆن خۆڕاگرییەك دەکەم.

سەرچاوەکان نووسیویانە کاتێ ((کە دەستێکیان بڕی، دەستەکەی تری لە خوێن هەڵسوی و هەموو دەم و چاوی خۆی بە خوێن سوور کرد، موعتەسەم گوتی ... ئەمە چ کارێکە دەیکەی؟ گوتی حیکمەتێك لەم کارەی مندا هەیە، کە تۆ هەردوو دەست و پێی من دەبڕی خوێن لە لەشمدا نامێنێ. کەسێك خوێن لە لەشیدا نەمێنێ رەنگی زەرد هەڵدەگەڕێ، من بۆیە رووی خۆم بە خوێن سوور دەکەم کەوا نەزانن من لە ترسان زەرد هەڵگەڕوام))[٢٣٥]. بەڵێ بابەك ئاوا پێشوازی لە مەرگ کرد و هیچ قسەیەکی نەکرد و دەمی هەڵنەبڕی. موعتەسەم فەرمانی دا کە لە لای رۆژهەڵاتی بەغدا لە نێوان دوو پرد دا بە دارییەوە هەڵواسن. سەرئەنجام بابەك ئاوای لێکرا. بەڵام با بزانین داخۆ ئەفشین کێ بوو، و ئاکامی چی لێهات.

## ئەفشین

هەوڵدراوە ئەفشین لە ریزی قارەمانانی نەتەوەیی ئێران نیشان بدرێ. بە بایەخ و پێدا هەڵدان باس لەو بزاڤ و پیلانگێڕیانەی کراوە کە دژی دەزگای خەلافەت ئەنجامی دان. ئەو خیانەت و چەپەڵکارییە ئاشکرایەی کە دەرهەق بە بابەك و مازیار کردوویەتی، بە کارێکی بەرژەوەندیخوازانە دراوەتە قەڵەم، ئەمانە شتگەلێکن جێی گومان. ئەفشین وەك چۆن لە مێژووی ژیانی ئەودا دەردەکەوێ، شازادەیەکی دەسەڵاتخواز بووە و جگە لە کۆکردنەوەی پارە و سامان بۆ

---

٢٣٤- شد رات المذهب، ب٢، ل٥١.

٢٣٥- سیاستنامە، ل١٧٦.

وەدەستهێنانی دەسەڵات، خەمێکی تری نەبووە، دەیویست بگاتە فەرمانڕەوایەتی خوراسـان و بـۆ ئەو کارە تەنانەت باوك و برای خۆشی کردنە قوربانی. هەوڵی دەدا پارە و دارایی کۆبکاتەوە و بـۆ ئەو مەبەستە، خیانەتی لە لەشکرییەکانی خۆی و تەنانەت لە هاوڕێ نزیکەکانی خۆیشی دەکـرد. بۆ ئەوەی بە ئارەزووە شیرینەکانی خۆی بگـات بـاکی بـە فیـداکردنی ویـژدانی خۆیـشی نـەبوو. عارەبەکانی بە دوژمن دەزانی و قەت لە ناخەوە ئایین و ڕێبـازی ئـەوانی قبـوڵ نـەکردبوو، بـەڵام دەسەڵاتخوازی و ماڵپەرستی ناچاری کردبوو ببێتە خزمەتکاری خەلیفـەی عارەبـان. دەرهـەق بـە ئایینی دێرینی خۆی وەفـادار مـابووەوە، بـەڵام لـە پێنـاو پلەوپایـە و مـاڵ و دارایـی بـە نـاوی موسڵمانەتی، هاودینان و هاونەژادەکانی خۆی دەکردنە پارووی چەوری دوژمنان. عارەبـەکانی بـە بوونەوەری سووك دەزانین، بەڵام وەك خۆی دەیگوت هەموو کارێکی دەکرد لە پێناویاندا، تەنانەت لەبەر خاتری ئەوان چەوری دونگی پەزی دەخوارد و سواری وشتر دەبوو و دەمپێی دەکردنـە پێـی* دوژمـنایەتی کردنی لەگەڵ بنەماڵەی (تاهیر) لەبەر ئەوە بوو کە چاوی بڕیبووە خوراسان و بـەخیلی بە فەرمانڕەوایانی ئەوێ دەبرد. دۆستایەتیکردنی لەگەڵ مازیار پلانێك بوو دژی بنەماڵـەی تـاهیر و سـەرئەنجام بـە فـێڵ، مازیاریـشی کـردە قوربـانی ئـەو دۆسـتایەتیکردنە. ئـەو چـالاکی و پیلانگێڕیانەی کە دژی خەلیفەی ئەنجام دەدان زیاتر لە ئـەنجامی تـرس و دڵـەڕاوکێوە بـوون. لـە خەبات و هەوڵدانەکانی خۆیدا قەت بیری لـە ئێرانییـەکان و ئـایین و فەرهـەنگی زەردەشـتییەکان نەدەکردەوە و لە خەمیاندا نـەبوو. بـە وردبوونـەوە لـە مێـژوو، زۆر بەڵگـە و بـەرژەنگی گـرنگ سەبارەت بەو ڕاستییە بەدی دەکرێن.

## ئەشروسنە

پارێزگای ئەشروسنە، کە باوباپیرانی ئەفشین پشتاوپشت فەرمانڕەواتیان تیا کردووە، لـەو دیـو ڕووبار لە نێوان سـیحون و سـەمەرقەندا هەڵکـەوتبوو. لـە ڕۆژهەڵاتـەوە بـە فرغانـە و لـە لای ڕۆژئاواشەوە دەگەیـشتەوە سـەمەرقەند. لـە باکووریـەوە چـاچ و بەشـێك لـە فرغانـە و لـە لای باشووریشەوە کش و چغانیان هەڵکەوتبوون. ئـەم هەرێمـە بـەهۆی زۆری ئـاو و هـەبوونی کـانزا، ئاوەدان و بەهێز بوو. دەڵێن چوارسەد قەڵای تیابوو. [(یەعقوبی) مردووە لـە (٢٩٢ ك/٩٠٥ ز)]

* ئەم سێ کردەوەیە واتە خواردنی چەوری دونگی مەڕ، سواربوونی وشتر و کردنە پێی دەمپایە لەوان ڕۆژگاران لای ئێرانییەکان زۆر بە سووکی سەیر دەکرا. و.ك.

نووسیویه که دوای داگیرکردنی ولاّتی ڕۆژهەلاّت، عارەبە (مەزەری) و (یەمانی)یەکان لە هەموو ولاّتی خوراساندا جێگیربوون جگە لە هەرێمی ئەشروسنە کە لەوێ خەلّك لێنەدەگەڕان عارەب نزیکیان ببنەوە. جگە لەو ناوە بە شاری گەورەی ئەشروسنە دەگوترا (بەلسان)، لە شارەکانی تری ئەم هەرێمە دەتوانین ناوی (بنجیکت) و (سامات) و (رامین) و (دارك) و (خەرقانە) ببەین. فەرمانڕەواکانی ئەو هەرێمە کە نازناوی گشتیان ئەفشین بوو، بارەگایان لە شاری (بنجکیت) بوو. وەك دیارە ئایینەکەیان (سمنی) یا (مانەوی) بوو. (سمنی)یەکان پێدەچێ لەسەر ئایینی بوودا بووبن[٢٣٦] و وەکو عارەبەکانی (جاهلی) ئەو وێنانەیان دەپەرست کە دروستیان دەکردن، کە نوێژیان دەکرد رووی خۆیان دەکردە بتەکانی خۆیان. پیاوە ژیر و هۆشمەندەکانیان لە عیبادەت و نیایشدا نیگەرانی پەروەردگار بوون و ئەو وێنە و بتانەیان بە خوا دەزانین و دەیانگوت پەرەستنی بتەکان هۆکاری نزیك بوونەوەیە لە خواوەند ...[٢٣٧] ئایینی مانیش لەو هەرێمەدا بلاّو ببووەوە، بەلاّم بەهەرحالّ بەلّگەکان نیشان دەدەن کە شازادەکانی ئەشروسنە، وەکو بەرمەکییەکانی بەلّخ، لەسەر ئایینی بوودا بووینە. ئەو بتانەی کە لە مالّی ئەفشین دۆزرانەوە تارادەیەك ئەوە دەردەخەن کە ئەو لە سەر ئایینی بت پەرستی بووە و بەلّگە و بەرژەنگگەلێکی تریش کەلە مێژووچکەی ژیانی ئەفشیندا ئاماژەی پێدەکرێ، ئەو قسەیەی سەردوە پشت ڕاست دەکەنەوە.

بەلّێ ئەشروسنە، ولاّتی ئەفشینەکان تا کۆتایی خەلافەتی (بەنی ئومەییسە) لە دەستدرێژییەکانی عارەب و موسلّمانان پارێزراو بوو. بە پێی قسەی [(بلازەری) مردووە لە (٢٧٩ ك/٨٩٢ ز)] لە سەردەمی [(مەروان کوڕی محەمەد) مردووە لە (١٣٢ ك/٧٥٠ ز)]ی دوایین خەلیفەی ئەمەویدا، والی خوراسان کە ناوی [ (نەسر کوڕی سەییار) مردووە لە (١٣١ ك/٧٥٠ ز)] بوو بەسەر ئەشروسنەیدا دا، بەلاّم نەیتوانی شتێك بە شتێك بکات.[٢٣٨] خەلیفەکانی (بەنی عەبباس)یش تا سەردەمی مەئموون نەیانتوانی دەست بەسەر ئەوێدا بگرن.

---

٢٣٦- التنبیه و الاشراف، ل ١٣٨.

٢٣٧- مروج الذهب، ب١، ل٨٢ . سومنیه هەمان شەمەنەکانن، جۆرێکن لە بت پەرستەکان، مەزهەبێکی هیندییەکان بووە باوەڕیان بە دۆنایدۆن بووە، لە نێو گەلان و تایفەکانی ئاکنجی لە تورکستان و چیندا، لایەنگریان هەبووە. لە بارەی باوەڕی ئەوانە بگەڕێوە بۆ مفاتح العلوم خورازمی ل٢٥ و الفهرست بۆ باسکردن لە داب و رسومیان بگەڕێوە بۆ وتاری Shamanism لە کتێبی Forgotten Religions .

٢٣٨- فتوح البلدان، ل ٤١٨.

کاتێ کە مەئموون بووە خەلیفە لە سند خەریکی غەزووکردن بوو. ئەفشینی ئەشروسنەش کە، ناوی (کاووس) بوو نامەی بۆ (فەزل کوڕی سەهل زولریاسەتەین)ی وەزیر و کاتبی مەئموون نارد داوای ئاشتەوایی لێکرد و ئامادەبوو پارە بدا تا موسڵمانان بە سەر وڵاتی ئەودا نەدەن. ئەو پێشنیازەی ئەو قبولکرا، بەڵام کاتێ مەئموون خوراسانی جێهێڵا و بەرە و بەغدا گەڕایەوە، (کاووس)یش پەشیمان بووەوە و ئەو پارەیەی کە لە بەرامبەر ئاشتیشدا قبوڵی کردبوو، نەیدا.

یەکێك لە خزمەکانی کاووس کە خەزێنەدار و وەزیریشی بوو و ناوی (تەرادیس) بوو، کچی خۆی دابووە [(فەزل) مردووە لە (٢٠٢ ك/٨١٨ ز)] یەکێك لە کوڕەکانی کاووس و بە هۆی ئەو نفووز و کاریگەرییەی کە لای فەرمانڕەوای ئەشروسنە هەیبوو، هەمیشە پەسنی فەزلی دەکرد و پێیهەڵدەدا و لە (خیدر)ی کوڕەکەی تری کاووس کە بە ئەفشین بەناوبانگ بوو، بەرزتر و لێهاتووتری دادەنا و هەوڵی دەدا خیدر بشکێنێ و زەمی بکات و لەبەر چاوی باوکی بە هیچ و بێ کەڵك نیشانی بدات. ماوەیەك دواتر، خیدر کە لەو دوو ڕوویی و بەدزمانییەی تەرادیس بێزار ببوو، تەرادیسی کوشت و هەڵات بۆ لای (هاشم کوڕی محورە ئەلخەتلی) و داوای لێکرد کە نامەیەك بۆ کاووسی باوکی بنێرێ و داوای لێخۆشبوونی بۆ بکات. کاووسیش دوای کوژرانی تەرادیس، ژنێکی بەناوی (جیند)ی هێنابوو و رایکردبووە لای یەکێ لە (دێهگان)ەکانی خۆی.

کە خیدر کوڕی کاووس لە ڕەوشی نالەبار و شێواوی ئەشروسنە ئاگادار بووەوە، کەوتە کەلکەڵەی ئەوەی کە بە فێڵ و خیانەت، فەرمانڕەوایی ئەوێ کە لەدەست فەزلی برایدا بوو، بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. لە پێناوی ئەوەدا چووە سەر ئایینی ئیسلام و ڕۆیشتە بەغدا. لەوێ لە تەماعی حکوومەت و دەسەڵات خۆی تەسلیمی خیانەت کرد. لەوێ لە بەغدا چووە لای مەئموون و مەئموونی بۆ داگیرکردنی ئەشروسنە هاندا. بەمشێوەیە سەرزەمینی باو و باپیران و تەنانەت باوك و برای خۆیشی لە تەماعی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی بە دوژمنان فرۆشت. خیدر نیشانی مەئموونی دا کە گرتنی ئەشروسنە بە ئاسانی دەکرێ و ئەوەی کە خەڵکی تر لای خەلیفە بە مەترسیدار و سەخت نیشانیان دابوو، ئەو بە ئاسان و زۆر سادە خستییەڕوو. تەنانەت نزیکترین و کورترین ڕێگەی کە دەچێتە ئەشروسنە نیشانی خەلیفە دا و ئەو تاوانانەی کە لە پێناو پلەوپایە و پارە ئەنجامی دان، لە خیانەتکردن بە نیشتیمان و بنەماڵەی خۆیەوە دەستی پێکرد.

مەئموون، (ئەحمەد کوڕی ئەبو خالید ئەهوەل)ی بە لەشکرێکی زۆرەوە بۆ غەزووکردنی ئەشروسنە وەڕێخست. کە کاووس لە هاتنی لەشکری عارەب ئاگاداربووەوە، فەزلی کوڕی خۆی ڕەوانەی لای تورکەکان کرد، بۆ پشتگیریی لە پەلاماری عارەبان داوای یارمەتی لێکردن، بەڵام

فەرماندەی عارەبەکان بەر لەوەی فەزل ئەو هێزەی تورکان بۆ یارمەتی ئەوان دەهاتن بگەیەنێ، خۆی گەیاندە دەروازەی ئەشروسنە.

کاووسی فەرمانڕەوای ئەشروسنە پێیوابوو عارەبەکان ئەو ڕێگایە نزیکە کە بە بیاباندا ڕەت دەبێ پێنازانن و بە ڕێگای دوور و درێژ ماوەیەکی پێدەچێ تا ئەوان بتوانن بگەنە ئەشروسنە، بەڵام عارەبەکان بە چاوساغی خیدری کوڕی کاووس بە نزیکترین و کورتترین ڕێگادا کە کاووس بیری لێنەدەکردەوە بە سەریان دادا. کاووس کە بەو شێوەیە لە ناکاو کەوتە بەردەستیان بە ناچاری ئیسلامی قبوڵ کرد و گوێڕایەڵی خۆی نیشان دا. کاتێ کە فەزل لەوە ئاگادار بووەوە تورکەکانی لە بیابان جێهێڵا و خۆی هاتەوە لای باوکی و لەگەڵ ئەودا بووە ئیسلام و زینهاری بەست، تورکەکانیش لە تینوێتیان لە بیابان لە نێو چوون...

## لە خزمەتی خەلیفەدا

ئینجا کاووس چووە بەغدا لای مەئموون و ئیسلامبوونی خۆی ڕاگەیاند. مەئموون کردییەوە فەرمانڕەوای وڵاتەکەی، دوای ئەویش خیدری کوڕی لە جێی ئەو دانا.[٢٣٩]

بەم چەشنە ئەفشین خیدری کوڕی کاووس کە باوك و برا و زێد و نیشتیمانی خۆی فرۆشتبووە عارەبان، لەوە بە دواوە هەوڵی دا لە دەزگای خەلافەتدا دەسەڵات و نفووزێك وەدەست بێنێ. ئەو نفووز و دەسەڵاتەشی بۆ ئەوە دەویست کە لە لایەن خەلیفەوە فەرمانڕەوایەتی خوراسان و ئەودیو ڕووباری بدرێتێ. بۆ ئەو کارە، پێویست بوو لە هیچ خزمەتێك بۆ دەزگای خەلافەت درێغی نەکات. بۆیە هەوڵیدا لە دوژمنایەتیکردنی ئێرانییەکاندا پێشبڕکێ لەگەڵ فەرماندە عارەب و تورکەکان بکات. لەو کارەشدا تاڕادەیەکی زۆر سەرکەوت، بەڵام ئەو سەرکەوتنە بۆ ئەو بە بڕی ئەو خیانەتە گەورانە بوو کە ئەنجامی دەدان.

ئەفشین هەوڵی دا خزمەتکردن بە دەزگای خەلافەت بکاتە ئامرازێك بۆ کۆکردنەوەی پارە و گەیشتن بە دەسەڵات و توانایی. بۆیە وەکو فەرماندەکانی تری ئیسلام شان بە شانی خەلیفە کەوتە غەزووکردن و داگیرکاری. ماوەیەك لە میسر بۆ مەئموون شەڕی کرد[٢٤٠]، لە غەزووی ڕۆمیشدا خزمەتی زۆری بە خەلیفە کرد. لە تەواوی ئەو خزمەتکردنانەدا ئامانجی ئەوەبوو کە

---

٢٣٩- بلاذری، فتوح البلدان، ل٤١٩.

٢٤٠- تاريخ يعقوبی، ج٣، ل١٩٢.

سەرنج و ڕێزی خەلیفە بۆ لای خۆی ڕاکێشێ و خۆی لە سەردار و فەرماندەکانی تری ئەو شایستەتر و لەبارتر بناسێنێ، دەیویست بە سەرنجڕاکێشانی خەلیفە بگاتە ئارەزووە دێرینەکانی خۆی کە گەیشتن بوو بە فەرمانڕەوایەتی خوراسان، بەڵام (تاهیرییەکان) لە خوراساندا باڵادەست بوون و بەدیهێنانی ئەو خەونە، کارێکی ئاسان نەبوو...

## ڕەوشی خوراسان

خوراسان و سیستان لە دەستی (تاهیرییەکان) بوون. ئەو بنەماڵە ئێرانییەش لە پێناوی پارە و پلەوپایە چووبوونە ریزی خزمەتکارانی خەلیفە. بەڵام بە شانازی نواندن بە نەژادی ئێرانی خۆیان، هەوڵیان دەدا خەڵکی خوراسان بۆ لای خۆیان ڕابکێشن. بانگەشەی سەربەخۆبوونیان دەکرد، بەڵام ئەو سەربەخۆبوونەی کە ئەوان دەیانویست سەربەخۆیی فەرمانڕەوایی بنەماڵەیی بوو. دەیانویست حکوومەتی خوراسان بە شێوەیەکی جێماوەیی بۆ بنەماڵەی ئەوان بێت و بۆ ئەو کارە لە ئەنجامدانی هیچ شتێك نەدەپرینگانەوە. هەم شانازیان بە نەژادی ئێرانی خۆیان دەکرد و هەم بەرامبەر کلتوور و شارستانیەتی ئێرانی کەمتەرخەم بوون، هەم خۆیان بە ئێرانی دەزانی و هەم دژایەتی ئەو ڕاپەڕین و سەرهەڵدانە ئێرانیانەیان دەکرد کە پێیانوابوو هەڕەشەن بۆ سەر سەربەخۆیی ئەوان.

ماوەیەکی زۆر لە سیستان تاهیرییەکان لەگەڵ (خەواریج) ناچاربوون شەڕ بکەن. خوراسانیش چەندین ساڵ لە ڕۆژگاری حوکمڕانیەتی ئەواندا گیرۆدەی ئاژاوە و فیتنەی خەواریج بوو. خەواریج ماوەیەکی زۆر بوو کە لە سیستان و خوراساندا ڕاپەڕیبوون، بەڵام ستەم و زۆرداری کاربەدەستانی تاهیرییەکان ئەوانی زیاتر هان دەدا. لە سەروبەندی دەرکەوتنی بابەکدا، (عەبدوڵڵا کوڕی تاهر) (٢٣٥ ك/ ٨٤٩ ز) کە لە لایەن مەئموونەوە کرابووە فەرمانڕەوای خوراسان لە (دینەوەر) بوو و سوپا و سەربازی بۆ شەڕ دژی بابەکی خوڕەمدین ڕەوانە دەکرد. (محەمەد کوڕی حەمید تاهیری) کە لە لایەن عەبدوڵڵاوە لە نیشاپوور بوو ((زۆر زوڵمی دەکرد، لە خۆڕا هەندێك خەڵکی دەگرت و لە سەرای خۆی بەندی دەکردن)) ئەو زوڵم و زۆرداریانە بوونە هۆی ئەوەی کە (خەواریج) پەلاماری گوندێکی نیشاپووریان دا و خەڵکێکی زۆریان کوشت. عەبدوڵڵا تاهیر ((خوراسانی لە خەواریج

پاك كردەوە و زۆری لیّ كوشتن))[241] بەلاّم ئەو خویّنرِشتن و پیاوكوژیانە خوراسان و سیستانیان شپرزە و ویّران كردبوو.

هەر رِۆژە و لە گۆشەیەكی ولاّت خەلّكی ستەملیّكراو رِادەپەرِین.[242] دارودەستە و پیاوەكانی تاهیرییەكانیش بۆ سەركوتكردن و تیّكشكاندنیان هەندیّ جار ئەو پەرِی زەبر و زەنگیان بەكاردەهیّنا و چیّ نارِەوا بوو دەرهەق بە خەلّك ئەنجامیان دەدا. ئەو قات و قرِی و مەرگ و میرە سەختەیش كە لە سالّی ٢٢٠ك/٨٣٥ ز بە هۆی وشكبوونی رِووباری (هیرمەند)، بۆست و سیستانی گرتبووەوە، ببووە مایەی پەرەسەندنی ئەو نارِەزایەتییانە. هەلّسوكەوت و رەفتاری كاربەدەستانی تاهیرییەكان لە بەرامبەر خەلّكی خوراسان ئەوەندە زالّمانە و نەفرەت ئەنگیّز بوو كە فەرمانداری خوراسان ناچاربوو نامەیەك ئاراستەی هەموویان بكات كە ((بەم نامەیە دەمەویّ لە خەو هەلّتانسیّنم و چاوتان بكەنەوە و بیر لە بەرژەوەندی خۆتان بكەنەوە و لەگەلّ سەران و گەورە پیاوانی ولاّت نەرمی بنویّنن و پەرە بە كشتوكالّ بدەن كە ئیّستا لاواز بووە و بیگەرِیّننەوە سەر حالّەتی خۆی چونكە خوای گەورە ئیّمە بە هۆی ئەو خەلّكەوە دەژیینیّ و لە زمانی ئەوانەوە درودی ناردووە و ستەم و بیّدادی دەرهەق بەوان حەرام كردووە))[243].

ئەو نامەیە ئەوە نیشان دەدات كە كاربەدەستانی تاهیرییەكان چۆن خەلّكیان دۆشیوە. خەلّكی ستەملیّكراویش كە گیرۆدەی خواست و ئارەزووی ستەمكاران دەبوون جگە لە سەرهەلّدان و سەركەشیكردن چارەیەكی تریان بەدی نەدەكرد. فەرماندە و حوكمرِانەكانیش بۆ دامركاندنەوەی ئەو سەرهەلّدان و رِاپەرِینانە، ئەو پەرِی توندی هۆڤیگەریان بەكارهیّنا و لە هەمانكاتدا هەندیّ جار دوایین چەكی خۆیان بەكاردەهیّنا و بە شیّوەیەكی كاتی بەرپرسەكانی خۆیان ئاوا بە نامەیەك وەك عەبدوللاّ تاهیر دەنووسیّ ((لە خەو هەستن و چاو بكەنەوە)) ئاگادار دەكردەوە. بەلاّم ئەو كاربەدەست و بەر پرسە چاوچنۆك و ستەمكارانە هەرگیز نەیاندەتوانی چاو لەو داهاتە زۆر و زەبەندە بپۆشن كە بەشیّكیشیان لیّ دەدایە فەرمانداری ولاّت.

لەگەلّ ئەو هەموو پشیّوی و بیّ سەروبەریەش، خوراسان بۆ بنەمالّەی تاهیرییەكان پیّگەی حكومەتیّكی بەهیّز و سەرچاوەیەكی زۆر باشی داهات بوو. بۆیە ئەفشین چاوی تەماعی

---

٢٤١- گردیزی، ل٢.

٢٤٢- تاریخ سیستان، ل١٨٥ — ١٨٩.

٢٤٣- گرد یزدی، ل٤.

تێبرپیبوو. لەوانەیە ئەو وا بیری کردبێتەوە کـە ئەگـەر خوراسـانی کەوتـە دەسـت حکوومـەتێکی فراوانو بەهێز لە هەرێمی خۆی دابمەزرێنێ. بۆیە لە پێناوی گەیشتن بەو ئامانجە بێ باکانە هـەموو هەوڵێکی دەدا.

## رکابەرایەتیکردن دژی تاهیرییەکان
## فەرمانڕەواییان لە ساڵی (٢٠٥-٢٥٩ ك/٨١٩-٨٧١ ز)

کاتێ کە ئەو لە ئازەربایگاندا خەریکی شەڕ بوو دژی بابەك، ڕووداوێك روویـدا کـە نـاکۆکیی ژێربەژێری ئەفشین و عەبدوڵڵای تاهیری گۆڕی بۆ دوژمنایەتییەکی ئاشکرا، دەنووسن ئەفشین ئـەو دەستکەوت و دیاریانەی کە لە ئازەربایگان ئەرمەنستاندا دەستی دەکەوتن رەوانـەی ئەشروسـنەی دەکردنەوە. بە ناچاری ئەو دیاری و دەستکەوتانە بەخوراساندا و بە قەڵەمڕەوی عەبـدوڵڵا تـاهیردا تێدەپەڕین و فەرمانڕەوای خوراسان لێیان ئاگادار دەبـوودەوە. عەبـدوڵڵا تـاهیر ئـەو هەواڵـەی بـە موعتەسـەم راگەیانـد. موعتەسـەمیش فـەرمانی دا کـە عەبـدوڵڵا روونووسـێك لـەو دیـاری و دەسەتکەوتانەی کە ئەفشین بۆ ئەشروسنەیان دەنێرێتەوە، وەك بەڵگە وەدەست بێنێ.

ئەفشین هەرچی کەلوپەل و شـتومەکێکی لـە ئازەربایگـان و ئەرمەنـستاندا وەدەسـتدەکەوت دەیکردنە نێو کیسە و هەگبەوە و بە هۆی خزم و پیاوەکانی خۆیەوە دەیناردنەوە بۆ زێدی خـۆی. هەر یەك لەو کەسانەی کە بۆ ئەو کارەی دادەنان کیسەی پڕاوپـڕ لـە زێـڕ و زیـوی تـا دەیتـوانی هەڵیانبگرێ شانی دەدایە بەر و هەڵیدەگرت و بەرێی خوراساندا دەیبردەوە بـۆ ئەشروسـنە. کاتـێ کە ئەو کاروانانەی زێڕ و گەوهەر، بەرەو ئەشروسنە بە نێو نیـشاپووردا رەت دەبـوون، عەبـدوڵڵا تاهیر فەرمانی دا کە کاروانچییەکان بگرن و ئەو پارە و داراییانەی کە لە نێو کیسە و هەگبـەکان پێیان بوو، لێیانبستێنن. ئینجا لێیپرسین کە ئەو شتانەتان لە کوێ هێناوە؟ گوتیان ئەم شـتومەك و دەستکەوت و دیاریانە هی ئەفشینن. عەبدوڵڵا تاهیر گـوتی ئێـوە درۆ دەکـەن ئەگـەر ئەفـشین بیویستبا ئەو شتانە بۆ شوێنێك بنێرێ نامەی بۆ من دەنووسی کە بۆ بەرێکردنتان ئاگادارتـان بم، بەڵام ئێوە دزن و ئەو هەموو پارەیەتان دزیوە.

بەمجەشنە عەبدوڵڵا ئەو پـارە و کەلوپەلانـەی ئەفـشینی لـە پیاوەکـانی ئـەو سـتاندنو بـە سەربازەکانی خۆی دان. دوای ئەوە نامەی بۆ ئەفشین نووسی کە ئەمانە ئەو قسەیە دەکەن، بـەڵام من باوەڕم پێنەکردن و پێموانییە کە تۆ ئەو هەموو شـتە بـۆ ئەشروسـنە بنێرییـەوە و ئاگـاداری منیش نەکەیتەوە کە بۆ وەرێکردنیان یارمەتیتان بدەم. ئێستا من ئەو پارە و کەلوپەلانەم بە سەر

سەربازەکانی خۆمدا دابەش کردوون، ئەگەر هی تۆ نەبن ئەوا بۆ سەرباز و پیاوەکانی خەلیفە باشن و ئەگەر هی تۆشن ئەوا من هەرچی داومەتە سەربازەکان بەهاکەی چەندە بۆ تۆی دەگەڕێنمەوە.

ئەو ڕووداوە ساردی نێوان ئەفشین و عەبدوڵلا تاهیری بەهێزتر کرد و ئەو دوو دژبەرە بەهێزە بۆ لە نێوبردنی یەکتر دەستیان بە خەبات کرد. گیرانی بابەك بە دەستی ئەفشین پێگەی ئەفشینی لای خەلیفە بەهێز کردو بووە هۆی بایەخپێدانی خەلیفە. بە شێوەیەك کە پیاوە نزیکەکانی خۆی لە سامەڕاوە بۆ پێشوازیکردنی ئەو ناردن و زۆر ڕێزی لێنا و خەلات و ئیکرامی زۆری پێبەخشی. دەڵێن تاجێکی زێڕینی چنراوی بە زومسڕودی سەوز و یاقووتی سوور بە دوو کەمەربەندی گرانبەهاوە پێبەخشین و فەرمانی دا کە (ئەترجە)ی کچی (ئەشناس)ی گەورە سەرداری تورك بدرێتە کوڕی ئەفشین کە ناوی (حەسەن) بوو، لە ڕێورەسمی بووك گواستنەوەدا خەرجیی و بەزمێکی شایستەیان ئەنجامدا و شاعیران زۆربەشیان و باڵی ئەفشینیان هەڵدا.[٢٤٤] بێگومان ئەو هەموو میهرەبانی و دۆستایەتی نواندنەی خەلیفە، بەخیلی و کینەی تاهیرییەکان و رکابەرەکانی تری ئەفشینیان کە لە دەرباردا نفووز و دەسەلاتیان هەبوو، دەورووژاند.

## بەدگومانی خەلیفە

بەمشێوەیە، بۆ ئەوەی کە خەلیفەی بەرامبەر بەدگومان بکەن، تۆمەتی ئەوەیان خستە پاڵ کە گوایە بە نهێنی لەگەڵ بابەکدا پەیوەندی هەیە و ڕێککەوتوون و پشتیوانی لێدەکات. موعتەسەم کە بەرامبەر ئەفشین بەدگومان ببوو، ویستی تاقی بکاتەوە ((پێیگوت چی بە باش دەزانی لە بارەی بابەك؟ پێت باش نییە وازی لێبێنین؟ خۆت دەزانی ئەو پیاوە پیاوێکی ئازا وزیرەك و بێباکە و لە کاروباری شەڕ و لەشکریشدا هاوتای نییە. با بواری پێبدەین و خزمەتێکی بکەین. ئەفشین گوتی ئەی (میری باوەڕداران) کافرێك کە ئەو هەموو خوێنەی موسڵمانانی ڕشتبێ، چۆن دەبێ زیندوو بمێنێتەوە؟ موعتەسەم کە ئەو قسەیەی بیست بۆی ساغ بووەوە ئەوەی کە لە بارەی ئەوەوە بەویان ڕاگەیاندووە درۆیە)).[٢٤٥]

---

٢٤٤- مسعودی، مروج الذهب، ب٢ ل٣٥٣.

٢٤٥- جومع الحكايات، نسخه خطی.

لە ڕاستیشدا ئەو تۆمەتەی درابووە پاڵ ئەفشین فڕی بەسەر ڕاستییەوە نەبوو. ئەفشین کە سەرکوتکردنی بابەکی خوڕەمدینی وەك ئامرازێك بۆ وەدەستهێنانی پشتیوانی و سەرنجی خەلیفەوە بە ماندووبوون و سەختی سێ ساڵ لەشکرکێشی ئەنجامدابوو و بابەکی بە فێڵ و تەڵەکە خستبووە نێو داوەوە و نامەردانە گرتبووی، ڕێی تێنەدەچوو لە ژێرەوە سازشی لەگەڵدا کردبێ.

ئەفشین کە لە پێناو پارە و پلەوپایە، بنەماڵە و زێد و هەموو شتێکی خۆی کردبووە قوربانی خۆ نزیككردنەوە و دۆستایەتی خەلیفە، چ ئومێدو چاوەڕوانییەکی لە سازش و دۆستایەتیکردن لەگەڵ دیلێك کە خۆی دابوویە دەستی خەلیفە هەبووە تا لە ژێژەوە سازشی لەگەڵدا بکات؟ بۆ شازادەی ئەشروسنە کە باوك و برا و شار و دیار و ئایین و باوەڕی خۆی لە پێناو پارە و پلەوپایە کردبووە قوربانی، گرتنی بابەکی خوڕەمدین بە ئامرازێکی شایستە دەژمێردرا کە بیگەیەنێت بە ئارەزووی دێرینی، واتە گەیشتن بە حوکمڕانیەتی خوراسان و وڵاتی ئەو دیو ڕووباری جەیحون.

ئەو ئێستا ببووە مایەی ڕێزو خۆشەویستی خەلیفەو بۆ گەیشتن بە ئارەزووی لە مێژینەی خۆی تەنها هەریەك هەنگاوی لە پێش بوو، پێویست بوو بە فرت و فێڵ عەبدوڵلا تاهیر کە بە هەڤڕکی خۆی دەزانی لەبەرچاوی خەلیفە ناشیرین بکا و خەلیفەی لێبتۆرێنێ و رقی لێ هەستێنێ و جێی ئەو بگرێتەوە. پێویست بوو کە سەرداری تاهیری لەبەرچاو موعتەسەم بخات و خۆی بگاتە فەرمانڕەوایی خوراسان. ڕاپەڕینی مازیار موژدەی گەیشتن بەو ئاواتەی پێدەدا.

## مـازیــــار

لەڕاپەڕینی مازیاردا، بۆ گەیشتن بە دەسەڵات بیری زیندووکردنەوەی ئایینی دێرین پیادە دەکرا و ئەم بیرەی زیندووکردنەوەی ئایینی دێرینە، ئامرازێك بوو کە پێدەچوو گەیشتن بە ئامانجەکانی بۆ مازیار ئاسان دەکرد.

لەڕاستیدا، ئەو زوڵم و ستەمەی کە لە لایەن کاربەدەستەکانی خەلیفە دژی ئێرانییەکان ئەنجام دەدرا، خۆی بەس بوو بۆ دروستکردنی گیانی یاخیبوون و بەرەنگاربوونەوەی خەڵك دژی خەلیفە. بێبەشکردن و نارەزایەتی، خەڵکی هەمیشە ئامادەی یاخیبوون و سەرکەشی دەکرد و لەم میانەدا هەرکەسێك دژی خەلیفە دەنگی هەڵبڕیبا و ڕاپەڕیبا، خەڵکی داخ لە دڵ و یاخیگەر و ناڕازی، لە دەوری کۆدەبوونەوە.

ڕاپەڕینی مازیاریش بۆ خەڵکی زۆرلێکراوی ئێران کە زوڵم و بێداد و ستەمێکی زۆریان لە دەستی کاربەدەستانی عارەب بینیبوو، تروسکایی و دەرووێك بوو، لەبەر ئەوە بوو کە ئەو

ڕاپەڕینە ماوەیەکی زۆر ببووە مایەی ئومێدی خەڵکی. لەڕاستیشدا ئەو مازیارە کوڕی قارنی کوڕی ونداد هورمزد، سپەهبۆد زادەی تەبەرستان بوو. کاتێ کە قارنی باوکی کۆچی دوایی کرد، فەرمانڕەوایی تەبەرستان کەوتە دەستی مامی. ئەو پیاوە چووە لای مەئموون و لە لایەن ئەوەوە نەوازش و پێشوازی کرا. مەئموون ناوی نا محەمەد و کردیە والی ناوچەکانی تەبەرستان و ڕوویانو دەماوەند،[٢٤٦] ئینجا خەلیفە نامەیەکی بۆ مامی نارد و فەرمانی دا کە ئەو ویلایەتە تەسلیم بکات. مازیار بەرەو هەرێمی تەبەرستان کەوتەڕێ. کاتێ کە مامی لەوە ئاگاداربووەوە، زۆر تووڕە بوو. لەگەڵ پیاوەکانی خۆی لە شار هاتە دەر و واینواند کە دەیەوێ بچێتە پێشوازی مازیار. یەکێ لە نۆکەرەکانی باوکی مازیار کە لەو سەفەرەدا هاوڕێی مازیار بوو، مازیاری ترساند و پێگوت مامت بەو شێوەو دەستە و دایرەیەوە تەنها بۆ ئەوە هاتۆتە پێشوازی تۆ خافڵگیرت بکا و بتگرێ و لە نێوت ببات. پێویستە هەرکە گەیشتیتە ئەو بە هاوڕێکانی جیای بکەیتەوە و لە نێوی ببەیت. مازیار ئاوای کرد و مامی خۆی کوشت[٢٤٧] و هەموو قەڵەمڕەوی فەرمانڕەوایەتی باوباپیرانی خۆی خستە ژێر ڕکێفی خۆی و نامەی بۆ مەئموون نووسی کە لەبەر ئەوەی مامم دژایەتی کردم لە نێوم برد. لەوە بە دواوە مازیار خۆی بە (گەیلی گەیلان) و (ئەسپەهبودی ئەسپەهبودان) و نەوەی شاهان ناوزەد کرد. بەڵام بە ڕواڵەت بەر فەرمان و باجدەری خەلیفە بوو. لەبەر ئەوەی تەبەرستان بە بەشێکی قەڵەمڕەوی تاهیرییەکان کە فەرمانڕەوای خوراسان بوون دەژمێردرا، مازیار دەبوا باج و خەراجی خۆی بداتە بنەماڵەی تاهیر. لە سەردەمی خەلافەتی مەئموون و تا چەند ساڵی سەردەمی موعتەسەمیش ئەوەی کرد.

## مازیار و تاهیرییەکان

وردە وردە ناخۆشی و دوژمنایەتی کەوتە نێوان مازیار و تاهیرییەکان. دوژمنایەتی و ناخۆشیی نێوان باجدەرێکی بەرفەرمان، بەڵام لە خۆبایی و باجستێنێکی تەماعکار و لە هەمانکاتدا نەفرەتئامێز، مسۆگەر بوو. ئەو دوژمنایەتییە گەیشتە ئەو ڕادەیە کە مازیار بە ئاشکرا خۆی لە ناردنی باجی تەبەرستان بۆ عەبدوڵڵا تاهیر ببوێرێ.

---

٢٤٦- بلاذری، فتوح، ل ٣٣٤.

٢٤٧- تاریخ یعقوبی، ب٣، ل ٢٠٢.

موعتەسەم نامەی بۆ نارد کە باج و خەراج بۆ لای عەبدوڵڵا تاهیر بنێرێ، کەچی ئەو وەڵامی دایەوە کە: من باج نادەمە عەبدوڵڵا، بەڵام باجەکە بۆ دەرباری خەلیفە رەوانە دەکەم. لەوە بەدواوە مازیار باجی خۆی یەکسەر بۆ موعتەسەم دەنارد، هەرکە ئەو پارە و کەلوپەلە دەگەیشتە هەمەدان، موعتەسەم لە لایەن خۆیەوە کەسێکی دەنارد تا لەوێ بە باوەڕپێکراوی عەبدوڵڵای بسپێرن و بۆ خوراسانی ببەن. چەندین ساڵ ئاوا تێپەڕی و تا دەهات دوژمنایەتی نێوان مازیار و عەبدوڵڵا تاهیر تیژتر و بەهێزتر دەبوو.

لەو نێوەدا ئەفشینیش کە دوژمنایەتی لەگەڵ تاهیرییەکان هەبوو، هەلێکی بۆ رەخسا. ئەوە بەهۆی داگیرکردنی ئازەربایگان و سەرکەوتنی بەسەر بابەکدا، لای موعتەسەم پایە و پلەیەکی بەرزی وەدەست هێنابوو. ئاگاداری ئەو ناکۆکییەی نێوان عەبدوڵڵا تاهیر و مازیار بوو و چاوی تەماعیشی لە هەرێمی خوراسان هەبوو. بەو ئومێدە بوو کە بتوانێ دوای سەرکوتکردنی بابەك، رێز و پشتیوانی خەلیفە دەستەبەر بکات و جێی عەبدوڵڵا تاهیر لە خوراسان بگرێتەوە. ئەوەی کە لەو بارەیەوە ئومێدی پێدەبەخشی، نیگەرانی خەلیفە بوو لە عەبدوڵڵا.

لەڕاستیدا موعتەسەم لە عەبدوڵڵا تاهیر دڵگران بوو، بەڵام زاتی نەدەکرد کە حکوومەتی خوراسانی لێ بسێنێتەوە توانای تەواوی بۆ ئەمە لە خۆدا نەدەبینی. بەڵام ئەفشین جارجار قسەی وای لە خەلیفە دەبیست ئاماژە بوون کە دەیەوێ بنەماڵەی تاهیر لە حکوومەتی خوراسان بەرکەنار بکات. سەبارەت بە دڵگرانبوونی خەلیفە لە عەبدوڵڵا تاهیر باسێك دەگێڕنەوە کە گوایە: ((لەو کاتەی کە عەبدوڵڵا پەردەداری مەئموون بوو، رۆژێك موعتەسەم بەخۆی و ژمارەیەك دەست و پێوەند و نۆکەری خۆی هاتە بەردەرکەی مەئموون. عەبدوڵڵا پێیگوت ئەم کاتە کاتی چوونە لای خەلیفە نییە بەو هەموو نۆکەرەوە. موعتەسەم گوتی تۆ بە چوارسەد نۆکەرەوە دەچیتە لای خەلیفە و لای دادەنیشی، کەچی بۆ من بە رەوا نابینی بەم ژمارە کەمە بچمەلای. عەبدوڵڵا گوتی من ئەگەر بە چوارسەد نۆکەریشەوە بچمە لای ئەوەندە تەماعم نییە کە تۆ بە چوار کەسەوە دەیکەیت. موعتەسەم گەڕایەوە و تووڕە بوو، کاتێ کە مەئموون پێیزانی بانگی هەردووکیانی کرد و پێکی هێنانەوە)).[٢٤٨]

---

٢٤٨- تاریخ گردیزی، ل٣.

## گەمەی ئەفشین

بەم چەشنە، ئەفشین کەرقی لە عەبدوڵڵا تاهیر دەبووەوە و ئارەزووی گرتنە دەستی فەرمانڕەوایەتی خوراسانی لە دڵدا بوو، هەوڵیدا کە هەلەکە بقۆزێتەوە. ناوبراو بە هۆی گرتنی ئازەربایگان و گرتنی (عەمرویە) سەرنج و خۆشەویستی خەلیفەی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو و لەو رق و نەفرەتەش کە موعتەسەم بەرامبەر بە عەبدوڵڵا تاهیر هەیبوو، ئاگادار بوو. دەیزانی کە مازیار لە دژی عەبدوڵڵا ڕادەوەستێ و ڕووبەڕووی دەبێتەوە. بۆیە بیری کردەوە کە ڕاپەڕینی مازیار دەرفەتێکی لەبار دەبێ بۆ گەیشتنی ئەو بە ئارەزووی دێرینی. ئارەزووی حکوومەتی خوراسان و ئەو دیوی ڕووبار کە بۆ گەیشتن بەمە لە هیچ شتێك نەدەپرینگایەوە.

لەوە بە دواوە لە ژێرەوە هانی مازیاری دەدا کە دژی عەبدوڵڵا تاهیر ڕاپەڕێ، دەیویست ڕاپەڕینی مازیاریش وەکو ئەوەی بابەك ئەوەندە درێژە بکێشێ کە عەبدوڵڵا تاهیر نائومێد و دەستەوەستان بکات تا بەڵکو ئەو بە سوپایەکی تازەوە بۆ کپکردنی ئاژاوەی مازیار بنێرن و حکوومەتی خوراسان لە عەبدوڵڵا بستێننەوە و تەسلیمی ئەوی بکەن ...[249] و پێیوابوو کە بەو شێوەیە نەك هەر تۆڵە لە عەبدوڵڵا تاهیری رکابەری دێرینی خۆی دەکاتەوە بەڵکو فەرمانڕەوایی خوراسان و ئەو دیو ڕووباریشی دەکەوێتە ژێر دەستەوە.

بەڵێ ئەفشین، بەو هیوایە، نامە و نامەکاری لەگەڵ مازیار دەستپێکرد و دۆستایەتی دەربڕی و پەیامی بۆ نارد کە خەلیفە بەڵێنی ولایەتی خوراسانی پێداوە و هانی دا ڕووبەڕووی عەبدوڵڵا تاهیر ببێتەوە و بۆی نووسی کە لای موعتەسەم پشتیوانی لێدەکات ...[250] بەمچەشنە ئەفشین، مازیاری کردە قوربانی نەخشە و پیلانە چەپەڵەکانی خۆی و ناچاری کرد کە دژی عەبدوڵڵا ڕاپەڕینێکی بێ سەرئەنجام بەرپا بکات.

## ڕاپەڕینی مازیار

داوەری لە سەر ڕاستی و ئامانجی ڕاپەڕینەکەی مازیار کارێکی ئاسان نییە. نەك هەر ئەوەی مێژوونووسەکان لە بارەی ئەوەوە نووسیویانە نارۆشن و شاش و تێکەڵە لەگەڵ دەمارگیریی

٢٤٩ - Caliphate ،p517 .

٢٥٠- طبری، ب١٠، ل٣٤٩.

ئیسلامیانە، بەڵکو لە خودی بزاڤەکەشدا فاکتەری جیاجیا و دژ بە یەك هێندە زۆرن کە زۆر زەحمەتە مرۆڤ داوەرییەکی تەواوی لەبارەوە بکات.

ئایین و رێبازی مازیار کە لە پێناویدا دژی عارەب و موسڵمانەکان راپەڕی و دەستی دایە چەك چی بوو؟ بە دروستی دیار نییە. بەڵام بە پێی هەندێ مەزەندە و نیشانە تارادەیەك دەتوانین وەڵامی ئەو پرسیارەی سەرەوە بدەینەوە. نووسیویانە کە لەگەڵ ئەفشیندا لە سەر یەك ئایین بووە[٢٥١]. لە بارەی ئەوەی کە ئەفشین لەسەر ئایینی زەردەشتی بێ، گومان هەیە. بڵاوکردنەوە و برەوی مەزهەبی (سومنی) لە قەڵەمڕەوی فەرمانڕەوایی باو باپیری ئەو و دۆزینەوەی هەندێ بت لە ماڵەکەیدا ئەو بۆچوونە دێنینە ئارا کە ئایینی ئەفشین جۆرێك بووە لە ئایینی (سومنی). بەڵام بوودایی و سومنی بوونی مازیار لەگوین نییە. پێناچێ و دوورە، لە تەبەرستان و مازەندەران ئایینی سومنی و بوودایی برەوی هەبووبێ. ئەگەر مازیاریش فریوی ئەفشینی خواردباو لە پێناو دۆستایەتی لەگەڵ ئەودا ئایینی سومنی قبوڵ کردبا، مەحاڵ بوو لە نێو زەردەشتییەکانی تەبەرستاندا بتوانێ هاوڕێ و هەوادارانێك پەیدا بکات...

هەندێ گوتویانە کە مازیار ((چۆتە سەر ئایینی بابەکی خوڕەم دین و جلی سووری پۆشی))[٢٥٢] لە بارەی ئایینی بابەك، وەك پێشتر باسکرا، زۆرتر لەو باوەڕەدان کە پاشماوەی ئایینی مەزدەك بووە. ئەوەی لە گێڕانەوەی (مەتاوی) شدا دەردەکەوێ سەبارەت بە مازیار و راپەڕینەکەی باسکردنە لە نفووز و کارتێکردنی سەرەتاکانی مەزدەکی لە بیر و تێڕوانینەکانی. دەنووسن کە بە جووتیار و وەرزێرانی گوتووە ماڵ و سامانی گەورەکانی خۆیان تاراج بکەن و لە دژیان راپەڕن.[٢٥٣] لەو فەرمانەی مازیاردا نفووزی رێنووێنی و تەعالیمەکانی مەزدەك تا ئەندازەیەکی زۆر بەرچاو و دیارن. نووسیویانە کە مازیار لەگەڵ بابەکیشدا نامە و نامەکاری دەکرد.[٢٥٤] رەنگە یەکێك لە هۆکارەکانی سەرنەکەوتنی مازیار لەمەوە بووبێ. چونکە زەردەشتییەکانی تەبەرستان هەرگیز مەیلی مەزدەکی و خوڕەم دینییەکانی مازیاریان پەسەند نەکردووە. ئایینی مەزدەکی و خوڕەم دینیش لای ئەوان وەکو موسڵمانان بە نەویستراو و رەتکراوە

---

٢٥١- مروج الذهب، ب٢، ل٣٥٤.

٢٥٢- تاريخ گرديزى، ل٣.

٢٥٣- كامل ابن اثير، ب٦، ل١٦٨.

٢٥٤- ابن اثير، هەمان جێ.

دەژمێردرا. (کوهیار)ی برای مازیار کە خیانەتی لێکرد و ئەوی ڕادەستی عارەبان کرد، ڕەنگە جگە لە هەستی بەخیلی پلەوپایە خوازی، لە ژێر کاریگەریی مەیلە و زەردەشتییەکانی خۆیشی بووبێ. هەندێ لە نووسەرانیش باسیان لە گروپێك بە ناوی (مازیاریە) لە تەبەرستان کردووە و ئەو گروپەیان بە یەك شت زانیوە لەگەڵ خوڕەمییە و بەرگ سوورەکان (سرخ جامگان) واتە پەیڕەوکارانی بابەك.[255] بەڵێ سەرچاوە درەنگترەکان، مازیاریان بە (زەندەقە) تۆمەتبار کردووە کە ئەویش دەبێ جۆرێك لە ئایینی خوڕەمی بووبێ.

بەڵام وێڕای ئەمانە هەمووی هەندێ لە سەرچاوەکانیش نووسیویانە کە مازیار لە خەلیفە هەڵگەڕایەوە ((هەمان زنناری زەردەشتی بەست و ستەم و سووکایەتی بە موسڵمانان کرد))[256] واپێدەچێ هەمان ئەو گەڕانەوەیە بۆ ئایینی پێشوو بووە، کە لە هەندێ سەرچاوەکاندا وەك (کوفر) و (ئیرتداد)ی مازیار لێکدراوەتەوە[257]

دەتوانین ئەو ئەگەرە دابنێین کە لە نێو هەڤاڵ و لایەنگرەکانی مازیاردا پەیڕەوی هەریەك لەو دەستە و گروپانە هەبووبن. دووریش نییە کە مازیار بۆ گەیشتن بە ئامانجی خۆی، وەکو هەموو دەسەڵاتخوازەکانی مێژوو، بە پێی پێویست هەر ماوەیەك ئایینێکی تازەی هەڵبژاردبێ. بەهەرحاڵ ئەوەی لە مێژووی سەرهەڵدان و ژیانی ئەودا دەردەکەوێ، کەم و زۆر ئەو بۆچوونە پشتڕاست دەکاتەوە کە مازیار تەنها لە پێناو زیندووکردنەوەی ئایینی کۆن ڕانەپەڕیوە. بزاڤەکەی ئەو هەرچەندە لە ڕەنگ و بۆی ئایینی و نەتەوەیی بەدەر نییە شۆڕشێکی نیشتیمان خوازی بووە. ئەو بۆ سەربەخۆکردنی حکوومەتی خۆی، دژی خەلیفەی بەغدا ڕاپەڕیوە و بۆ هێنانەدی ئارەزووی خۆی سوودی لە هەموو ئەو فاکتەرە ئایینی و نەتەوەیی و سیاسیانە وەرگرتووە کە لەبەر دەستیدا بووە. وردبوونەوە و لێکۆڵینەوە لە مێژووی ڕاپەڕینەکەی ئەودا ئەو قسەیە پشتڕاست دەکاتەوە. بۆیە لەم نووسینەدا ناکرێ ئەگەرچی بە کورتیش بێ ئاماژە بەو ڕووداو و بوویەرانە نەکەین.

---

٢٥٥- بغدادی: الفرق بین الفرق، ل٢٥٢.

٢٥٦- تاریخ طبرستان، ب١، ل٢٠٩.

٢٥٧- ابن فقیة، ل٣٠٩.

## دووسەد و بیست و چوار

دوژمنایەتی کردنی عەبدوڵلا تاهیر، کە ئەفشین ئاگرەکەی بۆ خۆش دەکرد لـە خۆیـاییبوون و دەسەڵاتخوازی مازیاری پەرەپێدا و وای لێکرد کە دژی خەلیفە ڕابپەڕێ. مازیـار لـە سـاڵی (٢٢٤ ك/ ٨٣٩ ز) بە ئاشکرا دژی خەلیفە ڕاپەڕی. خەڵکی تەبەرستانی ناچارکرد کە بەیعەتی پێبکـەن. فەرمانی بە وەزیرەکاندا کە دژی ئاغا موسڵمانەکانی خۆیـان ڕاپـەڕن و دەسـت بـە سـەر مـاڵ و سامانیان دا بگرن و تالانیان بکەن. کاتێ بەسەر بارودۆخەکەدا زاڵ بـوو، هـەموو موسـڵمانەکانی لەسەر کار لابـردن و هـاوڕێ و پـەیڕەوکارە زەردەشتی و ناموسـڵمانەکانی خـۆی دامـەزرانـدن و فەرمانی پێدان کە مزگەوتەکان تێکبدەن و شـوێنەواری ئیـسلام ڕەش بکەنـەوە. (سۆرخـستان)ی نوێنەری (ساری) لەو ئەرکەدا لەوانی تر زیاتر لێبڕاوانە و ڕشتر ئەرکی خۆی ئەنجام دا. نـاوبراو بـە فەرمانی مازیار بیست هەزار کەسی لە خەڵکی (ساری) و (ئامول) بۆ (هۆرموزاباد) کە لە نێـوان (ساری) و (ئامول) هەڵکەوتووە، کۆچ پێکردن و لەوێیدا بەندکردن[٢٥٨] ئەمانە ئـەو کەسـانە بـوون کە دژی شۆڕش و ڕاپەڕینی مازیار بوون. گرتن و بەندکردنی ئەمانـە کـاری ڕاپەڕینەکـەی ئاسـان کـرد. دوای ئـەوە شـوورە و حەسـاری شـارەکانی سـاری و ئـامول و (ئەمیـشە) یـان تێکـدان. سۆرخستان، ژمارەیەك لە بەگزادە و گەورەکانی کە تۆمەتباربوون بە دژایەتیکردنی ڕاپەڕین، بـەو بیانووەی کە لەگەڵ عارەبان هاوکار و هاودەستن، وەك کەسانێکی ترسناك و گومانلێکراو، تەسلیم بە وەرزێرەکانی کردن کە بە فەرمانی ئەو هەموویان لە نێو بردن.

لەو ڕاپەڕینەدا ڕۆح و ڕەنگ و بۆی ئایین هێندە دیار نییە. پەرەسەندنی کوشت و بـڕ و تـالان‌و وێرانکاری و خوێنڕێژی نیشانەی بـێ سـەروبەرەییە. مازیـار و هاوڕێکـانی لـەو ڕاپەڕینـەدا پـتر خەریکی کۆکردنەوەی ماڵ و دارایی بوون. دەنووسن کە خێرا کەوتە کۆکردنەوەی بـاج و خـەراج و خەراجی یەك ساڵی لە ماوەی دوو مانگدا بە زۆری لە خـەڵك سـتاند.[٢٥٩] کـاری زوڵـم و سـتەم و بێدادی و سووکایەتیپێکردن لەو ماوەیەدا، گەیشتە ئەو پەڕی، ((لێنەگەڕا لە هیچ شوێنێك کـەس بپرمێتە سەر ژیان و کاروباری تایبەتی خـۆی، هـەموو خـەڵکی ناچـارکردبوو بـۆ ئـەو خـەریکی دروستکردنی کۆشك و هەڵکەندنی خەندەق و قوڕکاری بن)).[٢٦٠]

---

٢٥٨- ابن اثیر، ب٦، ل١٦٨.

٢٥٩- ابن اثیر، هەمان جێ.

٢٦٠- تاریخ طبرستان، ب١، ل ٢١١.

لەوەها راپەڕینێکدا کە زیاتر لە ئاژاوە و بێ سەرەو پەرەیی دەچوو، رك و کینە و نەفرەتی خەڵکی، شتێکی ئاسایی و لە نکۆڵی نەهاتوو بوو. لە نامەیەکی سکاڵا ئامێزدا کە موسڵمانانی تەبەرستان سەبارەت بە راپەڕینی مازیار بۆ خەلیفەیان نووسی و لە مێژووی (تەبەری)دا هاتووە، دەتوانین بە ئاشکرا نیگەرانی و نارەزایەتی قوربانیانی ئاژاوە و پشێویەك ببینین.

ئایا مازیار نەخشەی مەزنتر و بیر و ئەندێشەی بەرزتری هەبووە کە بۆ هێنانەدیان ئاوا بە پەلە و خێرا کەوتۆتە تالآن و برۆی ماڵ و داهاتی خەڵك؟ ئەمە بەدوور دەبینرێ. وەك زانراوە ناوبراو لە کۆکردنەوەی پارە و گرتنە دەستی دەسەڵات و سەربەخۆیی بترازێ ئامانجێکی تری نەبووە. بۆیە ئەو پارە و پوولەی کە بە زۆر لە خەڵکی ستاندبوو، بۆ هێنانەدی سەربەخۆیی و ئامانجەکانی خۆی خەرجی دەکرد. دەنووسن کاتێ کە ئەویان دەستگیر کرد و بردیانە سامەڕا، داوای لە موعتەسەم کرد کە پارەیەکی زۆری لێوەربگرێ و نەیکوژێ[٢٦١]، بەڵام موعتەسەم قبوڵی نەکرد.

بەڵێ سکاڵا و زوڵم و بێدادی، وایان لە موعتەسەم کرد کە فەرمان بدا و عەبدوڵڵا تاهیریش بە فەرمانی خەلیفە بە تەفروتووناو لە نێوبردنی راپەڕینی مازیار هەستێ. عەبدوڵڵا، (حەسەن کوڕی حوسێن)ی مامی خۆی بە لەشکری خوراسانەوە بۆ سەرکوتکردنی ناوبراو نارد و موعتەسەمیش (محەمەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی مەسعەب)ی بە ژمارەیەکەوە لە دەرباری خەلافەتەوە بۆ ئەو مەبەستە رەوانەکرد.

ئەفشین کە دوژمنایەتی و ناکۆکی لەگەڵ عەبدوڵڵا تاهیردا هەبوو، وەك چۆن پێشتریش باسمان کرد، نامەی بۆ مازیار نووسی و پەیامی پێڕاگەیاند کە لە بەرامبەر عەبدوڵڵا تاهیردا ڕابوەستێ و چاوەڕوانی پشتیوانی و یارمەتیدانی ئەو بکات. لە ڕاستیدا مەبەستی ئەفشین ئەوە بوو کە مازیار ئەوەندە لە بەرامبەر عەبدوڵڵا تاهیردا خۆڕابگرێ کە خەلیفە ئەو جارەش وەکو راپەڕینی خوڕەمییەکان ناچاربێ ئەو بۆ دامرکاندنەوەی راپەڕینەکەی مازیار ڕەوانە بکات و حکوومەتی خوراسان و ئەو دیو ڕووباریش بدا بە ئەو.

---

٢٦١- مسعودي: مروج الذهب، ب٢، ل٣٥٤.

## شکست

بەڵام عەبدوڵڵا خۆی زۆر زوو توانی ئەو ئەرکە بەجێبگەیەنێ و یاخیبوونی مازیار وەکو نەخشەکانی ئەفشین، پووچەڵ بکاتەوە. مازیار برایەکی هەبوو، ناوی کۆهیار بوو، کە بەخیلی بە مازیار دەبرد و رکی لێدەبووەوە. کاتێ لەشکری خوراسان بە فەرماندەیی (حەسەن کوڕی حوسێن)ی مامی عەبدوڵڵا تاهیر گەیشتە سنووری تەبەرستان، کۆهیار نامەی بۆ حەسەن نووسی و پەیامی بۆ نارد کە ئامادەیە مازیاری برای رادەستی ئەوان بکات.

نامەی بۆ حەسەن نووسی و پێیڕاگەیاند کە لە شوێنێکدا خۆیان لە بۆسەدانێن. ئینجا بە مازیاری گوت کە ((حەسەن بۆ لێبووردن و زینهار خواستن دێتە لای تۆ و لە فلانە شوێنە، (جێگایەکی تری ناوبرد)، دەیەوێ قسەت لەگەڵ بکات)) مازیار باوەڕی کرد و بۆ چاوپێکەوتنی حەسەن بەرەو ئەو شوێنەی کۆهیار گوتبووی، کەوتە رێ. کۆهیار حەسەنی ئاگادارکردەوە و ئەویش بە هێزێکەوە رێی مازیاری گرت. مازیار کە کەوتە نێو بۆسەی ئەمانە ویستی ڕابکات. کۆهیار لێنەگەڕا و هاوەڵانی حەسەن دەوریان داو دەستگیریان کرد و بە بێ هیچ شەڕ و دانوستانێك دیل کرا،[٢٦٢] و بردیانە سامەڕا لای خەلیفە.

## ئاشکرابوونی پیلان

سەرچاوەکان نووسیوویانە کاتێ کە مازیاریان بۆ سامەڕا دەبردە لای خەلیفە، لە ڕێگادا مەستیان کرد و کاتێ کە تەواو سەرخۆش بوو باسی پەیوەندی نێوان خۆی و ئەفشینی کرد و نهێنی نێوان خۆی و ئەوی ئاشکرا کرد. دەڵێن عەبدوڵڵا فەرمانی دا مازیار لەو سندووقە بێننەدەر کە خستبوویانە ناوی ((و هێنایە لای خۆی و کاڵەکی لەپێش دانا و پێیگوت (ئەمیرلمونمنین) پادشایەکی بە بەزەییە من داوای لێدەکەم کە بتبوورێ و لە تاوانت خۆش بێ. مازیار گوتی پەنا بەخوا لە گوناهی تۆش دەبوورێ. عەبدوڵڵا پێی سەیر بوو کە ئەو لە سەروبەندی مەرگدایە و بە تەمای چی خوازیاری لێبووردنی منە. عەبدوڵڵا بڕیاری دا سفرەیان ڕازاندەوە و شەرابیان هێنا و پێکی خەست و پڕاوپڕی بۆ تێکرد و ئەوەندە شەرابی دەرخوارد دا تا تەواو هۆشی لە لا نەما و مەست بوو. ئینجا عەبدوڵڵا لێپرسی کە ئەمڕۆ ئەوەت بەسەر زاری داهات. ئەگەر من بە تەواوی لە چۆنیەتی ئەمە ئاگادار بکەیتەوە لێت دەبوورم و بەزمەکەمان

---

٢٦٢- بلاذری: فتوح البلدان، ل٣٣٥.

خۆشتر دەبێ. مازیار گوتی چەند ڕۆژێکی تر بۆت ئاشکرا دەبێ. عەبدوڵلا زیاتر بە دوایدا چوو پرسیاری کرد و پێیداگرت و سوێندی دا. مازیار سەرپۆشی نهێنییەکەی خۆی لادا و گوتی من و ئەفشین خیدر کوڕی کاوس لە مێژە پێکەوە پەیمانمان بەستووە کە دەوڵەت لە عارەبان بستێنینەوەو بۆ بنەماڵەی کیسرای بگێڕینەوە. پێرێ لە فلانە شوێن نێردراوی ئەفشین گەیشت و پەیامی هێنا کە فلانە ڕۆژ موعتەسەم لەگەڵ منداڵەکانی بۆ میوانی بانگ دەکەمە ماڵی خۆم و لەوێ لەنێوی دەبەم. عەبدوڵلا زیاتر شەڕابی داپێ تا هیچ ئاگای لە خۆی نەما ئینجا بردیانە هەمان ئەو جێیەی کە باسی کردبوو، ئەوەشی بۆ موعتەسەم نووسی...))[٢٦٣] وەك دیارە کە لەم ڕیوایەتەدا ناوی عەبدوڵلا تاهیر لە شوێنی حەسەن کوڕی حوسێن هاتبێ. گومان لە ڕاستی ئەو باسەدا هەیە، بەلام گومانی تێدا نییە کە گیرانی مازیار بووە بیانووێك بۆ بنەماڵەی تاهیری و دوژمنەکانی تری ئەفشین کە ئەویش بگیرێ و لە نێو ببرێت. بەڵێ مازیار بەدەستی پیاوەکانی عەبدوڵلا تاهیر گیرا و سەرهەڵدانەکەی دامرکایەوە و نەخشەکانی ئەفشینیش بوونە بلقی سەر ئاو.

پلەوپایەو کاریگەریی ئەفشین لە بەغدا، دژبەرەکانی ئەویان سەرسام کردبوو. ئەو پلەوپایە و شوێنەی کە لەلای خەلیفە وەدەستی هێنابوو، بەخیلی و ئیرەیی دەربارییەکانی خەلافەتی دەوروژاند. بایەخنەدان بە هەندێ لە بەرپرس و نزیکەکانی دەرباری خەلیفە و ئەو هەوڵ و کۆششەی کە بۆ وەدەستهێنانی هێز و دەسەلات دەیدا، بەرهەڵستکارانی ئەوی بەرەو ناکۆکی و دوژمنایەییەکی ئاشکرا دژ بەو هاندەدا.

## دوژمنانی ئەفشین

دەرباری موعتەسەم لەو سەردەمەدا مەکۆی پیلان و چەپەڵکاری بوو. چەندین دەستەو گرووپی جیاجیا پێکهاتبوون و هەریەکەیان هەوڵی دەدا سەرنجی خەلیفە بۆ لای خۆی ڕابکێشێ. (محەمەد کوڕی عەبدولمەلیك زیات)ی وەزیر و (ئەحمەد کوڕی ئەبی داود)ی قازی، هەریەکەیان هەوڵیان دەدا دەسەلات و کاریگەریی خۆیان زیاتر پەرە پێبدەن. فەرماندە تورکەکانی وەکو (ئەشناس) و (بوغا) و سەردارە عارەبەکانی وەك (ئەبی دەلفی عەجەلی) هەریەك هەوڵیان دەدا دەستکەوت و دەسەلاتێکی باشتر بۆ خۆیان دەستەبەربکەن. لە نێو ئەو هەموو ململانێ و ڕکابەری و

---

٢٦٣- مرعشی: تاریخ طبرستان و رویان مرعشی، ل١٥٦، چاپ پترزبۆرگ.

ناکۆکیانەدا ئەفشین ببووە مایەی بایەخ و سەرنجی خەلیفە و بتەوێ و نەتەوێ ئەوانی تر بەخیلییان پێدەبرد. ڕەفتاری سەرەڕۆیانە و لە خۆباییانەی ئەو پیاوە هەندێ جار ئەو بەخیلی پێبردنەی دەگۆڕی و دەیکردە نەفرەت و ڕك لێبوونەوە.

(ئەبو دەلف قاسم کوڕی عیسا عەجەلی) کە پێشتر لە هاوەڵانی محەمەد ئەمین بوو و دواتر لای مەئموون ڕێز و پلەوپایەی هەبوو، بە یەکێ لە ناودارانی عارب دەژمێردرا و بە هۆی شکۆو دەست و دڵ فراوانی و ئازایەتی و زەوق و سەلیقەی خۆی لە دەرباری موعتەسەمدا خۆشەویست بوو. لە سەردەمی موعتەسەمدا کە ئەفشین فەرمانڕەوای هەرێمی چیا بوو، ئەبو دەلف لەلایەن ئەوەوە لە هەرێمی دەیلەمدا خەریکی شەڕ و غەزووکردن بوو، لە شەڕی دژی بابەکیشدا لە ئازەربایگان لەگەڵ ئەودا بوو، ئەو ئازایەتییانەی کە لە شەڕەکاندا نیشانی دەدان وایان لێکردبوو بکەوێتە بەردڵ و سەرنجی خەلیفەوە.

بەڵام ئەفشین چاوی بەو پێشکەوتنانەی ئەو هەڵنەدەهات و بۆ وەلانان و لە نێوبردنی، نەخشە و پیلانی دەگێڕان. چەندین جار داوای لە موعتەسەم کردبوو کە لە پای ئەو هەموو خزمەتە گرنگانەی کە ئەنجامی داون، بواری پێبدا و دەستی ئاوەڵا بکات ((تا خێرو بێر و فەرمانڕەواییەکەی لێ بسێنێ)) و دواجار موعتەسەم ئەگەرچی دەیزانی کە دوژمنایەتی و گرژی نێوان ئەمانە تا چ ڕادەیەکە، ئەو داخوازییەی ئەفشینی قبوڵ کردبوو.

## ئەحمەدی کوڕی ئەبو داود

خەلیفە ئەبو دەلفی بە ئەفشین سپاردبوو. ئەفشینیش لە هەوڵی فەوتاندنی دا بوو، بەڵام ئەحمەد کوڕی ئەبو داود کە قازی قازییەکانی بەغدا بوو پێیڕاگەیشت و ئەبو دەلفی لە چەنگی ئەفشین دەرباز کرد. ئەو هەوڵەی کە ئەحمەد کوڕی ئەبی داود بۆ ڕزگارکردنی ئەبو دەلفی دا لە زۆربەی سەرچاوەکاندا باسکراوە. بەڵام ئەو گێڕانەوەیەی کە لە مێژووی (بەیهەقی)دا لە زاری خودی ئەحمەدەوە هاتووە، لە هەمووان سەرنجڕاکێشترە و پێموایە باسکردنی لێرەدا بێ سوود نەبێ. ئەحمەد دەڵێ کاتێ کە من لە موعتەسەمم بیست کە ئەبو دەلفی تەسلیم بە ئەفشین کردووە، بۆ ڕزگارکردنی ئەبی دەلف لەگەڵ چەند کەس لە خزم و هاوەڵەکانی خۆم بەرەو ماڵی ئەفشین کەوتمە ڕێ...

کاتێ گەیشتمە داڵانی سەرای ئەفشین، پەردەدار و پلەدارەکانی ئەو هاتنە پێشم...و منیان بردە ژوورەوە و پەردەیان دادایەوە و من بە پیاوەکانی خۆم گوت لە داڵانەکە دابنیشن و چاوەڕێی

من بکەن. کە گەیشتمە سەرای ئەفشین بینیم وا لە سەرووی ژووریّ دانیشتووەو رایەخیّکی چەرمیان لە پیّش ڕاخستووە بۆ ئەوەی ژوورەکە پیس نەبیّ، ئەبو دەلف بە تای شەلواریّك و چاو بەستراو لەویّ دانیشیّنراوە و سەربڕ شمشیّری ڕووتی بەدەستەوەیە و لەسەر سەری ڕاوەستاوە، ئەفشین لەگەلّ ئەبودەلف قسان دەکات و کابرای شمشیّر بەدەست چاوەڕوانە تا ژمارە (دە)ی بۆ بژمیّرن و ئەو سەری ئەبو دەلف لیّبکاتەوە.... گوتم ئەی فەرماندە، خوا بمکا بە فیدای تۆ، بۆ قاسم عیسا هاتووم کە لەڕیّی خوا وازی لیّبیّنی و بەمنی ببەخشی ... بە تووڕەیی و بیّ بایەخانە گوتی: نەمبەخشیوە و نایبەخشم، ئەمیرلموئمنین داویەتە دەستی من و دویّ شەو سویّندی خوارد کە لە بارەی ئەوەوە قسە نەکا و هەرچی بمەویّ لەگەلّی بکەم، ڕۆژانیّکی دوور و دریّژە بە ئاواتی ئەوەم ... هەستام و سەرم ماچ کرد و هەولّمدا سوودی نەبوو، جاریّکی تر شانیم ماچ کرد و ویستم بنوشتیّمەوە و ئەژنۆی ماچ بکەم، بە تووڕەییەوە پیّی گوتم: تاکەی واز ناهیّنی؟ بەخوا قەسەم ئەگەر هەزار جار خاك و خۆلّ ماچ بکەیت بیّهوودەیە و وەلاّمت نادەمەوە ... ئینجا گوتم ئەی ئەمیر من هەرچی شایستەی پیاوەتی بوو کردم و تۆ ڕیّزی منت نەگرت، دەزانی کە خەلیفە و هەموو بەردەستەکانی بەڕیّزیان چ ئەوانەی لە تۆ مەزنترن و چ ئەوانەی بچووکترن، ڕیّز لە من دەگرن و قسەی من لە ڕۆژهەلاّت و ڕۆژئاوا کاری خۆی دەکات و سوپاس بۆ خوای گەورە کە ئەو منەتەی تۆم نەکەوتە گەردنەوە و ئەرکی من تەواو بوو. پەیامی ئەمیرلموئمنین بشنەفە: دەفەرموویّ کە (قاسم عەجەلی) نەکوژی و دەستی بۆ نەبەی و هەر ئیّستا بینیّرەوە مالّیّ و ئەگەر بیکوژی ئەوا لە جیاتی ئەو دەتکوژمەوە.

کاتیّ ئەفشین ئەمەی بیست، هەموو بەدەنی لەرزی و دەست و پیّی سست بوون و گوتی ئەم پەیامەی خواوەند ڕاستە؟ گوتم بەلّیّ، قەتت بیستووە کە فەرمانەکانی ئەو هەلّبگیّڕمەوە.... ئینجار ڕووم کردە قاسمو گوتم قاسم، گوتی بەلّیّ قوربان، پیّمگوت تەندروستیت؟ گوتی بەلّیّ، گوتم خۆ زامدار نیت؟ گوتی نا، بە پیاوەکانی خۆشم گوت ئیّوە شایەت بن کە تەندروستی باشە و ساغ و سەلامەتە، گوتیان شایەتین و من بە تووڕەییەوە گەڕامەوە. لە دلّی خۆم دەمگوت کوشتنی قاسم مسۆگەرتر کردووە ئەگەر ئیّستا ئەفشین بە دوامدا بیّتەدەر و بچیّتە لای خەلیفە و بلّیّ من پەیامی وام نەناردووە و بگەڕیّتەوە یەکسەر قاسم بکوژیّ ... کاتیّ گەیشتمە بارەگای خەلیفە و گەیشتمە لای خزمەتکاری خەلیفە ... بانگی کردم و چووم دانیشتم. خەلیفە کاتیّ کە منی بەو شیّوە بینی ... گوتی چی ڕوویداوە بیّژە. دەستم پیّکرد و ئەوەی کردبووم هەمووم بۆ باسکرد، کاتیّ گەیشتمە ئەو شویّنەی کە گوتم سەری ئەفشینم ماچ کرد، بینیم ئەفشین لە دەرکە هاتە

ژوور بە پشتێن و کڵاوەوە. من نیگەران بووم و قسەی خۆم بڕی ... کە ئەفشین دانیشت بە تووڕەییەوە بە ئەمیرلموئمنینی گوت: خودان دوێنی شەو قاسمت بە من سپارد کە هەرچی بمەوێ لەگەڵی بکەم، ئەمڕۆ ئەم پەیامەی تۆ ڕاستە، کە ئەحمەد هێنای و دەڵێی نابێ بیکوژم؟ موعتەسەم گوتی پەیامی منە، کەنگێ بیستووتە کە ئەبو عەبدوڵڵا پەیامێك لە ئێمە و باو پیرانی ئێمە بە کەسێك ڕابگەیەنێ و ڕاست نەبێ؟ کە دوێنی شەو لەبەر ئەو هەموو داوایەی تۆ ڕازی بووین و قاسمان دایە دەستت، دەبوا بتزانیبا ئەم پیاوە نۆکەر زادەی بنەماڵەی ئێمەیە، ئەگەر تۆ پیاوێکی ژیر بووایت بانگت دەکرد و بە گیان منەتبارت دەکرد و بە جوانی و بە خەڵاتکردنەوە دەتناردەوە بۆ ماڵەوە، ئەوەت نەکرد و لەوەش دزێوتر دڵشکاندن و نیگەران کردنی ئەبو عەبدوڵڵایە، بەڵام کەسێك ئەوە دەکات کە ئەسڵ و گەوهەرەکەی شایستە و سزاوار بێت. ئاخر (عەجەم) چۆن دەتوانێ عارەبی خۆش بوێ کە لە شمشێر و نێزەی ئەوان ناخۆشی زۆری بینیوە؟ هەستە و بگەڕێوە لەمەو دوا هۆشیارتر و لەسەرخۆتربە.))[٢٦٤]

بەمشێوەیە، ئەحمەد کوڕی ئەبی داود توانی ئەبو دەلف قاسم کوڕی عیسای عەجەلی لە چەنگی ئەفشین ڕزگار بکات. بەڵام ئەو سەرگەردانی و بایەخ پێنەدانە لە خۆباییانەی ئەفشین کە لەو ڕووداوە دەرهەق بە ناوبراو ئەنجامی دان، بووە مایەی نێوان ناخۆشیی ئەو و وەك لە دادگاییکردنی ئەفشیندا دەبینین ئەو هەڵسوکەوتەی ئەفشین بە گران لەسەری کەوت. چونکە ئەو پێشەوا (موعتەزیلە) لە لای موعتەسەمی خەلیفە نفووزێکی زۆری هەبوو. ئەو سەرئەنجام موعتەسەمی هێنایە سەر ئەوەی کە بایەخ و پایەی ئەفشین کەم کاتەوە و ئاگاداری دەسەڵاتەکەی بێ. دەڵێن بە ئاماژە و پێشنیازی ئەو بوو کە موعتەسەم سوپای کردە دوو بەش و نیوەی دایە ئەفشین و نیوەکەی تریشی دایە ئەشناس. ئەفشین بەوە دەڵتەنگ بوو و رك و کینەی ئەحمەد و موعتەسەمی لە دڵ گرت. ئەحمەد بەو دەسەڵات و ئوتوریتەیەی کە لای موعتەسەم هەیبوو توانی ئەفشین لەبەرچاوی خەلیفە بخات. باسێك کە لەوبارەیەوە دەگێڕنەوە ئەو ڕاستییە پشتڕاست دەکاتەوە:

ڕۆژێك ئەحمەد، بە موعتەسەمی گوت، ئەبو جەعفەری مەنسوور ڕای یەکێ لە نزیکەکانی خۆی لە بارەی ئەبو موسلیمی خوراسانی خواست، کابرا بە ئەبو جەعفەری مەنسووری گوت،

---

٢٦٤- تاریخ بیهقی، طبع دکتر فیاض، ل١٧٤ — ١٧٧.

*- الانبیاء / ٢٢

(لوكان فيهما آلهة إلاالله لفسدتا)* مەنسوورگوتبووی ئەمە بەسە و دواتر ئەبو موسلیمی کوشت. موعتەسەم گوتی تۆش ئیدی بەسە و دوای ئەوە ئیدی کەوتە هەوڵی کوشتنی ئەفشین.[٢٦٥]

لەوەدا دەردەکەوێ کە ئەحمەد کوڕی ئەبی داود و ڕەنگە کەسانی تری دەمارگیری عارەب بۆ کوشتن و لە نێوبردنی ئەفشین هەوڵیان دابێ و خەلیفەیان هاندابێ. جگە لە ئەحمەد کوڕی ئەبی داود، (محەمەد کوڕی عەبدولمەلیك زیات)ی وەزیری موعتەسەم و لایەنگری عەبدوڵڵا تاهیریش دژی ئەفشین بووە و ڕکابەرایەتی لەگەڵدا کردووە. بە ڕێکەوت ڕووداوی (منکجور) و ڕاپەڕینەکەی مازیار کە لەو ماوەیەدا ڕوویاندا بە قازانجی ئەوان تەواو بوو و خەلیفەیان بەرامبەر بە ئەفشین بەدگومان کرد.

## لە ئازەربایگان

چیرۆکی یاخیبوونی (منکجور) بەمشێوەیەی خوارەوە بوو، کاتێ کە ئەفشین کاری بابەکی یەکلایی کردەوە و گەڕایەوە سامەڕا، (منکجور) ناوێکی خزمی خۆی کردە فەرمانڕەوای ئازەربایگان کە بەشێك بوو لە قەڵەمڕەوی حوکمڕانیی خۆی. منکجور لە یەکێ لەو گوندانەی ئەو دەڤەرە کە هی بابەك بوو، پارە و داراییەکی زۆری دۆزییەوە، بەڵام ئەو شتەی لە موعتەسەم شاردەوە و ئاشکرای نەکرد. نامەبەری ئازەربایگان نامەیەکی بۆ خەلیفە نووسی و ئەو هەواڵەی پێڕاگەیاند، بەڵام منکجور لە نامەیەکدا نکۆڵی لێکرد و هەواڵگرەکەی خەلیفەی وە درۆ هێنایەوە. وتوویژ و لێپرسینەوەیان کەوتە نێوان. منکجور هاتە سەر ئەوەی کە هەواڵگرەکە بکوژێ. خەڵکی ئەردەبیل ڕازی نەبوون و لێنەگەڕان کە ناوبراو بکوژێ. منکجور کەوتە شەڕ لەگەڵیان. ئەو هەواڵە گەیشتەوە موعتەسەم و فەرمانی بە ئەفشیندا کە منکجور لەسەر کار لاببا و یەکێکی تر لە شوێنی ئەو دابنێ.

سەرچاوەکان نووسیوویانە منکجور خەڵکی (فەرغانە) و برای ژنەکەی ئەفشین بوو و یاخیبوونی دژی خەلیفە بە دەست لە پشتدانی ئەفشین بووە. بە پێی هەندێ گێڕانەوە، هاوەڵانی بابەکیش لەو هەنگاوەیدا لەدەوریدا کۆبوونەوە و ئەو (محەمەدی کوڕی عەبدوڵڵای رسانی) و ژمارەیەك لە لایەنگرانی خەلیفەی کوشتن. کاتێ کە موعتەسەم بە ئەفشینی گوت منکجور لەسەر کار لا ببا و یەکێکی تری لە شوێندا دابنێ، ئەفشین ئەبی ساج دیوداد کە ئەویش یەکێ لە کەسە

---

٢٦٥- دینوری: اخبار الطوال، ل٣٤١.

نزیکەکانی خۆی بوو، بە سوپایەکی زۆرەوە ڕەوانەی ئازەربایگان کرد.[٢٦٦] لە ڕاستیشدا ئەفشین ئەو سوپایەی بە ڕواڵەت بۆ شەڕ دژی منکجور ناردبوو، بەڵام لە ژێرەوە فەرمانی پێدابوون کە لایەنگر و یارمەتیدەری منکجور بن.[٢٦٧] بۆیە موعتەسەم (بوغا)ی سەرداری تورکی بۆ شەڕ دژی منکجور ڕەوانە کرد. کە منکجور ئەو هەواڵەی بیست یەکسەر لە فەرمانی خەلیفە چووە دەرەوە و ناکەس و دز و ڕێگرەکانی لە دەوری خۆ کۆکرنەوە و لە ئەردەبیل چووە.دەر. سەرداری خەلیفە کەوتە دوای و شکاندی و ڕایکردە نێو یەکێ لە قەڵاکانی بابەك و قەڵاکەی چاککردەوە و کردیە پەناگای خۆی، ماوەیەك لەوێ ڕووبەڕووی بوغا ڕاوەستا و سەرئەنجام هاوەڵەکانی خۆی دەستگیریان کرد و ڕادەستی سەرداری خەلیفەیان کرد. هەندێکیش گوتویانە کە ئەو خۆی داوای زینهار و لێبوردنی لە بوغا کردووە. بەهەرحاڵ منکجوریان بردە سامەڕا و موعتەسەم خستیە نێو بەندەوە. لەم سەروبەندەدا ڕووداوی ڕاپەڕینی مازیاریش کۆتایی پێهات و ئەفشین لە هەردوو ئەو ڕووداوەدا تۆمەتبار کرا.

## تێشکانی ئەفشین

بەمشێوەیە بەر لە هێنانی مازیار بۆ سامەڕا، ئەفشینیش کە لێی کەوتبوونە گومان و تۆمەتیان خستبووە پاڵ، دەستگیر کرابوو و دوژمنەکانی توانیان لە نێوی ببەن و بیفەوتێنن. ئاوا، چەند ڕۆژێك پێش ئەوەی کە مازیار بگەیەننە سامەڕا، ئەفشینیان دەستگیر کرد. کەسێك کە لە پێناوی خەلیفەدا پشتی کردبووە دین و دۆست و ئازادی و تەنانەت زێد و خاکی باو باپیرانی خۆیشی، ئێستا کەوتبووە بارودۆخێك کە دەبوا لە خەلیفە واتە لەو هەموو ئومێد و ئارەزووانەی کە ساڵەهای ساڵ بوو کاری بۆ دەکردن هەڵبگەڕێتەوە. بۆ ئەفشین کە خاك و نیشتیمانی باپیرانی خۆی تەسلیمی خەلیفە کردبوو و بابەك و مازیاری لە پێناو ڕەزامەندی خەلیفە خائینانە

---

٢٦٦- ئەم ابو الساج دیودادە لە شەڕی بابەك و ئەفشیندا هاوکاری لەگەڵ ئەفشین کردبوو و پێوەندی خزمایەتییان هەبوو، دوایش بووە کارگوزاری خەلیفە و چەند پۆستێکی وەرگرت، منداڵەکانیشی لە ئازەربایگاندا حکوومەتیان پێکهێنا. سەبارەت بە بارودۆخە ئەوان بگەڕێوە بۆ Defremery، memoire sur la Famille des Sadjides لە ژورنال ئازیاتیك ١٨٤٧ هەروەها طبری و ابن اثیر سەرچاوەکانی ناسراوی تر بە تایبەت دائرە المعارف اسلام.

٢٦٧- تاریخ یعقوبی، ب٣، ل٢٠٣.

ڕاکێشابوونە ژێر سێدارە، خەلیفە تاکە پەناگایەك بوو کە ئەو بتوانێ هیـوا و ئاواتـە فریـودەر و کاتییەکانی خۆی لە سەر بنیات بنێ.

بەڵام ڕەوتی ڕووداوەکان، ئومێد و ئارەزووەکانی ئەویان کردنـە بلّقـی سـەر ئـاو. یـاخیبوونی منکجور کە بە فەرمانی ئەو و بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەلیفە ڕێکخرابوو بە هۆی ئازایەتی و هـەوڵی تورکـەکانی موعتەسـەم سـەرکوت کرابـوو. راپـەڕینی مازیـار کـە ئەفـشین بـە بـەڵێن و وادەی ئومێدبەخـشانە پـشتیوانی و هـانی دابـوو، بـە دەسـتی تاهیرییـەکان، دوژمنـەکانی ئەفشین، دامرکابووەوە.

لە دەزگای خەلافەتیشدا هەموو شتێك بە زیانی ئەو هەڵدەسوڕا. فەرمانـدە تورکـەکانی وەك (ئەشناس) و (ئیتاخ) وردە وردە بە پـێش ئـەو کـەوتن و لـە لای خەلیفـە نفـووز و کاریگـەریی زیاتریان پەیدا دەکرد. ئەحمەد کوڕی ئەبی داود و کەس و کارەکانی ئەبی دەلـف ڕۆژانـە مێـشکی خەلیفەیان دژی ئەو سەردارە خۆپەرستە سەرەڕۆیە، پڕ و بەدبینتر دەکرد.

هاوەڵانی عەبـدوڵڵا تـاهیریش بـۆ لـە نێـوبردنی ئـەو دوژمنـە دێرینـەیان لـە هـیچ شـتێك نەدەپرگانەوە. بەمچەشنە ڕەوشی دەرباری خەلافەت بە ئاشکرا بە زیانی ئەو گۆڕا بوو.[٢٦٨] تـرس و بەدگومانی، ڕك و نائومێدی یان لە ڕوحی ئەودا پەرەپێدەدا و خەلیفەش بەرامبەر ئـەو دۆسـت و خزمەتگوزارەی خۆی بەدبین ببوو.

چارەیەك نەمابوو، ئەفشینیش بە ئاشکرا دەیبینی کە موعتەسەم بە تەواوی بەرامبەر بـەو گۆڕاوە. دەیزانی کە نفووز و دەسەڵاتی ڕکابەر و دوژمنەکانی، ئیدی چیتر بواری خۆ دەرخستن و خۆنواندنی پێنادەن. تێدەگەیشت کە بوونی ئەو هەموو پیلان و ڕکابەریکردنەی کە دژی ئـەنجام دەدران ئیدی لە دەرباری خەلیفەدا جێگایەکی ئاسوودە بۆ ئەو دەست ناکەوێ. ترسـا و کەوتـە هەوڵی ئەوەی کە خۆی لە نێو گێژاوی لافاو دووربخاتەوە. بەڵێ لە ڕاکـردن بـەو لاوە چـارەیەکی تری نەبوو.

## لە هەوڵی ڕاکردندا

یەکەم جار زۆر مەشکی ئامادەکردن تا بەو مەشکانە لە ئـاو بپەڕێتـەوە. پێویـست بـوو کـە موعتەسەم و دەست و پێوەندەکانی مژوول و سەرگەرم بکات تا بە هۆی ئەو مەشکانە بتوانێ لـە ئاوی ڕووباری دیجلە بتوانێ بپەڕێتەوە و ڕێگەی موسڵ بگرێتە بەر. ئینجا لە زێی گەورە بدا و لـە

268- Caliphate ‹p517.

ڕێی ئەرمەنستانەوە خۆی بگەیەنێتەوە هەرێمی خەزەر. ڕەنگ بوو بەمشێوەیە بیتوانیبا هەم خۆی لە مەترسی قوتار بکات و هەم دیسان زێدی باپیرانی خۆی بکەوێتەوە دەست کە ڕۆژگارێك لە پێناو وەدەستهێنانی پلەوپایە و سامان و دارایی لە دەستی دابوو. پارە و پوول و شمەکێکی زۆریشی کە بۆ فەرمانڕەوایی کردن پێویست بوون، پێشتر ناردبوونە لای خزم و کەسەکانی خۆی.

بەڵام ئەو کارە بەند بوو بە شانس، و ڕەوتی ڕووداوەکان بڕیاریان لێدەدا، بە ڕێکەوت ئەو ڕووداوەی کە یارمەتیدەربێ بۆ ئەو هەنگاوەی ئەفشین، ڕووی نەدا. بۆیە ئەفشین نەیتوانی بەو نەخشەیە خۆی لە گێژاوی مەترسییەکان دەرباز بکا و ناچار بوو بیر لە ڕێگا چارەیەکی ترسناکتر بکاتەوە.

ئەمجارەیان ژەهرێکی گیانستێنی ئامادە کرد و بڕیاری دا کە خواردنێك سازبکا و موعتەسەم و هاوەڵەکانی بانگهێشت بکا و ئەو ژەهرەیان دەرخوارد بدا مەگەر بەمشێوەیە بتوانێ خۆی لەو مەترسییە دەرباز بکا کە باڵی بەسەردا کێشا بوو. بیری لەوە کردبووەوە کە ئەگەر خەلیفە خۆی بانگهێشتەکەی قبوڵ نەکرد و نەهات، ئیزن لەو وەربگرێ کە ئەشناس و ئیتاخ و تورکەکانی تری خەلیفە بانگ بکات. هەرنەبێ ئەوان ژەهر خواردوو بکات بە شێوەیەك کە لە ماڵی ئەو چوونە دەر نەگەنە ماڵی خۆیان و لە بەین بچن و نەتوانن بە دوای بکەون. بە پێی گێڕانەوەیەکی تر گوایە ویستوویە خەلیفە و فەرماندە سەربازییەکانی بانگهێشت بکا و هەموویان لە ماڵی خۆی بکوژێ. ئینجا کە شەو داهات بەو مەشکانەی کە پێشتر ئامادەی کردبوون لە شار بچێتەدەر و لە ڕووبار بپەڕێتەوە و خۆی دەرباز بکات.

ئەگەر ئەم نەخشەیە سەری گرتبا، بۆی هەبوو بتوانێ لە ڕێی خەزەرەوە بچێتەوە ئەشروسنە و خەڵکی هەرێمی خەزەر دژی موسڵمانان هان بدا و ئاژاوە و سەرهەڵدانێك دژی خەلیفە بەرپا بکات. بەڵام ئەو پیلانەش سەری نەگرت و فێڵ و تەڵەی میرزادەی ئەشروسنە ئاشکرا بوو.

## دەستپێکی پیلان

ئەفسەرانی ئەفشین، لەوکاتەی کە سەرداری ئەشروسنە دژی خەلیفە نەخشەی دەکێشا، ئاگاداربوون. سەرچاوەکان نووسیویانە کە ئەوانیش وەکو سەرانی تر لە سەرای خەلیفە نۆبەتداریان دەکرد. لە نێوان بیژەنی ئەشروسنی[٢٦٩] و یەکێ لە کەسە نزیکەکانی ئەفشیندا گفتوگۆیەك ڕوویدا

---

٢٦٩- طبری وای نووسیوە کە بیژەنی فارسییە.

کە نهێنییەکەی ئاشکرا کرد. بیژەن گوتبووی پێموانیە ئەفشین بتوانێ ئەو کارە بکات کە بە دەستیەوەتی. ئەو پیاوە قسەکەی بیژەنی بە ئەفشین ڕاگەیاند و ئەفشین لە بیژەن کەوتە گومان و هەوڵی لە نێوبردنیدا. بیژەن کە بە هۆی یەکێ لە برادەرەکانی خۆیەوە لە مەبەستی ئەفشین ئاگادار بووەوە، ترسا و شەو چووە سەرای خەلیفە و ئەوی لە پیلانی ئەمیرزادەی ئەشروسنە ئاگادار کردەوە.

لەوکاتەدا نامەی عەبدوڵڵا تاهیر گەیشتە خەلیفە و دەرکەوت کە مازیاریش دەستگیر کراوە. مازیاریش کە ئەفشین پەیوەندی پێوە هەبوو، ئەو نهێنییەی بۆ عەبدوڵڵا تاهیر ئاشکرا کردبوو. ڕەنگە عەبدوڵڵا تاهیریش لە نامەکەیدا ئاماژەی بەو پیلانەی ئەفشین دابووبێ. بەهەرحاڵ موعتەسەم لەو پیلانەی کە ئەفشین دژی خەلافەت دایابوو، ئاگاداربووەوە.

سەرداری ئەشروسنە میواندارییەکی ڕێکخستبوو و خەلیفەی لەگەڵ هاروون و جەعفەری کوڕانی خەلیفە بانگهێشت کردبوو بۆ ماڵی خۆی. خەلیفە گوتبووی ئەوان ناتوانن بێن، بەڵام من دێم و لەگەڵ پەنجا سوار لە کەسە باوەڕ پێکراوەکانی خۆی چووە ماڵی ئەفشین. ئەفشین سەرای خۆی ڕازند بووەوە و سەد کەسی لە هیندی و زەنگییەکانی خۆی شاردبووەوە تا هەر کاتێک ئاماژەی بۆ کردن لە کەمینەکانیان بێنەدەر و خەلیفە لە نێو ببەن.

کە موعتەسەم گەیشتە بەردەرکەی سەرای ئەفشین جڵەوی ئەسپی خۆی ڕاکێشا و ڕاوەستا و پرسی فلاّن و فلاّن لە کوێن؟ ئینجا پیاوە نزیکەکانی خۆی یەك یەك ڕەوانەی ژووریێ کردن و خۆی لە دەرەوە مایەوە. یەکێك لەو هیندیانەی کە لە دالانەکە خۆی پەنا دابوو پژمی، موعتەسەم کە پێشتر بە هۆی بیژەنی ئەشروسنی لەو پیلانە ئاگادار کرا بووەوە، ڕیشی ئەفشینی گرت و بەسەریدا نەڕاندی و گوتی ((تالاّن، تالاّن!))

پیاوەکانی موعتەسەم ئەفشینیان دەستگیر کرد و بە زنجیران بەستیانەوە. سەرای ئەویان ئاگر تێبەردا و پیاوەکانیان دەستگیر کردن. خەلیفە، سەرداری ئەشروسنەی کە ئەو هەموو خزمەتە گرنگ و شایستانەی بەو کردبوون لە سەرۆکایەتی پاسەوانان لادا و ڕەوانەی زیندانی کرد. ریوایەتێکی تریش لەو بارەیەوە هەیە کە دەڵێ کاتێ کە بیژەنی ئەشروسنی چووە لای موعتەسەم و ئەوی لەو هەنگاوەی کە ئەفشین بە تەما بوو ئەنجامی بدا، ئاگادار کردەوە، موعتەسەم بانگی ئەفشینی کرد و لە کۆشکی خۆیدا دەست بەسەری کرد و دواتر ڕەوانەی دادگای کرد، بەم چەشنە بوو کە شازادەی جیهانخوازی ئەشروسنەیان گرت و ڕەوانەی زیندانیان کرد.

## دادگایکردنی ئەفشین

دوای ئەوە، ئەفشینیان ڕاکێشایە بەردەم دادگا، دادگایەك کە لە (ئەحمەد کوڕی ئەبی داود) قازی قازییەکان و (محەمەد کوڕی عەبدولمەلیك زیات)ی وەزیر و چەند کەس لە دەربارییەکانی موعتەسەم پێکهاتبوو، دەستی بە لێپرسینەوەی ئەوکرد. بەلاّم تۆمەتەکەی خیانەتکردن بە خەلیفە نەبوو، بەلکو بەوە تۆمەتبار کرابوو کە هێشتا هەر لەسەر ئایینی باو باپیرانی خۆیەتی و هەر بە ڕووکەش ئایینی ئیسلامی قبولکردووە و لە دلّدا هەر لەسەر ئایینی دێرینی خۆی ماوەتەوە. ژمارەیەکیش لە خەلکی (سوغد) و هاو ئایینە دێرینەکانی ئەویشیان بۆ شایەتیدان بانگ کردبوون.

ئەو دادگاییکردنە، وەك هەندێ لە لێکۆلەران باسیان کردووە و لەبەردەستیشدا هەیە، ڕەوشی دەرباری خەلافەت ڕوون دەکاتەوە و ئەوەنشیان دەدا کە ئایینی (شەمەنان) لەو سەردەمەدا هێشتا هەر لەبرەودابووە، بەتایبەتی لە خۆرهەلاّتدا بەتەواوی ئازادبووە و هیچ کەس بلاّوکردنەوەی ئەو ئایینەی قەدەغە نەکردووە، تەنانەت بە گشتی خەلکی ئێران ئەگەرچی بەناو و بەڕوالّەت موسولّمان بوون، بەلاّم زۆربەیان هەر پابەندو دلّبەندی ئایینی دێرینی خۆیان بوونو هەرکاتێك دەرفەت و دەلیڤەیەکیان بۆ هەلکەوتبا لە وازهێنان لە ئایینی ئیسلام و گەڕانەوە بۆ ئایینی دێرینی خۆیان ئاویان نەدەخواردەوە و دلّیان لەدلّ نەدەدا[٢٧٠].

دادوەری ئەو دادگاییکردنە، محەمەدی کوڕی عەبدولمەلیك زیات بوو و ئەوانەی بۆ ڕووبەڕووکردنەوەی ئەفشینیش ئامادەبوون بریتی بوون لە مازیاری شازادەی تەبەرستان و مەزرەبان کوڕی ترکیش یەکێ لە فەرماندەکانی سوغد و هەروەها دووکەسی خەلکی سوغد لەگەلّ (موبد)ێك بۆ شایەتی دان دژی ئەفشین لەو دادگاییکردنەدا ئامادەبوون. تەبەری و ئەوانی تر ڕەوتی ئەو دادگاییکردنەیان بەدرێژی باسکردووە. دەنووسن کە لەو دادوەرییەدا یەکەمجار دوو پیاوی خەلکی سوغدیان بانگکردن، ئەوانە جل و بەرگی دڕاو و کۆنیان لەبەردابوو، کە جلەکانیان داکەند هەموو ئێسکی بەدەنیان بەدەرەوە بوون و گۆشتیان پێوەنەمابوو.

کوڕی زیات کە سەرۆکایەتی دادگاکەی دەکرد پرسی: "ئەو دوو پیاوە دەناسی؟" ئەفشین وەلاّمی دایەوە: "بەلّێ ئەو دووکەسە لە ئەشروسنە مزگەوتێکیان دروستکرد. یەکێکیان بانگدەر و ئەوەی دیکەیان پێشنوێژی مزگەوتەکە بوو، من هەریەکەو هەزار قەمچیم لێدان، چونکە

---

٢٧٠- Caliphate ،p 518.

بەڵێننامەیەك لە نێوان من و پادشاکانی سوغددا هەبوو کە هەر کەسی ئازاد بێ لەسەر ئایینی خۆی بمێنێتەوە. ئەو دوو پیاوە بەسەر بتخانەیان دادا بوو و بتەکانیان فڕێ دابوونە دەرێ و مزگەوتێکیان لە شوێنی بتخانەکەدا دروست کردبوو. من لەبەر ئەوەی ئەوانە لە سنووری خۆیان زیاتر پێدرێژیان کردبوو و بەڵێنەکەیان شکاندبوو، هەزار قامچیم لێدان."

وەزیر پرسی: "ئەو کتێبەی کە بەزێڕ و دیبا و جەواهیر رازاندووتەوە و ناوەرۆکەکەی پڕە لە وتەی کوفر ئامێز چییە و بۆچی هەتە؟" بەرسڤی دایەوە کە"ئەوە کتێبێکە لە باوکمەوە بۆ من بەجێماوە. کتێبەکەش هەم وتە و گوتاری پەند ئامێزی زانا و بیرمەندانی ئێرانی تیایە و هەم وتە و باسی کوفر ئامێزی ڕابردوون، من سوود لەوتە پەند ئامێزەکان وەردەگرم و وتە کوفر ئامێزەکانیش بەلاوە دەنێم. من ئەو کتێبەم کە لەباوکمەوە بەمیرات بۆم بەجێماوە ئاوا بەڕازاوەیی بینیوە، بەپێویستم نەزانی کە ئەو جوانکارییەی لێبکەمەوە و وەکو خۆی لێیگەڕام. لەسەرای کۆندا کتێبی (کەلیلە و دیمنە) و کتێبی (مەزدەك)[٢٧١] هەیە و من پێموانییە هەبوونی ئەو کتێبانە ئێمە لە ڕیزی موسڵمانان بێنێتە دەرەوە..." ئینجا بانگی موبدەکەیان کرد. موبد گوتی کە "ئەم پیاوە گۆشتی ئاژەڵی مردار کە خنکێنرابێ دەخوا و منیشی ناچار دەکرد کە ئەو گۆشتە بخۆم و دەیگوت ئەم جۆرە گۆشتە لە گۆشتی ئەو گیاندارەی کە سەری بڕابێ تازەتر و باشترە." موبد ئەوەشی زیادکرد کە "ئەم هەموو ڕۆژانی چوارشەممە مەڕێکی ڕەشی دەخنکاند و دەیکوشت و ئینجا بەشمشێر دوولەتی دەکرد و بەنێو هەردوو لەتی لاشەی مەڕەکەدا دەڕۆیشت و گۆشتەکەی دەخوارد" و هەروەها ئەو تۆمەتەشی دایە پاڵ کە "ڕۆژێك بەمنی گوت: من بۆ ئەو عارەبانە هەرچییەك کە نەفرەتم لێدەکرد، کردم تا ئەو ڕادەیەی کە ڕۆنی دوونگم خوارد و سواری وشتر بووم و دەمپێی — واتە نەعلەم -کردە پێم تەنها ئەوە نەبێ کە تائێستا مووێك لە جەستەم کەم نەبۆتەوە، واتە نەمووێکم بە ئاهەك لەخۆم کردۆتەوە و نەخەتەنەکراوم." ئەفشین ڕووی لە

---

٢٧١- ناوی ئەو کتێبە لە پارچە هۆنراوەی ئەسمەعی لە جنێودانی بەرمەکییەکان داهاتووە هەندێك لە گێڕانەوەی (جاحێز) لە (البیان و التبین ب٢، ل١٦٠) مروك گوتراوە، ئەم گریانە دورە، بەلام وتەی حەمزەی ئەسفەهانی و دانەری نەناسراوی مجمل التواریخ کە ئەم جۆرە ڕێوایەتەی لە حەمزە وەرگرتووە مروك لەسەردەمی ئەشکانی دەبێ دانرابێ.

واژەی مروك: واژەی مروك پەرتووك و پەڕاوی ناسراوی مۆدك بەمانای بەشارەتە کە بۆ کتێبی ئایینی لەجێ خۆیەتی.

ئامادەبووان کرد و پرسی: بەمن بڵێن ئایا باوەڕتان بەو پیاوە هەیە کە ئەم قسانە لای ئێوە دەکات؟ ئەم پیاوە موبدێکی زەردەشتی بوو لەسەر دەستی (متەوەکیل)ی برای خەلیفە خۆی بەپەشیمان نیشانداو بوو بە موسڵمان. ئایا باوەڕ بە دینداری ئەم پیاوە دەکەن؟" گوتیان نا، گوتی"ئەی چما شایەتی کەسێك کە باوەڕ بە دینداریییەکەی ناکەن قبوڵدەکەن؟" ئینجا ئەفشین ڕووی کردە موبدەکە و پرسیاری کرد"ئایا هیچ دەریچە کلاو ڕۆژنەیەك لە نێوان ماڵی من و ماڵی تۆدا هەبووە؟ کە لەوێوە سەر هەڵکێشیێ و لە بارودۆخ و ڕەوشی من ئاگادار ببیتەوە؟" گوتی نەخێر. پرسی"مەگەر ئەوە نەبوو کە من تۆم بردە ماڵی خۆم و نهێنی خۆم بۆ باسکردی و دۆستی و حەز و خۆشەویستی خۆم دەرهەق بە ئێران و ئێرانییەکان بۆ ئاشکرا کردی، ئایا وانەبوو؟" موبد گوتی:"وەك دەڵێی وابوو" ئەفشین گوتی:"کەوایە تۆ نە لە ئایینی خۆت شایستەی باوەڕپێکردنی و نە لە گفت و پەیمانبەستندا وەك خۆت دەمێنیتەوە. ئەو ڕازەی کە من دۆستانە بەتۆم سپارد، تۆ نامەردانە ئاشکرات کرد."

ئینجا مەزرەبانی کوڕی ترکیش هاتە پێش، لە ئەفشینیان پرسی ئەم پیاوە دەناسی؟ گوتی نا. بەمەزرەبانیان گوت تۆ ئەمە دەناسی؟ گوتی بەڵێ ئەمە ئەفشینە. بە ئەفشینیشیان گوت ئەمە مەزرەبانە. ئینجا مەزرەبان ڕووی لە ئەفشین کرد و گوتی:"ئەی فێڵباز، ئەو هەموو فێڵ و چاوبەستەکییە چییە بەکاریان دێنی؟" ئەفشین گوتی:"ئەی ڕیشدرێژی نەزان دەتەوێ چی بڵێی؟" گوتی:"خەڵکی لای خۆتان چۆن نامەت بۆ دەنووسن؟" گوتی:"وەك چۆن بۆ باوك و باپیرمیان دەنووسی ئاواش بۆ منی دەنووسن." پرسی: بۆ ئەوانیان چۆن دەنووسی؟ ئەفشین گوتی:"ئامادەنیم بیڵێم." مەزرەبان گوتی:"مەگەر ئەوان لەنامەکانی خۆیان بەزمانی ئەشروسنیان نەدەنووسی؟" گوتی:"باوایان دەنووسی" پرسیاری لێکرد: ئایا مانای ئەم وشانە ئەوە نییە کە "بۆ خوای خوایان لەبەندەی ئەوەوە فلانی کوڕی فلان؟" ئەفشین گوتی:"بۆنا، مانای ئەم وشانە ئەوەیە." محەمەد کوڕی عەبدولمەلیك زیات ڕووی کردە ئەفشین و گوتی: "ئایا موسوڵمانان هەرگیز چاوەڕێی ئەوە دەکەن ئاوا لەبارەیانەوە بدوێن و ئاوا ناویان بهێنرێ؟ ئەی چیت بۆ فیرعەون هێشتۆتەوە کە دەیگوت من پەروەردگاری ئێوەم؟" وەڵامی دایەوە "خەڵکی بەم شێوەیە ناوی باوك و باپیری دەهێنا و هەروەها منیش بەرلەوەی ببمە ئیسلام هەربەم شێوەیە ناوم دەهێنان، کاتی بوومە ئیسلام بەچاکم نەزانی کە خۆم لەباپیرانی خۆم دابڕم، تا بەفەرمانەکانم سەرپێچی لەبڕیار و فەرمانەکانم نەکەن."

(ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم کوڕی مەسعەب) کە بەڕێوەبەری پۆلیس بوو گوتی:"هەی داد ئەی خیدر تۆ چۆن سوێند بەخوا دەخۆی و ئێمە بە موسوڵمانت دەدەینە قەڵەم و تۆش داوای ئەوە دەکەیت کە فیرعەون داوای دەکرد؟" وەڵامی دایەوە کە "عەجیف"[272]، ئەو سورەیەی بەسەر عەلی کوڕی هیشام"دا خوێند و تۆش بەسەر منیدا دەخوێنی، بزانین کە سبەینێش کێ بەسەر تۆیدا دەخوێنێ." ئەم وەڵامە بە ئاشکرا ئاماژە بۆ ئەو پیلان و بەدزمانی و خراپەکاریانە دەکات کە دەربارییەکان و دەست و پێوەند و نزیکەکانی خەلیفە دژی یەکتر ئەنجامیان دەدا. عەلی کوڕی هیشام لە کۆتاییەکانی قۆناغی خەلافەتی مەئموونندا سەرۆکی پاسەوانەکان بوو. چەپەڵکاران بە سەرکەشی و لادەر تاوانباریان کرد و مەئموونیان لێ بەدگومان کرد. خەلیفە فەرمانی بە (عەجیف کوڕی عەنیسە) دا کە یەکێك لەسەردارانی ئەو بوو، عەلی کوڕی هیشام ئامادە و دەست بەسەر بکات. عەجیف هەوڵی دا تا ئەو و حوسێن کوڕی هیشامی برایان لە نێوبردن. سەری عەلیان بەنێزەوە کرد و بردیانە برقە و دوای ماوەیەك فڕێیان دایە نێو دەریاوە[273].

عەجیفیش چەند ساڵ دواتر کەوتەبەر رك و نەفرەتی مەعتەسەم و بەو تۆمەتەی کە هانی عەبباس کوڕی مەئموون برازای مەعتەسەمی داوە دژی خەلیفە ڕاپەڕێ، خرایە زیندان و لە نێویان برد. نەفرەت و بەدگومانی خەلیفە دژی عەجیف بەڕادەیەك بوو کە ئەو کاتەی عەجیف نوسیەبین کۆچی دوایی کرد، سالْحی کوڕی، هاتە لای خەلیفە و نەفرەتی لەباوکی کرد و بێزاری خۆی ڕاگەیاند و داوای لە خەلیفە کرد کە ئەو بەناوی باوکییەوە بانگ نەکەن و لە جیاتی سالْحی کوڕی عەجیف بە سالْحی کوڕی مەعتەسەم ناوی بێنن[274]. لەو وەڵامەی کە ئەفشین بەقسەکانی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم دەیداوە، لەڕاستیدا ئاماژە بە گۆڕان و بوویەرەکانی زەمانە دەکا و بەکینایە پەردە لەسەر پیلان و نەخشە ژێربەژێرەکانی رکابەرەکان لادەبات.

---

٢٧٢- مەبەست لە عەجیف بن عبنسە کە لەسەردارانی مەئموون بوو دوای عەلی کوڕی هاشم کرایە سەردەستەی پاسەوانەکان.

٢٧٣- تاریخ یعقوبی، ب٣، ل١٩٣.

٢٧٤- تاریخ یعقوبی، ب٣، ل٣٠٣.

## ئەفشین و مازیار

دوای ئەمانە مازیاری سپەهبۆدی تەبەرستانیان لەگەڵدا ڕووبەڕووکردەوە، ئەوەی کەلەو بارەیەوە (یەعقوبی) باسی کردووە جیاوازە لەگەڵ ریوایەتە بەناوبانگەکەی تەبەری. یەعقوبی دەنووسێ کاتێ کە مازیاریان لەگەڵ ئەفشیندا ڕووبەڕووکردەوە، ئیبن داودی قازی بەمازیاری گوت: ئەمەیە ئەفشین، کە دەڵێی ئەو تۆی بۆ شۆڕش و یاخیبوون هانداوە. ئەفشین ڕووی کردە مازیارو گوتی:" درۆ بۆ خەڵکی بازاڕی ناڕەوایە، ئاشکرایە بۆ پادشایان چەندە شتێکی ناشیرین و دزێوە. بەخوا درۆ تۆ لە مردن ڕزگار ناکات و ئاکامی ژیانی خۆت بەدرۆ کۆتایی مەهێنە."

مازیار گوتی: ئەفشین نە نامەیەکی بۆ من نووسیووە نە نێردراوێکی بۆلای من ناردووە، جگە لەوەی نەبێ کاتێ کە (ئەبولحارث)ی بریکاری من بۆی گێڕامەوە کە چۆتە لای ئەفشین، ئەفشین ڕێزی لێناوەو چاکەی لەگەڵدا کردووە[275]. بەمشێوەیە بەگوێرەی قسەی یەعقووبی مازیار پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەفشین بەتەواوی ڕەت کردەوەو نکۆڵی لێکرد.

بەڵام ڕیوایەتی تەبەری لەو بارەیەوە باوترە. ئەو دەنووسێ کاتێ کە مازیاریان هێنا، لە ئەفشینیان پرسی، ئەم پیاوە دەناسی؟ گوتی نا. بەمازیاریان گوت تۆ ئەم پیاوە دەناسی؟ گوتی بەڵێ ئەمە ئەفشینە. بە ئەفشینیشیان گوت ئەمە مازیارە. گوتی ئێستا ناسیم.

پێیانگوت ئایا قەت نامەت بۆ نووسیوە؟ گوتی نەخێر. لە مازیاریان پرسی ئایا ئەفشین نامەی بۆ تۆ نووسیوە؟ گوتی بەڵێ، (خاش)ی برای نامەی بۆ کۆهیاری برام نووسی کە :"ئەم ئایینە سپیە لەمن و تۆ و بابەك زیاتر، کەسێکی تری نەماوە پشتیوان و یارمەتیدەری بێ. بابەك بەنەزانی خۆی بەکوشتندا و من زۆرم هەوڵدا کە لە مردن دەربازی بکەم نەکرا و گێلی و نەزانی خۆی لێنەگەڕا تاکاری بەوە گەیشت کە خۆت دەزانی، بەڵام تۆ ئەگەر ڕاپەڕی و مل بۆ ئەمانە کەچ نەکەیت، ئەمانە هیچ کەسێکیان نییە بۆ شەڕی تۆی بنێرن، هەر منم کە زۆربەی سواران و دلاوەرانم لەگەڵ دان، جا ئەگەر منیان بۆلای تۆ ڕەوانە کرد ئەوا دێمە ڕیزی ڕاپەڕین و ئیدی هیچ کەسێك نابێ بتوانێ لەبەرامبەرمان بوەستێ و شەڕی ئێمە بکات. جگە لە سێ لایەن کە بریتین لە عارەبەکان، مەغریبییەکان و تورکەکان. بەڵام عارەبەکان وەکو سەگ وان هەندێ ئێسقانیان بۆ هەڵدە و سەریان پێدابخە. ئەو مێش و مەگەسە مەغریبییانەش خەڵکانێکی سەرەخۆرەن، بەڵام ئەو بەچکە شەیتانانە کە پێیان دەگوترێ تورك دوای کاتژمێرێك کە تیرەکانیان تەواوبوون ئینجا

---

275- تاریخ یعقوبی، ب3، ل203.

بەسەریاندا بدە و هەموویان تارومار و بنبڕ بکە. تا ئایین بۆ ئەو حاڵەتەی بگەڕێتەوە کە ئێران لە ڕۆژگاری شکۆداری خۆیدا تێیدابوو."

ئەفشین گوتی ئەم پیاوە قسەیەك لەسەر برای خۆی و برای من دەکات و ئەم قسەیە هیچ پەیوەندی بەمنەوە نییە. ئەگەر منیش شتێکم بۆ نووسیبان بۆلای خۆی رابکێشم کە متمانەم پێبکا، شتێکی خراپ نەدەبوو چونکە من بە شمشێر یارمەتی خەلیفەم داوە، لەجێی خۆی دەبوو کە بەفێڵ یارمەتی ئەویش بدەم تا مازیار دەستگیر بکەم و ڕادەستی خەلیفەی بکەم و هەمان ئەو سوود و بەهرەیە وەربگرم کە عەبدوڵڵا تاهیر لە گرتنی مازیار وەریگرتووە و لەلای خەلیفە پلەوپایە و دەسەڵاتی خۆم وەربگرمەوە." ئینجا مازیاریان بردە دەرەوە.

ئەو وەڵامەی ئەفشین بەئاشکرا لە ناخی دڵی ئەوەوە سەرچاوە دەگرێ و ئەوە نیشان دەدا کە ئەمیرزادەی ئەشروسنە بۆ ئەوە نامە و نامەکاری لەگەڵ مازیاردا کردووە کە فریوی بدا و بەخیانەت کردن دەرهەق بەو خزمەتێك بەدەزگای خەلافەتی عارەبەکان بکات. کاتێ کە ئەفشین بەزمانێکی توند قسەی لەگەڵ مەزرەبان ترکیش و ئیسحاق ئیبراهیمدا کرد، ئیبن ئەبی داودی قازی نەڕاندی بەسەریدا. ئەفشین گوتی ئەی ئەبا عەبدوڵڵا تۆ قازی بۆ ئەوەی دادگەری بکەی. ئەبی داود لێیپرسی ئایا تۆ خەتەنە کراوی؟ ئەفشین گوتی نا. لێیپرسی خەتەنەکردن کارێکە ئایینی ئیسلامی پێ تەواو دەبێ و پاك و خاوێنی دێنێتەدی، چی ڕێگر بوو بۆ تۆ ئەنجامی نەدەیت؟ وەڵامی دایەوە کە مەگەر لە ئیسلامدا پاراستنی گیان جایز نییە و کاری پێناکرێ؟ قازی گوتی با. گوتی ترسام کە ئەگەر ئەو پێستە لەجەستەی خۆم بکەمەوە بمرم. ئەبی داود گوتی تۆ پیاوی نێزە و شمشێری و ترسی مردن لەشەڕ دووری نەخستییەوە، بڕین و لێکردنەوەی تیکە پێستێکی زیاد لە مردن دەتترسێنێ؟ ئەفشین گوتی شەڕکردن کارێکی ناچاریە کە سوودی لێوەردەگرم و دەتوانم بەرگەی بگرم بەڵام، ئەمەیان پێویست نییە و بەئەنجامدانیشی لە گیانی خۆم دڵنیانابم. جگە لەوە پێموانییە کە خۆم خەتەنە نەکردووە، ئەمە سەرپێچی بێ لە ئیسلام.

ئیبن ئەبی داود بە ئامادەبووانی گوت ئێستا بۆ هەمووتان ڕوون بووەوە کە کار و هەڵسوکەوت و حاڵی ئەمە چۆنە. ئینجا بە (بوغای) سەرداری تورکی گوت کە لەو دانیشتنەدا ئامادەبوو ئەفشین بگرێ و لەدەرکەی وەزیرەوە بۆ زیندانی ببات.

بەم چەشنە بوو کە سەردەمی هێز و دەسەڵات و شکۆی ئەفشین، شازادەی ئەشروسنە کۆتایی هات.

## سەرەنجامی ئەفشین

سەرچاوەکان نووسیویانە کە لە زینداندا مرد. دەڵێن بەرلەوەی بمرێ، کەسێکی ناردە لای موعتەسیم و داوای لێکرد باوەڕ پێکراوێکی خۆی بنێرێتە لای. موعتەسیم (حەمدون کوڕی ئیسماعیل)ی نارد. ئەفشین دەستی بەقسان کرد و داوای لێ بوردنی کرد لەوەی لەبارەی ئەوەوە گوتراوەو گوتی بە (میری باوەڕداران) بڵێ مەتەڵی من و تۆ وەکو ئەو پیاوە وایە کە گوێلکێکی دابەست و قەڵەوی کرد تاباش گوشتی گرت و رسکا، برادەرەکانی دەیانویست گۆشتەکەی بخۆن و هەوڵیاندا خاوەنەکەی ڕازی بکەن کە بیکوژێتەوە، بەڵام داواکەیانی قبوڵ نەکردن، دواتر هەموویان رێککەوتن کە بڵێن: ئەرێ برا تۆ ئەم بەچکە شێرە بۆ دادەبەستیو بەخێوی دەکەیت، مەگەر نازانی بەچکەشێر کە گەورە بوو دەگەڕێتەوە سەر بنەچەی خۆی. کابرا گوتی ئەمە گوێلکەکەی بەچکەشێرە؟ پێیان گوت شێرە و لە هەرکەسێکی دەتەوێ بپرسە، پێشتر هەرکەسێکیان دەناسی چووبوونە لای و پێیانگوتبوو ئەگەر سەبارەت بەو گوێلکە لێیان پرسین بڵێین بەچکە شێرە. کابرا لەهەر کەسێکی پرسی پێیانگوت شێرە. بڕیاری دا گوێلکەکە سەربڕن. من ئەو گوێلکەم، چۆن دەتوانم ببمە شێر؟ بۆخاتری خوا چاو بەسزاکەی مندا بگێڕێتەوە، حەمدون گوتی من کە لەلای ئەو هەستام سەبەتێك میوەی لەلا بوو کە موعتەسەم (٢٢٧ ك/ ٨٤٢ ز) بە (واسق) ی (٢٣٢ ك/٨٤٧ ز) کوڕیدا بۆی ناردبوو. ئەفشین ئەودەم تەندروستی زۆر باش بوو، کاتێ لەلای ئەو گەڕامەوە گوتیان مردووە[٢٧٦]."

بەم پێیە دیارە ژەهر خواردیان کردووە. تەرمەکەیان لەزیندان هێنایەدەر و لە دەروازەی گشتی بەداریانەوە هەڵواسی[٢٧٧].کۆمەڵە بتێکی زۆریشیان هێنان کە دەیانگوت لەماڵەکەی ئەویان هێناون و، لەگەڵ تەرمەکەی دا سووتاندیانن.

چیرۆکی ناکامی کاری ئەو لە هەندێ کتێبدا ئاوا هاتووە کە : "موعتەسم رۆژێك میوەیەکی زۆری دانایە سەر سەبەتێك و بەکوڕەکەی خۆی کە نازناوی (هاروون ئەلواسیق بیللا) بوو، گوت ئەم میوەیە ببە بۆ ئەفشین، میوەکەیان بۆ واسق هەڵگرت و چووە لای ئەفشین. ئەفشین سەیرێکی میوەکەی کرد گوتی ﴿لااله الا الله﴾ چ میوەیەکی خاسە، بەڵام ئەوەی من حەزی لێدەکەم تیای نییە. واسق پرسی تۆ ئارەزووی چ میوەیەك دەکەی؟ گوتی (شاهەڵوژە). (واسق) گوتی هەر ئێستا

---

٢٧٦- ابن اثير، ب، ل٣٥٨.

٢٧٧- مروج الذهب، ب٣، ٣٤٤، تن کامل ابن اثیر، ل٩ -١٦٨، چاپی لەندەن، رووداوی ٣٦٦.

بۆت ڕەوانە دەکەم و ئەفشین پێی گوت: سڵاوی من بە ئەمیرولمونمینین ڕابگەیەنە و پێی بڵێ باوەڕ پێکراوێکی خۆی بنێرێتە لام تا پەیامێکی تایبەتی خۆمی بۆ بنێرم. موعتەسم، حەمدون کوڕی ئیسماعیلی نارد و حەمدون لەسەردەمی (متەوەکیل) لەبەندی سلێمان کوڕی وەهبدا بوو، ناوبراو ئەو باسەی واگێڕاوەتەوە کە: موعتەسم منی نارده لای ئەفشین و پێی گوتم ئەفشین زۆر درێژدادڕە. نابێ زۆر لە نزیکی دانیشی. من چوومە لای و ئەو سەبەتە میوەیەم لەوێ بینی کە دەستی لێنەدابوو. پێیگوتم دانیشە و دانیشتم، دەستی بە قسەی خۆمانە کرد و دەیویست سەرنجی خۆیم بۆ ڕاکێشی. پێیمگوت بە کورتی ئەوەی مەبەستتە دەریبڕە، چونکە ئەمیرلموئمینین پێیگوتم دانەنیشم، ئەفشین بە کورتی گوتی بە ئەمیرلموئمینین بڵێ کە زۆر چاکەی دەرهەق بەمن ئەنجام داوە و پلە و پایەی بەرزی پێ بەخشیوم و سوپا و سەربازی زۆری خستۆتە ژێر فەرمانم، ئێستا قسەی ناڕاست سەبارەت بە من وەردەگرێ و بۆ ڕاستی و دروستی ئەو قسانە ناگەڕێتەوە بۆ عەقڵی خۆی ... ئەوەی کە بەتۆیان گوتووە گوایە من منکجورم دژی تۆ هانداوە و بەو فەرماندانەم گوتوە کە بۆ شەڕی منکجور چوونە، شەڕ نەکەن... تۆ پیاوێکی، ڕەوشی شەڕ و شۆڕان دەزانی و شەڕت لەگەڵ پیاواندا کردوون و هێز و لەشکری زۆرت بۆ شەڕان بردووە، ئایا ڕێی تێدەچێ فەرماندەی لەشکر وابە سەربازەکان بڵێ؟ ئەگەر ڕێشی تێچوو، نابێ تۆ ئەو قسانە لە دوژمنەکانی من قبوڵ بکەیت، خۆت دەزانی کە مەبەستی ئەوان بەو قسانە چییە... حەمدون دەڵێ لای وی هەستام، سەبەتە میوەکە وەك خۆی دەست لێنەدراو لە شوێنی خۆی بوو. کاتێ هاتمەدەر، دوای ئەوە گوتیان ئەفشین مردووە و موعتەسەم گوتی تەرمەکەی نیشانی کوڕەکەی بدەن. ئەفشینیان لە زیندان هێنایە دەر و هەڵیاندایە بەردەم کوڕەکەی. کوڕەکەی مووی سەر و ڕیشی خۆی دەرهێنان. دواتر ئەفشینیان هەڵگرت و بردیانەماڵی ئیتاخ و لەوێشەوە بردیانە دەروازە و هەڵیانواسی و دواتر لەداریان کردەوە و خستیانە نێو ئاگر و سووتاندیان و خۆڵە مێشەکەشیان فڕێ دایە نێو دیجلەوە. کاتێ کە شتومەك و کالاکانی ئەویان هاوێر دەکرد و دەژمارد لەنێو شمەکەکانیدا پەیکەری پیاوێکیان دۆزیەوە کە لەدار دروستکرابوو و بەزێڕ و جەواهیر ڕووپۆش کرابوو، جگە لەوە لەهەر جۆرێك بتی تریان دۆزینەوە و کتێبیان دۆزینەوە کە دیانەت و ئایینی بتپەرستانیان تیا نووسرابوو[٢٧٨]."

---

٢٧٨- حافظ البرو:- زبدة التواريخ، نسخه خطى.

سەرەنجام چارەنووسی ئەفشین کە بە ئامانجی خۆی نەگەیشت بەو شێوەبوو. وەك چۆن بابەك و مازیاریش فریوی ئەویان خوارد و نەیانتوانی شتێك بکەن. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵ و خەباتی ئەو سەردارانە، جیابوونەوە و سەربەخۆیی خوراسان و بەشێك لە ولاّتی ئێرانی لەژێر ڕکێف و دەسەلاّتی خەلافەتی بەغدا، لێکەوتەوە. تاهیرییەکان دەسەلاّت و سەربەخۆییان وەرگرت و حکوومەتی ئەوان مژدەی دروستبوونەوەی دەوڵەتی ئێرانی هێنا.

## تاهیرییەکان

ئایا دەتوانین حوکمڕانیەتی تاهیرییەکان بە دەستپێکی حکوومەتی سەربەخۆی ئێرانی دوای ئیسلام بدەینە قەڵەم؟ قسە هەڵدەگرێ. تاهیرییەکان، ئێرانی و خەڵکی پۆشەنگی هەرات بوون. زۆریش شانازیان بە نەژادی خۆیان دەکرد. بەلاّم بەر لە گەیشتن بە حوکمڕانیش لە ڕێی (مەوالات)ەوە خۆیان بە عارەبەکانەوە بەستبووەوە، بەلاّم کاتێ کە هاتنە خوراسان لەبەرئەوەی دەیانویست پەیوەندی خۆیان لەگەڵ دەرباری بەغدا ببڕن، بە پێویستیان زانی کە پەیوەندی نێوان خۆیان و ئێرانییەکان پتەو و مکوم بکەن. هەوڵیاندا بۆ جێگیرکردنی حکوومەتەکەیان پێگەیەکی مکوم لە نێودڵی خەڵکدا دروست بکەن. حکوومەتەکەیان، هەرچۆنی بگری ڕەنگێکی ئێرانیانەی نەبوو و ئەوان بیری زیندووکردنەوەی دەوڵەتی ساسانی و بووژاندنەوەی ئایینی زەردەشتیان کە ئەوانی تر هەوڵیان بۆ دەدا، لە مێشکی خۆیان هێنابووە دەر. دەوڵەتی ئەوان، هەرچەندە لە دەوڵەتی بەغدا جیاببووبوونەوە، بەلاّم لە ئایینی موسوڵمانی جیانەبوونەوە. بۆیە، بەپێچەوانەی مازیار و بابەك، پشتیوانی و لایەنگری موسوڵمانە ئێرانییەکانیان لەدەست نەدا و هەر ئەوەش بوو کە توانیان ئارەزووی سەربەخۆیی و دەسەلاّتدارێتی خۆیان بچەسپێنن و بێننەدی. ڕەفتاریشیان لەگەڵ خەڵك و ژێر دەستەکانی خۆیان نەرم و دادپەروەرانەبوو. سەرچاوەکان دەنووسن کاتێ لەساڵی ٢٢٠ك/٨٣٥ لە سیستان قات و قڕی ڕوویدا و ئاوی ڕووباری هیرمەند وشك بوو، ئەوان سێسەد هەزار دەرهەمیان ناردە لای مەلاکانی سیستان تا لە نێوان دەروێش و هەژاراندا کە پەرپووت ببوون دابەش بکەن[٢٧٩]. ڕاستە کە کاربەدەستەکانی ئەوان لە خوراسان دەستیان لە بێدادی و دەستدرێژیکردنە سەر خەڵك نەدەبوارد، بەلاّم لەو

---

٢٧٩- تاریخ سیستان، ل١٨٦.

ڕۆژگارەی کە خەلافەتی بەغدا گلۆڵەی کەوتە لیژی و بەرەو هەڵوەشانەوە دەڕۆیشت، دەسەلاتی پۆلاپینی ئەوان، خوراسانی لە ئاژاوە و هەرج و مەرج و پشێوی پاراست.

ئا بەم شێوەیە، ئەگەرچی ناتوانین دەوڵەتی ئەمانە وەکو ئەوەی کە ئەبو موسلیم و سنباد و ئەستادسیس و بابەك و مازیار هەوڵی دامەزراندنیان بۆ دەدا بزانین، بەلام دەوڵەتی ئەمان، بەهەرحاڵ پێشەنگی سەربەخۆ بوونی ئێران بوو.

## نەبەرد لەنێو ڕووناکیدا

ئەو نەبەرد و بەرخۆدانەی کە ئێرانییەکان لە ماوەی ئەو دوو سەدەیە بەرامبەر پەلاماردەرانی عارەب نواندیان هەمووی هەر لە نێو تاریکی و رق و دەمارگیرییەوە نەبوو. ئەو نەبەردە لە نێو ڕووناکی و ژیری و زانینیشەوە بەردەوام بوو و بازاڕی وتوویژ و دیالۆگە ئایینی و فەلسەفییەکان گەرم بوو. زۆر لە ئێرانییەکان، هەر لە ڕۆژانی دەستپێکەوە بە دڵخۆشی خۆیان ئایینی ئیسلامیان قبوڵکرد و ئەو ئایینە نوێیەی کە عارەبەکان هێنابوویان، لە ئایینی دێرینی باو و باپیرانی خۆیان باشتر دەبینی و (ثنویت - دوالیزم dualism)ی نارۆشن و تاریکی زەردەشتیان لەهەمبەر (توحید)ی بێ ئەملا و ئەولای ئیسلام، بە (شیرك) و (کوفر) دەزانی. ئەوانە ئەو حەماسەتە توند و سەرکەشەشیان تیانەبوو کە وای دەکرد هەرشتێك کە پاك و چاك و دروستە، بە ئێرانی بزانن و هەر چییەکیش دزێو و پیس و نادروستە، بە نائێرانی بدەنە قەڵەم. بۆیە ئایینی ئیسلامیان بە ئایینێکی پاك و چاك و ئاسان کەوتە بەرچاو و بەشەوق و زەوقەوە لە دەوری کۆبوونەوە. بەڵام ئەگەرچی ئایینی عارەبەکانیان قبوڵکرد کەچی ئەوانیان خستە ژێر کاریگەریی فەرهەنگ و پەروەردەی خۆیانەوە و هێنایانە سەر فەرهەنگو شارستانیەتی خۆیان. بەڵام ئێرانییەکان هەموویان هەر ئاوا نەبوون. هەندێکی تریان، وەك چۆن لە هەر شتێکی تازە مەترسیان هەیە و خۆی لێ دوور دەگرن، بەرامبەر ئایینی عارەبانیش وابوون و ڕوویان لێوەرگێڕاو هەر لەبەرئەوەی ئەو ئایینە دیاردەیەکی نا ئاشناو تازە و نەناسراوبوو، قبوڵیان نەکرد. وایان بەباشتر زانی وڵات و زێدی خۆیان جێبهێڵنو سەری خۆیان هەڵبگرن و ببنە ئاوارە و دەربەدەری گۆشە و کەناری جیهان و ئەو ئایینە نوێیە کە بۆ ئەوان شتێکی نەناسراو و نامۆ و نەشیاو بوو، ڕەت بکەنەوە و قبوڵی نەکەن. تەنانەت دواجار دوای ساڵەهای ساڵ دەربەدەری و بێ دەرەتانی لە کێو و بیابانەکان، ئازاری کۆچکردنیان بەکۆڵ دادا و چوونە (سند) و (سنجان) تا ئەو ئایینەی کە لە باو و باپیرانی خۆیانەوە وەریانگرتبوو و زۆر دڵبەستەی بوون وازلێنەهێنن و لەدەستی نەدەن. ئەوانەی کە بەرگەی ئازاری دەربەدەری و ئاوارەییشیان نەدەگرت، بەناچاری ملیان بۆ خەفەتی سووکایەتی و ئازاری موسوڵمانان کەچکرد و لە شوێنەکانی خۆیان مانەوە و (جزیە) یان داو دەستیان لە ئایینی دێرینی خۆیان بەرنەدا. بەشێکی تریان، هەر لە سەرەتادا دژی ئایینی ئیسلام ڕاوەستان و کەوتنە بەرەنگارییەوە، ئەوان چوونە نێو و قبوڵکردنی ئەو ئایینەیان کە عارەب هاوردبوویان. بە سووکایەتی و ناڕەواییەك دەرهەق بەخۆیان لێکدەدایەوە. بۆیە ئەگەر بە ڕواڵەتیش خۆیان بەموسڵمان دەنواند، لەژێرەوە

زۆر لە عارەبەکان و ئەو ئایینە بێزاربوون و لەهەر شوێنێکیش دەرفەتێکیان بۆ هەڵکەوتبایە ڕادەپەڕین و عارەبەکان و موسڵمانەکانیان تەفر و توونا دەکرد. ئەو بۆچوونەی کە عارەب نزمترین مرۆڤی سەر ڕووی زەویە مێشکی ئەوانی وا پڕ و سەرقاڵ کردبوو کە هەرگیز نەیاندەویست بیر لە ئاشتەوایی یان نزیکبوونەوە لەوانە بکەنەوە. هەر ڕۆژە و لە شوێنێکدا و بەبیانوێك دەستیان بەراپەڕینێك دەکرد و هەوڵیان دەدا عارەبەکان بەو ئایینەی کە لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان لە ئێران وەدەرنێن. هەندێکی تریش هەبوون کە ئیسلامیان، نە لەبەر ئەوەی کە شتێکی نامۆ و نەناسراوە، و نە لەبەر ئەوەش کە هێنراوی دەستی عارەبانە، بەڵکو تەنها لەبەرئەوەی کە ئایینە، ڕەت دەکردەوە و لەدژی ڕاست دەبوونەوە.

(زینـدیق)ەکان و (بیرئازادەکان) کە لەسەرەتاکانی سەردەمی خەلافەتی عەبباسیدا ژمارەیەکی زۆریان لە بەغدا و شارەکانی تردا هەبوو، لەوانەبوون.

بەهەرحاڵ بوونی ئەو گروپ و تێڕوانینە جیاجیایانە، بازاڕی باس و مشتومڕی ئایینی یان لە نێوان عارەبەکان و ئێرانییەکاندا گەرم دەکرد و دەبووە مایەی دروستبوونی نەبەردێکی سەخت لە نێو ڕووناکی و لەژێر تیشکی عەقڵدا کە ماوەیەکی زۆر درێژەی کێشا و دەرەنجامی گرنگیشی هەبوو.

## ئایینی زەردەشت

بەڵێ، ئایینی زەردەشتی کە کەوتبووە بەر مەترسی ئیسلامەوە، ئایینێك بوو باوەڕی بە بوونی دوو هێز (ثنویت) هەبوو. لەو ئایینەدا بنەمای چاکە لە بنەمای خراپە جیاوازبوو. هەرچییەك کە چاك و ڕووناکی و جوانی بوو بە بنەمای چاکە دادەنراو هەرشتێکیش دزێو و تاریکی و چەپەڵی بوو دەدرایە پاڵ خراپەوە. ئەم ئایینە وەکو ئایینە ڕووحانییەکانی تر، ئەو توانایەی هەبوو کە تۆوی چاکە و ڕووناکی لە نێو دڵان بچێنێ و گەرد و تەپ و تۆزی چرکین و ئەهریمەنی لە گیانەکان بسڕێتەوە و نەهێڵێ، جگە لەوە ئایینی کار و کۆشش بوو و بێکاری و گۆشەنشینی و خۆ لە خەڵك دابڕینی بەشتێکی پاك و یەزدانی دانەدەنا. ئەوەی بە ئەرکی سەرشانی ئادەمیزاد دەزانی کە لە ژیانیدا دژی درۆ و چەپەڵکاری و نزمبوون خەبات بکا و ئەو دیاردە دزێوانە لەقاوبدا[281]. فدیە و قوربانی و بادە گوساری بەشتی بێهودە دە ژمارد و

281- یەسنای٣٠، بڕگەی هەشتەم.

پەسەندی نەدەکرد. ئەوزوهد و ریازەتەش کە لە ئایینەکانی تردا هەبوو لە ئـاییـنی زەردەشـتدا نەبوو.

لەو ململانێیەی کە لە نێوان چاکە و خراپەدا هەیە، مـرۆڤ دەبـێ لای چـاکە بگـرێ، ئـەوە ئەرکەو ئەو ئەرکەش کە بۆ مرۆڤ دیاریکراوە، دەرخەری ئەو ئازادی و ئیختیاریەیە کە مرۆڤ لە کار و هەنگاوەکانی خۆیدا هەیەتی. بەم پێیە جەبر و لـە چارەنووسـینیش کـە هـۆی سـەرەکی پووکانەوەی ئایینەکانە لە ئایینی زەردەشتیدا بوونی نەبوو. مرۆڤ ئەو توانایەی هـەبوو کـە لـە نێوان چاکەو خراپەدا چاکە هەڵبژێرێ و لاگیری چاکە بێ. ئەمە ئیدی بەسترابووەوە بە خواست و ئیختیاری ئەوەوە. رزگاری و ئازادبوونی ئەویش بەو خواست و ئیختیارەی ئـەوەوە پەیوەسـت بوو. لەوەها ئایینێکدا، کە ئادەمیزاد بەرپرسی کار و کـرداری خۆیـەتی، ئیـدی شـوێنێك بـۆ تەقدیر و لە چارەنووسین نییە و هیچ کەس ناتوانێ گوناهی تەوەزەلی‌و کەنارەگیری خـۆی بخاتـە ئەستۆی تەقدیری نادیاری بێ دەرەنجام[٢٨٢]. ئایینێك کە ئاوا سـادە و سـوودمەند بـوو بەچـاکی دەیتوانی رێگای ڕاست و ڕووناکی و پاکی نیشانی خەڵك بدات و حەز و ئارەزووی مەعریفەت و کار بخاتە نێودڵی ئادەمیزادەکانەوە. بەڵام ئەو کارە دام و دەزگایەکی رێك و پێکی گەرەك بـوو کە لەگەندەڵی و پۆخلکاری فریوکاران بەدووربێ، ئەو چەشنە دام و دەزگایـە لـە کۆتاییـەکانی سەردەمی ساسانییەکاندا لەئێراندا بوونی نەبوو. لەڕاستیدا هێزی مـەعنەوی ئایینی زەردەشـت بەس بوو بۆ ڕێنوێنی ئەخلاقیی خەڵك، بەڵام ئەو تین و تاو و توانایەی نەبوو کە بتوانێ دەزگای گەورەی شارستانیەت و کۆمـەڵگای ساسانی لەگەڵ خۆیدا بەرەو پێشەوە ببات و ئەمە ئـەرکێك بوو کە پادشاکانی ساسـانی لەسـەردەمی ئەردەشـێردا [مـردووە لـە (٢٤١ ز)] خـستبوویانە سەرشانی ئەو. ئەردەشێری بابەکان حکوومەتی ساسانی لەسەر پایەی ئاین بنیات نا و ئـاین و دەوڵەتی بەدوو برای هاوپشتی یەکتر دانان. لەوە بەدواوە موبد و (هیربد)ەکان زۆر هەوڵیاندا کە چارەنووسی حکوومەت و دەوڵەت بگرنە دەستی خۆیان. ئەگەر یەکێك لەپادشـاکان دژی پلـە و پایەخوازی رۆحانییەکان ڕاوەستابوا، یا وەکو (یەزدی گورد) بە گوناهکار دەدرایە قەڵـەم، یـان وەك قوباد بە بەدناو و بێ دین دەژمێردرا. (ئاتەشـگا) لـە سەرانسـەری سـەردەمی ساسـانیدا چاودێر و باڵا دەست بوو بەسەر هـەموو کارەکانـداو موویـد و هیربـۆدان زۆرترینـی پۆسـت و

---

٢٨٢- بۆ توێژینەوە لە بارەی جەبر و ئیختیار لە ئایینی زەردەشت بگەڕێوە بۆ کتێبـی جەکسـۆن لـەژێر ئـەو ناونیشانە zoroasrtian studies. New York ١٩٢٨ part ١١.

کاروبارەکانیان لەدەستدا بوو. وەها دەسەلات و ئیعتبارێک کە ئەو نفووز و کاریگەریەی بەروحانییەکان بەخشی بوو لە هەموو کارەکانی دەولەتدا، بەس بوو بۆ ئەوەی کە گەندەڵی رابکێشێتە نێو دەزگای رۆحانییەوە. لە راستیشدا موویید و هیربودان لەدوا دواییەکانی سەردەمی ساسانیدا کەوتبوونە نێو گەندەڵکاری. کتێبی پەهلەوی (مینۆگئی خیرەد) کە بە پێی نیشانەکان لە دوا قۆناغی ساسانیدا دانراوە، لە شوێنێکیدا کە باس لە عەیب و کەم و کوڕی رۆحانییەکان دەکات، دەڵێ عەیبی رۆحانییەکان ریاکاری و چاوچنۆکی و فەرامۆشکاری و تەمبەڵی و کورت بینی و خراپەکارییە"[٢٨٣].

ئایا ناوهێنانی ئەو هەموو عەیب و شوورەیی و ناتەواویی و کەم و کوڕی و خەسڵەتە ناپەسەندانە، نیشانەی بوونی ئەمانە نییە لە نێو چینە ئایینییەکانی ئەو سەردەمە؟ پێناچێ هیچ گومانێك لەوەدا هەبێ. بەتایبەت کە سستی و بێ هێزی و گەندەڵی نیشانەگەلی تری کاری موبدەکانن لەو سەردەمەدا.

## گەندەڵی و ناکۆکی

بەڵێ، ئاتەشگا ئەگەرچی ئاوێتەی گەندەڵکاری موغ و موبدەکان ببوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموو کاروبارێکدا داوای مافێکی تایبەتی بۆ خۆی دەکرد. بەمچەشنە، بە هۆی ئەو گەندەڵی و بێ سەر و بەرییەی کە لە هەموو کاروبارەکانی موبید و هیربودانی زەردەشتیدا بەدی دەکرا، ئیدی ئاتەشگا توانای بەڕێوەبردنی ئەو هەموو ئەرك و کاروبارانەی نەمابوو. لە راستیدا تا دەزگای کارگێڕی و کۆمەڵایەتی ساسانی زیاتر فراوان دەبوو و تا دەسەلات و هێزی شارستانیەتی ڕووکەش و ڕواڵەتیانەی شاهەنشاهی ئێران پەرەی دەسەند، توانا و هێزی ئاتەشگا لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی وڵات کەمتر دەبووەوە و دادەکشا. بەتایبەت کە داهێنان (بیدعەت)ە ئایینییەکانیش هەر ڕۆژە دەسەلاتی موبدانی دەخستە لەرزەوە و خەڵکی یان سەبارەت بە پاکی و ڕاستی ئەوان دەخستە نێو گومان و دوودڵییەوە.

لە نیشانە و بەرژەنگەکاندا دەردەکەوێ کە لە قۆناغی ساسانیدا، جیاوازی و ناکۆکییەکی زۆر لە ئایینی زەردەشتیدا هەبووە و ئەو هەموو ناکۆکی و دژایەتیە، زادەی بیدعەتە

---

٢٨٣- دانا و مینوگئی خیرەد، بەشی ٥٩- بگەڕێوە بۆ وەرگێرانی وێست، ل١٨٣ و دەقی پەهلەوی چاپ داراب دەستور پشوتن سنجانا، ل٨٣.

ئایینییەکان بووە کە لەو سەردەمەدا سەریان هەڵدا و بێگومان کاریگەرییەکی لە ئایینی فەرمی دەوڵەتدا هەبوو. لە قەڵەمڕەوی بەرفراوانی حکوومەتی ساسانیدا، ئایینی زەردەشت، لەگەڵ ئایین و مەزهەبە جیاجیاکاندا ڕووبەڕوو بوو. ئایینی عیسا و مەزهەبەکانی کلدانی و (سابینەکان) لەلای ڕۆژئاوا لەبەرامبەریدا بوون. لە ڕۆژهەڵاتدا ئایینی بوودا و دینی شەمەنان هەڕەشەیان لێدەکرد. فەلسەفەی یۆنانیش، بەتایبەت لە سەردەمی ئەنۆشیروان، هەندێ هزر و ئەندێشەی سەرقاڵی خۆی کردبوون. لەو هەموو ڕووبەڕووبوونەوە و مشتومڕەی کە لە نێو ئایین و تێڕوانینەکاندا لەگۆڕێ بوو بە ناچاری ئاین و ئایینزای تازەی دەهێنایە ئارا.

## ئایینی مانی

ئایینی مانی یەکەمین داهێنانی (بیدعەی) ئایینی بو کە لەگەڵ سەروسەدایەکی زۆری ئەو ڕووبەڕووبوونەوەی تێڕوانین و باوەڕانە سەری هەڵدا. سەربردەی مانی و ئەو ئایینە نوێیەی کە دایهێنا، باسێکی درێژە و لەم نووسینەدا جێی نابێتەوە. ئەوەندە هەیە کە مانی بەحوکمی ئەو ژینگەیەی کە تیایدا پەروەردە بوو و بەپێی هەلومەرج و بارودۆخی قۆناغی ژیانی خۆی، ئایینێکی داهێنابوو کە تیایدا زۆر لە ڕەگەز و بەشە عیسایی و زەردەشتی و زەرڤانی و هەندێ لە بیروباوەڕی (سابینەکان)، (مەندائییەکان) و (حەرانییەکان)ی پێکەوە پەیوەست کردبوون و تێکەڵکێشی یەکتری کردبوون[٢٨٤]. باوك و دایکی ئێرانی بوون و بێدەستی خۆی بەشێك لە بیروباوەڕی ئەوانی هەبوو، بەڵام وەك سەبارەت بەو باسکراوە و دەرکەوتووە لە (بابل) دا ئەشونومای کردوە، بۆیە بیروباوەڕی بابلییەکان و کلدانییەکان و مەزهەبە جیاجیاکانی سابینەکان و حەرانییەکان لە هزری ئەودا کاریگەریان هەبوو. گەشتو گەڕانێکی زۆریشی بەرەو ڕۆژهەڵات کردبوو کە ئەو گەشتانە لەوێ ئەویان بە بیروباوەڕەکانی بوودایی ئاشنا کردبوو و دەتوانین کارتێکردنی هەموو ئایین و باوەڕەکان لە بیروباوەڕ و تێڕوانینی ئەودا بەدی بکەین. ئایینی مانی کە لە ڕاستیدا هەویرێکی شێلدراوی بیروباوەڕ و مەزهەبە باوەکانی ئەو سەردەمە بوو، لای موغەکان، بە بیدعەیەکی گەورە

---

٢٨٤- بگەڕێوە بۆ کتێبی مانی و ئایینەکەی ئەو کە بریتییە لە دوو وتاری بەڕێز سەید حەسەن تەقی زادە، بڵاوکراوەی ئەنجوومەنی ئێران ناسی، ل٣٠- کە نوێترین توێژینەوەی گرنگە لەبارەی مانی، پێڕستی لەسەر چاوەی ڕەسەنی فارسی و عارەبی پێوەندار بە مانی بە هەوڵی ئەحمەد ئەفشار شیرازی خراوەتەسەر کە زۆربەی سەرچاوەی لەوێ وەرگرتوون.

لێکدەدرایەوە و وەکو لە کتێبە مێژووییەکاندا باسکراوە، مویدانی زەردەشتی بۆ دامرکاندنەوەی، هەوڵێکی زۆریان داوە. ئەویان دادگایی کرد و لە نێویان برد و پەیڕەوەکارەکانیشیان بەتوندی سزادان. بەڵام وێڕای ئەوەش، ئایینی مانی کە زەوقێکی عیرفانی و جوانکارییەکی هونەری تایبەتی هەبوو، لەنێو نەچوو و ساڵەهای ساڵ نەك هەر هەڤرکی ئایینی زەردەشتی بوو بەڵکو لەگەڵ ئایینی عیسا و تەنانەت لەگەڵ ئایینی ئیسلامیشدا لە دژایەتی و بەهەرڵستکاری دا بوو. بەڵام هەر لەو کاتەی کە مانی لەسەردەمی شاپووری یەکەمدا ئاشکرابوو، مویدەکان ئایینی ئەویان بە بیدعەت و (زەندقە) دایە قەڵەم و بەتوندی مەحکومیان کرد، چونکە دەرکەوتنی ئەو جۆرە نۆبەرە و داهێنانە بیدعەتانە، زەربەی لە شکۆداری و تواناو دەسەڵاتی ئەوان دەدا.

## مەزدەك

وێڕای ئەمە ڕووبەڕووبوونەوەی بیروباوەڕ و مەزهەبە جیاجیاکان، سەرهەڵدانی ئەو جۆرە داهێنان و بیدعەتانەی یان دەکردە شتی حەتمیو ئەو سەرسەختییەی کە موغەکان لە کوشتن و ڕاودەدوونانی مانەوییەکان پیادەیان دەکرد دەرگە و دەروازەی بێ باوەڕیان پێ نەبەستراو زۆری پێ نەچوو کە مەزدەك دەرکەوتو قسەی تازەتری لەگەڵ خۆی هێنان. وەك لە سەرچاوەکان باسکراوە خۆی یەکێك لە مویبدەکان بووە و، ئەو ئایینە نوێیەش کە هێنای بە لێکدانەوەو پێداچوونەوەیەکی تێڕوانینەکانی زەردەشت دەژمێردرا. لە بواری پرسی دڕندەییو ئازار، کە هەم زەردەشت و هەم مانی گرنگییەکی تایبەتیان پێدەداو بە تەوەری باوەڕی (دوالیزم) دەژمێردرا، مەزدەك بۆچوونێکی تازەی هێناو گوتی دەبێ هەموو خراپەو دزێویەکانی جیهان لە دێوی بەخیلیو دێوی چاوچنۆکییەوە بزانین. چونکە ئەو شتەی کە یەکسانی و بەرامبەری نێوان خەڵکی، کە مایەو هەوێنی ڕەزامەندی هۆرفرە، نابوودکردووەو لە نێوی بردووە، هێزو دەسەڵاتی ئەو دێوە ناحەزانەیە. بۆیە تا ئەوکاتەی هەرچی کە مایەی بەخیلیو رق و چاوچنۆکی خەڵکە لە نێو نەچێ یەکسانیو بەرامبەری کە فەرمانو خواستی ئەوە لە جیهاندا بەدی نایە. ئایا چیرۆکی هاوبەشیکردن لە ژنو دارایی دەرەنجامی لۆژیکی ئەو بۆچوونە بووە کە مەزدەك هەیبووەو خۆی کاری بۆ کردووە و، برەوی پێداوە؟ یا دژەکانی ئەوو ئەو کەسانەی کە تێڕوانین و بۆچوونەکانی ئەویان بە هۆکاری پشێوی باری جیهان زانیوە، ئەو قسەو باسەیان داوەتە پاڵ! حوکمدانی دروست لەو بارەیەوە کارێکی ئاسان نییە، چونکە شتێك لە کتێب و نووسینی مەزدەکییەکان نەماوەتەوە، بەڵام دوور نییە ئەوەی کە مێژوونووسانی زەردەشتیو مەسیحی و موسڵمان لەو بارەوە تۆماریان کردووە خاڵی نەبێ لە زیادەڕۆیی. ئەو چەشنە

ناوهێنانەی کە لە کتێبەکانی زەردەشتی لە بارەی مەزدەك دەهێندرێ پڕاوپڕە لە کینەو نەفرەت. سەرچاوە مەسیحییە سریانی و یۆنانییەکان تروسکایەکی ویژدانیان تیا بەدی ناکرێ، جا ئەوەی لەو بارەیەوە باسیان کردووە چۆن لە بەخیلی و چەپەڵی خاڵی دەبێ؟ بەو کوشتارە سەرسوڕهێنەرە دڵڕەقانەیەی کە خوسرەو ئەنوشیروان دەرهەق بە پەیڕەوکارانی مەزدەك ئەنجامی دا، مویدەکان پێیانوابوو ئیدی ئایینی (مەزدەکی کوڕی بامداو) لەناوچووە، بەڵام تەنانەت دوای ڕوخانی ساسانییەکانیش هەر مایەوەو ماوەیەکیش بەناوی (خوڕەمدینی)یەوە لەدژی موسڵمانان بەرخۆدانی کرد[285].

## زەندقە و لێکدانەوەی بنەماکان

لە سەردەمی ئەنوشیرواندا هەندێ نیشانە و بەرژەنگ لەبەردەستدان کە باس لە ئاشنابوونی ئێران بە فەلسەفەی یۆنانی دەکەن. بەرلەوەش پەیوەندیی هزری لەگەڵ هیند و یۆنانی هەبوو. زۆر لە کتێبە ئایینی و زانستییەکان لە هیندی و یۆنانییەوە وەرگێڕدرابوونە سەر زمانی پەهلەوی. کاریگەریی بیروباوەڕ و داب و نەریتە یۆنانی و هیندییەکان بێگومان ئاسۆگەی تازەی دەکردەوەو شك و گومان و بیدعەتگەلێکی دەهێنانە ئارا. سادەیی و ڕۆشنیی سەیر کە لە بیروباوەڕە کۆنەکاندا هەبوو لە ژێر بار و کاریگەریی ئەندێشەگەلی تازەدا تێکدەشکان. بایەخدان بەهەڵسەنگاندن و شیکردنەوەی بیروباوەڕەکان و خولیای شیکردنەوە و وردبوونەوە لە ئەفسانەکان تا دەهات پەرەی دەسەند. زەندقە کە مویدەکان بە توندی دژایەتیان دەکرد، سەرچاوەی لە هەمان ئەو مەیل و خولیایەی ڕامان و شیکردنەوەیە دەگرت. مانی و مەزدەکیش ئەو باوەڕەی کە هێنابوویان و کاریان بۆ دەکرد ڕەنگی ڕامان و شیکردنەوەی هەبوو، بۆیە مۆرکی زەندقەیان بەسەردا بڕی. باوەڕبوون بە ئەفسانە و بیروباوەڕە کۆنەکان وردە وردە سست دەبوو، و ڕەواجیان نەدەما و ڕۆشنبیران لەبەرامبەر هەڵگرانی ئایینە تازەکان، شیکردنەوەیان کردبووە چەکی دەستی خۆیان. لەو شیکردنەوانەدا کە بریتی بوون لە بەڵگەکاریی عەقڵی، هەندێ جار لە ڕواڵەتی دەربڕینەکان کتێبی ئایینیی لادەرانە دەنووسران. لە نێویاندا لەو گفتوگۆیەی کە یەکێ لە مۆغەکان لەگەڵ مەسیحییەکدا کە ناوی

---

٢٨٥- سەبارەت بە مەزدەك بگەڕێوە بۆ کریستەن سەن لە بارەی پادشایەتی قوباد و سەرهەڵدانی مەزدەك کەلەلایەن نەسروڵڵا فەلسەفی و ئەحمەد بیرەشك وەرگێڕدراوەتە سەرزمانی فارسی. تاران، چاپ کەلالە خاوەر، ١٣٢٠ هەتاوی.

(مێهران گوشنەسپ) بوو، کردوویەتی، ئاوا دەڵێ: "ئێمە بە هیچ چەشنێك ئاگر بەخوا نازانین، خوا بە هۆی ئاگرەوە نیایش دەکەین، وەك چۆن ئێوەش خوا بە هۆی خاچەوە دەپەرستن." مهران گشنسب، کە لە کتێبە سریانییەکاندا ناوی "گیورگیس"ە، هەندێ گوزارە لە ئاوێستا نەقڵ دەکات و دەیسەلمێنێ کە لە ئایینی زەردەشتدا، ئاگر بارتەقای خوا کراوەتە مایەی پەرستن[٢٨٦].

ئەو گەشبینی و سادەییەی کە تایبەت بوو بە ئایینی زەردەشت، لە دوا دوایەکانی ئەو سەردەمەدا، وردە وردە لە ژێر کارتێکردنی فەلسەفە و زەندقەدا تێك دەشکا. بڵاوبوونەوەی باوەڕی مانی و ڕێنوێنییەکانی عیسا و بودا، هەموویان لەو هۆکارانە بوون کە مەیل بەزوهدو گۆشەگیریان لە نێوان خەڵکدا کەم و زۆر برەوپێدەدا. لە ئامۆژگاری (ئۆشنەر) گوزارەیەك هاتووە کە تاڕادەیەکی زۆر لەگەڵ باوەڕ و تێڕوانینەکانی زەردەشت جیاواز و تاڕادەیەك مۆرکێکی مانیی هەیە. گوزارەکە دەڵێ:"گیان دەمێنێتەوە، ئەوەی کە لە نێو دەچێ جەستەیە." ئایینی زەرڤان کە لە سەردەمی ساسانیدا لە هەموو ڕێباز و ئایینەکانی تر لە پێشتر بوو، چارەنووس و تەقدیری برەوپێدا، کە بۆ ئایین و دەوڵەت ژەهرێکی کوشندە بوو.

## زەرڤانییەکان

زەرڤان، خوای دێرین، کە بە باوکی هورمزد و ئەهریمەن دەژمێردرا، تەنها زەمانی بێکۆتایی نەبوو، بەڵکو بە مەزهەری تەقدیر و چارەنووسیش دەژمێردرا. لە ئایینی زەرڤاندا، ئەوپەڕی هەوڵدرا بوو کە ڕەگی چاکە و خراپە هەردووکیان بگەڕێنرێنەوە بۆیەك چاوگ کە زەرڤانە. لەوە بەدواوە زەرڤان کە پەروەردگاری زەمان بوو، بووبە خاوەن ئیختیاری ڕەها و دەسەڵاتی بەهێز و ئیدی بوارێك بۆ دەسەڵات و ئیختیاری مرۆڤ نەمایەوە. بەم شێوەیە باوەڕبوون بە جۆرێك (جەبر) کە دەرەنجامی ئەو ئایینە بوو، هێواش هێواش خۆی خزاندە نێو خەڵك و بوو بە مایەی روخان و پووکانەوەی دەوڵەت[٢٨٧].

---

٢٨٦- بگەڕێوە بۆ کتێبی Hoffmann هۆفمان لە بارەی رەسالەی سوریانی کردەوەی شەهیدانی ئێران، وەرگیراوە لە کتێبی Christensen: L، Iran sovs les sassanides، p٤٣٥.

٢٨٧- سەبارەت بە ئایینی زەرڤان سەیری کتێبی Zaehner Zurvan Azoroastrian Dilemma oxfird ١٩٥٣. بکە کە زانیاری بەکەڵکی تێدایە هەرچەندە دانەر سەرچاوەی زۆری لەبەردەستدا بووە، بەڵام سوودی باشی وەرنەگرتووە.

لەو ئایینەدا، ورمزد و ئەهریمەن، دوو کوڕ بوون، لەو کاتەی کە زەرڤان ناوی (بێ کۆتایی) بوو. لەبەرئەوەی ئەو دوو هێزە مەزنە لەیەك بنچینەوە بوون، لە ڕووی دەسەڵاتەوە لەگەڵ یەکتردا یەکسان و بەرابەرانە بوون و لەکاروبارەکانی جیهاندا هاوسەنگییەك دەهاتە ئارا، بەم تەرزە ئـایینی زەرڤـان (دوالیزم)ی زەردەشتی بەرەو جۆرێك یەکخستن نزیك دەکردەوە و لەو دیوی هێـزی چـاکە و خراپـەدا بوونێکی ڕەهای کە زەمانی بێ کۆتایی و هەمیشە مانەوەیە، دادەنـا. ئـەو بوونـە ڕەهایـە، بـووە خوایەك کە هەم دانەری جیهان بوو و هـەم بـە لەنێوبەریـشی دەژمێـردرا، هـەروەکو (کرونـوس)ی پەروەردگاری زەمان لای یۆنانیە کۆنەکان کە بەسەر هەموو شتێکدا باڵا دەست بـوو، زەرڤـانی بـێ کۆتاییش لە ئێراندا هەموو شتێکی لە ژێر چەنگدا بوو. لە نێو لێکۆڵەراندا، هەندێکیان بۆچـوونیان وابوو کە ئەو ئایینە دوای سەردەمی زەردەشت هاتبێتە ئـاراو لـە مـۆرکی کـارتێکردن و نفـووزی فەلسەفەی یۆنانی بێبەش نییە. کاریگەریی یۆنان، ڕەنگە نەکرێ لەگەشـەپێدان و تـەواوبوونی ئـەو ئایینە نکۆڵی لێ بکرێ، بەڵام ڕاستی ئەوەیە کە باسکردنی زەرڤان لە ئاڤێستاشدا هـاتووە. ڕەنگـە کە ئەو باوەڕە لە لێکدانەوە (تەئویل)ی هەندێ قسەکانی ناو ئاڤێستاوە هـاتبێ و هەنـدێ مایـە و هەوێنی لە باوەڕەی کلدانییەکان و دواتر لە فەلسەفەی یۆنانیشدا بۆ زیادبووبێ. بە هەرحاڵ موبد و ڕۆحانییەکانی زەردەشتی، ئایینی زەرڤانیشیان وەکو باوەڕەکانی مانی، بەجۆرێك ڕەفـز و بیدعـەت دەژمارد و دژایەتیان دەکرد. دواجار کە لە دوا دوایـیـەکانی سـەردەمی ساسـانیدا، بـە هـۆی ئـەو گۆڕانکارییەی لە هەموو بارودۆخی ئـەو کاتـەدا هـاتبووە پـێش، ئـەو ئایینـەش برەوێکـی زۆری پەیداکردو تەنانەت بەبڕوای هەندێك لـە لێکۆڵـەران لـەو سـەردەمەدا گروپـی زەرڤـان لـە هـەموو گروپەکانی تری زەردەشتی باڵا دەستتر و لەپێشتر بووە[٢٨٨].

## گومان و سەرسوڕمان

لەبەرامبەر ئەو بیدعەتانە کە لەو ڕۆژگارانەدا هـەر ڕۆژە و نموونەیـەکی تازەیـان لـە گۆشـە و کەنارێکی وڵات سەری هەڵدەدا، موبدەکان سەرسـەختی و توندوتیژییـەکی سـەختیان نیـشاندەدا. هەرچی کە لەگەڵ ڕاو ئەندێشەی ئەوان کۆك و سازگار نەبا، لای ئـەوان بـە نادروسـت و ڕەتکـراوە دەژمێردرا. ئەو کەسانەی کە خوایـان بـە چـاوگی چـاکە و بـە سەرچـاوەی خراپـە دەژمـارد، لـە (دینکەرد)دا بە خراپی باسیان دەکرا و ئایینی ئەوان بە فێربوونی خراپـە لێکدەدرایـەوە موبـدەکان

٢٨٨- christensen: L,Iran sous les sassanides, p766.

وەك رۆحانی و پیاوانی ئایینی هەموو میللەتانی دنیا، رەفتاری نالەباریان دژی نەیارەکانیان ئـەنجام دەدا. ئەو توندوتیژییەی رۆحانییەکان، بتەویٔ یان نا لە هزری ئەو کەسانەی کە خولیـا و مـەیلـداری ئازادیی بیرو ئەندێـشە بـوون، کاردانـەوەی تونـدی دەهێنایـە ئـارا، وەك گومـان و سەرسـوڕمان. (برزۆیە)ی پزیشك یەکێ لەو کەسانەیە کە پێدەچێ لەسەردەمی ئەنوشێرواندا گیرۆدەی ئەو گومان و سەرسوڕمانە بووبێ. ئەگەر ئەو بەشەی (کلیلە و دمنە)ش کە بـەناوی ئەوەوەیـە، وەك ئـەوەی کـە (ئەبورەیحانی بیرونی) پێیوابووە لەلایەن (ئیبن موقەفەع)ەوە بۆ دەقی ئەسڵی (کلیلە و دمنـە) زیـاد کرابێ، دیسان گومانی تێدا نییە کە رەوشی ئەو جۆرە خەڵکە بـە دروسـتی و روونـی دەردەخـات. رەوشی ئـەو کەسـانەی کـە لەدەسـت سـەختگیریی موبـدەکان لـە کاروبـاری ئاییـنـدا کەوتبوونـە سەرسوڕمان و دوودڵییەوە، لە خستنەڕووی ئەو ڕەوشەی کە (برزۆیە)ی پزیـشك سـەبارەت بـەخۆی دەیخاتەروو رەنگی داوەتەوە، دەڵێ (هەوڵ و کۆششی زۆرمدا بۆ وەدەست خستنی زانـستی ئـایینی، بەڕاستی ڕێگەیەکی یەکجار سەخت و دوورو درێژو بێکۆتاییم هاتـە پـێش، سەرانـسەر مەترسـیو تەنگانە، لەکاتێکدا کە نەرێگەکەو نـە رێبەرایـەتی و ڕێنوێنیکـەرێك دیـاربوون دەسـتم بگـرن... ناکۆکیی زۆری نێوان پەیڕەوکاران و میللەتان، هەندێك بە هۆی میراتی بەجێماو دەستیان بەداوێکی بێ هێزوە دەگرت، هەندێکی تر بە هۆی پەیڕەوکردنیان لەپادشاکان و مەترسی گیانیـان هـەنگاویان لەسەر ستونێکی لەرزۆك دادەنا، کۆمەڵێکیش بە هۆی تەماعی دونیا و بەرزبوونەوەی پلە و پایە و خۆهەڵکێشان لەنێو خەڵکدا، دڵیان بە پاڵپشتێکی رزیوبەست بوو و پاڵیان بە ئێسقانێکی کلـورەوە دابوو، ناکۆکیی نێوانیان لە ناسینی خوداوەند و سەرەتای خەلیقەت و ئاکام و ئەنجام، ناکۆکییـەکی دیاربوو. بەم بیر و هزرە لە بیابانی گومان و دودڵیدا سام گرتوو بووم، ماوەیەك وێـڵ و سـەرگەردان بووم، بەدەور ئەو بازنەیەدا خولامەوە، لە پێناوی گەیشتن بەو ئامانجە مەزنە بڕیارمدا کە درێژە بەم هەوڵەم بدەم، هەڵبەت نە ڕێگەم بەرەو مەبەست دۆزییـەوە و نەبـەرەولای ڕێگـای راسـت بەڵگـەو نیشانەیەکم دەستکەوت. ئەوەبوو کە بەردەوام رۆیشتنم بە باشترزانی و پێم داگرت بۆ ئـەوەی چـاوم بەزانایانی هەموو بوارەکان بکەوێ و بەقووڵی لە بنج و بنەوانی بیروباوەڕیان بکۆڵمەوە و هەوڵ بـدەم کە تیڕوانینی ڕاستگۆیانە و دڵپەسەند وەدەست بهێنم. ئەو هەنگاوەی خۆم گەیاندە ئەنجام و هـەموو مەرجی توێژینەوەشم ڕەچاوکرد. هەر تایەفەیەکم بینی پەسنی گەورەیی و بەرزیی ئایینی خۆی دەدا و رۆڵی ناحەزەکانی بە ناشیرین و کەم نیشان دەدا، هەر لایەکیشیان خۆی بەڕەوا و ئـەوی تـری بـە ناڕەوا دادەنا و بەهیچ لێکدانەوەیەك نەمتوانی بەدوایان دابچمو چارەسەرێك بۆ گرفت و دڵـەڕاوکێی

خۆم بدۆزمەوە، بۆم دەرکەوت کە بوونیادی پەیڤەکانیان هەمووی بێ هوودە بوو و هیچ گرێیەکی نەکردەوە کە ویژدانی خاوەن هزر پەسەندی بکات[289].

ئەو هزرەی سەرسوڕمان و گومان و دوودڵی، دواتر لەسەردەمی موسوڵمانانیشدا مایەوە و کەسانێك پەیدابوون کە بە هۆی سەرسوڕمان و دوودڵییەوە بە زەندقە تۆمەتبارکران.

بەڵام ئەوەی کە مویدەکانی زەردەشتی نیگەران دەکرد هەر تەنها ئەو بیدعەتە سەیرانە نەبوون، بەڵکو ئایینەکانی تریش لەکاری بانگەشەکردنی خەڵکدا گەرم بوون، لەلایەك ئایینی عیسا و لەلایەکەی دی ئایینی بوودا، ئایینی زەردەشتیان خستبووە نێوان خۆوە و تەنگیان پێهەڵچنیبوو.

## ئایینی عیسا

ئایینی عیسا لە قۆناغی فەرمانڕەوایی ئەشکانیەکاندا دیسان لە نێو خەڵکی ئێراندا بڵاوبووەوە. لە قۆناغی فەرمانڕەوایی ساسانیدا، شاری (تیسفۆن) ئەسقوفێکی هەبوو و زۆر لە بنەماڵە بەناوبانگەکان چووبوونە سەر ئایینی مەسیحی. شاکانی ساسانی لەو کاتەی کە ڕۆم ئایینی عیسای قبولکرد، مەسیحییەکانیان زۆر مەترسیدار دەبینی و کەوتنە ئازار و ڕاوەدوونانیان. موغان و مویدەکانیش بەردەوام لەسەر ئەو کارە هانیان دەدان. هەندێ لەشاکان وەکو یەزدگوردی یەکەم مردووە لە (٤٢٥ ز)و خوسرەوی پەروێز مردووە لە (٦٢٨ ز) بە نەرمی و ڕێزەوە ڕەفتاریان لەگەڵ ئەو خاچپەرستانەدا دەکرد. بەڵام هەر ڕۆژە جەسارەت و پێدرێژی مەسیحییەکان، زیاتر دەبوو و کارەکەی زەحمەت دەکرد. لەسەردەمی یەزدگورد دا جارێك کەشیشێك کە ناوی (هاشو) بوو، لە شاری هورمزد ئەرشیری خوزستان، ئاتەشگایەکی کە نزیك کڵێسا بوو تێکدا. ڕوونە کە ئەو لاسارییەی تا چ ڕادەیەك بۆتە مایەی تووڕەیی مویدان و سەرانی وڵات. جارێکی تر لە شاری (ڕەی) کابرایەکی مەسیحی بەناوی (نرسی) چووە نێو ئاتەشگایەك و ئاگرەکەی کوژاندەوە و ئەوێی کردە نوێژخانەی مەسیحییەکان و نوێژی دابەست. ئەو کارەش بووە هۆی ئەوەی کە یەزدگورد لەو میهر و خۆشەویستییەی دەرهەق بە مەسیحیەکانی دەنواند پەشیمان ببێتەوە. لەسەرچاوە سریانی و ڕۆمیەکاندا باس و چیرۆکی زۆرهەن کە باس لە فشار و ئازاردانی مەسیحیەکانی ئێران دەکەن. لەگەڵ ئەوەشدا لە هەمان سەرچاوەکاندا ئەو خاڵە دەردەکەوێ کە ئایینی مەسیحی لەوان ڕۆژگاراندا

289- کەلیلە و دەمنە: بە کۆششی عبدالعظیم قریب، چاپ چوارەم، ل ل ٤٢-٤٣.

لە ئێران بڵاوبوونەوەی بەخۆیەوە بینیوە. هەتا ئەو سەختگیریانەی مویدەکانیش نەیانتوانی پێش لە بڵابوونەوەی خێرای ئەو ئایینە لە نێو چین و توێژە جیاجیاکانی خەڵکدا بگرن[290].

## ئایینی بوودا

لە لای ڕۆژهەڵاتیشەوە ئایینی بوودا ڕۆژ دوای ڕۆژ پتر بڵاو دەبووەوە. هەمیشە زاهید و گەڕیدە بوودابییەکان لە بەلخ و سوغد و وڵاتانی دراوسێی چین و هیندستاندا سەرقاڵ و خەریکی بڵاوکردنەوە و فێرکردنی ئەرك و تەعالیمی بوودا بوون. لەدوادواییەکانی قۆناغی فەرمانڕەوایی ساسانییەکاندا سەربوردەیەکی پەند ئامێز لە بوودا لەژێر ناوی (بوذاسف و بلوهر) لە هەندێ لە ناوچەکانی ئێراندا بڵاوببووەوە. جگە لەوە، وەك لەسەرچاوەکاندا دەردەکەوێ بوودا یا یەکێك لە قوتابییەکانی ئەو کتێبێکی بەزمانی فارسیش هەبووە[291]. ئایینی (شەمەنی)یش کە لە تورکستان و سوغددا باو و لەبرەودا بووە بە وێنەیەك لە ئایینی بوودایی دەژمێردرێ. لێکۆڵەران لەو باوەڕەدان ئایینی بوودا، بەو شێوەیەی کە لە سوغد لە برەودابووە لە ڕاستیدا سەر بە ناوەندە بوودابییەکان بووە. زۆرترین دەقە سوغدییەکان کە تا هەنووکە چاپ و بڵاوکرانەتەوە یا لەسەر کتێبە ئایینە چینیەکان وەرگێڕدراون یا ئەسڵەکەیان لە هیندی یاچینی وەرگیراوە. بەهەرحاڵ لە بەلخ و سوغد و تورکستاندا، ئایینی بودا بە هۆی گەڕیدە و زاهیدە چینی و هیندییەکانەوە بڵاوبۆتەوە و کتێبگەلێکیش سەبارەت بە ئایین و سەربوردە و بەسەرهاتی بوودا بە فارسی و زمانەکانی دی لە ئێران دەستا و دەستکراون و هەبوونە[292].

## مشتومڕە فەلسەفییەکان

بەڵێ ئایینی زەردەشت، لە کۆتایی قۆناغی فەرمانڕەوایی ساسانیدا، بەهۆی بیدعەتە ئایینیەکان و لە ئەنجامی گەندەڵی و پۆخڵەواتی موبیدە بەهێزەکان، لاوازبوو. نفووز و کاریگەریی ئایینی عیسا و ئایینی بوداش لە دوو لاوە: لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە تەنگیان پێهەڵچنیبوو و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لاوازتریان دەکرد. لەوانەیە ئەگەر ئایینی ئیسلام لە دوورگەی عارەبیەوە نەهاتبا،

---

٢٩٠- سەبارەت بە ئایینی عیسا لە ئێرانی سەردەمی ساسانی. بگەڕێوە بۆ کتێبی lobovrt کە لە سەرچاوەکاندا ناوی هاتووە.

٢٩١- خوارزمی، مفاتح العلوم، ص ٣٥ طبع مصر، ١٣٤٢ه. بلاذری، ص٧١.

٢٩٢- بگەڕێوە بۆ وتاری p. Demieville، Benveniste لە گۆڤاری ژورنال ازیاتیك ساڵ ١٩٣٣ — ژمارە ٢١٣

ئایینی زەردەشت لە بەرامبەر نفووزی ئەو دوو ئایینەدا خۆی بەتەواوی دۆڕاندبا، بەڵام ئیسلام بەوورە و رۆحێکی تازە و بەتیغێکی تیژەوە هاتە نێو کاروبارو، رەوشەکە و رەنگێکی دیکەی بەخۆوە گرت. هێز و هەیبەتی ئیسلام ئایینەکانی تری خستە ژێر چەپۆکی خۆی و لیستی هەموویانی پێچایەوە.

ئەو ئایینانەی کە لە ئێراندا لەبرەودابوون ئەوانەی کە خاوەن کتێب بوون، یان بوون بە موسوڵمان یان ملیان بۆ دانی جزیە کەچ کرد. ئەوانەیش کە خاوەنی کتێب نەبوون کوژران یان پەرش و بڵاوبوون، یان بەناچاری بوونە موسوڵمان. لەگەڵ سەپاندنی دەسەڵات و باڵادەستی ئیسلام (ذمی)یەکان کە قبوڵیان کردبوو جزیە بدەن، بێگومان توانا و مافی ئەوەیان نەبوو کە بە ئاشکرا ئایینی خۆیان بڵاوبکەنەوە و کاری بۆ بکەن. بۆ ماوەیەکی زۆر عارەبەکان هەموو جموجۆڵ و سەرپێچییەکیان بە شمشێر و قەمچی وەڵام دەدایەوە.

موسوڵمانەکان ئایینی زەردەشتیان بە (مەجوس) ناودەبرد و پەیڕەوکارانی ئەو ئایینەیان بە بڕیاری پێغەمبەر لە ڕیزی خاوەن کتێبەکان قبوڵکردن[293].

بەم پێیە دانی جزیەیان لێ قبولکردن و ئەو مامەڵەیەی کە لەگەڵ کافر و (موشریك)ەکان ئەنجامیان دەدا لەگەڵ ئەوانیان نەدەکرد. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگای باس و گفتوگۆ و داکۆکیکردن لە خۆیان پێنەدەدان و هیچ چەشنە مافێکی بڵاوکردنەوە و بانگەشەیەکی ئایینی خۆیان نەبوو. لە بەرامبەر بانگدان کە لە منارەی مزگەوتەکان بەرزدەبوودوە، سروودی (مۆغ) نەیدەتوانی دەنگی بێ و لەبەرامبەر ئەوەی کە قورئان دەیگوت، (گات)ی زەردەشتی بواری خۆنواندنو دەربڕینی نەبوو. زۆری پێچوو تا زەمینەی ئازادی پەیدابوو و موبید و هیربۆدانی زەردەشتی ئەو بوارەیان بۆ لوا کە لەبەرامبەر زانا ئایینییەکان و قسەکەرە موسوڵمانەکاندا دابنیشن و قسەی خۆیان بکەن. ئەو ئازادیەی دەربڕین لە قۆناغی فەمانڕەوایی خەلیفەکانی سەرەتای عەبباسیدا بەتایبەت لە سەردەمی مەئموونیدا هاتە کایەوە. بەڵام وێڕای ئەمانە هەموویان بەرلەوەش هەندێ لە تێڕوانین و باوەڕە ئایینییەکان کە تایبەت بوون بە زەردەشت، لەنێو موسوڵماناندا کەم و زۆر برەویان سەندبوو. لەڕاستیدا تەنانەت ئەو ژمارەیەش لە ئێرانییەکان کە بە پێخۆشی‌و ڕەزامەندیی خۆیان چووبوونە سەر ئایینی ئیسلام هەرگیز نەیانتوانیبوو مێشك و دڵی خۆیان بە تەواوی لە میراتو نەریتە ئایینییەکانی ڕابردووی خۆیان خاڵی بکەن. بۆیە سەیر نییە کە هەندێ باوەڕ و تێڕوانینی دێرینی باو و باپیرانی خۆیان لەگەڵ ئایینی تازەیاندا تێکەڵ کردبێت.

---

٢٩٣- بلاذری، ل ٧١.

## فەلسەفەی (دوالیزم)

بۆ نموونە پێدەچێ باسکردن لە بارەی قەدەر تاڕادەیەکی زۆر لە بیروباوەڕی زەردەشتییەوە سەرچاوەی گرتبێ. ئەوەی کە لەزاری پێغەمبەری ئیسلامەوە دەربارەی (قەدەریە) گوتوویانە کە (قەدەریە) بە (مەجوس)ی ئەو میللەتە بژمێرن، دەرخەری ئەوەیە کە زاناکانی ئیسلام لەسەرەتاوە تێبینی پەیوەندی بیروباوەڕی (قەدەریە) یان لەگەڵ ئایینی زەردەشتی کردووە. بنەمای باوەڕی قەدەریە، لەسەر ئەو خاڵەبوو کە مرۆڤ بکەری کارەکانی خۆیەتی و نابێ کردەوەکانی خۆی حەواڵەی خواستی خوابکات. ئەم خاڵە لە ڕاستیدا جۆرێك دوانەیی (ثنویت) بوو کە لەگەڵ تاکایەتی و یەکبوونی (وحدت و توحید)ی ئیسلام هێندە نێوانی خۆش نەبوو و بنچینەکەی بە جیاکەرەوەی نێوان بنەمای چاکە و بنەمای خراپە دەژمێردرا. ئەو تێڕوانینە کەسێك بەناوی [(معبد جهنی) ٨٠ ك/ ٦٩٩ ز مردووە] لە دوا دواییەکانی قۆناغی فەرمانڕەوایی (بەنی ئومەییە) بڵاوی کردەوە و وەك لە کتێبەکاندا گێڕاویانەتەوە ئەمیش لە کەسێکی ئێرانی کە ناوی (سنبویە) بووە، وەریگرتووە. هەڵبەتە دواتر ئەو کەسانەی کە ئەو بیرەیان قبولکردبوو هەوڵیاندا لەگەڵ قورئان و حەدیسدا بیگونجێنن، بەڵام بە ئاسانی ناتوانرێ کاریگەریی و ئوتوریتەی ئایینی زەردەشتی لە دروستبوونی ئەو بیرەدا نکۆڵی بکرێ. هەندێ لە لێکۆڵەران لەو باوەڕەدان کە پرسی تایبەتکردنی پێشەوایەتیش بۆ عەلی و منداڵەکانی ئەو، کە بناغە و بنچینەی مەزهەبی شیعەیە، هەڵقوڵاوی بیروباوەڕ و تێڕوانینی سەردەمی ساسانیە کە (فەڕی ئیزەدی - خوایی) و مافی پاشایەتی تەنها بۆ ساسانییەکان بەڕەوا دەزانێ. ڕەنگە خستنەڕووی ئەو پرسە بەم شێوەیە دوور نەبێ لە زیادەڕۆیی، بەڵام ئەوەندە هەیە کە بیرۆکەی دەقی پێشەوایەتی (نص امامت) لەلایەن خوا بۆ ئەو ئێرانیانەی کە باوەڕیان بە (فەڕی ئیزەدی) هەیە لە بیری کۆبەندی و هەڵبژاردن (اجماع و انتخاب)ی خەلیفە گومانی تیانییە، مەعقول تربووە. بەڵام ئەگەر بێتوو ئەوەش دروست نەبێ و بیروباوەڕی شیعە و قەدەریە تاڕادەیەك ڕەنگ و بۆ و مایەیان لە بیروباوەڕ و تێڕوانینەکانی زەردەشتەوە وەرنەگرتبێ، ئەوندە هەیە کە لە ئایینی موسوڵمانیدا زۆر داب و نەریت و بیروباوەڕ هەن کە هاوشێوە و کۆکن لەگەڵ بیروباوەڕە کۆنەکانی زەردەشتدا. ئەوە ڕاستە کە یەزدان و ئەهریمەن لە تەختی (جەبەروت)ی کۆنی خۆیان هاتوونەتە خوار و (مەلەکوت)ی ئاسمانەکان ئیدی گۆڕاوە، بەڵام دیسان لە پشت ئەو گۆڕانە ڕووکەشیانەدا، نەخشەگەلێکی جێگیر ماوەتەوە کە هێشتا وەك خۆی لەبەرچاو و دڵی خەڵکدا هۆگر و ئاشنایە. ئەگەرچی (ئەڵڵا) و (ئیبلیس) یەك شت نین لەگەڵ هورمز و ئەهریمەن، بەڵام دیسان ناوی ئەم دووانە، بنەمای چاکە و خراپە دەخەنەڕوو و وەبیری دێننەوە. چیرۆکی ئیبراهیم

و ئاگری نەمرودیش یادەوەری زەردەشت و ئاگری پاك بوو. دۆزەخ و بەهەشت و قیامەت و سیرات دەیتوانی بیروباوەڕ و تێڕوانینە کۆنەکان کە دۆزەخ و (چینوت) نموونەیەکی بوو، وە بیربێنێتەوە، پێنج نوێژەکانیش تەنها هی موسوڵمانەکان نەبووە، لە ئایینی زەردەشتیشدا پەیڕەوکاران ڕاسپێردرابوون ئەنجامیان بدەن. بەم پێیە خەڵك، واتە، خەڵکە ئاساییەکە کە وەکو موبید و هیربەدەکان دیدەوان و پاسەوانی ئاگری موغان نەبوون بە ئاسانی دەیانتوانی ئایینی نوێ کە لە وڵاتی عارەبان هاتبوو قبوڵ بکەن. نەفرەت و بێزاری لە موبیدەکان و سەرسوڕمانی زۆر لەکاری خاوەن بیدعەتەکانیش زیاتر هانی دەدان کە ئایینی موسوڵمانی قبوڵ بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ژمارەیەی کە هاتنی ئایینی تازەیان قبوڵ نەدەکرد لەلایەن ئیسلامەوە پەنادرابوون (اهل زیمە) و ئاتەشگاکانیان پارێزرابو و، بەڵام بواری بڵاوکردنەوەو بانگەشەی ئایینیان نەبوو. موسوڵمانان ئەوانیان لە جێبەجێکردنی ئەرك و ڕێوڕەسمە ئایینییەکانیان ئازاد کردبوون، بەڵام هەر ئەوەندە، ئیدی ڕێگەیان پێنەدەدان کە بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕ و ئایینی خۆیان بەرەنگاری قورئان و ئیسلام ببنەوە. خەلیفەکانی ئەمەوی، لەو بارەیەوە زیاتر سەختگیریان دەکرد. هەر جۆرە تێڕوانینێکی نوێیان بەتوندی مەحکوم دەکرد کە بۆنی بیدعەتی لێهاتبا. بێگومان ئەوەیان لەپای پارێزگاری و ئایینداریییەوە نەبوو، چونکە زۆربەی ئەمەوییەکان عیلاقەیەکیان بەلای ئاییندا نەبوو. کەچی لەگەڵ هەر ئەندێشە و بیرۆکەیەکی تازە و هەر بیرێکی ئازاد دا دژایەتیان دەکرد کە ئەو ئەندێشەو بیرکردنەوانە لە مێشك و هزری مەوالییەکانەوە سەرچاوەیان دەگرت. لای ئەمەوییەکان مەوالی بۆ سەروەریی عارەبەکان بە مەترسییەکی گەورە دەژمێردرا. (معبد جهنی) ئەو تێڕوانینەی کە سەبارەت بە (قەدەر) هەیبوو لە سنبویەی ئێرانییەوە وەریگرتبوو و بەڕواڵەت حەجاج کوڕی یوسف لەبەر ئەم هۆیە کوشتی. لەبەرامبەر (غیلانی دیمەشقی) (١٢٥ك/ ٧٤٣ ز) یشدا کە ئەویش هەمان تێڕوانینی هەبوو، بەنی ئومەییە ڕەفتارێکی سەخت و توندوتیژانەیان ئەنجام دا. (جهم کوڕی سەفوان) (١٢٨ك/ ٧٤٦ ز) یش کە باوەڕی بە (جەبر) هێنابوو، و خەڵکی ترمزی خوراسانو دامەزرێنەری مەزهەبی جەهمییە بوو، ئەویش بەتوندی سزا درا. بەم تەرزە بەنی ئومەییە وێڕای هەموو ئەو گوێنەدانە بە کاری ئایین، بەو پەڕی توندی و سەختگیرییەوە ڕێیان لە بڵاوکردنەوەی هەر بیروبۆچوونێك دەگرت کە سەرچاوەی لە مەوالییەوە وەرگرتبا.

## زەندیقییە

خەلیفەکانی سەرەتای (بنەماڵەی عــەبباس) یــش لــەو بــوارەدا تونــد و ســەختگیر بــوون. لــە سەردەمی (مەنسوور) و (مەهدی)دا زۆر لە مەوالی و نامــەوالی بــە تۆمــەتی زەندقــەوە کــوژران. لەگەڵ ئەوەشدا بەڵگەو نیشانەگەلێکی زۆر هەن کە ئــەوە دەردەخــات لــەدوا دوایــیــەکانی قۆنــاغی فــەرمانڕەوایی بــەنی ئومەییــەدا، پاشماوەکــانی زەردەشــتی و مانەوییــەکان بــەنهێنی خــەریکی بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکانی خۆیان بوون. زەندیقییە پێدەچێ لە گروپەکانی دی زیاتر لەو بارەیــەوە هەوڵیانداوە. شێوازی بانگەوازی ئەو زەندیقییە لە یەکەم دەستپێکدا، هێنانە ئارای گومان لە بنەما و کۆڵەگە ئایینی و ئەخلاقییەکانی موسوڵمانەکان بوو. هــەر بۆیــە لــە زەمینــەو کــەش‌و هــەوای گەندەڵئامێز و تاوانکارانەی حکوومەتی بەنی ئومەییە، ئــەوان زووتــر لــە گروپــەکانی تــر بــوار و دەرفەتی بزاڤ و هەوڵدانیان هەبوو. زەندقە وەك پێدەچێ درێژەی ڕێنوێنی‌و سروشتەکانی مانی بــوو، بەڵام بنەماکەی لەسەر گومان‌و دوو دڵی بەرامبەر بە هەموو ئایینەکان جێگیر بوو. لەبەرئەوە بــوو کە هەرکەس گومانی لە بیروباوەڕ و بنەما ئایینەکاندا هەبوو، پەیوەندی بە زەندیقییە یا لانی کــەم سەر بە ئەوەوە بوو. لە حکوومــەتی بــەنی ئومەییــە ئــەو جــۆرە بیروباوەڕانــە هەڵبەتــە زیــاتر لــە مەزهەبەکانی تر بواری گەشەکردنیان هەبوو. ســەیر نییــە کــە یــەکێك لــە گەنــدەڵترین خەلیفــەی ئەمەوی، واتە (وەلید کوڕی یەزید) مردووە لە ساڵی (١٢٦ك/٧٤٢ز) ڕەزامەندی بەرامبەر تێڕوانین و بیروباوەڕەکانی زەندیقییە نیــشاندا و خــۆی بــە زەنــدقی هەڵکێــشا. لــە دەســتپێکی خەلافــەتی عەبباسیشدا، گرفتاری و سەرقاڵی خەلیفەکان تارادەیەك زەمینە و بواری بڵاوبوونــەوەی تێڕوانینــی زەندیقییەی فەراهەم کردبوو. بۆیە لە بەسرە و بەغدا، پەیڕەوکارانی مانی‌و بیر ئازادو لانیکەکانی تر کەوتنە بڵاوکردنەوەی مەزهەبی خۆیان و دروستکردنی گومان و دوودڵی لە بیروباوەڕی موسوڵمانان. لە سەردەمی مەنسوور و مەهدی دا هەوڵ و چالاکییەکانیان کاراتر و ترسناکتر بوون و خەلیفەکانیان ناچارکردن بکەونە چارەسەرکردنی ڕەوشەکە.

لــە ڕاســتیدا زەندیقییــە هــەم هەڕەشــەی لــە ئیــسلام دەکــرد و هــەم خەلافەتیــشی دەخــستە مەترسییەوە. بنەمای خەلافەت و حکوومەتی عارەبی لەسەر ئایین و قورئانــدا جێگیربــوو و ئــەوان نکۆڵیان لەوە هەمووی دەکرد. بۆیە ڕێنــوێنی و چــالاکییەکانی ئــەوانیان بــۆ خەلافــەت و دیانــەت بەهەنگاوێکی زیانبەخش دەژماردن. ئەوان بە باشی قسەیان لەسەر قورئــان نــەدەکرد. ئــەوەی کــە شیکەرەوەکانی پێیاندەگوت (محکمات و متشابهات)ی قورئان، ئەوان قبوڵیان نەبوو. دەیانگوت لــە قورئاندا دەق‌و لێــدوانی دژ بەیــەك هــەن و هەنــدێ ئایاتیــان بــە پێــچەوانە و دژی هەنــدێکی تــر

دەژماردن[٢٩٤]. بەشێکیشیان هەندێ قسەیان لە خۆوە دروست دەکرد و ئەو قسانەی خۆیان لەبەرامبەر کتێبی خوا دادەنان. بە چاوی سووکیشەوە سەیری داب و ڕێ و ڕەسمە ئایینییەکانیان دەکرد. (یەزدان کوڕی بازان) لە مەککە بوو، تەوافی خەڵکی بەدەوری حەرەمی کەعبەدا بینی پێکەنی و گوتی ئەو خەڵکە وەکوگاگێڕەوان کە بە پێیەکانیان گێرەی خەرمان دەکەن[٢٩٥]. زەندیقییەکی تر کاتی لەگەڵ جەعفەری سادق دەمەتەقێی (مونازەرە =مشت و مڕ) ی دەکرد لێیپرسی ئەرێ پێمناڵێی ئەم نوێژ و ڕۆژووە سوودیان چییە؟ ئیمام گوتی ئەگەر هەستانەوەیەك هەبێ بەجێگەیاندنی ئەو فەرزانە سوودمان پێدەگەیەنن و ئەنجامدانیشیان هیچ زیانێکمان لێنادا[٢٩٦]. بێگومان ئەو جۆرە قسانە کە زەندیقەکان باسیان دەکردن و دەریان دەبڕین بێباکانە و ترسناك بوون. لە خۆڕانییە کە خەلیفەکانی عەبباسی زوو تێبینی ئەو مەترسییەیان کرد و کەوتنە دژایەتیکردنی. لە بیرمەندان و ئازاد بیرانی ئەو سەردەمە، کە سانێکیش بەتۆمەتی زەندقە لە نێوبران. بەڵام بەڵگەنامە و نیشانەکان ئەوە دەردەخەن کە لەسەردەمی خەلیفە مەنسووردا بانگەشە و بانگەوازی زەندیقییەکان ئەوپەڕی چالاکی و توندوتۆڵی بەخۆوە بینی.

## عەبدوڵڵا کوڕی موقەفەع

لە نێو ئەو کەسانەی کە لەو سەردەمەدا بەتۆمەتی زەندیقییەوە گرفتاربوون و سەرەنجام کوژران دەتوانین ناوی [(ئیبن موقەفەع) مردووە لە ساڵی (١٦٨ك/٧٨٦ز) و (بەشار کوڕی بۆرد) (١٦٨ ك/٧٨٦ ز)] بێنین. عەبدوڵڵا کوڕی موقەفەع لە وەرگێڕ و نووسەرە مەزنەکانی زمانی عارەبی بوو، بەڵام خۆی ئێرانی بوو، ناوە ڕاستییەکەی (روزبە کوڕی دادویە) بوو و خەڵکی (شاری جور) ی (فارس) بوو. سەبارەت بەزەندیقبوونی ئەویش زۆر باس و گێڕانەوە لە کتێبەکاندا هەیە. دەڵێن کتێبێکی لەبەرامبەر قورئاندا داناوە. لەزاری مەهدی خەلیفەوە دەگێڕنەوە کە گوتوویە هیچ کتێبێکم لەبارەی زەندیقییەوە نەدیوە مەگەر ئەسڵەکەی هی ئیبن موقەفەع بووبێ. (ئەبو رەیحانی بیرونی) یش باسی کردووە و گوتوویە کاتێ کە ئیبن موقەفەع کتێبی کلیلە و دیمنەی لە زمانی پەهلەوییەوە وەرگێڕا سەر زمانی عارەبی، بەشی (بەرزویە)ی کە لە دەقە ئەسڵییەکەدا نەبوو بۆ کتێبەکە زیادکرد تا شك و گومان لەبیروباوەڕی موسوڵمانان دروست بکات و خەڵك بۆ قبوڵکردنی ئایینی خۆی کە ئایینی (مانی) بوو ئامادە بکات.

---

٢٩٤- ملطي، التنبية و الرد، ل ٤٤-٤٣.

٢٩٥- طبري، ب١٠، ل٥٤٨.

٢٩٦- بگەڕێوە بۆ: بحارالانوار، ب٤.

لەوەی کە لە کتێبەکاندا سەبارەت بە ئیبن موقەفەع هاتووە ئەوە دەردەکەوێ کە مەیلی بەلای زەندیقییەدا بووە. (سوفیان کوڕی معاویە)ی فەرمانڕەوای بەسرەش کە ئەوی بە شێوەیەکی سەخت و دڕندانە کوشت هەر بە زەندیقیبوون تۆمەتباری کرد. بەلام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ناوبراو زیاتر لەهەر شتێك بووە قوربانی بەخیلی پێبردن و ڕق و کینەی دوژمنەکانی خۆی. دەگێڕنەوە کە ئەو سوفیانە ڕقێکی لە ئیبن موقەفەع لەدڵدا بوو و هەمیشە لەهەلێك دەگەڕا بیخاتە داوو بیگرێ. مەنسووری خەلیفەش ڕقێکی بەرامبەر ئیبن موقەنەفع هەبوو و بۆیە سوفیانی دژی ئەو هان دەدا. فەرمانڕەوای بەسرە بیانوێکی دۆزییەوە و نووسەری زەندیقی گرت. دواتر بڕیاری دا تەنوورێك گەرم کەن و ئەندامەکانی جەستەیان یەك یەك بڕین و بە بەرچاوی ئەوەوە هەڵیاندانە نێو ئاگرەوە. لەو قسانەی کە لە کتێبەکاندا لە ئیبن موقەفەع گێڕدراونەتەوە دەردەکەوێ کە ئەویش وەك زەندیقییەکانی دی بەچاوی ڕێزەوە سەیری ئایینەکانی نەدەکرد. ئەگەر قسەی ئەبورەیحانی بیرونیش کە دەڵێ ناوبراو بەشی بەرزویەی خستۆتە سەر کلیلە و دیمنە ڕاست نەبێ، دیسان بەلگە و نیشانەگەلێك هەن کە ئەوە نیشان دەدەن ئیبن موقەفەع بەچاوی گومان و دوودڵییەوە سەیری ئاین و مەزهەبەکانی دەکرد. یەکێ لەو بەلگەنامانە نامەیەکی ئەوە کە بە (رسالە الصحابە) بەناوبانگە و بۆ مەنسووری خەلیفەی ناردووە، لەو نامەیەدا دوای ئەوەی لەبارەی خوراسانییەکان و ئاگاداربوونیان لەلایەن خەلیفەوە داواکاری دەخاتەڕوو و زۆر جەختی لەسەر دەکات، دەڵێ لەبارەی (ئەحکامە فیقهییەکان) ناکۆکی و دووفاقییەکی زۆر هەیە. زۆر دەبینین کە لە بارەی یەك کێشە دوو بڕیاری پێچەوانەو دژ بەیەك دەردەکرێن. دواتر داوا لە خەلیفە دەکات کە بیر لە چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە بکاتەوە و نامەیەك بۆ دۆزگەرەکانی خۆی بنووسێ تاکو بەپێی ڕێنوێنی ئەو نامەیە دادوەری خۆیان بکەن و تووشی ناکۆکی و سەرلێشێوان نەبن. ئەو گومان و دوودڵییەی کە لە "بەشی بەرزۆیەی پزیشك" دا هەیە و بنەمای هەرە گرنگی بیروباوەڕی زەندیقییەشە. لەونامەیەدا بە ئاشکرا دیارە و نیشان دەدا کە نووسەر زیاتر لەوەی لەهەوڵی چارەسەر دابێ مەبەستی پەلەگرتن و لەکەدارکردنە. بەهەرحاڵ، ئیبن موقەفەع ئەگەر لەزەندیقییەکانیش بووبێ وەکو ئەو بەشەی زەندیقییەکان نەبووە کە بێ ئایینی و بیرکردنەوەی ئازادانەیان بە جۆرێك ناسککاری و ڕاهێنان لێکدەدایەوە، بۆیە ئەو بە ئەندازەی بەشار کوڕی بۆرد و (ئەبان کوڕی عەبدولحەمید) خۆی بە زەندیقبوون هەڵنەکێشاوە، بەلکو هەوڵی داوە لە ڕێی وەرگێڕانی کتێب و بلاوکردنەوەی نووسین و نامیلکەی زانستی و ئەدەبییەوە، موسوڵمانان بە بیر و هزرە تازەکان ئاشنا بکات و ئەوان سەبارەت بە بیروباوەڕ و تێڕوانینە ئایینییەکانی خۆیان بخاتە گومان و دوودڵییەوە.

## بەشار کوڕی بۆرد

بەڵام بەشار زەنـدیقیبوونی وەکـو شـیرینکاری و هونـەر نوانـدنێك تەماشـا دەکـرد و لـە خـۆ پێهەڵکێشانیش پێی باکی نەبوو. بەشار کوڕی بۆرد شاعیرێکی نابینا و خەڵکی (تەخارستان) بـوو. لە غەزەلخوانیدا ناوبانگی بەو ڕادەیە گەیشت کە ژنان دەچوونە ماڵەکەی تا فێری شیعرەکانی بـبن و سترانبێژەکان لـە هۆنراوەکـانی ئـەو بـترازێ هـۆنراوەی کەسـی تریـان نـەدەکردە گـۆرانی. پیـاوە ئایینییەکانی ئەو سەردەم دەیانگوت کە هیچ شتێك وەکو سروودەکانی ئەم کوێرە فـسق و فجـور و تاوان و شەهوەت بڵاوناکەنەوە و برەوی پێنادەن. بەشار ئەو زەوق و هونەرکارییەی بۆ بڵاوکردنـەوەی زەندیقییەش بەکاردەهێنا و ئاشکرایە کە شـیعرەکانی ئـەو بـە فاکتـەری سـەرەکی بڵاوبوونـەوەی زەندیقی دەژمێـردرێن، [(واسـل کـوڕی عـەتا) مـردووە لـە (١٣١ك/٧٤٩)]یەکێکـە لەسـەرانی (موعتەزیلە) لەوبارەیەوە وتویە "قـسەکانی ئـەم کـوێرە یـەکێك لـە گـەورەترین و کاریگـەرترین تەڵەکانی شەیتانن." یەکێك لەو بیروباوەڕانەی کە بەشار بە ئاشـکرا ڕایدەگەیانـدن و خـەڵکی فێـر دەکرد یەکێکیان ئەوەبوو کە نـاوبراو ئـاگری، کـە بەسـومبلی ڕوونـاکی و پەرسـتنی زەردەشـت و زەندیقییە دەژمێردرێ، لە خاك کـە سـوجدەگای موسـوڵمانان و بـە هـەوێن و پێکهێنـەری مـرۆڤ دەژمێردرێ، لە پێشتر و مەزنتر دادەنا. ئەم کۆپلە شیعرەی ئەو بەناوبانگە کە دەڵێ:

الارض مظلة و النار مشرقة زەوی تاریکە و ئاگریش ڕووناك

والنار معبودة منذ کانت النار لەوکاتەی ئاگر هەیە پەرستراوە

تەنانەت ئەو شەیتانی کە لە ئاگر دروست کراوە لە ئادەم مەزنتر دادەنا کە لە خاکەوە هـاتبووە بوون. ئەو جۆرە قسەو دەربڕینانە کە تانە و تەشەر و سووکایەتی کردن بوون بەرامبەر بە بیروباوەڕی موسوڵمانان، بوونە هۆی ئەوەی کە بە زەندیقیبوونی تۆمەتبار بکەن و سەرەنجام مەهـدی خەلیفـە، لەبەر لەقاودانێك (هەجوێك) کە بەشار بەرامبەر بەو کردبووی کاتێ چووە بەسرە فەرمانی دا بیگرن و ئەوەندەیان قامچی لێدا تا گیانی لە دەستدا.

## بڵاوبوونەوەی زەندیقی

جگە لە بەشار و ئیبن موقەفەع چەند کەسێکی تریش لە وێژەوان و نووسەرانی زمـانی عـارەبی تۆمەتی زەندیقیبوونیان لەسەر بووە و تەنانەت چەندین کتێبیشیان بۆ لایەنگری و سەلماندنی ئایینی مانی و (مەرقیبون) و (بەردەسیان) نووسیوون. هەندێك لەوانە بەدەستی مەهدی کوژران. لەنێویاندا (عەبدولکەریم کوڕی ئەبولعوجا) (١٥٥ ك/٧٧٢ز) بوو کە لەسـەر ئـایینی مـانی بـوو و بایـەخ و

گرنگی بەبلاوکردنەوەی ئەو ئایینە دەدا و بۆ سەلماندنی ڕاستی ئایینەکـەی خـۆی ڕاسـتەوخۆ و بـە ئاشکرا لەگەڵ دژبەرەکانی دەکەوتە مشتومڕ و هەڤپەیڤین. وەك چۆن هەندێ لەو هەڤپەیڤینانەی کە لەگەڵ (ئەبولهوزیل عەللاف) کە یەکێك لە (موعتەزیلە)کانی بەغدا بوو، کردوونی لـە کتێبەکانـدا تۆمارکراون و نووسراون. ئەویش بەدەستی مەهدی خەلیفە کوژرا. لە ڕاستیدا زەندیقییـە زیـاتر لـە هەموو مەزهەبەکانی تری ئێرانی کۆن لە سەردەمی خەلیفەکاندا پەرەی سـەندووە و ڕواجـی پەیـدا کردووە. چونکە مەزهەبێك بوو کە زۆرتر بیر ئازادان و ئەو کەسانەی کە دەیانویست نەچنە ژێر باری هیچ ئایینێك لەگـەڵ زەوق و سـەلیقەی خۆیـان ڕێکیـان دەخست. زۆری واش هـەبوون تـەنها بـۆ ناسککاری و خۆشگوزەرانی، قبوڵیان دەکرد. جگە لەوەش ئەم مەزهەبە هەر تایبـەت بـە مـەوالی نەبوو عارەبەکانیش لە کۆنەوە ئاشنابوون پێی. عارەبەکان بە هۆی خەڵکی حیرە لەگـەڵ زەندیقییـە ئاشناییان هەبوو و عێراقیش خۆی لە کۆنەوە بەیەکێ لە مەیدانـەکانی دەرکـەوتنی ئـایینی مـانی دەژمێردرا. بەم تەرزە، لە سەرەتای قۆناغی فەرمانڕەوایی خەلیفەکانی بەغدا، زەندیقییە لە نێو زۆر لە ڕۆشنبیران و بیرئازادانی ئەو سەردەمەدا برەوی هەبووو باوبوو. جگە لەو کەسانەی کە بە تۆمەتی زەندیقییەوە کوژران و لە نێو بران کەسانێکیش هەبوون کە سەر بە زەندیقییە بوون، بەڵام بە ئاشکرا خۆیان پێهەڵنەدەکێشا، بۆیە گرفتار نەبوون. لە شاعیران و وێژەوانـە عارەبـەکانی ئـەو سـەردەمە، دەتوانین ناوی زۆران بێنین کە سەر بە زەندیقیە و زەردەشت بوون و باس و سـەربوردەیان لـە کتێبـە مێژوویی و ئەدەبییەکاندا هاتووە. ئەوەی خەلیفەکانی وا لێدەکرد ڕووبەڕوویان ببنـەوە ئـەوەبوو کـە زەندیقییەکان بەپێداگری و دڵنیاییەوە هەوڵیان دەدا خەڵك بەرامبەر بە هەموو ئایینەکان بەدگومان و بێ باوەڕ بکەن. جگە لە مانی هەموو ئەو کەسانەی کە بە پێغەمبەر ناویان دەرکردوە، لای ئەوان درۆزن بوون. بێگومان خەلیفەکانی بەغدا نەیاندەتوانی بەرگەی ئەوە بگرن. بە تایبەت کـە قورئـان زەردەشتییەکانی بە خـاوەنی نامـەی ئاسمـانی (ئـەهلی کتێـب) نـاوزەدکردبوو، بـەڵام لـە بـارەی مانەوییەکان هیچ قسەیەکی لـەو جـۆرە لـە قورئانـدا بـاس نـەکرابوو. بۆیـە مەهـدی خەلیفـە و جێنشینەکانی، بۆ لە نێوبردن و نەهێشتنی زەندیقییەکان زۆر بەتوندی کەوتنەخۆ. وەك چۆن دەبینین کە مەهدی، کەسێکی دەستنیشان کرد تا زەندیقییەکان دەستنیشان بکا و سەرکوتیان بکات و ناوی لێنا "صاحب الزنادقه"[٢٩٧]. هەروەها وەسیەتی بۆ کوڕەکەی خۆی کرد کە گەیشتە خەلافـەت لـە

---

٢٩٧- طبری، ب١٠، ل٩.

داپلۆسین و ڕاوەدوونانیان ڕانەوستیٚ و سستی نەنوێنیٚ[298]. (هادی) لە ڕاوەدوونانی ئەو گروپە، لێبڕاوانە هەنگاوی نا. (هاروون)یش بەهەمان شێوە سستی نەنواند و لە ساڵی ١٧١ك/٧٨٨ز کە کەسانی پەرتەوازە و ڕاکردووی پەنادان، ئەو پەنادانە ئەو زەندیقانەی نەگرتەوە کە لە ترسی ئەو خۆیان شاردبووەوە. لە سەردەمی (مەئموون)یشدا یەکیٚ لەسەرانی ئەوانی لە شاری (ڕەی) کە ناوی (یەزدان بەخت) بوو بانگکرد تا بە ئامادەبوونی ئەو لەگەڵ زانا موسوڵمانەکان گفتوگۆ و هەڤپەیڤین بکات. یەزدان بەخت داوای کرد کە ئازادانە لەگەڵ زانا موسوڵمانەکاندا هەڤپەیڤین ئەنجام بدات، بەڵام لە گفتوگۆکەدا دۆڕاندی. مەئموون پێیگوت ئەی یەزدان بەخت وەرە سەر ئایینی ئیسلام ئەگەر پەنام نەدابای ئەوا ئێستا دەمکوشتی. گوتی ئەی (ئەمیرلمونمینین) قسەکەت پەسندە، بەڵام دەزانم تۆ لەو کەسانە نیت کە خەڵك ناچار بکەیت دەست لە ئایینی خۆیان هەڵبگرن. بەڵام وێڕای ئەمەش مەئموون سەبارەت بە زەندیقییەکان چاوپۆشینی نەبوو. سەرچاوەکان نووسیویانە کە لەبەدواداگەڕان و ڕاوەدوونانی ئەو تاقمە هەمان شێواز و ڕێچکەی خەلیفەکانی پێش خۆی هەبوو. کاتیٚ هەواڵیان بۆ هێنا کە دە کەس لە زەندیقییەکان پەیدابوونە و خەڵك بۆ سەر ئایینی مانی بانگهێشت دەکەن، فەرمانی دا کە هەر دەکەسەکە بگرن و بیانهێنن بۆ لای ئەو. مشەخۆرێکی ورگن کاتیٚ ئەو دەکەسەی بینی وا بۆ جێیەك دەچن، وایزانی بۆ سەر ئاهەنگ و داوەتێك بانگهێشت کراون. خۆی خستە ناو ئەوانەوە و سواری کەشتییەکیان کردن و ئەویش لەگەڵ ئەواندا سواری کەشتییەکە بوو. پیاوەکانی خەلیفە تێیان هاڵان ئەو مشەخۆرەشیان لەگەڵ دەکەسەکە زنجیر کرد و ڕاپێچیان دان. کابرا زۆر ترسا و لەگیراوەکانی پرسی ئێوە کێن و ئەو کۆت و زنجیرەیان بۆ خستە دەستتان؟ ئەوانیش حاڵ و ڕەوشی خۆیان بۆ باسکرد و لێیان پرسی ئەی تۆ چۆن کەوتیە نێو ئێمەوە؟ گوتی من کابرایەکی مشەخۆرم کاتیٚ کە ئێوەم پێکەوە بینی وامزانی دەچنە سەر نانخواردنێك بۆیە خۆم خزاندە نێو ئێوەوەو خۆم گرفتار کرد. کاتیٚ کە کەشتییەکە گەیشتە بەغدا ئەوانەیان بردنە لای مەئموون، خەلیفە یەك یەك بانگی کردن و داوای لێکردن نەفرەت لەمانی بکەن و واز لە ئاییینی ئەو بێنن، لەبەرئەوەی قبوڵیان نەکرد هەموویانی کوشتن. ئینجا ڕووی کردە مشەخۆرەکە و پرسیاری ناو نیشانی لێکرد. کابرا حاڵو کاری خۆی بۆ باسکرد، مەئموون پێکەنی و لێیخۆشبوو[299].

---

٢٩٨- طبری، ب١٠، ل٤٢.

٢٩٩ مروج الذهب، ب٣، ل٣٢٠.

## مەئموون و کۆڕەکانی هەڤپەیڤین (مجالس مناظرة)

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ڕەفتارەی مەئموون لەگەڵ سەرجەم گروپەکانی تردا دەیکرد، نەرمتر و هێمنانەتر بوو. لە ڕاستیدا ڕۆژگاری مەئموون، قۆناغێکی نوێی باس و مشتومڕ و هەڤپەیڤینە ئایینییەکان بوو لە نێوان خاوەن کتێبەکاندا. ئەو کۆڕە هەڤپەیڤینانەی کە زیاتر بە ئامادەبوونی ئەو پێك دەهێندران، بواری بە پەیڕەوکارانی ئایینەکان بەتایبەت بە مویدەکان دا کە بۆ سەلماندنی بیروباوەڕی خۆیان بکەونە باس، و مشتومڕ و هەڤپەیڤین لەگەڵ زانا موسوڵمانەکان ئەنجام بدەن. لەو هەڤپەیڤینانەدا، نەبەردێکی تازە لە نێوان مویدانی زەردەشتی و قسەکەرانی موسوڵماندا دروست بوو. نەبەردێك کە لە ڕووناکی و لەژێر سایەی عەقڵ و زانستەوە بوو و شمشێر و چاوسوورکردنەوەو دەستێوەردانی تیا نەبوو.

بە هۆی ئەو خولیایەی کە مەئموون سەبارەت بە توێژینەوە و شرۆڤەی بیروباوەڕ و تێڕوانینەکان هەیبوو، هەندێ ئازادی بە پەیڕەوکارانی ئایین و مەزهەبەکان دا کە بتوانن گفتوگۆو هەڤپەیڤین سەبارەت بە بیروباوەڕی خۆیان ئەنجام بدەن. قسەکەر و زاناکانیش کە لەگەڵ زانست و مەعریفەی یۆنانی و ئێرانی و هیندیدا ئاشنایەتیان هەبوو لەگەڵ خاوەن ڕاو قسەکەر و بیرپارەکاندا کەوتنە مشتومڕ و لەوەی پەیوەندی بە هزر و پرسی باوەڕەوە هەیە قسەو باس‌و پرسیارگەلێکی تازە هاتنە کایەوی. لە بارەی مرۆڤ کە ئایا خۆی دەسەڵات و ئیختیارێکی هەیە یان نا، لە بارەی قورئانیش کە ئایا دروستکراوی دەستی مرۆڤە یان نا، باس و مشتومڕێکی گەرم سەری هەڵدا. سەبارەت بە ئایین و مەزهەبەکانیش کە ئایا کامیان لەگەڵ عەقڵ و زانستدا کۆکن و کامیان نا، باس و گفتوگۆ هاتنە ئاراوە. پەیڕەوکارانی ئایین و خاوەن بیروباوەڕەکان لەگەڵ یەکتردا کەوتنە هەڤپەیڤین و باس و مشتومڕ. مەئموونی خەلیفە ئەو جۆرە کۆڕ و باس و هەڤپەیڤینانەی پێ خۆشبوون و بۆ سەلماندنی ڕاستی، بە فاکتەرێکی کاریگەریی دەزانین. بۆیە ئەو شمشێرەی کە خەلیفەکان لە ڕووی بیرمەند و خاوەن تێڕوانینەکانیان هەڵکێشابوو، ئەو خستییەوە نێو کالان و ڕێگەی دا کە پەیڕەوکارانی ئایینەکان لەگەڵ وتەبێژ و زانایانی ئیسلام ڕووبەڕوو ببنەوە و بکەونە باس و هەڤپەیڤینی ئازادانە. مەئموون پێیوابوو کە دەبێ سەرکەوتن بەسەر دوژمن بە هۆی بەڵگەوەبێ نەك بە هۆی هێز و دەسەڵات، چونکە ئەو سەروکەوتنەی بە هۆی هێز و دەسەڵاتەوە بێتەدی، لەگەڵ نەمانی هێز و دەسەڵاتیش لە نێو دەچێ، بەڵام ئەو سەرکەوتنەی بە هۆی بەڵگەوە بێتەدی هیچ شتێك ناتوانێ

لەنێوی ببات[300]. لەبەرئەوە بوو کە مەئموون بایەخێکی تایبەتی بە گفتوگۆ و هەڤپەیڤینەکان دەدا و هەمیشە هەستان و دانیشتنی لەگەڵ قسەکەر و لێکۆڵەراندا هەبوو. سەرچاوەکان نووسیویانە کە ڕۆژانی سێ شەممە لە بارەگای خەلافەتدا زانایان و بیریارانی خاوەن قەڵەم و سەر بە ئایینە جیاجیاکان کۆدەبوونەوە و ژوورێکی تایبەتی بۆ دەڕازاندنەوە و خواردنیان دەخوارد و دەستیان دەشووشتن و ڕۆشناییان دادەگیرساند، ئینجا کۆڕیان دەبەست و دەکەوتنە باس و مشتومڕ و هەڤپەیڤینەوە. مەئموون ئەمانەی لەلای خۆی دادەنان و ئیدی کۆڕەکە گەرم دەبوو. لە ڕادەربڕیندا ئەوپەڕی ئازادیان هەبوو و نیوە شەوان دیسان نانیان دەخوارد ئیدی بڵاوەیان لێدەکرد[301]. لەو کۆڕو دانیشتنانەدا پەیڕەوکارو پێشەوایانی ئایینە جیاجیاکان ئامادە دەبوون. لە نێویاندا کەسانی وەکو (ئازەر فرینبغ)ی پێشەوای زەردەشتییەکانو (یەزدان بەخت)ی پێشەوای مانیەکان ئامادە دەبوون. لە هەندێ لەو جۆرە کۆڕانەدا کە لە خوراسان پێکدەهێنران (عەلی بن موسا ئەلرەزا)ش بەشداری دەکرد. لە کتێبەکاندا هەندێ لەو گفتوگۆیانەی کە لەو دانیشتنانە ئەنجام دراون، تۆمارکراون. ئەوەی لەو کتێبانە دەردەکەوێ ئەوەیە کە ئەو جۆرە کۆڕانە بازاڕی باس و مشتومڕ و شیکردنەوەی یان لە بوارەکانی زانستی کەلام و باوەڕدا، باش گەرم کرد و پەیڕەوکارانی ئایین و مەزهەبەکانی ناچارکرد بۆ پاڵپشتیکردن و پشتڕاستکردنەوەی مەزهەبەکانیان بۆ ڕەتدانەوەی گومان و دوودڵی نکۆلیکەرەکان کتێب و وتار و نامیلکە بنووسن.

## هەڤپەڤینی دوانەیی - دوالیزم (مناظرة ثنوي)

لەو هەراو بەزمەی کە کەوتبووە نێو پەیڕەوکارانی باوەڕ و مەزهەبە جیاجیاکان لەو سەردەمەدا، مەزدیسنان و زەردەشتیانیش ئەو بوارەیان بۆ ڕەخسا کە لەو هەڤپەیڤین و دیالۆگانەدا بەشداری بکەن. بەشداربوون لەو کۆڕ و هەڤپەیڤینانە بووە هۆی ئەوەی کە مویدەکان لە بارەی ئیسلام و قورئانیش بکەونە گفتوگۆ و لە دروستی و نادروستی باوەڕێك بکۆڵنەوە و مشتومڕی لەسەر بکەن، کە سەدەیەك پێشتر ئایینی زەردەشتی شکست پێدابوو و بەسەریدا زاڵ ببوو. دەتوانین هەندێ نموونە لەو جۆرە هەڤپەیڤینانە کە لە نێوان زەردەشتییەکان و زانا موسوڵمانەکاندا ئەنجام دراون لە کتێبەکان بەدی بکەین. بۆ نموونە سەرچاوەکان نووسیوویانە کە بە ئامادەبوونی مەئموون یەکێ لە

---

٣٠٠- تاریخ بغداد، ب١٠، ل١٨٦ وەرگیراوە لە نۆبەختی، ل٤٢.

٣٠١- مروج الذهب، ب٢، ل ٣٢٧.

هیربدانی گەورە لەگەڵ ئیمام ڕەزا کەوتبووە بەرامبەر هەڤپەیڤینەوە. "ئیمام ڕەزا لێپرسی بەڵگەی تۆ لە بارەی ئەوەی کە زەردەشت بە پێغەمبەر دەزانی چییە؟ هیربدەکە گوتی: زەردەشت شتێکی هێنا کە کەسی تر پێش ئەو نەیهێنابوو و شتگەلێکی بۆ ئێمە ساغ کردەوە کە جگە لەو کەس ساغی نەکردوونەتەوە. ڕەزا گوتی: ئایا ئەو شتانەی کە لە بارەی ئەوەوە دەیانڵێی لە پێشینانەوە بە ئێوە نەگەیشتوون؟ هیربد گوتی: بەڵێ لەوانەوە بە ئێمە گەیشتووە. ڕەزا گوتی: خەڵکانی تری جیهانیش هەمان ئەوە دەڵێن و ئەوانیش ئەو شتەی کە لە بارەی پێغەمبەرانی خۆیان وەك موسا و عیسا محەمەد هەیانە لە پێشینانەوە وەریانگرتووە. کەوایە هۆی چییە کە ئێوە زەردەشت لە ڕێی گێڕانەوەی پێشینانەوە دەناسن‌و دان بە پێغەمبەرایەتی ئەودا دەنێن و بانگەشەی دەکەن کە ئەوەی ئەو هێناویە کەس نەیهێناوە، بەڵام بانگەشەی پێغەمبەرانی تر کە پەیامی ئەوانیش هەر لە ڕێی پێشینانەوە گەیشتۆتە دەست پەیڕەوەکانیان، باوەڕ ناکەن؟ هیربد وەڵامی پێنەدرایەوەو شوێنەکەی بەجێهێشت"[302]. نموونەیەکی تر لەو جۆرە هەڤپەیڤینانە گفتوگۆیەکە کە لە نێوان مەئموون لەگەڵ (دوالیست)ێکدا ڕوویدا. چیرۆکی ئەو هەڤپەیڤینە بەم چەشنە باسکراوە: "لە ڕۆژگاری مەئمووندا، وا باو بوو کە ناوبراو بڕیاری دابوو لەبەردەم ئەودا هەموو مەزهەبەکان ڕووبەڕوو هەڤپەیڤین بکەن، ڕۆژێك پیاوێکی زانا هات کە سەر بە مەزهەبی (دوانەیی) بووو بۆ داکۆکیکردن‌و سەلماندنی ئەو مەزهە بە لەگەڵ خەڵکانی تردا گفتوگۆو هەڤپەیڤینی ئەنجام دەدا. مەئموون فەرمانی دا زاناو شارەزایانی ئایینی ئیسلامیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کابرای ناوبراو کۆکردنەوە. کابرا کاتێ هاتە قسەکردن گوتی جیهانێك دەبینم پڕە لە چاکە و خراپە و ڕووناکی و تاریکی و جوانی و دزێوی، هەر ئاوێنەیەك لەو دژ بەیەکانە دەبێ دروستکەرێکی دیکەیان هەبێ، چونکە عەقڵ ناسەلمێنێ کە دروستکەرێك هەم چاکە بکا و هەم خراپە، ئەو جۆرە بەڵگانەی هێنانەوە. لە نێو کۆڕی دانیشتواندا دەنگی ناڕەزایەتی بەرزبووەوە و ڕوویان کردە خەلیفە و گوتیان ئەی میری خاوەن باوەڕان جگە لە شمشێر شیاو نییە بە هیچ زمانێکی تر قسە لەگەڵ ئەم پیاوە بکرێ. مەئموون دەمێك بێدەنگ بوو، ئینجا لێپرسی ئایا مەزهەب چییە؟ وەڵامی دایەوە: مەزهەب ئەوەیە کە دروستکەر دووانن، یەکێکیان خوای خراپەو ئەوەکەی تر خوای چاکە. مەئموون گوتی ئایا هەردووکیان بە سەرکرداری خۆیاندا دەسەڵاتدارن یان بێدەسەڵاتن؟ وەڵامی دایەوە کە: هەردووکیان بەسەرکرداری خۆیاندا زاڵ و

---

٣٠٢- عیون اخبار الرضا، باب ١٢.

دەسەڵاتداران و دروستکەر هەرگیز دەستەوەستان و بێدەسەڵات نییە. مەئموون گوتی: هیچ دەستەوەسان و بێهێزی لێدەوەشێتەوە.گوتی نەخێر، چۆن پەروەردگار بێدەسەڵات دەبێ.

مەئموون گوتی (الله اکبر)، خوای چاکە دەیەوێ خۆی بێ و خوای خراپە نەبێ یا خوای خراپە دەیەوێ کە خوای چاکە نەبێ بە خواست و داخوازی ئەوان بێ یان نا؟ کابرا گوتی نابێ و هیچ کامیان بەسەر ئەوی تردا زاڵ نییە.

مەئموون گوتی: کەوایە دەستەوەستانی هەر یەك لەو دوانە دەرکەوت و خوا هیچ بێ دەسەڵاتیەکی تیا نییە. ئەو (دوانەیی)یە سەری سوڕما، ئینجا مەئموون فەرمانی دا کوشتیان و هەمووان ئافەرینیان کرد[٣٠٣]." ناوی ئەو (دوانەیی) یە لە کتێبان نەهاتووە، بەڵام ئەو ڕەفتارەی کە مەئموون دواجار لەبەرامبەری بەکاری هێنا لەگەڵ ئەو ڕەفتارە کە دەرهەق بەمانەوییەکان دەیکرد وەك یەکە. هەندێ لە لێکۆڵەران ئەو دوالیستە بە کەسێکی مانەوەی دەزانن، تەنانەت بە یەزدانبەختی مانەوی دەزانن[٣٠٤]. لە کاتێکدا کە مەئموون یەزدانبەختی نەکوشتووەو پەنای داوە و کوژرانی ئەو دوالیستە بە چیرۆکێکی دروستکراوو نەشیاو دەچێ و ڕەنگە سەرلەبەر شتێکی خەیاڵی و دروستکراوی دەستی نووسەر و زادەی ئارەزووو دەمارگیری ئەو کەسەبێ کە پێکیەوە ناوە. بەڵام ئەو گفتوگۆیەی کە لە نێوان ئەو دوالیستەو مەئموون ڕووی داوە لەسەر بنەمای باوەڕی زەردەشتی بووە و لە کتێبە پەهلەوییەکاندا شتی لەو چەشنە هەیە. ئاشکرایە کە لەو جۆرە هەڤپەیڤینانەدا ئەوەی کە زۆر، زەردەشتیە دوالیستەکانی نیگەران کردووە، مەسەلەی چاکە و خراپەیە. نیگەرانی ئەوان لەوەدایە کە چۆن دەکرێ کرداری خراپە بدرێتە پاڵ خوا؟

## وتەی گومانشکێن

لە کتێبی پەهلەوی (شکەنەد گومانێك و چار) [٣٠٥] دا کە پێدەچێ کەمێك دوای ئەو مێژووە نووسرابێ، هەندێ قسەن کە نیشان دەدەن موبیدان لەو بارەیەوە تا چ ڕاددەیەك لە نێو گومان و دوو دڵیدا ژیاون؟ ئەو هزرەی کە دزێوی و تاوان بۆ خوای چاکەو لەهەمانکاتدا چاکەو

---

٣٠٣- بیان الادیان، چاپ عباس اقبال، ل١٨.

٣٠٤- عەباس ئیقبال، پەراوێزی بیان الادیان، ل ٥٨.

٣٠٥- ئەم کتێبە لە لایەن west بە ئینگلیزی (١٨٨٥ ز) demenasce بە فەرانسەوی (١٩٤٥) وەرگێڕدراوە. سادیق هیدایەت بۆ سەر زمانی فارسی وەری گێڕاوە.

جوانی بۆ خوای چاکە دەگێڕێتەوە، بۆ ئەوان قووت نەدەدراو نەیاندەتوانی بیری لێبکەنەوە. ئایا خوایەك کە چاکە و جوانییەکانی جیهانی ئافراندووە، دزێوی و خراپەکانیشی دروست کـردوون و پێشکەشی جیهانی کردوون؟ ئەگەر خوای جیهان ئافریدەی خراپە و چاکە بـێ، بتـەوێ یـان نـا دەبێ خۆیشی نەزان و بێ تواناو دوور بێ لە چاکەو بەزەیی، کە ئەمانە کەمو کوڕین و خوایـەك کـە بەدیهێنـەری تـەواوو بـێ کـەموکوڕی بێـت چـۆن دەکـرێ ئـەو کەموکوڕیـەی هـەبێ و لێبوەشێتەوە؟[306] لەو هەڤپەیڤینەی کە لە نێوان دوالیستەکە و مەئمووندا ڕوویدا ئەو هزرە کـە لە (شکەنەو گومانیكو چار)دا بۆتە بنچینەی باسێك، بێگومان یەکێ لە گرنگترین گرفتـەکان بووە کـە مەزدیسنان و دوانەییـەکانی لـە قبـوڵکردنی ئـاینی ئیـسلام خـستۆتە دوو دڵـیو گومانەوە. دەیانپرسی ئەگەر وەکو موسوڵمان دەڵێن خوا هاوتاو بێ هاوشێوەیەو بەسەرکەوتوو، لە نێوبەری دەدەنە قەڵەم چ ڕوو و ڕوخسارێکی هەیە؟[307] جگە لەوە، ئەو خوایەی کە هاوشـێوە و هاوتای نەبێ لای مەزدیسنان وێناکردنی ئاسان نەبوو. دەیانگوت وەها خوایەك ئەگەر ژیـر و پەسندکراوە بۆچی بوار بە چاکە و خراپە دەدا و ئەگەر چاکە لە خراپە بە باشتر دادەنـێ، ئـەدی هۆی چییە کە ناپاکان و خراپەکاران لەم جیهانەدا لە پێـشتر و زیـاترن؟[308] ئەگـەر (ڕەحـیم) و (ڕەحمان)ە لەپای چی نەزانی و کوێری و دڵڕەقی و خراپەکاری بەسەر خەڵکدا دەسەپێنێ؟[309].

زانایانی ئیسلام وەکو (ئەبولهوزەیل) (٢٢٦ك/٨٤٢ز) و (نیزام) (٢٢١ك/٨٣٢ز) کە ناوی ئـەبو ئیسحاقی کوڕی سەیارە وەڵامی وردو دروست بەرامبەر ئەو ڕەخنەو پرسیارانە دەخەنە ڕوو، کە لە کتێبەکانی کەلامدا هاتوون. بەڵام ئەو جۆرە ڕەخنە و ئیرادانە کە لـە کتێبـی (شـکەنەد گومانیـك وچار) ئاڕاستەی زانایانی ئیسلام کراون، نموونەیەکن لەو هەڤپەیڤینانەی کە لـە سـەرەتای قۆنـاغی گفتوگۆ و هەڤپەیڤینی نێوان مەزدیسنان و موسوڵمانەکاندا برەویان هـەبووە. ئـەو بـوارە فـراوان و لێبوردەییەی کە مەئموون بەرامبەر مەزدیسـنان و گروپـە ئاینییـەکانی تـر دەینوانـد، وردە وردە جورئەتی پێدان کە ڕەخنە لە دەقەکانی قورئانیش بگرن و ئەو قسە و ئایەتانە بە قـسەی دژ بەیـەك بژمێرن. نموونەی ئەو جۆرە ڕەخنانە دەتوانین لە کتێبی (شکەنەد گومانیك وچار)دا بـەدی بکـەین و

---

٣٠٦- شكند گمانيك وچار، فصل ١١ بند ١٦ -١٣.

٣٠٧- هەمان سەرچاوە، هەمان بەش، ٣٦-٣٠.

٣٠٨- هەمان سەرچاوە، ٣٦-٣٠.

٣٠٩- هەمان سەرچاوە، ٤٤-٣٧.

دەشێ ئەو جۆرە ڕەخنە و ناڕەزایەتیانە بە نموونەیەك لەونەبەردە بدەینە قەڵەم کە ئێرانییەکان لە ژێر سایەی لۆژیك و ڕووناکیدا دژی عارەبەکان و موسوڵمانەکان ئەنجامیان دەدا. لە جێیەکی ئەم کتێبەدا هاتووە "لە کتێبی ئاسمانی ئەواندا، لەبارەی چاکە و گوناهەوە ئەو بانگەشەیە هەیە کە پێچەوانەی یەکترن. دەڵێ: "چاکە و گوناە هەر دووکیان لەمنەوەن، دێو و جادوو ناتوانن زیان بە کەس بگەیەنن. هیچ کەس ئایین قبوڵناکات ئەگەر خواستی منی تیا نەبێ و هیچ کەس ڕوو لە کوفر ناکات و ناکەوێتە سەر ڕێی خراپە ئەگەر من خواستم لەسەری نەبێ، لە هەمان کتێبدا زۆر ناڕەزایەتی دەربڕاوە و نەفرەت لە ئافەریدەکانی خوا کراوە کە چما خراپە و گوناهکاری دەکەن... ئەمە خواست و کرداری خودی خۆیەتی کەچی خەڵکی بە هۆی ئەو تاوان و خرپەکاریانە بە ئازار و ئەشکەنجەی دۆزەخ و سزای گیان و جەستە دەترسێنێ و هەڕەشەیان لێدەکات. لە جێیەکی تردا دەڵێ کە "من خۆم، خەڵك بۆ سەر گومڕاهی ڕادەکێشم، لە کاتێکدا ئەگەر بمەوێ دەتوانم بۆسەر ڕێی ڕاستیان ڕێنوێنی بکەم، بەڵام خۆم گەرەکمە ئەمانە بچنە دۆزەخ" و دیسان لە جێیەکی تری ئەم کتێبەدا هاتووە کە "خەڵك خۆیان فاکتەر و بکەری تاوان و گوناهکارین"[310] ئەمانە نموونەیەکن لەو شتانەی کە مەزدیسنان وەك بەڵگە بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ زانایانی ئیسلام و سەلماندنی ڕاستی و دروستی ئایینی خۆیان لە چاو ئایینەکانی تر، دەیانگوتن. بەڵام، قسەکەرانی ئیسلامیش قسەی خۆیان هەبوو و زمانیشیان وەکو شمشێری غەزووکارەکانیان بۆ وەڵامدانەوە و لە نێوبردنی ئەو ڕەخنە و گومانانە لەکاربوو و سەرکەوتنیان لەو ڕووەوە وەدەست هێنا و کۆتاییان بەو مقۆمقۆ و هەڤپەیڤینانە هێنا. بەڵام ئەو قسانە، نیشان دەدەن کە موبیدان و هیربدانی زەردەشتی تەنانەت لە هەرەتی هێز و دەسەڵات و شکۆی ئیسلامیشدا، هەرکاتێك دەرفەتی قسەکردنیان بۆ ڕوخسابوا بەرامبەری ڕاوەدەستان و بۆ ڕەتکردنەوەی بەڵگەی خۆیان دەهێنایەوە و ئەو بەڵگانە ئەگەر نادروستیش بن، دەرخەری ئەبەردێکن کە لە نێو ڕووناکی و عەقڵ و زانستیشەوە لە نێوان ئێرانییەکانو عارەبەکاندا گەرم بوون. بەڵام هەڤپەیڤینی زانایانی زەردەشتی هەر تایبەت نەبوو لەگەڵ زاناو قسە بێژانی ئیسلام بەڵکو لەگەڵ جولەکە و مەسیحی و مانەوییەکان و تەنانەت لەگەڵ (دەهری)یەکانیشدا گفتوگۆ و هەڤپەیڤینیان هەبوو. دەتوانین نموونەیەك لەو هەڤپەیڤینانە لە کتێبی (شکەنەد گومانیك وچار)یشدا بەدی بکەین. لەمانەدا دەردەکەوێ کە زەردەشتییەکان

---

٣١٠- شکند گومانیك، فصل ١، بند٢٦٥-٢٦٤.

لە سەردەمی ئیسلامیشدا، لە بڵاوکردنەوەی ئایینی خۆیان کەمتەرخەم و خەمسارد نەبوونە و لەو ئەرکەشیاندا ئەوپەڕی حەز و سەلیقەیان هەبووەو خستویانەتە گەڕ.

## گوجەستەك ئەبالیش

یەکێك لەو هەڤپەیڤینانەی کە لە نێوان (ئازەرفەرنبغ)ی موبیدی گەورەی زەردەشتیو (گوجەستەك ئەبالیش)ی زەندیق کە مانی یان دەهری بووە، هەبووە، نیشاندەری ئازادی ئەمانەیە لە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی خۆیان لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی مەئموونداا. نووسراوێکی بچووك لەو بارەیەوە بە زمانی پەهلەوی بە جێماوە کە چیرۆکی ئەو هەڤپەیڤینەی تیایە[311]. لەو نووسراوە دا، ئەبالیش کە لە ئایینی زەردەشت هەڵگەڕاوەتەوە، لە حزووری مەئموون لەگەڵ (ئازەرفەرنبغ)ی موبیدی زەردەشتیدا دەکەوێتە هەڤپەڤین و گفتوگۆ و هەفت ڕەخنە بە شێوەی پرسیار دەخاتەڕوو. بەڵام ئەو وەڵامانەی کە ئازەرفەرنبغ دەیانداتەوە ئەوەندە سەرنجڕاکێش و ڕەوانن کە مەئموون و ئەوانەی لەوێ دانیشتوون سەرکەوتنی ئازەرفەرنبغ پشتڕاست دەکەنەوە و ئەبالیش شەرمەندە و تێکشکاو لە دانیشتنەکە دەچێتە دەرەوە. پەیڕەوکارانی مەزدەك لە هەموو پاشماوەی گروپە ئایینییەکانی تری سەردەمی فەرمانڕەوایی ساسانی، نەفرەتلێکراوتر و مەترسیدارتر تەماشا دەکران. لەگەڵ ئەوەشدا لە دوا دواییەکانی سەردەمی فەرمانڕەوایی مەئمووندا، بواری خۆ دەرخستنیان بۆ ڕەخسا و ڕووبەڕووی موسوڵمانان بوونەوە. ئەو گروپە لە ژێر ناوی خوڕەمی و خوڕەمدینی لە سەردەمی مەئموون و موعتەسەمدا ڕاپەڕین و باس و چیرۆکی ئەمانە لە بەرسەهاتی بابەك و مازیاردا هاتووە. ئەو گروپە ئایینیە لە گروپە زەردەشتییەکانی تر کەمتر بواری گفتوگۆ و هەڤپەیڤین و بەڵگە هێنانەوە لەگەڵ موسڵمانەکانیان هەبوو و ئەو نەبەردەی کە بۆ سەرکەوتن و سەرخستنی ئایینی خۆیان ئەنجامیان دەدا سەرلەبەر لە مەیدانەکانی جەنگ بووە. سەرەڕای هەمووی ئەمانەش لەو کتێبانەی کە سەبارەت بە زانستی کەلام و گەلان و میللەتان نووسراون بنەمای باوەڕ و ئایینەکەیان باسکراوە، بەڵام وا پێدەچێ لەبەرئەوەی موسوڵمانان ئەوانەیان بە خاوەنی کتێب (اهل الکتاب) نە ژماردووە، بواری گفتوگۆ و دیالۆگیان پێنەداون. لەبەرئەوە ناتوانین بزانین داخۆ بۆ

---

٣١١- دەق وەرگێڕانی نوسراوەکە لەلایەن بارتلمی بە زمانی فەرەنسی (١٨٨٧) و هەمان چاپ بە زمانی ئینگلیزی (١٩٣٦) بڵاوکرایەوە صادق هیدایەت وەرگێڕاوە لە (١٣١٦ هەتاوی).

بانگەشە و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی ئایینی خۆیان چ بەڵگەیەکیان هێناوەتەوە و لە نێو ڕووناکیی زانست و عەقڵدا چۆن چۆنی توانیویانە لەگەڵ زانایانی ئیسلامدا ڕووبەڕوو ببنەوە؟

## شعوبییەکان

لە گێروگازی ئەو مشتومڕانەی کە سەبارەت بە زەمینەی بیروباوەڕ و تێڕوانینە ئایینییەکان لە نێوان بیرمەند و زانایان لە گۆڕێدا بوون، پرسێکی دیکەش لە نێو موسڵمانەکاندا جێی باس بوو: ئایا عارەبەکان کە ئێران و زۆر وڵاتی تری جیهانیان هێناونەتە ژێر ئاڵای ئیسلام و بەسەر زۆر لە گەلانی جیهاندا سەرکەوتوون، لە گەلانی تری جیهان ڕەسەنترو مەزنترن؟ هەڵبەتە عارەبەکان خۆیان لەو بارەیەوە گومانێکیان نەبوو. زۆر بە ئازایەتیو جوامێریو میوانەوازیو قسەزانی خۆیانەوە دەیان نازی. لەبەرئەوە هەوڵ و تێکۆشانەیش کە لە کاری بڵاوکردنەوەی ئیسلامدا نواندبوویان، خۆیان لە موسوڵمانەکانی تر بە خاوەن هەقتر دەزانی. بە هۆی ئەوەیش کە پێغەمبەر عارەب بوو و قورئانیش بەزمانی عارەبی بوو، پێیانوابوو کە عارەب لە هەموو میللەت و گەلانی تری جیهان مەزنتر و لە پێشترە و ئەو تێڕوانینە لە ڕۆژگاری ئەمەوییەکاندا، لە ئێران کە عارەبەکان زۆر خۆیان پێهەڵدەکێشا بووە مایەی ڕەنج و ئازاری زۆر. بۆیە هێواش هێواش ئەو بیرە لە مێشکی موسوڵمانان چەسپی کە ئەو بانگەشەیەی عارەبەکان و ئەو ڕەفتار و کردارەیان کە بە سووك سەیری موسوڵمانانی نا عارەب دەکەن، بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ ناوەڕۆك و ڕێنوێنییەکانی قورئان یەك ناگرێتەوە. مەگەر ئەوە نییە کە لە قورئاندا برایەتی و یەکسانی گشت موسوڵمانان بەڕاشکاوییەوە باسکراوە؟ قورئان بە ڕاشکاوییەوە دەیگوت کە "ئەی خەڵکینە، ئێمە ئێوە هەموومان لە پیاو ژن ئافراندووە و کردوومانن بە تیرەو هۆز گەلێك تا یەکتر بە هۆی ئەوەوە بناسن"[312]. هەروەها جەختی دەکردەوە کە "هێژاترینی ئێوە لای خوا ئەو کەسەیە کە پارێزکار و پاکترە" و پێغەمبەریش گوتبووی: "عارەب هیچی لە ناعارەب هێژاتر و مەزنتر نییە مەگەر بە هۆی پارێزکاری خۆیەوە بێت". بەو پێیە، ئەو بانگەشە و خۆ هەڵکێشان و فیز لێدانانەی کە عارەبەکان دەیانکرد نارەوا بوون و هیچ بنەمایەکی دروستیان نەبوو. لەبەرئەوە زۆر لە موسڵمانان نەیانتوانی بەرگەی ئەو نارەوایی و بەسووککگرتنانە بگرن و بە ئاشکرا کەوتنە ڕەتکردنەوەی ئەو بانگەشانە و نکۆڵیکردن لێیان. گوتیان عارەب هیچ شتێکی لە میللەتانی تری جیهان زیاتر نییە. مرۆڤەکان گشتیان لە یەك گەوهەرن و لە

---

٣١٢- قورئانی پیرۆز: سورەتی حجرات، ئایەتی ١٣.

نەژاد و تۆرەمەدا هیچیان هێژاتر نین لەوەی دیکەیان، ئەگەر مەزنی و هێژاتر بوونێك هەبێ، لە نێوان میللەتان و تیرە و هۆزەکاندا نییە بەڵکو لە نێوان تاکەکانە و ئەویش تەنها بە هۆی پاکی و پارێزکارییەوەیە و بەس. چاکە و خراپە و بەرزی و نزمی لە نێو هەر میللەت و تایفەیەکدا هەیە، بەڵام لە نێو هەر میللەت و تایەفەیەکدا چاکە، چاکەیە و و خراپەش خراپە. ئەو کەسەی کە خۆی نزم و هیچ پووچە ناتوانێ بە هۆی گەورە و پێشینانی میللەتەکەی خۆی، شەرەف و مەزنایەتی بۆ خۆی زیادبکات و ئەو کەسەیش کە خۆی مەزن و بەرز و گەورەیە بە هۆی ئەوەی سەر بە پیاو خراپانی هۆزکەیەتی لە شکۆ و هێژاییەکەی کەم نابێتەوە. کاتێك خەڵکی عێراق گشتیان ڕەچەڵەکی خۆیان دەگێڕایەوە بۆ خوسرەوقوباد، شاعیرێك لە شعوبییەکان بەگاڵتەپێکردنەوە پرسی ئەگەر وایە ئەی (نەبەتی)یەکان بۆ کوێ چوون؟

ئەو کەسانەی کە مەزنتربوونی عارەبانیان ڕەتکردەوە لایەنگرانی یەکسانی بوون و ئەو جۆرە بانگەشە و قسانەیان بە زیانی ئیسلام دەزانین. بەڵام عارەبەکان، بەتایبەت نەفام و خۆفشکەرەوەکانیان، کە قسەی ئەو یەکسانخوازانەیان قبوڵ نەدەکرد، تووشی لۆمەگەلێکی خراپتربوونەوە. ئەو کەسانەی بەناوی شعوبی ناسران، قسەکانی یەکسانیخوازەکانیان کردنە دەستاوێز و بیانوو و هێواش هێواش کەوتنە سووکایەتی پێکردن و لۆمەکردنی عارەبەکان. گوتیان و بەڵگەیان هێنایەوە کە عارەبەکان نەك هیچ شتێکیان لەگەلانی تر زیاترو باشتر نییە بەڵکو خۆیان هیچ شتێکی تایبەتی و باشتریان تیانییە. ئەوان قەت نە دەوڵەتێکیان هەبووە، نە دەسەڵاتێك، نە پیشەسازی و هونەرێکیان پێشکەش بەجیهان کردەوە و نەزانست و زانیارییەك، جگە لە تاڵانکاری و پیاوکوژی هونەرێکیان نەبووەو لەبەر برسییەتی و بەدبەختی، منداڵەکانی خۆیان زیندە بەچاڵ دەکرد و دەکوشت. بەڵام سەبارەت بە قورئان و ئایینی ئیسلام کە عارەب پێی دەنازن و پۆزی بەسەر موسوڵمانەکاندا، پێلێدەدەن، خۆی هیچ پەیوەندییەکی بە عارەبەوە نییە. قورئان و ئایینی ئیسلام خۆیان لەو قسە و بانەگشە بێجێ و ناڕەوا و دەمارگیریانە بێزارن و ئەو هەڵس و کەوتەیان بەشتی دزێوو و ناڕەوا داوەتە قەڵەم.

ناوی شعوبی، کە لەو گروپە ناکۆکەی عارەب و لەو کەسانەی کە لایەنگری یەکسانی بوون نراوە، لەو ڕووەوەیە کە ئەو دوو گروپە لەو باوەڕە بوون کە هۆز و تیرە عارەبەکان، لەگەڵ گەلانی ناعارەب هیچ جیاوازییەکیان نییە، و ئەو قسە و بانگەشانەی عارەبەکان کە خۆیان لە خەڵکانی تر

هێزاتر و مەزنتر دەزانن، قسە و بانگەشەی بێجێ و ناڕەوان[٣١٣]. مشتومڕی نێوان عارەبەکان لەگەڵ ئەو شعوبییانە وردە وردە پەرەیان سەند، ئیدی لە هەر گروپێك قسەکەرانێك سەریان هەڵدا و یەکتریان لۆمە و جنێوباران دەکرد و دژبەرانی عارەب، بە تایبەت زەردەشتی و زەندیقییەکان، بازاڕی ئەو هەنگامەیان گەرمتر کردو لە پەلامارو هەجووی عارەب زیاد لەوەی پێویست بێ، زیادەڕۆییان کردو کارەکەیان گەیاندە ڕادەیەك کە هێواش هێواش نەك هەر خەڵکی عارەب بەڵکو هەر شتێکی تریش لە زمان و ئایین و بیروباوەڕەوە بگرە کە دەگەڕایەوە بۆ عارەبەکان، خرایە بەر سووکایەتی پێکردنەوە و نارەزایەتی و دژایەتی کردنی ئەو بانەگەشانەی عەرەبەکانیان کردنە بیانوویێك کە دژایەتی بانەگەشەکانی قورئان و ئیسلامیش بکەن و لەو مشتومڕانەدا بە تەواوی لە سنوور دەرچوون.

ئەو شعوبییانە هەر تەنها لە ئێران نەبوون، لە هەموو وڵات و سەرزەمینە ئیسلامییەکانی تریش لە هەرجێیەك کە خەڵك لە دەستی خۆپەرستی و فیزلێدانەکانی عارەب وە تەنگ هاتبوون، شعوبییەکانیش دروست دەبوون و دژی عارەبەکان ڕاست دەبوونەوە. بەڵام لە ئێراندا، لە هەموو جۆرە خەڵکێك لە نێو ئەو گروپە یەکیان دەگرت کە هەموویان بۆ ناشیرینکردن و دژایەتیکردنی عارەب هاودەنگ و هاودەست دەبوون. لەگەڵ ئەوەشدا، زۆرترینی ئەو شعوبییانە لە ئێران لەو کەسانە بوون کە ستەم و بێدادیان لەدەستی عارەب چەشتبوو.

دەتوانین بڵێین وەرزێر و گوندنشینەکان، بەتایبەت ناوچە دوورە دەستەکانی ئێران لە هەمووان پتر کەوتبوونە بەر ستەم و بێدادی عارەب. لەلایەك خاوەن موڵك و دەرەبەگەکان ستەمیان لێدەکردن و لەلایەکی تریش باجگر و کاربەدەستەکان ماڵ و قووتی ڕۆژانەیان بەتاڵان دەبردن. لەبەرئەوە بووکە ئەوانە، لە هەموو چین و توێژەکانی تر زیاتر لەگەڵ بیروباوەڕی شعوبی ئاشنابوون. سەرچاوەکان نووسیوویانە کە "لە نێو شعوبییەکاندا ئەوانەی کە زۆر رکیان لە عارەبان دەبێتەوە و دژیانن ئەوباش

---

٣١٣- بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە شعوبییەت بگەڕێوە بۆ ضحی الاسلام دانانی ئەحمەد ئەمین کە بە هۆی عەبباسی خەلیلی بە ناوی (پەرتووی ئیسلام) بۆ سەر زمانی فارسی وەرگێڕاواە. هەروەها زنجیرە وتارەکانی جەلال هرمایی لە گۆڤاری میهر ساڵی دووەم کە زۆربەی بابەتەکەی لە هەمان کتێبی ضحی الاسلام وەرگرتووە. هەروەها دائرە اسلام ج٤، ص٤١٠ و توێژینەوەی گولد زێهر لەم بارە لە کتێبی muhammedanische studien، ١شکند گمانیك، فصل١، بەند ٣٦٥ -٦٢٤.

نەبەتی و جووتیار، گوندنشینەکانی ئێرانین، بەڵام سەران و ئەرستۆکراتەکانی ئێرانی کە خاوەنی پلە و پایەی بەرزن، ئایینیان ناسیووە و شەرەف بە ڕەچەڵەکی خۆیان دەزانن"[314].

ئەو وتەیەی (ئیبن قوتەیبە) ئەگەرچی لە ڕەنگ و بۆی مەبەستدارانە و دوژمنانە خالّی نییە، سەرنجڕاکێش و گرنگە. لە کاتێکدا کە هێزێکی هێرشبەر دەست بەسەر وڵاتێکدا دەگرێ و دەیخاتە ژێر ڕکێفی خۆی، ئەرستۆکرات و سەرانی ئەو وڵاتە هەمیشە زووتر لە چین و توێژەکانی تر دەست لەگەڵ هێرشبەر و دوژمنان تێکەڵ دەکەن و دۆستایەتیان دەکەن. ئەو پلە و پایە پڕ بەهایەی کە هەیانە هەمیشە وایان لێدەکات بۆ پاراستنی شکۆ و دەسەڵاتی خۆیان لەگەڵ دوژمنە داگیرکەرەکانی خۆیاندا تێکەڵاو بن و کاریگەریی و نفووزی ئەوان قبوڵ بکەن. بۆیە دەبینین دوای هەر کارەساتێك کە بەسەر وڵاتێکدا هاتبێت توێژی ئەرستۆکرات لە هەموو خەڵکی تر زووتر داب و نەریتە نەتەوەییەکانی خۆی لەدەست داوە و تەنانەت ڕێ و ڕەسم و نەریتی بێگانەکانی وەکو (پایە و شکۆ)یەکی تازە، قبوڵ کردووە.

لە ئێرانیش، جووتیار و مەزنزادەکان، هێواش هێواش توانیان جێی خۆیان لەنێو حکوومەتی عارەبیدا بکەنەوە، بۆیە لە هەندێ حاڵەت کە پلەوپایەو ناوو ناوبانگی خۆیان تێیدا مەبەست بوو بترازێ، لە راپەرینەکانی دژ بە عارەبەکاندا، کەمتر بەشداریان دەکرد. بەڵام گوندنشینانو وەرزێران کە لە ژێر ستەم و چەوسانەوەی داگیرکەراندا دەیانناڵاند، نەیاندەتوانی لەگەڵیان ڕێکبکەون و ببنە هاودەنگ و هاودەستیان، هەمیشە لە بیانوێك دەگەڕان کە لەبەرامبەر ستەمکاران و شەڕخوازەکانی عارەب ڕاست ببنەوە و بەرخۆدان بکەن. لەبەرئەوە بوو کە قسە و بانگەوازی شعوبییەکان لای گوندنشی و وەرزێرە ستەمدیدەکان، نفووزو کارتێکردنێکی زۆری دەبوو. بەسەرهاتی شعوبییەکان لە مێژوودا، سەرنجڕاکێش و مایەی خوێندنەوەیە. باوەڕی ئەوان لەبە بچووکزانینی عارەبان، سەرچاوەی لە هەستی نەفرەت و تۆڵەسەندنەوەوە وەردەگرت. ئەوان نەك هەر عارەبیان لە ناعارەب هێژاتر و گەورەتر دانەدەنا بەڵکو ئەوانیان لە هەموو میللەتانی جیهان نزمتر و هیچ و پوچتر دەزانی. ئەو بۆچوون و بانگەوازە لەسەردەمی حکوومەتی ئەمەویدا کە عارەبەکان ئەوپەڕی دەسەڵات و سەروەریان بەدەستەوە بوو، لاواز و کز بوو، بەڵام لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عەبباسییەکاندا وردە وردە پەری سەند و بەهێزبوو. لە زەمانی (هیشام کوری عەبدولمەلیك) مردووە لە ساڵی (١٢٥ك/٧٤٣ز) کاتێ (ئیسماعیل کوری یەسار) مردووە لە ساڵی (١٣٥ك/٧٥٣ز) شانازی بە

---

٣١٤- ابن قتيبه، كتاب العرب، رسائل البلغاى، ل٣٣٠.

نەژادی ئێرانی خۆی کرد، بە توندی سزا درا. دەڵێن ناوبراو لەبەردەم ئەو خەلیفە ئومەوییە شعرێکی خوێندەوە و تیایدا پەسنی شکۆو گەورەیی نەژادو تۆرەمەی ئێرانییەکانی کرد و گوتی "کێیە وەکو خوسرەو و شاپوور و هورمزان شایستەی شانازیو مەزنایەتی بێ؟". کاتێ هیشام گوێبیستی شعرەکانی بوو، تووڕەبوو و پەلامارەدرانە پێیگوت "شانازی بەسەر مندا دەفرۆشی و لەبەرامبەر خۆمدا پەسنی خۆت و میللەتەکەت دەکەی و پێیانهەڵدەڵێی!" دواتر فەرمانی دا لێیدەن و فڕێی دەنە نێو بیرێك[315].

لە قۆناغی فەرمانڕەوایی ئەمەویدا، بیروڕا و قسەی شعوبییەکان بەوپەڕی سەرسەختییەوە دژایەتی دەکراو ڕەتدەکرایەوە، بەڵام لە ڕۆژگاری عەبباسییەکاندا، کەسانێکی وەکو (بەشار کوڕی بۆرد) بە ئاشکرا عارەبیان لەقاو دەدان و پەسنی ئێرانییەکانیان دەکرد، هەندێ لەوانە تەنانەت بە ئاشکرا خەلیفەکانیان کە بەنی هاشم بوون ڕەتدەکردنەوەو دەیانگوت وەرنو بەرلەوەی پەشیمان ببنەوە، خۆتان وازبێنن و بۆ حیجازی زێدی خۆتان بگەڕێنەوە و خەریکی خواردنی مارمیلۆك و لەوەڕاندنی مەڕەکانتان بن...[316].

ئەگەرچی نووسین و ئاسەوارەکانی شعوبییەکان بەتەواوی لەلایەن دەمارگیرە لایەنگرەکانی عارەبەوە لە نێو براون، بەڵام لەوەی لە دوو توێی کتێبەکانی دوژمنەکانیان وەرگیراوە و نەقڵ کراوە بەچاکی دەتوانین ڕاستی داوا و بانگەشە و پوختەی پەیام و قسەی شعوبییەکان تێبگەین. نەفرەت لە عارەب، هێواش هێواش وەك چۆن (جاحظ) وتویە بە نەفرەت لە هەر شتێك کە پەیوەندی بە

---

٣١٥- بۆ درێژەی ئەم چیرۆکە بگەڕێوە بۆ اغانی، ب٤، ل١٣٥، هەروەها لە ضحی الاسلام ب١، ل ٣٠ -٢٩ کە شیعری ئیسماعیل کوڕی سەیار لەوێ هاتووە.

من مثل کسری و سابور الجنود معا

و الهرمزان لفغر او لتعظیم

٣١٦- ضحی الاسلام، ب١، ل٦٥ ئاماژەیە بۆ متوکلی کە دەڵێ:

فقل لبنی هاشم اجمعین — هلمو الی الخلع قبل الندم

فعودوا الی ارضکم بالحجاز — لاکل الضباب ورعی الغنم

برۆ بە کوڕانی هاشمییەکان بڵێ با دەست هەڵگرن بەرلەوەی پەشیمان ببنەوە، و بگەڕێنەوە خاکی خۆیان لە حیجاز بۆ خواردنی کلۆ و مێشوولە و بەخێوکردنی مەڕ و ماڵات.

عارەبەوە هەیە کۆتایی هات[317] و شعوبییەکان وردە وردە قسەی یەکسانخوازەکانیان کـردە بیانوێـك بۆ پەرەپێدان و بڵاوکردنەوەی دوانەیی (ثنویت)و زەندیقییەت.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی مەئموون و موعتەسەمدا پەرەسەندنی نفووز و دەسەڵاتی ئێرانـی و تورکەکان، بەتەواوی عارەبەکانی لاواز و زەبوون کردبوو. فیشاڵ و بانگەشەی گەورەتربوونی نـەژادی عارەب ئیدی لە ئەفسانەیەك بەولاوە شتێك نـەبوو. خەلیفـەکان لـە دایکیانـەوە عـارەب بـوون. وەزیرەکان زیاتر لە نێو ئێرانییەکاندا هەڵدەبژێردران. سەرداران و سوپاسـالارانی خەلیفـە زیـاتر لـە تورك و ئێرانییەکان بوون. لە بەرئەوە بڵاوکردنەوەی پەیامی شعوبییەکان ئیـدی تووشـی بەربەسـت نەدەبوو و بەم چەشنە، لە نێو گێروگازی ئەو مشتومڕ و دەمەتەقێ مەزهەبیو کەلامیانەی، کە لەو ڕۆژگارنەدا لە نێوان گروپە موسوڵمانەکان و مەزهەبەکانی تردا لە گۆڕێـدا بـوون، پـەیام و قـسەی شعوبییەکانیش وەکو پەیام و قسەی ئایین و مەزهەبێکی نوێ دەرکەوت و بەرهەڵستکار و لایەنگری پەیداکردن. بەرهەرحاڵ، لەڕۆژگاری مەئموندا هێواش هێواش شعوبییەکان لە دەربارەی خەلافەتـدا ڕێز و پێگەیەکیان وەرگرت. وەك ئەوەی هەندێکیان لە (بەیتولحیکمە)ی مەئمووندا پۆست و پلـەیان هەبوو.

---

٣١٧- الحيوان، ب٧، ل٦٨.

## دوایین ساڵەکان

لەو ساڵانەی کە بەغدا کوشتن و لەداردانی بابەك و مازیار و ئەفشینی لیّ ئـەنجام درا، دوو سەدەی بێدەنگی و تێکۆشانی ئێرانییەکان تێدەپەڕێ. لە داگیرکردنی نەهاوەندەوە تـا کـوژرانی بابەك دوو سەد ساڵ تێپەڕی کرد. ئەو ماوەیە بۆ ئێرانییەکان وەکـو شـەوەزەنگێکی خـەوئامێز تێپەڕیبوو، شەوێکی تاریك و ترسناك کەلە هاڕە و نرکەی تۆفانەکان و ناڵـەی کونـدە پـەپۆکان بترازێ هیچ شتێك ئەو بێدەنگییە هێدمە ئامێزەی تێك نەشـکاندبوو. لـە بێدەنگییـە هێدمـە گرتووەی ئەو دوو سەدە تاریك و شەوە زەنگەدا، لە نێوان هێـزی ئێرانـی و عارەبیـدا، کێـشمە کێشێکی گەورە لە گۆڕێدا بوو. لە شانۆی رکابەریە سەربازی و سیاسـییەکاندا دوو دژبـەری دڵ پڕ لە کینە بەرۆکی یەکتریان گرتبوو و هەریەکەیان هەوڵی دەدا پشتی ئەوی دی لـە زەوی بـدا. مێژووی ئەو دوو سەدەیە، مێژووی نواندنی هێز بوو لە نێوان دوو نەتەوەی ئێرانـی و عارەبیـدا لەماوەی ئەو هێزنواندنو پێکداپژانەی نێـوان ئـەو دوو هێـزەدا، زۆرجـار عارەبـەکان پـشتیان بەعەردی کەوتبوو، بەڵام لەو ساڵانەی کە بەغدا کوشتن و لە سێدارەدانی بابەك و مازیاری وەك ئاهەنگ و جەژنی سەرکەوتن یاد دەکردەوە، ئیدی بەکردەوە مەیدانەکە بـۆ عارەبـان بەتـەواوی چۆڵ ببوو.

لە کۆتایی دوو سەدەدا، عارەب ئیدی دەسەڵاتداری ئێران نەبوو. ئەو سەروەری و دەسەڵاتەی کە لە سەردەمی بەنی ئومەییە بە فیز و خۆهەڵکێشانەوە بۆ خۆی بەڕەوای دەبینی و بـە مـافی خـۆی دابووە قەڵەم، لەم ڕۆژگارەدا ئیدی بەتەواوی لە بیری چووبووەوە. لـە دەربـاری خەلافەتـدا نفـووز و دەسەڵاتی ئەوان ئیدی نەیدەتوانی ڕووبەڕووی نفووز و دەسەڵاتی ئێرانییەکان ببێتەوە. بـاڵا دەسـتی فەرهەنگ و شارستانیەتی ئێرانی، خەلیفەی عارەبی بەتەواوی خستبووە ژێـر کاریگـەریی خـۆی و بەسـەریدا زاڵ ببـوو. نـەجیبزادە و فەرمانـدە ئێرانییـەکان، یـانی ئەوانـەی کـە لـە سـەردەمی ساسانییەکاندا بەقەولی مێژوونووسانی ئیسلامی بە (صاحب بیوتات = خاوەن ماڵەکان) ناو دەبران، لە دوا دواییەکانی دوو سەدەی بێدەنگی و دان بە خۆداگرتندا، ئەوەی کـە لـە ڕووخـانی مـەداین و نەهاوەند دا لە دەستیان دابوو، دووبارە وەدەستیان هێنایەوە. حکوومەتە ناوچەییەکان بە زۆریی لـە دەستی ئەواندا بوون و بەدانی بەرتیل و باج و خەراج ئەو بوارەیان دەسـتەبەر دەکـرد، کـە خـەڵکی هەژار و بێ پشت و پەنا بەناوی ئایینەوە وەکو مانگا دابدۆشن. لە دەربارەی خەلافەتدا عارەبـەکان کشابوونە دواوە و نۆکەرە تورکەکان کە تازە هاتبوونە نێوەوە، وەکـو خـووی نۆکەرایـەتیی خۆیـان، لایەنگری و دۆستایەتی و پشتیوانیی خۆیان بە هەرکەسێك کە کڕیار بوایە دەفرۆشت.

## نفووز و ئوتوریتەی تورکەکان

خەلیفە کە لە پەرەگرتنی دەسەلات و هەژموونی ئێرانییەکان دەترسا، لەبەرئەوەی پشتیوانی و دۆستایەتی عارەبەکانی لە دەست دابوو، هەوڵی دەدا هێزی تورکەکان بکاتە پشت و پەنای خۆی. بۆ ڕازی کردنی تورکەکانیش پێویست بوو کە دەستیان ئاوەڵا بکات بە کەیفی خۆیان یاری بە گیان و ماڵی خەڵکی بکەن. بەڵێ پێویست بوو کە بەخشینی خەلات و دانی پارە و دارایی ئەو نۆکەرە تازە بابەتانە ڕازی و گوێڕایەڵی خۆی بکات.

بە چاکی دەتوانین ئاکامی ئەو بارە ئالەبارە وێنا بکەین: بڵاوبوونەوەی گەندەڵی و بەرتیل و پەرەگرتنی ستەم و نائەمنی لەوەها بارودۆخێکدا شتێکی مسۆگەرە. لە بەغدا هێواش هێواش کار گەیشتە ئەو ڕادەیە کە هیچ کەس بەتەمای گیان و ماڵی خۆی نەبوو. تورکەکان، بەهەزار جۆر خەڵکیان ئازار دەداو خەلیفەش نەیدەتوانی ڕێگری ئەو کارانەیان بێت.

لە کۆتاییەکانی قۆناغی فەرمانڕەوایەتی موعتەسەمدا، دەرباری خەلافەت بە تەواوی کەوتبووە ژێردەستی تورکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تا موعتەسەم خۆی مابوو، تورکەکان لەبەرئەوەی نۆکەری کڕدراوی ئەو بوون، بەرفەرمانەتی ئەویان دەکرد، بەڵام دوای ئەو ئیدی ملیان بۆ هیچ خەلیفەیەك کەچ نەدەکرد. ئەوان لە بەغدا بەسەر خەلیفەدا زاڵ ببوون و لە شارەکاندا ستەم و بێدادیان دەرهەق بەخەڵك ئەنجام دەدا. بە زۆری و زۆرداری داراییەکانی خەڵکیان دەبرد و کەسیش نەیدەتوانی لە مافی خۆی بپێچێتەوە. بە تۆبزی دەستدرێژیان دەکردە سەر نامووسی خەڵك و کەسیش نەیدەتوانی ڕووبەڕوویان ببێتەوە. باسی ئەو پیاوە کە پێنج سەد دیناری بەقەرز دایە ئەمیرێك لە بەغدا، لە کتێبی (سیاسەتنامە) دا هاتووە[318]. ئەو باسە نموونەیەکە لە ڕووداو و بوویەرەکانی ژیانی ئاسایی ئەو ڕۆژگارەی خەڵکی بەغدا کە تورکەکان بێ ئەندازە دەستیان بە سەر گیان و ماڵ و سامانیان داگرتبوون.

## ستەمکاریی کار بەدەستان

لە بەغدا بارودۆخ بەم چەشنە بوو، بەڵام لە دەڤەرەکانی تر لەوەش خراپتر بوو. کارگوزارانی خەلیفە، چ تورك و چ عارەب، شەلم، کوێرم کەوتبوونە گیانی خەڵك. ئەمانە لە

---

۳۱۸- نظام الملك: چاپی خلخالی، ل۳۰ — ۳۵.

پێناو پڕکردنی کیسەی خۆیان لـە هـیچ جـۆرە سـتەم و بێدادییـەك نەدەسـڵەمینەوە. ئەمـەی خوارەوە یەکێ لە نموونەکانی زوڵم و بێدادی کاربەدەستانی خەلیفەیە:

"... لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی موعتەسەمدا کابرایەکی نووسەر هەبوو کە بێکار بوو و بەردەوام چیرۆك و باسی دەنووسین و دەچووە سەرای مەعتەسەم و کاتێ موعتەسـەم دادەنیشت ئەو باسەکەی پێشکەش دەکرد و ناوەڕۆکی باسەکەش ئەوەبوو کە من پیـاوێکی نووسـەر و بـە توانام و ئەگەر ئەمیرولموئمینین کارێکم بۆ دیـاری بکـا بـە باشـی ئـەنجامی دەدەم و خەزێنـەی خەلیفە دەوڵەمەندتر دەکەم و خۆیشم نانێك بۆ خۆم وەدەست دێنم. موعتەسەم لەو پێـشنیاز و داواکارییانەی ئەو ماندوو بوو، و فەرمانی بە کارگێڕ و نوێنەرانی دیوان دا کارێك کە ئەوەنـدە بایەخی نەبێ دیاری بکەن، گوتیان مزگەوتی بەسرە دەبێ بەردڕێـژ بکرێـت چـونکە کـە بـاران دەبارێ حەوشە و دەوروبەری دەبێتە قوڕ و لیتە. فەرمانێکیان بۆ نووسی کە بچێ و ئەوکارە وە ئەستۆ بگـرێ. فەرمانەکـەی وەرگـرت و کەوتـەڕێ، لـە ڕێگـا دا بـەردێکی جوانی (تـورت) ڕەنگاوڕەنگی دۆزییەوە و بەردەکەی هەڵگرتەوە و لەگەڵ خۆیدا بـردی، کـاتێ گەیـشتە بەسـرە غولامێکی لە پێش خۆی ڕەوانەی شار کرد تا پێشوازی لێبکەن، خەڵکی شار بیریان دەکـردەوە تۆ بڵێی بە چ ئەرکێك هاتبێ. فەرمانەکەی پێ ڕاگەیاندن کـە دەبـێ مزگـەوتی شـار بەردڕێـژ بکرێ، پێیان گوت بەسەرچاو جێ بەجێی دەکەین، بەڵام ئەمە شتێکی ئەوەندە گرنگ نەبووکـە بۆ جێبەجێکردنی فەرماننامەی خەلیفەی بۆ بێنی. کابرا بـەردە عەقیقـەی لـە گیرفـانی خـۆی دەرهێنا و گوتی فەرمانەکە ئەوەیە کە هەموو بەردەکان لەم جۆرە بەردەبن. هـەموویان واقیـان وڕما و گوتیان جا ئەو جۆرە بەردە لە کوێ دەست دەکەوێ؟ ئەویش پێیداگرت تا ناچاری کـردن لە جیاتی ئەو جۆرە بەردە پارەیەکی زۆر بدەن، ئینجا ڕێگەی پێدان هەر بەردێك کە لەوێ هەیە بێنن و کاری بەردڕێژکردنەکـەی پـێ ئـەنجام بـدەن. کـابرا ئـەو پارەیـەی لێـوەرگرتن و بـۆڵای مەعتەسەم گەڕایەوە، موعتەسەم لێی پرسی ئەو پارەیـە چییە؟ گـوتی ئەمـە داهـاتی کـاری بەردڕێژکردنی مزگەوتی بەسرەیە کە بەمنتان سپاردبوو. موعتەسەم گوتی کەسێك ئەو هـەموو پارەیە لە کارێك کە هیچ بایەخێکی نییە وەدەست بێنێ شایستەی هەموو کـارێکی گەورەیـە، بۆیە فەرمانیدا بیخەنە ڕیزی نووسەرانی دیوان و کاروبارەکەی ڕێك کەوت"[319]. کاتێـك خەلیفـە ئەو پاداشتانە بە پۆست و پلە و پایە پاداشت دەداتەوە ئاشکرایە کە بەرپرس و کارگوزارەکـان بۆ ڕازیکردنی دڵی خەلیفە لە شار و دەڤەرەکانی تردا چ ئاگرێك دەنێنەوە.

---

٣١٩- عوفی: جوامع الحکایات، نسخه خطی.

بەمتەرزە کارگوزارانی خەلیفە، بۆ ئەوەی خەزێنەی سوڵتان لە پڕی دابێ و خۆیشیان لەم مێوەدا سوودێکیان پێ ببڕێ لە ئاست هاوڵاتیاندا خۆیان لە هیچ چەشنە ستەم و بێدادییەك نەدەپاراست. ئەمانە بەزۆری کار و پلە و پایەی خۆیان لەڕێی بەرتیل و بەرتیلکارییەوە وەدەست دەهێنا.

وەزیر هیچ کاربەدەستێکی دانەدەمەزراند ئەگەر لە پێشدا پارەیەکی وەك بەرتیل لێنەستێنی و بەو بەرتیلەیان دەگوت "مرافق الوزراء" (پێداویستییەکانی وەزیران). یەکێك لە نموونەکانی ئەو بەرتیلخواردنانە لەبەرسەهاتی (خاقانی) ی وەزیری (موقتەدیر) ی خەلیفەی عەبباسیدا دەخوێنینەوە: دەنووسن کە "ئەو زۆر دانان و لادانی ئەنجام دان بەڕادەیەك کە دەڵێن لەیەك ڕۆژدا فەرمانڕەوایەتی (کوفە)ی بە نۆزدە کەس داوە و لەهەر یەکێکیشیان بڕێك بەرتیلی وەرگرتوە و هەریەکێك لەوان کە کارەکەی تەواو دەبوو یەکسەر بەرەو کوفە دەکەوتە ڕێ، لە ڕێگادا ئەو کۆمەڵە گەیشتنەوە یەکتر و گوتیان باشە چ بکەین؟ یەکێکیان گوتی ویژدان ئەوەیە کە کامە لە دوای هەمووان چۆتە لای وەزیر و فەرماننامەی بەڕێوەبردنی کوفەی لێوەرگرتووە با ئەو بچێتە کوفە.

لەسەر ئەوە ڕێککەوتن هەژدە کەسەکەی تر گەڕانەوە و کەسی نۆزدەهەم چووە کوفە. خاقانی کە ئەوانەی بینی تەریق بووەوە و هەریەکەیانی بۆ کارێك دامەزراند"[٣٢٠].

کاتێك لە سەردەمی موقتەدیردا کە دەسەڵات و نفووزی خەلیفەکان بە هۆی بەرتەسکبوونەوەی قەڵەمڕەویی حکوومەت زۆر لە نزمیدا، وەزیرێك بۆ کاری چاودێری و بەڕێوەبردنی شاری کوفە بەم شێوەیەی سەرەوە بەرتیلی وەردەگرت ئاشکرایە کە لە سەردەمی ڕەشید و مەئموون و موعتەسەمدا وەزیرەکان تا چ ڕادەیەك توانیویانە شوولی لێهەڵکێشن.

کاتێك کارگوزار یا چاودێرێك توانای ئەوەی نەبوایە ئەو پارەیەی کە پێیدەگوترا "مرافق" بداتە وەزیر، دەبوا بەشێکی پارەکەی بە نەخت بدابا و ئەوەی دەشمایەوە بەزەمانەت لە ماوەیەکی دیاریکراو و بەپێی ڕێککەوتن بدات.

بە زۆری خەلیفەکانیش ئاگاداری ئەو مامەڵانە دەبوون و بەکارێکی نا پەسەند و زاڵمانەشیان نەدەزانین.

---

٣٢٠- هندوشا: تجارب السلف، ل ٣٠.

## گەندەڵیی حکوومەت

ئەو کارگوزارەی کە کار و پلە و پایەی خۆی بەو شێوەیە وەدەست دەهێنا، ماڵ و دارایی خەڵکی تاڵان دەکرد و باکیشی پێنەبوو، هەرچەندی بیویستایە و لە هەر کەسێك حەزی لێبا (جزیە) و باج و خەراجی وەردەگرت. هیچ ڕێگرییەك لەبەردەم ئەو چاوچنۆکی و هەوەسبازییەی ئەودا بوونی نەبوو. بەسەرهاتی (معن کوڕی زائدە) لە سیستان ئەو ڕاستیەی سەرەوە پشتڕاست دەکاتەوە.

معن کوڕی زائدە لە سەردەمی خەلافەتی مەنسوور بووە فەرمانڕەوای سیستان. ئەو کابرایە لە مێژوودا بە کەسێکی سەخی و دەستکراوە بەناوبانگە — و بێگومان بۆ وەدەستهێنانی ئەو ناوبانگە باشە پێویستی بەوە هەبووە کە پارە و سامانێکی بێ ژماری لەبەردەست دابێ — لە سیستان و بۆستدا دەستیکرد بە ستاندن و دەستبەسەردا گرتنی ماڵ و دارایی خەڵك و زۆر ستەم و ناڕەوایی ئەنجامدان. دانەری مێژووی سیستان دەنووسێ کە (عەبدوڵڵا کوڕی عەلاء) نامەیەکی وەك سکاڵا بۆ خەلیفە نارد، بەڵام "نامەکەیان لە ڕێگادا گرت و هێنایانە لای (معن)، ئەویش بانگی (عەبدوڵڵای کوڕی عەلاء)ی کرد و خستیە ژێر لێپرسینەوە. (عەبدوڵڵا) نکۆڵی کرد. فەرمانی دا کە سەری بتاشن و چوارسەد قەمچی لێبدەن و هەروا بڕیاری دا ئەو و ئەوانەی لەو کارەدا هاوکارییان کردبوو لەسەریان بدرێ، بەهەزار حاڵ تا توانیان خۆیان بکڕنەوە و پارەیەکی زۆری لێستاندن. چل پیاوی (خەواریج)ی گرتن و ڕەوانەی بۆستی کردن و فەرمانیدا کە سەرایەکی بۆ دروست بکەن و لەکارکردندا پەلە بکەن و هەر جێگایەك تەواو دەبوو نامەی دەنارد کە جێگایەکی تریش ئاوا لێبکەن و ئاوا چاکی بکەن یا دەستکاری بکەن."[321].

خەڵکی ستەملێکراو لەبەرامبەر ئەو هەموو دەستدرێژی و ستەم و ناڕەواییانە هیچ ڕێگا چارەیەکیان شك نەدەبرد. وەزیریش لەو بارەیەوە چی لە کارگوزارەکان کەمتر نەبوو و خەلیفە خۆیشی بەرتیلی لە هەردووکیان وەردەگرت و لە ڕەوشێکی ئاوادا سکاڵا و دەردە دڵکردن بە هیچ نەدەچوو.

ئەو بەسەرهاتەی کە لە خوارەوە لە (ئەغانی)یەوە گێڕدراوەتەوە نیشان دەدا کە لەو ڕۆژگارەدا خەڵکی تا چ ڕادەیەك لەلایەن فەرمانڕەوا و وەزیرەکانی خەلیفەوە چەوسێندراونەتەوە و زۆربەی هەرە زۆریش لە بەرگەگرتنی ئەو هەموو بێدادی و ستەمە بترازێ ڕێگا چارەیەکی

---

٣٢١- مؤلف مجهول: تاریخ سیستان، ل ١٤٥.

دیکەیان نەبووە. سەرچاوەکان نووسیویانە کە (محەمەد کوڕی عەبدولمەلیك زیات)ی وەزیری مەعتەسەم ڕۆژێك بۆ گوێگرتن و لێپرسینەوە لە سکالاکانی خەڵك دانیشتبوو، کاتێ دانیشتنەکە تەواو بوو، پیاوێکی بینی کە هێشتا هەر دانیشتووە، لێپرسی ئایا کارێکت هەیە؟ گوتی بەڵێ زوڵمم لێکراوە و مافم بستێنە. وەزیر لێپرسی کێ زوڵمی لێکردووی؟ گوتی تۆ زوڵمت لێکردووم و تا ئێستاش نەموێراوە بێمە لات. گوتی بڵێ بزانم سەبارەت بەچی زوڵمت لێکراوە؟ کابرا وەڵامی دایەوە، نوێنەری تۆ فلانە عەردی منی بەزۆر دەست بەسەر داگرتووە و کاتی دانی باج و خەراجیش کە هات، من خۆم باجەکەم دەدەم دا تا مولکەکە لە دیوان بەناوی تۆوە تۆمار نەکرێ و خاوەندارێتی من لە نێو نەچێ. نوێنەرەکەی تۆ هەموو ساڵێ داهاتی ئەو مولکە بۆ خۆی دەبا و منیش هەموو ساڵێ باجە زەویانەکە دەدەم. وەزیر گوتی ئەو قسەیەی تۆ پێویستی بە شایەت و دیاریکردن و شتی تریش هەیە، پیاوەکە گوتی ئەگەر وەزیر لێم تووڕە نەبێ قسەیەك دەکەم، گوتی بڵێ: گوتی دیاریکردن لەو پرسەدا هەمان شایەت و بەڵگەیە و ئەگەر شایەتەکان شایەتی خۆیان دا ئیدی پێویست بە هیچ شتێك ناکات، ئەی کە دەڵێی "شتی تریش، مانای چییە و مەبەستت لەمەدا چییە؟"[٣٢٢].

## وەزیرەکان

ئەو ستەم و بەرتیلخواردنە سەرچاوەیەکی داهاتی گرنگ بوو بۆ کارگوزار و وەزیرەکان، لەبەرئەوەی خەلیفەکان خۆیان ئاگاداری ئەو ڕەوشە بوون هەرکاتێك پێویستیان بە پارە هەبوایە، دەستیان بەسەر دارایی ئەوانە دادەگرت. ئەو وەزیرەی کە دوای یەك دوو ساڵ لەسەر کار لادەبرا جگە لە زەوی و زاری زۆر، هەزاران هەزار دیناری زیڕیشی دەبوو و ئەو سامانەشی بەزۆری لە ڕێی بەرتیل و دەست بەسەر داگرتن و (مرافق) ەوە وەدەست دەهێنا. لەگەڵ ئەوەشدا ژیانی زۆربەی وەزیرەکان بە ناکامی کۆتایی دەهات. خەلیفە داراییەکەیانی لێدەستاندن و بەو کارەی دەگوت (پاککاری). زۆر لە خەلیفەکان، وەزیرەکانی خۆیان کە دەکەوتنە بەر ڕق و نەفرەت (پاککاری) دەکردن و دەستیان بەسەر دارایی و سامانی خۆیان و کەس و کارەکانیان دا دەگرت. ئەو نەریتەی دەستبەسەر داگرتن و پاککاریە وردە وردە لە نێو پیاوەکانی تری حکومەتیش برەوی سەند و دەشێ بڵێین بووە گرنگترین سەرچاوەی کۆکردنەوەی سامان. کارگوزاران، ماڵ و

---

٣٢٢- اغانی: ب٢، ل ٤٧.

دارایی هاولاتیانیان (پاککاری) دەکرد، وەزیرەکان دارایی کارگوزارەکانیان گل دەدایەوە و خەلیفەکانیش هەمان مامەڵەیان لەگەڵ وەزیرەکاندا ئەنجام دەدا. کار گەیشتە ئەوەی کە لە دەزگای حکوومەتدا، بەڕێوەبەرایەتییەك بەناوی "دیوانی پاککاری" دامەزرێندرا.

(ئیبن فورات)ی وەزیری موقتەدیر گوتویە کە دەهەزار دینار لە داهاتی من چۆتە نێو خەزێنەی سوڵتان و ژماردوومە کە تەواو ئەوەندەم لە (حوسێن کوڕی عەبدوڵڵا جەوهەر) وەرگرتبوو. لە ڕاستیدا، وەزیر یا کارگوزاری هەرێمەکان لەو نێوەدا هیچ زەرەری نەدەکرد. ئەوەی کە خەلیفە لێیدەستاند ئەویش لە کەسانی تری ستاندبوو و دوای ماوەیەکیش کە دەچووەوە سەر کار دیسان دەیتوانی بە هەمان شێوە لە خەڵکی بستێنێتەوە.

کاتێك وەزیرێکیان پاککاری دەکرد و ئەو بڕە پارەیەی کە لێیان داوا دەکرد لە توانایدا نەدەبوو بیدا، دووبارە دەیانگەڕاندەوە سەرکاری پێشووی تا بە هۆی دەسەڵات و توانای پێشووی بتوانێ دووبارە لە داراییەکانی خەڵك ئەو بڕە (قەرز)ەی کە لەسەری مابوو بداتەوە دەزگای خەلیفە...

سامان و دارایی خەلیفە کە ئەو شکۆ و درەوشاوەییەی بە ئەفسانەکانی (هەزار و یەکشەوە) بەخشیبوو، لە ڕێگەی تاڵان و ستەمکارییەوە فەراهەم دەبوو. لە هەموو جێگایەکدا هەر تاراج و تاڵانکاری بوو. خەلیفەکان وەزیرەکانیان تاڵان دەکرد، وەزیرەکان دەستیان بەسەر دارایی کارگوزارەکاندا دەگرت، کار گوزارەکانیش بەر دەبوونە گیان و ماڵی خەڵك و لە پێناوی دەوڵەمەندکردنی خۆیان دایاندەدۆشین.

ئەو کار و ڕەفتارەی لێپرسراو و کارگوزارەکانی خەلیفە کە لە هەرێمەکاندا هەمیشە بەوپەڕی توندوتیژی و دڵڕەقییەوە ئەنجام دەدرا، بەزۆریی یاخیبوون و نارزایەتی بەدواوە بوو. بە خۆرایی نییە کە لە سەرانسەری مێژووی خەلیفەکاندا، شۆڕش و ڕاپەڕینی خوێناوی ڕوویاندەدا و زۆر گروپ و دەستەی ئایینی و سیاسی دروست دەبوون و ئەمە هەمووی دەرەنجامی ستەم و بێدادی کارگوزارە ستەمکار و فەرماندە و وەزیرە لە خوانەترسەکان بوو کە بەردەوام وەك دزی بێ تیروکەوان بەردەبوونە گیانی خەڵك و ئەو هەموو سامان و داراییە زۆر و زەوەندەیان لە ڕێی ئەو دزیکردنە بێ تیروکەوانییەوە کۆدەکردەوە.

## سامانی وەزیرەکان

لەڕاستیدا سامان و داهاتی وەزیرو فەرماندەکان لەو ڕۆژگارانەدا زۆر لـە ژمـار نـەهاتووو ئەفسانە ئامێزبوو. ئەو باسانەی کە کتێبەکان لەو بارەیەوە نووسـیویانەو گێڕاویانەتـەوە ئـەو ڕاستییە دەسەلمێنن. مێژوونووسان باسی زەماوەندکردنی مەئموونیان لەگەڵ کچی وەزیری خـۆی (حەسەن کوڕی سەهل) نووسیووە.

بۆ نموونە بەشێك لەو تێچوونانەی کە لەو زەماوەندەی بوك گواستنەوەیەدا بـە هـۆی وەزیـر خۆی ئەنجام دراوە ئەوە بووە کـە: "کـاتێ کـە مـەئموون گەیـشتە نێـو سـەرا، وەزیـر پێـشتر تاسەیەکی پڕکردبوو لە مۆم و مرواری لە نێو مۆمەکە دانابوون کە هەریەکـەیان بـە ئەنـدازەی دانەیەك فندق دەبوون و لە هەر یەکێك لەو مروارییانە پارچەیەك کاغەز کە لەسەر هـەر پارچـە کاغەزێکدا ناوی گوندێکی لێ نووسرا بوو هەبوو، کاتێ مەئموون گەیشت تاسەکەی لە ژێر پێی ئەودا هەڵڕشت و لەوانەی لەگەڵ مەئمووندا بوون هەرکەسیان ئـەو پارچـە کاغـەزەی بـۆ خـۆی هەڵگرتبایەوە ئەوا قەباڵەی ئەو گوندەی کە تیای نووسرا بوو بەناوی ئەوەوە دەکـرا."[٣٢٣]، ئـەم گێڕانەوەیە ئەگەرچی لە زیادەڕۆیی بەدەرنییە، بـەڵام لەڕاسـتیدا ڕەوشـی ئـەوکات و سـامان و دارایی سەرسوڕهێنەرانەی وەزیرەکانی ئەو ڕۆژگارە نیشان دەدات.

هەر لەو ڕۆژگارەدا یـەکێ لـە سـەرانی تەبەرسـتان لـەکاتی خەلافـەتی مەئموونـدا چـووە مەککە. "هەموو ڕۆژێ هاواری دەکرد خەڵکینە وەرن بۆ سـەرخوانی ئـەمیر، خـەڵکی دیـار و نادیار بەپیر بانگهێشتنەکەوە دەچوون. مەئموون فـەرمانی دا لـە بەغـدای ئـەودا هـیچ کـەس سـەوزە و دار نەفرۆشـێ. کاغـەزیان دەکـڕی و لـە جیـاتی دار دەیانـسووتاند و ئاوریـشمی سەوزیشیان لە جیاتی سەوزە دادەنایە سەر سفرە"[٣٢٤].

ئەو هەموو سامان و دارایییەی وەزیر و ئەمیرەکان لە کوێوە دەهات؟

بێگومـان سەرچاوەی سـەرەکی ئەو داهاتە، بریتی بوو لە بەرتیلخواردن و تاڵانکاری. چونکە وەزیرو فەرماندەکان پۆست و پلەوپایـەی خۆیـان بـە پـارە دەکـڕی. (یـەعقوب کـوڕی داود)ی وەزیری مەهدی سەد هەزار دیناری دایە (ڕەبیع حاجـب) تـا ئـەوی گەیانـدە ئـەو پۆسـتە[٣٢٥]. زۆریشیان بۆ پاراستنی پۆستی خۆیان لە هیچ شەرمەزاری و نزمییەك نەدەپرینگانەوە. چـونکە لەو پۆست و پلە و پایانەیاندا سامان و پارە و پولێکی زۆریان دەست دەکەوت.

---

٣٢٣- چهار مقاله، چاپی لیدن، ل٢٠.

٣٢٤- ابن اسفندیار: تاریخ طبرستان، ب١، ل ١٢٢.

٣٢٥- هندوشا: تجارب السف، ل١٢٦.

## جزیه و خەراج

بێجگە لە وەزیر و فەرمانـدەکان کـە لـە ڕێـی (پاککـاری) و (دەستبەسـەر داگـرتن) و (بەرتیلستاندن)ەوە سامان و پارە و پولیان وەدەست دەهێنا، کار گـوزارانی بـاج و خـەراج و (جزیە)ش لە ڕێی کۆکردنەوەی ئەو سامان و پارە و پوولەدا سامانێکی زۆریان دەسـتدەهێنا، تاوانیان دەرهەق بەخەڵکی ئەنجام دەدا. بەڵام بابزانین ئەو جزیە و باج و خەراجە چی بوو؟ لەو بارەیەوە لە جێی خۆیەتی قسەیەك بکەین.

خەراج بریتی بوو لە باجی زەویانەیەك کە لە (ئەهلی ذیمە) وەردەگیرا لەبەرامبەر جزیـە کە باجی سەرانە بوو. لە سەرەتای داگیرکاری ئیسلامدا خەڵکانێك کە خـاوەن کتێـب بـوون لەسەر ئایینی خۆیان مانەوە و کەوتنـە (ذیمـە)ی موسـوڵمانان. ئـەو زەوی و زارانـەی کـە هەیانبوون هەر لە دەستی خۆیان مانەوە، بەڵام موسوڵمانەکان بەشێکیان لـەو بەروبوومـە و داهاتەی ئەو زەویانە وەك خەراج لە خاوەن زەوییەکان دەسـتاند. جگـە لەخـەراج، سـاڵانەش برێك پارەیان بەناوی (جزیە) لەو (ئەهلی ذیمە)یانە دەسـتاند. جزیـە لـە پیـاوانی بـاڵق و تەندروست دەستێندرا و ژنان و منداڵان و بێنەوایان لەدانی ئـەو پارەیـە بەخـشرابوون. ئـەو جزیەیە کە لەوان وەردەگیرا ئەوانی دەخستە (ذیمـە)ی ئیـسلام و مـاڵ و گیانیـان پـارێزراو دەبوو. ئەگەر کەسێك لەو (ذیمە)یانە ئامادە نەبوا جزیە بدا جـایز نـەبوو بـە ئەشـکەنجە و زۆری لێی بستێنن. تاکە ئامرازێك بۆ ناچارکردنی ئـەو کەسـە کـە جزیـە بـدات جـایز بـوو نەوەبوو کە بخرێتە زیندانەوە. لە ستاندنی خەراجیش ئەشکەنجە و ئازاردانن بە شتێکی ناڕەوا دەژمێردرا[٣٢٦].

لەگەڵ ئەوەشدا، کارگوزارانی خەراج لە وەرگرتن و کۆکردنەوەی ئـەو داهاتـەدا، هـەرگیز خۆیان لە ئازار و ئەشکەنجەدانی خەڵك نەدەبوارد و (ئەهلی ذیمە) کە بـاری گرانـی جزیـە و خەراجیان لەسەرشان بوو لەو ڕێسا سەپێنەرانەیەدا جەفا و مەینەتی زۆریان کێشا.

---

٣٢٦- بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی جزیەو ‌قەراج و چۆنییەتی کۆکردنـەوەی بگـەڕێوە بـۆ کتـێبی ( Daniel c. Dennett)"سەبارەت بە گۆڕینی مەزهەب و پرسی جزیە لە سەردتاکانی ئیـسلامدا" چـاپی ١٩٥٠ وکتـێبی (Lokkegard) سەبارەت بە مالیات لەسەردەمی کۆن، چاپی کۆپنهاك١٩٥٠...

## (ئەهلی ذیمە)

لەڕاستیدا ئەو (ئەهلی ذیمە)بیانە ئەگەرچی لە ژێر چەتری پاراستنی موسولْمانان دەژمێردران، بەلاّم بەزۆری هیچ لێبوردن و نەرمکارییەك دەرهەق بەوان نەدەکرا. هەمیشە جەخت دەکرایەوە کە لە دەولّەتی ئیسلامدا هیچ کارێك بەوان نەدرێ. لە ڕۆژگاری ئەو خەلیفانەی کە تارادەیەك پابەندی ئایین بوون کاری نووسینیشیان مەگەر بەدەگمەن، دەنا پێنەدەدان و خەلیفەکان ئەوەیان بەدزێو و ناڕەوا دەزانی.

جگە لەوانەش دروستکردنی پەرستگەی تازە بۆ ئەوانە قەدەغە بووو هەروەها ئەو مۆڵەتەشیان پێنەدەدان کە ئەو ئاتەشگەیەی وێران دەبوو چاکی بکەنەوە و دەستی پێدابێنەوە. بەلاّم لەگەلّ ئەمەشدا لە هەندێ لە ناوچەکانی ئێراندا، بەشێك لە ئاتەشگا دێرینەکان هەروەك خۆیان مانەوە. وەك چۆن لە شاری کرمان کە تا دوا دواییەکانی فەرمانڕوایی (بەنی ئومەییە) هەندێ خەلّك هەر لەسەر ئایینی دێرینی خۆیان مابوونەوە ئاتەشگەکانیش مابوون. ئەو (زیمە)بیانە کە جزیە و خەراجیان دەدا هەڵبەت لەپەنای موسولْماناندا بوون، بەلاّم لە زۆر ڕووەوە زۆر کۆت و بەندیان بەسەردا سەپاندبوون. جلوبەرگیان لە جلوبەرگی موسولْمانان جیابوو. لە سەرەتای داگیرکاریی ئیسلامدا نێوچاوانیان داغ دەکرا و ناچاریان دەکردن کە (کوشتی) پشتێن ببەستن تا لەوانی تر بناسرێنەوە[327].

سواربوونی ئەسپیش بۆ ئەوان قەدەغەبوو. لە دانیشتنەکانیشدا بۆیان نەبوو لەلای سەروو دابنیشن، هەروەها بۆیان نەبوو خانوو بەرەی باشتر لە خانووبەرەی موسولْمانان دروست بکەن.

لە کاتی دانی جزیەش زۆر سووکایەتییان دەرهەق دەکرا، چونکە دەبوا ئەو جزیەیە بەوپەڕی خاکەساری و خۆ بەسووکگرتنەوە بدەن بە موسولْمانان. لەو ڕووەوە ئەو بەرپرسەی کە ئەرکداری وەرگرتنی جزیە بوو خۆی دادەنیشت و کابرای (زیمی) کە بۆ دانی جزیە دەهات لەبەردەم خۆیدا رایدەگرت. ئەگەر (زیمی)یەکە دەولّەمەند و تواناداربوا ئەوا ساڵانە چواردیناریان لێوەردەگرت و ئەگەر هەژار و بێنەوا با دینارێکیان لێوەردەگرت. بەلاّم کاتێ بۆ دانی ئەو جزیەیە بانگیان دەکرد بێتە پێشەوە، کابرای ئەرکدار شەقازەللە یان پێلەقەیەکی

---

٣٢٧- الامرال ابن عبید، ص٥٣.

سەختی لێدەداو پێیدەگوت جزیە بدە ئەی کافر: ئینجا (زیمی)یە بێچارەکە ناچار دەبوو دەست بخاتە گیرفانیو جزیەی خۆی بێنێتە دەر و بیخاتە سەر لەپی دەستی و بەوپەڕی کەساسی و شکستە ڕوویەوە بیداتە کابرای وەرگر. کاتی وەرگرتنی جزیە، پێویست بوو کە دەستی وەرگر لە سەرووتری دەستی ئەو کەسەوەبێ کە جزیەی دەدا.

بەزۆری، دوای ئەوەی کە ئەو جزیەیە وەردەگیرا، مۆرێکی لەسرب دروستکراویان دەدایە کابرای جزیەدەر کە پێیاندەگوت (بەرائەت) و بەملی خۆیەوە دەکرد تا چیتر داوای لێنەکرێتەوە. هەموو موسوڵمانان ئەو مافەیان هەبوو لەو کۆڕی جزیە وەرگرتنەدا ئامادەبنو ئەو زەبوونی و سووکایەتی پێکردنەی (زیمی)یەکان کە نیشانەی هێز و دەسەڵاتو سەرکەوتنی ئایینی موسوڵمانان بوو، تەماشا بکەن[٣٢٨].

## ستاندنی خەراج

کۆکردنەوەی خەراج لە ولایەتەکاندا هەمیشە بە هەڕەشە و فشاری زۆر توندەوە ئەنجام دەدرا. کەسانێك دانرابوون کە ئەرکی کۆکردنەوە و ستاندنی خەراجیان پێ سپێردرابوو و بەزۆری سواری سەر ملی خەڵکی دەبوون و بە شێوازێکی زۆردارانە و بەوپەڕی توندوتیژی و نەشکەنجەدانەوە خەراجیان لە خەڵکی دەستاند. ئەمانە وەك (قازی یوسف) واتەنی کەسانێك بوون کە "لە قازانج و پڕکردنی گیرفانی خۆیان بترازێ بیریان لە شتێکی تر نەدەکردەوە، جا ئەمانە چ بە هۆی ستاندنی خەراج و چ بەهۆی دادۆشینی خەڵك و بردنی ماڵ و سامانیان بایە، گرنگ نەبوو. جا ئەمەشیان چۆن لە خەڵکی دەستاند هەرباس ناکرێ، چەندە زاڵمانە ڕەفتاریان دەکرد... خەڵکیان لە بەرگەرمای خۆرەتاو ڕادەگرت و بەردەبوونە سەریان و دارکارییان دەکردن..."[٣٢٩] سەرچاوەکان نووسیویانە کە "ڕەشید کاتێ ئەو کارگوزار و جووتیار و کەسانەی کە وەرگرتنی خەراجیان پێ سپێردرا بوو دەستگیر کردن و (عەبدوڵڵای کوڕی هەیسەم کوڕی سام)ی دانا تا ئەو پارەیەی سەبارەت بەخەراج قەرزاری خەلیفە بوون لێیان وەربگرێتەوە، عەبدوڵڵا

---

٣٢٨- بگەرێوە بۆ (المعلم القربە)، ص ٤٥-٣٩ و کتێبی الخراجە ص ١٨، ٦١، ٦٢، ٧٠، ٧١ و هەروەها بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی اهلی زیمە و ڕەفتاری موسڵمانان دەربارەی ئەوان بگەرێوە بۆ کتێبی (اهل الذمة في الاسلام. تألیف ا. س. ترتۆن. ترجمە و تعلیق حسن جبشی مصر ١٩٤٩.

٣٢٩- الخراجە ص٦١، ٦٢.

هەموو جۆرە ئازار و ئەشکەنجەیەکی بۆ لێوەرگرتنەوەی قەرزەکان لەگەڵ بەکارهێنانی ئەوپەڕی توندوتیژی و سەرسەختی لەبەرامبەر پیادەکردن. بەڕێکەوت لە هەمان ساڵدا، رەشید تووشی نەخۆشییەکی دژوار بوو و دوایی ماوەیەك چاك بووەوە، (فەزیل)*ی هاتە لاو کە بینی بۆ ستاندنی خەراج زۆر ئازاری خەڵکی دەدەن و دڵڕەقی و سەرسەختییەکی زۆر ئەنجام دەدەن، پێیگوت دەست لەو خەڵکە هەڵگرن چونکە پێغەمبەر گوتویە هەر کەس لە دنیادا کەسێك ئازاربدا، خواوەند لە قیامەتدا ئازاری دەدا. رەشید بڕیاری دا کە دەست لە ئازاردانی خەڵکی هەڵبگرن و لەو ساڵە بەدواوە، ئازاردان نەما![330].

لە سەرانسەری قەڵەمڕەوی خەلافەتدا، خوراسان و (سەواد) لە هەموو شوێنەکانی تر زیاتر کەوتنەبەر جەور و ستەم و بێدادی کارگوزارانی خەلیفە، چونکە خوراسان و سەواد لە هەموو ناوچەکانی دی زیاتر خەراجیان دەدا. وردبوونەوە لەو پێڕستەی کە (ئیبن خەلدوون) لە بارەی خەراجی سەردەمی فەرمانڕەوایەتی مەئموون و بەراوردکردنی لەگەڵ ئەو خشتەیەی کە (قەددامە کوڕی جەعفەر) لە کتێبی (ئەلخەراج)دا سەبارەت بە خەراج لە سەردەمی موعتەسەمدا گێڕاویەتەوە، ئەو قسەیەی سەرەوە پشتڕاست دەکاتەوە.

سەرجەمی خەراجی خوراسان و سەواد بەقەدەر پتر لە نیوەی هەموو خەراجی قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عەبباسی بوو[331]. ئەو خەراجە زۆرو لە ژمار نەهاتووەش هەر لە کۆنەوە مایەی گۆڕان بەسەرداهاتن بوو. (سەعید کوڕی عاس)ی والی بەنی ئومەییە لە عێراق، گوتبووی "السواد بستان القريش ماشئنا اخذنا منه و ماشئنا تركناه" (واتە عێراق بێستانی قورەیشە ئەوەی ویستمان لەو بێستانە بردمان ئەوەی نەمانویست جێمانهێلا). ئەو قسەیە تەنانەت تا سەردەمی فەرمانڕەوایەتی مەئموون و موعتەسەمیش هەر ئاوابوو. کارگوزار و ئەرکدارەکانی خەلیفە لە خوراسان و عێراق، هەرکاتێك بیانویستبا خەراجیان زیاد دەکرد و هەرکاتێکیش بیانویستبا کەمیان دەکردەوە.

---

* فەزیل کوڕی عەیاز یەکێکە لە زاناو خواناسانی ناسراوی مێژووی ئیسلام. (وەرگێڕان) دائره المعارف فارسی، ب٢، ل ١٩١١.

٣٣٠- بگەڕێوە بۆ جۆرجی زێدان، تاريخ التمدن الاسلامی، ج ٢، ص ١٦..

٣٣١- يعقوبی ج٣، ص ١٤٦.

نموونەی ئەو ڕەوشە ناهەمووارە دەتوانین لـەم گێڕانەوەیـەی خـوارەوە بـەدی بکـەین: (داود کوڕی عەبباس کـە لـە سـاڵی (٢٣٣ك/٨٤٧ز) بـوو بـە والی بـەلخ، ئەوکاتـەی کـە خـەریکی دروستکردنی کۆشکی نوشاد بوو، خانمەکەی خۆی حکوومەتی ئـەوێی لـە جیـاتی ئـەو بـەڕێوە دەبرد. لەو ڕۆژگارەدا "... هەندێ لە مێژوونووسان نووسیویانە کە لە (دار الخلافه)وە زیـاد لـە پێویـست داوای خـەراجیان کـرد. خاتوونەکـەی داود... بوخـچەی جلوبەرگـەکانی خـۆی بـە نێردراوێك بۆ دار الخلافه نارد و دەڵێن: بوخچەکە کراسی ئەو خاتوونەی تێدابوو، کراسـەکە کـە بەدوڕومەرجان چنرابوو، بۆ ئەوەی نارد کە زیاد لە ڕادەی توانای خـەڵکی ژێـر قەڵەمڕەوەکـەی داوای خەراجیان لێنەکەن، دەڵێن کاتی نێردراوەکە کراسەکەی ناردە دار الخلافه و مەسەلەکەی بۆ خەلیفە باس کرد، خەلیفە لە خەراجی ئەو ساڵەی ئەو ولایەتە خۆش بوو و ئەو کراسەشی بۆ خاوەنەکەی گەڕاندەوە و گوتی ئەو خاتوونە ئێمەی فێری جوامێری و سەخاوەت کرد و بۆ ئێمـە شەرمە کە ئەو کراسەی لێوەربگرین[٣٣٢]."

بەڵام هەموو کات هەر ئاوانەبوو کە خەلیفە و کارگوزارەکانی شەرم لە هاووڵاتیـانی هـەژار بکەن. زۆرجاریش لەوەرگرتنی خـەراج و تـاڵانکردنی هاووڵاتیـان ئەوپـەڕی بـێ ڕەحمـی و بـێ شەرمییان کردووە. بە شێوەیەك کاتێ کە ڕەشید بڕیاریـدا ئـەو خەراجـەی کـە لـە سـاڵەکانی پێشووتر مابوو بدرێ و لە ئەستۆی خەڵکی ئیسفەهان و قوم بوو، داوا بکاتـەوە، ئەوەنـدە لـەو کارەدا توندوتیژی و سەرسەختی بەکارهێنا کە "هەموو قووت و خواردەمەنی ئەوانی فرۆشت و ئیدی چوارپێ و ئەسپەکانیان لەبڕی پارە بردن کە بەقەولی خەڵکی قوم بـەو ئەسـپانە دەگـوترا (یام)[٣٣٣]، تا ئەو ڕادەیەی کە لێنەگەڕا هیچ تایفە و گروپێکیان بهێتە بەغدا بۆ ئـەوەی نـەوەك هەندێ لە پارەکە کەم بکات، بەو شێوەیە هەموو خەراجەکەی لە سەرجەم خـەڵکی دەڤـەرەکان ستاند[٣٣٤]."

بەم شێوەیە خەلیفە و کارگوزارەکانی دەوڵەتی خەلافەت بەمەیلی خۆیـان هەرچـی حـەزیان لێبا و لەهەرکەسێك گەرەکیان با بەناوی خەراج داوایان دەکرد و لەو داواکردنەشیاندا هەمیـشە

٣٣٢- فضائل بلخ، منتخبات شارل شفر، ج١، ل٩٠.

٣٣٣- یان بەو ئەسپە دەگوترێ کە بۆ تەی کردنی قۆناغێك لەلایەن پەیك و نێردراوەکان بەکاردەهێندرێ برهان قاطع.

٣٣٤- تأریخ قم، ل ٣٠.

ئەوپەڕی ستەمکاری و بێ شەرمییان دەنواند. ئەو ستەم و بێدادییەی پیاوانی خەلیفە، خەڵکییان ناچار دەکرد کە بیر لە ڕێگا چارە بکەنەوە و ئەو ڕێگا چارانەش نەریت و شێوە و شێوازی جۆراوجۆریان هەبوو.

## نەریتی (ئیلجاء = پەنا)

هەندێجار خاوەن موڵکەکان بۆ ئەوەی لەدەستدرێژی کارگوزارە ستەمکارەکان پارێزراوبن پەنایان دەبردە بەر فێڵ لەخۆکردن! فێڵەکەش بەم چەشنە بوو کە موڵك و زەوی و زاری خۆیان بەناوی یەکێك لەکەسە دەستڕۆیشتوو و نزیکەکانی خەلیفە تۆمار دەکرد تا ئەو کەسانەی کە ئەرکی وەرگرتن و کۆکردنەوەی خەراجیان پێ سپێردرابوو زوڵم و ستەمیان لێنەکەن و لەبەرخاتری ئەو کەسە دەستڕۆیشتووە نیوەی یا کەمتری باجەکە وەربگرن. ئەو پرۆسەیە لە مێژووی ئیسلامدا بە "الجاء" بەناوبانگە و لەو نەریتەدا خاوەن زەوی بە وەرزێر یا کشتکار دەژمێردرا و زەوییەکە وردە وردە دەکەوتە ژێر خاوەندارێتی ئەو کەسە دەستڕۆیشتووەی کە پەنای دابوو[٣٣٥] و خاوەنی ئەسڵی زەویەکە تەنها وەك هاوپشکێکی بەرهەم و قازانجەکە دەمایەوە.

ئەو شێوازە لە هەر سەردەمێکدا کە خەڵکی لە دەستی ستەم و باڵادەستیی حوکمڕانە ستەمکار و چاوچنۆکەکان دەکەونە ترس و دڵەڕاوکێ، دەبێتە شێوازێکی باو و بەشێوەی جۆراوجۆر ئەنجام دەدرێ و دەردەکەوێ زوڵم و گوشاری بەنی ئومەییە یەکەمجار بووە مایەی بڵاوبوونەوەی ئەو "فێڵ"ە.

لە سەردەمی خەلافەتی (وەلید کوڕی عەبدولمەلیك)دا دانیشتوانی سەواد بۆ ئەوەی لە دەستی زوڵم و زۆری کارگوزارە ستەمکار و بەرتیلخۆرەکان پارێزراوبن، پەنایان بۆ (موسلیمەی کوڕی عەبدولمەلیك)ی برای خەلیفە کە والیی بەغدا بوو، برد. لەو کاتە بەدواوە زەوییەکانی سەواد بوونە هی موسلیمە و لەدەستی کوڕ و نەوەکانی ئەودا مانەوە تا ئەوکاتەی خەلافەت کەوتە دەستی (بەنی عەبباس) و ئەو زەوییانەش وەك بەشێك لەموڵکەکانی خەلافەت تۆمارکران. خەڵکی مەراغەش ئەوکاتەی کە (مەروان کوڕی محەمەد) والی ئەرمەنستان و ئازەربایگان بوو، پەنایان بردە بەرئەو و زەوی وزارەکانیان کەوتە ژێر دەستی مەروان تا دوای تێچوونی مەروان وەکو هەموو موڵکەکانی تری بەنی ئومەییە لێیانسەنرایەوە.

---

٣٣٥- ابن الفقیه، ل٢٨٢.

لە سەردەمی خەلافەتی عەبباسییەکانیشدا ئەم شێوازە درێژەی پێدرا. خەڵکی زەنجان لە ترسی دز و ڕێگران و لەبەر هەڕەشە و چاوسوورکردنەوەی کارگوزارەکان ناچاربوون موڵکەکانی خۆیان بەناوی (قاسم)ی کوڕی هارونە ڕەشیدەوە تۆماربکەن و بەم شێوەیە زەوی و زاری ئەوانیش وردە وردە بوو بە بەشێك لە موڵکی دەوڵەتی خەلافەت.[336]

لە (فارس)یشدا زوڵم و زۆری و بێدادیی و کارگوزاران و کۆکەرەوەکانی خەراج خەڵکییان ناچارکرد کە زەوی و زارەکانی خۆیان بەناوی سەران و کەسانی دەستڕۆیشتووی دەرباری خەلافەت تۆماربکەن[337].

بەم شێوەیە، زوڵم و فشاری کارگوزارەکانی خەلیفە، خەڵکی یان ناچاردەکرد کە واز لە موڵك و زەوی و زاری خۆیان بهێنیت و هاوسەنگی کۆمەڵگە تێك بچێ، بەڵام خەڵکی ئەم تێکچوونەی هاوسەنگییەی کۆمەڵگەیان بە چارەسەر و فاکتەرێك بۆ دەربازبوون لە جەور و ستەم و بێدادی کارگوزارانی خەلیفە لێکدەدایەوە.

## ئاشوب و ڕاپەڕین

هەندێ جاریش خەڵك شۆڕش و ڕاپەڕینیان دژ بە خەلیفە بۆ دەربازبوون لە بێدادیی و ستەمکاران بەتاکە ڕێگا چارەیەك دەزانی. تێبینی کردنی ئەو خاڵەی کە بەشی هەرە زۆری خەراجی قەڵەمڕەوی عەبباسییەکان لەلایەن خەڵکی خوراسان و عێراقەوە دەدرا نیشان دەدا کە چما زۆربەی ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینە خوێناویو مەزنانەی کە دژ بە خەلیفەکانی عەبباسی ئەنجام دراون لە خوراسان و عێراق بوونە، ئەو هەموو گوشارو ئەشکەنجەو بێدادییەی کە دەرهەق بەخەڵکی ستەملێکراوی خوراسان و عێراق دەکرا، ئەوانی ناچار دەکرد کە دژی خەلیفە ڕاپەڕنو دەست بدەنە شۆڕش و بەرنگاربوونەوە.

## چەتە و ڕێگرەکان (عەیاران)

هەڵسووڕێنەرانی حکوومەت، بە ئەشکەنجە و ئازاردانی خەڵك خەراجیان لێدەستاندن و پیاوە گەورەکان و بازرگانان کە بەری ڕەنج و ماندووبوونی تەمەنی خۆیان ئاوا لە ژێر مەترسی و

---

٣٣٦- ابن الفقيه، ل ل ٢٤٨ - ٢٨٢.

٣٣٧- اصطخري: صورة الارض، ل ١٥٨.

هەرەشەی تالأنکردندا دەبینی، ناچاردەبوون دەست لە کاری خۆیان هەلگرن. بۆ دەربازبوون لەستەم و بێدادیی کارگوزار و هەلسووڕێنەرانی دەولەت، زۆر لەخەلکی ناوچە جیاجیاکان ناچاربوون دەست بدەنە شۆڕش و راپەڕین و لە هەموو شوێنەکاندا پشێوی و نا ئەمنی حوکم فەرمابوو. رێگر و دز و جەردەکان لە رێگاوبانەکاندا بەسەر خەلکیاندا دەدا و بەردەبوونە گیانیان. وێلگەرد و رێگرە پەلاماردەران لە شارەکاندا هەڕەشەیان لە ئاسایشی خەلکی دەکرد.

زۆریش لە گروپە سەربازییەکان دەبوونە هاودەستی دز و رێگرەکان. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی مەهدی و هاروونیدا ئەو رێگرانە لە کۆچە و کۆلأنی شارەکان و کێو و هەردو گەردەنەکاندا بلأوببوونەوە[338]، هەندێ جار بەسەر کاروانەکانیاندا دەدا و کالأ و سەرمایەی بازرگانەکانیان بەناوی زەکاتەوە دەست بەسەردا دەگرتن[339]. نەداری و نا ئەمنی هەڕەشەیەکی توند بوو لەسەر ژیان و مافی خەلك. ئەو پارە و مالەی کە بەسەر کەسانی موستەحەقدا دابەش دەکرا هێشتا بەدەستی ئەوان نەدەگەیشت، کە بە هۆی زۆربوونی ئەو دز و رێگرە هیچ و پووچانە هەلدەلوشرا[340].

ئاشکرایە کە لەوەها رەوشێکدا چی دێتەدی. داماوی و مالوێرانی خەلکی، یەکەمین دەرەنجامی ئەو ستەمکاری و چەوساندنەوەیە بوو. هاوسەنگی لە کاروبارەکانی تریشدا نەیدەتوانی بێتەدی و پایەدار بمێنێتەوە. شۆڕش و راپەڕین و ئاشووبگەلی یەك لە دوای یەك شتێك بوو کە نەدەکرا خۆی لێ ببوێری. بەرەللأ و رێگرەکان لەشار و بیاباندا وا تەنگیان بەخەلك هەلچنی بوو کە بەغدایییەکان خۆیان بۆ داکۆکیکردن لە مال و گیانی خۆیان ناچاربوون لە دژیان راپەڕن[341]. لە سەردەمی خەلافەتی کورتی (ئەمین)دا، بەغدا بەتەواوی کەوتە بەردەستی بەرەللأو وێلگەردەکان و ئەمین بۆ شەڕی دژ بە مەئموونی برای لە بەغدا داوای کۆمەك و یارمەتی لێکردن. لە سەردەمی حکوومەتی (حەسەن کوڕی سەهل)یشدا ئاشووب و فیتنەخوازیی ئەوانە لە بەغدا و عێراقدا ئاسایش و ئازادییان بۆ خەلکی نەهێشتبووەوە. دەسەلأت و هێزی مەئموون و موعتەسەم ماوەیەك پەردەی بەسەر ئەو پشێویانەدا کێشا، بەلأم دوای موعتەسەم لاوازیی خەلیفەکان، تورکەکانی زال کرد. لەوە بەدواوە حکوومەت لە دەستی پیاوانی سوپادا بوو، خەلیفە تەنها هەر ناوی بۆ مابووەوە.

---

٣٣٨- بلاذری: فتوح البلدان، لل ٣٠٨- ٣٠٧.

٣٣٩- الفرج بعد الشدة، ج٢، ص ١٠٦.

٣٤٠- مستوفی قزوینی: تأريخ طزيدة، ل ٣١٤.

٣٤١- بگەڕێوە بۆ کامل ابن أپير، ج٥، ل ١٨٢.

## ستەمكارييەكان

بەغدا بەو شێوەیە بوو، بەڵام دەرەوەی بەغدا لەوەش خراپتر بوو. سەربازەکان و تورکەکان ئاسایش و ئۆقرەییان بۆ کەس نەهێشتبووەوە. هیچ کەس لە گیانو ماڵی خۆی دڵنیا نەبوو. هەر کەس ناچاربوو بۆ خۆی وەك تاك داکۆکی لە مان و شەرەف و نامووسی خۆی بکات. بێ باکی و بێ ئەدەبی تورکەکانی خەلیفە، هیچ سنوورێکیان نەدەناسی. لە فەلەستین یەکێك لە سەربازەکان بە زۆر چووە ماڵی کابرایەك، پیاوی ماڵەکە لە ماڵ نەبوو و ژنەکەی ڕێگەی نەدا سەربازەکە بچێتە ژوورەوە، سەربازەکە تووڕە بوو ژنەکەی دایە بەرقەمچی لێدان. کاتی پیاوەکە هاتەوە ماڵ لە تۆڵە و دەستکردنەوە بترازێ چارەیەکی تری نەبوو. بەو شێوەیە بوو کە ڕاپەڕینی (موبەرقەعی یەمانی) دروست بوو. دەڵێن ئەو کەچە پەڕۆیەکی لە ڕوخساری خۆی پێچاو لە یەکێ لە کێوەکانی ئەردەن خۆی شاردەوە. هەموو ڕۆژێ لە چیا دادەبەزی و ڕێبوارانی ناچاردەکرد فەرمان بە چاکە نەهی لە خراپە بکەن. باسی خراپەکارییەکانی خەلیفەی دەکردن و داوای لە خەڵکی دەکرد هاوکار و یارمەتیدەری بن[٣٤٢].

کارگوزاران و پیاوانی سوپا لە هەموو شوێنێکدا هەڕەشەیان لەگیان و ماڵی خەڵك دەکرد و هیچ کەس تەنانەت خەلیفەش، نەیدەویست و نەیدەتوانی ڕێ لە خراپەکارییەکانی ئەوان بگرێ، چونکە وەزیر و ئەمیرەکانی دەرباری خەلافەت داکۆکییان لێدەکردن. هەندێ جار وەزیر بڕێك پارەی لە کارگوزار یان بەرپرسێکی دیوان بەقەرز وەردەگرت و پێیدەگوت بە (تەفاریق) لە دانیشتوانی فلانە شوێنی بستێنێ.[٣٤٣] ئەو کارە بیانوییەکی دەدایە دەستی ئەو کارگوزارە کە بەکەیفی خۆی غەدر لە خەڵك بکاو بەربێتە گیانیان. خەڵك ڕادەکێشرایە ژێر باری ئازار و ستەمکاری، ماڵ و داراییان دەکەوتە بەر دەستبەسەرداگرتن و تاڵانکارییەوە. زیندانەکان لە خەراجدەران پڕ دەبوون و هەموو ئەو ستەم و نارەزاییانە لە پێناو پڕکردنی خەزێنەی دەوڵەت و بیانۆیەك بوون، بەناو بۆ جێبەجێکردنی مافەکانی دیوان.

---

٣٤٢- کامل ابن اثیر، چاپ ئەوروپا، ج٦، ل ٣٧٢.

٣٤٣- تأريخ الوزراء، ل ٣٦٢.

## گەندەڵی عارەب

بەڵێ لەو ڕۆژگارەی کە خەلیفەی بەغدا، لەو شارە پڕ شکۆ و گوناه ئامێزەی "هەزار و یەکشەوە"دا شکۆ و مەزنێتی دەرباری (تیسفۆن)ی زیندووکردبووەوە، ئیدی هیچ ناسەوارێکی لەو سادەیی و ئازادییەی کە داگیرکەرانی تیسفۆن و نەهاوەند وەك موژدە بەگوێی خەڵکیاندا دەدا لە نێو فەرمانڕەوایانی ئیسلامدا نەمابوو. خەلیفەی بەغدا، هێواش هێواش کەوتە سەرهەمان شێوە و ڕێڕەوی شاهانە و قەیسەرییانەی کە ئیسلام هێڵی ڕاست و چەپی بەسەر دا کێشابوو و هەمان ئەو نەریتەی ئەوانی زیندووکردبووەوە. هەمان بێ بەندوباری و بێدادییەکانیش کە لە حکومەتی تیسفۆندا هەبوون لەو ڕۆژگارانەی خەلیفەکانی ئیسلامدا بووژابوونەوە و کوڕ و نەوەکانی داگیرکەرانی تیسفۆن و نەهاوەند، وردە وردە لە دیمەشق و بەغدا تووشی هەمان چارەنووس بوونەوە کە ساسانییەکانی بەرەو شکست و نەهامەتی بردبوو.

لەڕاستیدا، ئەو سامان و داراییە فراوانەی کە لە سەرەتای داگیرکاریی ئیسلام کەوتە دەستی عارەبەکان، زۆر زوو ئەو داگیرکەرە سادە و بێ هزرانەی بەرەو تەمبەڵی و تەنپەرستی و گەندەڵی ڕاکێشا و وردە وردە ئەو سادەیی و دادپەروەرییەی کە ئایینی موسوڵمانەکان بانگەشەی دەکرد، بە ناچاری لە دڵی خەلیفە و فەرماندەکانی عارەب جێی خۆی دایە پلە و پایە خوازی و چاوچنۆکی و ئیدی خەلیفە و کارگوزارەکانی خەلیفە، ئەگەرچی لە هەموو شوێنێکدا سەری زمان و بنی زمانیان باسکردن بوو لە ئیسلام و موسوڵمانیەتی، بەڵام لەڕاستیدا ئەو جۆش و حەماسەت و باوەڕەیان لە دەست دابوو کە ئیسلام لە سەرەتادا دایهێنابوو. ئەو جیاوازییەی نێوان قسە و بانگەشەکانی پێش و کار و ڕەفتاری ئێستا، یان هەر لە سەردەمی بەنی ئومەییەدا ئەوەندە هەستپێکرا و ئاشکرا بوو کە (ڕەتبیلی سیستان) کاتی کارگوزارەکانی بەنی ئومەییەی ئاوا چاوچنۆك و سەرەڕۆ بینیبوون هاواری لێهەستابوو و گوتبووی: "ئەو خەڵکە کەوا لەمەوبەر دەهاتنە ئێرە؟ ئەوانەی کە زگیان بە پشتیانەوە قۆپابووەوە و ڕەنگ و ڕوخساریان لە بەر گەرما و تیشکی خۆر ڕەش داگەڕابوو، ئەوانەی کە خۆیان کەوش و لیانیان بۆ خۆیان لە گەڵا و تفری دارخورما دروست دەکرد... ئەگەرچی ئێوە لەوانەی پێشوو بەرچاوترن، بەڵام ئەوان لە ئێوە باشتر لەسەر وادەو پەیمان دەمانەوە و لە ئێوەش باشتر دەجەنگین[٣٤٤]." بەڕاستی ئەو قسەیە دروست

---

٣٤٤- بلاذری، ل ٤٠١- ٤٠٠.

بوو، چونکە لە هەمان ڕۆژگاری بەنی ئومەییەدا، عارەبەکان ئیدی ئەو عارەبە داگیرکەرانەی قادسیە و تیسفۆن نەبوون، گەندەڵی و ستەم و بەرتیل و بەرتیلکاری ئەوانی گۆڕیبوو.

هەر کەسێك کە لەو ڕۆژگارەدا وەك فەرمانڕەوا و بەڕێوەبەری حکوومەت دەنێردرایە هەرێمێك، یەکەمین کاری کە دەیکرد ئەوەبوو، والی و فەرمانڕەوایی پێشووی لەگەڵ هەموو کەس و کار و بەردەستەکانیانی دەگرت و ئینجا ئەو کەسانەی ئەوان گرتبوویانن ئازادی دەکردن و دوای ئەوەش هەموو پارە و سامان و دارایی والی پێشتر و هەرچی هی کەس و کار و دۆست و لایەنگرەکانی ئەو بوو، بە جۆرەها ئەشکەنجەو ئازار لێی دەستاندن. بە شێوەیەك کاتێ کە (خالید قەسری) (١٢٦ ك/٧٤٤ ز)ی والیی عێراق لەکار لابرا، (یوسف کوڕی عومەر) (١٢٧ ك/٧٤٥ ز) لە شوێنی ئەودا بووە والی، فەرمانی دا کە ناوبراو بگرن و لەگەڵ سێسەدو پەنجا کەسی تر لە کارگوزار و هاوکارەکانیدا بیاخەنە زیندانەوە. لەبەرئەوە بوو کە والیو بەرپرس و کارگوزارەکان ئەوەیان دەزانی ئەو چارەنووسە هەمیشە چاوەڕوانیانە لە کاری خۆیاندا هەوڵیان دەدا تا دەکرێ خەڵکی دابدۆشن و پارە و دارایی کۆبکەنەوە تاکو ئەو ڕۆژەی کە نۆبەتی لادان و دەرکردنیان هات هەم بتوانن بەو پارە و توانا داراییانەی کە هەیانە خەلیفە و ئەرکدارەکانی خەلیفە ڕازی بکەن و هەم بۆ خۆشیان شتێکیان هەبێ. سەرچاوەکان نووسیویانە (عومەر کوڕی عەبدولعەزیز) (١٠١ك/٧٢١ز) کاتێ چووە سەرتەختی خەلافەت، بانگی (یەزیدی کوڕی مهلب) (١٠١ك/٧٢١ز) ی کرد کە کارگوزاری خوراسان بوو و پێی گوت نامەیەکی تۆم بینیوە کە بۆ (سولەیمان) (٩٩ك/٧١٨ز) ی خەلیفەت نووسیوە و تیایدا وتوتە کە هەزار (دینار؟) ت لەلا کۆبۆتەوە. ئەو هەموو پارەیە لە کوێیە؟ یەزید سەرەتا حاشای لێکرد، بەڵام کە دیتی حاشاکردن سوودێکی نییە گوتی ئیزنم بدە تا بچم ئەو پارانەت بۆ بێنم، خەلیفە پێیگوت لە کوێیان دێنی؟ یەزید گوتی دەچم لە نێو خەڵك کۆیان دەکەمەوە. عومەری کوڕی عەبدلعەزیز پێیگوت دەتەوێ جارێکی تریش ئەو پارەیە لە خەڵکی بستێنیەوە؟ ... بڕیاریدا کە کەسێکی تر لە شوێنی ئەودا بنێرنە خوراسان[٣٤٥].

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە لەو مێوەدا تەنها خەڵکی ڕەشۆکی بوو کە ناچاربوون بەرگەی ئەو هەموو جۆرە بێدادی و نالەبارییانە بگرن تا کارگوزار و والی خەلیفە ڕازی بکەن. دەتگوت ئەمەیان لە چارەنووسراوە، وەك لێکۆڵەرێك گوتویە، ئەو خەڵکە بێ دەرەتانە ناچاربوون

---

٣٤٥- بگەڕێوە: عصر المأمون، ل٣٠.

زەوییەکان بکێڵن تاکو عارەبەکان بەرەکەی بدرۆنەوە و بۆخۆیان هەڵیلووشن.[346] بەڵام ئەو ستەمکاری و کارەساتە نامرۆڤانە کە لە ڕۆژگاری بەنی ئومەییە هەمیشە مایەی نیگەرانی و ناڕەزایەتی خەڵك بوون، بەتایبەت ئێرانییەکان، لە ڕۆژگاری عەبباسییەکانیشدا درێژەییان هەبوو. خەلیفەی بەغدا لە چاوچنۆکی و بێ پەروایییدا دەستی کەمی لە خەلیفەی دیمەشق نەبوو، دەست و پێوەند و کارگوزارەکانیشی وەکو ئەوانەی خەلیفەی دیمەشق، ستەمکار و سەرەڕۆ بوون. لە ڕۆژگاری عەبباسییەکاندا ئەو دەمارگیری و ڕەگەزپەرستییە عارەبییەش کە پاڵپشتی خەلیفەی ئەمەوی بوو ئیدی لە نێو چووبوو. بۆیە کاتێك کە نۆبەتی تێشکان و گلۆڵە کەوتنە لێژی خەلیفەکان داهات و ئێرانی و تورکەکان هێز و دەسەڵاتیان وەرگرت، داوای هاوکاری و پەنابردنە بەر عارەبەکانیش ئیدی نەسوودی هەبوو و نە جێبەجێش دەبوو. لەو ڕەوش و بارودۆخەدا بوو کە باڵادەستی و زاڵبوونی تورکەکان بەسەر خەلیفەکانی بەغدا ئەو بوارەی ڕەخساند کە خوراسان بەدەستی تاهیری و (سەفارییەکان) سەربەخۆیی وەربگرێ.

## دوای دووسەد ساڵ

هێشتا دووسەد ساڵی تەواو بەسەر ڕووخانی دەوڵەتی ساسانیدا تێنەپەڕیبوو کە لە حکوومەتی عارەبەکان لەناو بترازێ شتێك نەمابووەوە. سیستان و خوراسان و ئەو دیوی ڕووبار کە بەدرێژایی ساڵەهای ساڵ گرفتاری ستەم و بێدادی عارەبان بوو، لەو ماوەیەدا ئامادەی سەربەخۆبوون بوو. ئەمارەت و حکوومەت کە سەردەمانێکی درێژبوو تایبەت بوو بە عارەبەکان، ئیدی لە هەموو لایەك هەتا لە بەغداشدا زیاتر لە دەستی ئێرانییەکاندا بوو. زمانی ئێرانی کە دوای لافاوی قادسییە، بەرگەی "دوو سەدە بێدەنگی"ی گرتبوو، ئێستا ئیدی تەلەسمی بێدەنگی و خامۆشی دەشکاند و خۆی لەدەمی کەسانێکی وەکو (حەنزەلە)و (بوحەفس) و (محەمەد وەسیف) بۆ هۆنینەوە و چڕینی نەمرترین ئاوازە ویژەییەکانی جیهان ئامادە دەکرد. لە کۆتایی قۆناغی فەرمانڕەوایی موعتەسەمدا، هەرچەند (بابەك)ی سەرداری (ئاتروپاتین) ئازەربیجان لە سێدارە درابوو و هەرچەند کە (مازیار)ی میرزادەی تەبەرستان کوژرابوو، دیسان ژیلەمۆی ئێران لە ژێر خۆڵە مێشەکاندا دەگەشایەوە.

---

۳٤٦- فون کرمر، بگەڕێوە بۆ van nloten ل۳.

## دوورنمایەك

لە ماوەی ئەو دووسەدەیەدا چی بەسەر ئێراندا هاتووە؟ ئێستا دەتوانین دوورنمایەك لە مێژوو و ڕووداوەکانی ئەو دوو سەدەیە وێنابکەین. یەکەم لافاوێکی ترسناك و خرۆشا و هەڵیکرد کە دەوڵەتی ساسانیی ژێر و ژوور کرد، شارەکان گیران، ماڵەکان بەتاڵان چوون. ماوەیەك دواتر (حەججاج) لە عێراق و (قوتەیبە) لە خوراسان و عارەبی تریش لە هەموو جێیەکدا کوشت و کوشتار و بێدادییەکی سەختیان نایەوە. زۆری نەبرد کە شکستخواردووەکان، دەستیان بە نەبەردێکی قارەمانانە دژی داگیرکەران کرد. (ئەبو موسلیم) و (موقەننەع) لە خوراسانو (جاویدان و بابەك) لە (ئاترۆپاتین) و (سپەهبود خورشید) و (مازیار) لە تەبەرستان دەستیان دایە هەوڵ و خەباتێکی ئازایانە، چونکە بۆ ڕزگاربوون لە ستەم و بێدادی و سووکایەتییەکانی عارەب، خەڵکی ئێران لە بەرخۆدان و ڕاپەڕین بترازێ، ڕێگا چارەیەکی تریان شك نەدەبرد. لە میانی ئەو بەرخۆدان و هەڵسانەوەیەدا قارەمانی شکستخواردوو دیسان پشتی خۆی ڕاست کردەوە و پشتی داگیرکەری لە خۆبایی لە زەوی دا. باڵادەستی ئێرانیان بەسەر عارەبەکاندا دەرکەوت، حکوومەت و سەروەری عارەبەکان وردە وردە وەك "خەونی شەوی نیوەی هاوین"[٣٤٧] بووە دووکەڵ و بەهەوادا ڕۆیشت. خانەدانە ئێرانییەکان دووبارە ئیمتیازاتی دێرینی خۆیان بە شێوەیەکی تر بەدەست هێنایەوە و ئەو دەسەڵات و توانا و مەزنایەتییە، کەوتە دەستی تاهیری و سەرفارییەکان، بە مشێوەیە ئەوەی لە سەرەتای لافاوەکە لە دەست چووبوو، لە "کۆتایی شەوێك" کە لە نێو ترس و بێدەنگی دوو سەدەی هۆڤناکدا تێپەڕی، دووبارە تاڕادەیەك گەڕایەوە شوێنی خۆی.

---

٣٤٧- ئاماژەیە بە درامای بەناوبانگی شکسپیر کەبە هەمان ناونیشانە. Amidsu u mmer Nights dream.

## یادداشتەکان

* ل٢٧ مەبەست لەوشەی ئەنیران ولاَتەکانی ژێر دەستی پادشایەتی ئێرانن کە لـە سـنوری ئێران دانیین ولە دەرەوەن، بە مانای بیانی وغەیرە ئێرانـی ((لـە ئاڤێـستاan/aria کـە پێـك هاتووە لە an کە نیشانەی (نەرێ)یەو بەشی دووهەمی بە مانـای ئاریـایی و ئێرانـی کـۆن مانای نا ئاریایی نا ئێرانی لە پەهلـەوی aniran، لەپارسـیدا ئـەنیران وکـورت کراوەکـەی (نەیران)ە بە مانای بیانی و غەیرە ئێرانی .

برهان قاگح : گواری، پەراوێزەکانی، موحەمەد موعین، بەرگی١، ل ١٧٩.

***

* ل ٢٨ لەبارەی پادشاکانی حیرەویەمـەن هەروەهامێـژووی عەرەبـستانی پـێش ئیـسلام بگەڕێوە بۆ وتارەکانی سەید حەسەن تەقی زادە لەژێرناونیشانی : (تاریخ عربستان وقـوم عـرب در اوان ڤهور اسلام و قبل از ان) لـە سـێ بـەش، هەروەهابگـەڕێوە بـۆ: تـاریخ العـرب قبـل الاسلام، نووسینی، جەواد عەلی ، بەغدا. (تاریخ اسلام)، عەلی ئەکبەر فـەیاز، بلاوکردنـەوەی زانکۆی تاران .

* ل٤٢ لەبارەی (سەیفی ژی یەزەن)لەکۆنەوە چیرۆکی لەبارەوە گوتراون کەرەنگە هەندێکی لە نوسراوە مێژوویەکانەوە وەرگیرابن‌و بەشەکانی تری بەروالّەت وەکو دیارە لەرێگـەی هەرئـەو چیرۆك‌و نووسینە مێژوویيانـەوە هاتونەتـەناوباس وکتێبـە مێژوویيـەکان, بەهـەرحالّ هەنـدێك لەوباسانەی کە طبری (تەبەری) و ئـەوانی تـر لـەبارەی ڕابـردوی(سـەیفی ژی یـەزەن)و بـاوکی کردوویانە, لەو چیرۆکانە سەرچاوەیان گرتووە, کەیەکێك لە کۆکەرەوان و دانەرانی کـۆنی ئـەو چیرۆکانە( ابوالمعالی — ئەحمەد کوڕی موحەمەد کوفی) بووە کە چیرۆکی هەمزەش هەر ئەوکۆی کردوتـــەوە و گێڕاویەتـــەوە, نوســـخەی جۆراوجـــۆر لەچـــیرۆکەکانی (ســـەیفی ژی یەزەن)ئەمرۆلەکتێبخانەکانی جیهاندا هەن. بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ وتاری:

(ڤان رونکن ) Van Ronkrel لـە گوڤـاری Acta Orientlio .ج٥،بەشـی١،لـە سالّی١٩٢٦ چاپ کراوە.

***

* ل٤٧ (وەهـرەز) سـەبارەت بـەوناوە (وەهـرەز، وهـرز)يـان(ڤـەهرەز) (ڤەهرۆز،بـەهرۆز) بەچەندشێوازی ترهاتووە و جیاوازیوناتەبایی هەیە وەکولەکتێبەکانی(مجمـل التـواريخ، مولـف مجهول، ل ١٧٢, التنبيهالاشراف، مسعودي، ل١٢٦)دا هەیە.

***

* ل٨١ یەکەمین پادشای ماد( دیاکۆ) بووە، نزیکەی ٧٠٨ پ . ز لەسەرتەختی پادشـایی دانیشتووە, داگیرکردنی نەهاوەنـد بـەهۆی عارەبـەکان لەسـاڵی ٦٤٢ زدا ڕوویـداوە، کەواتـە مەودای نێوانیان ١٣٥٠ساڵ بووە کە دەکاتە چواردە سەدە .

***

* ل٩١ باژ و برەسم وکشتی (زمزمە و هوم و پـشتێن) لەدروشمـە تایبەتییـەکانی ئـایینی زەردەشتین کەپێویستییان بەروونکردنەوە هەیە.

(باژ) کەلە ریشەی ئاڤێستایی وشەی (وەچ)ەوە هاتووە بەمانای وتەو پەیڤـو بەشـێوەیەکی گشتیبە هەمووئەو نزاودوعا کورتانە دەگوترێ کەزەردەشـتی یـەکان بـەدەنگینزم دەیانخوێنـد, هەروەکو زاراوەنووسان وتویانە ئەم وشەیە لەگەڵ زەمزەمەدا(واتەوێرد) یەکە .

زەمزەمە وشەیەکە کەموّغەکان لەستایشی پەروەردگاردا لەکاتی خۆشوشتن و لەسەر سفرەی نان خواردندا بە دەنگێکی نەرم دەیانخوێند.(نیایشی کورتی زەردەشتییەکان ).

(برەسم) بریتی یە لە لکەدارێکی بڕاو کـە بـەپێی و نـەریتێکی تایبـەتی نـزا خوێندنـەوە بەکێردی تایبەت بەناوی (برەسمچین) دەبڕدرا، دوایی ئەو لکە دارانەکەدەبێ لەدرەختی هەنار بن دەکرانە دەستچەنە, ئەوبرەسمە لەکاتی بەجێگەیاندنو ئەنجامدانی مەراسیمی ئایینی بەدەسـتی چەپەوە دەگرن و بەخوێندنی نزاو دوعـای تایبـەت, لەراسـتیدا سوپاسـی پـەروەردگار بـەجێ دەگەیەنن , برەسـم گـرتن وەکـو( ئیـسترابۆن لـە سـاڵی٥٢٠ ی پـێش زایـین مـردووە) باسـی لێوەکردووە، لەپەرستگادا لەبـەردەم ئـاگر نـەریتی مۆغـەکان بـووە , پـێش ئـەوەی دەسـت بەخواردن بکەن برەسمیان وەرگرتووە و باژیان خوێندووە .

(کشتی =کستی)،(پـشتێن ) چـەند داوەبـەنێکی رسـتراوە کەزەردەشـتییەکان لەسـەردەتای تەمەنی باڵغ بوون، لەپشتیان دەبەستن, ئەم پشتێنە لەحەفتاو دوو داو لە خـوری مـەڕی سـپی دەڕسترا و سێ جار لەپشتیان دەئاڵاند, کەژمارەی حـەفتاو دوو بەبۆنـەی ژمـارەی یەسـناکانی

ئاڤێستایە و سێ جاریش پشتێن بەستن کە هێمایە بۆسێ دروشمی سەرەکی ئەندیشەی چاك، پەڤیی چاك، رەفتاری چاك، مەراسیمی پشتێن بەستن و پۆشینی بەرهەڵبێنە بۆ منداڵان لەراستیدا نیشانەی ئەوەیە کە منداڵان دوای ئەوە لەریزی خاوەن ئایین دادەنران .

(هانوما )ناوی گیایەکە، شەراب و شەربەتێکی تایبەتی لێ دروست دەکەن کە( هوم )ی پێ دەڵێن، بە دروستی دیار نیە ناوە زانستیەکەی ئەو گیایە چییە، شەرابێ کەلەکولاندنی ئەم گیایە دروست دەکرا وەکو دیارە لەزووەوە لەلایەن زەردەشتی یەکان باو بووە، بەهەرحاڵ ئەوشەرابە سەرخۆشکەر نەبووە، بەڵکو لەجیاتی قوربانی و فدیەدان بەکارهاتووەو بەگرنگترین مەراسیمی ئایینی مەزدی یەسنان ژمێردراوە. لەبەرامبەر ئاگرداندا چەند لەساقەی ئەوگیایە بەنەریتێکی تایبەت دەشۆردراو بەدارێ لەدرەختی هەنار هەروەها برێك ئاو لەگەڵ خوێندنی سروودێك لە ئاڤێستا، لەناو هاوەنی تایبەت دا دەیانکوتا. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بگەرێوە بۆ (پورداوود : یەشتها ج١ ، خرده اوستا، محمد معین : مزدیسنا و ادب پارسی).

***

* ل١٢٢ بەهرام شا، لە رەچەڵەکی کیانی دا پاشایەکی فریاد رەسە کە بە باوەری زەردەشتییەکان لەگەڵ دەرکەوتنی هۆشیدەر سەرهەڵدەدا، لە (بەهمەن یەشت )دا ئەوبە دڵی وەرجاوەند کەمانای مەزن ولێهاتوو دەگەیەنێ، ناوزەدکراوە. ئەو بەهرامە لە سەردەمێکی وادا دەسەلاتی پاشایەتی دەگرێتە دەست و کاتێك لە تەمەنی سی ساڵیدایە هێز لە چین و هیند کۆدەکاتەوەو بەرەو (بەلخ )یا (بەهرود) دەچێت، سەرکەوتنی بێ وێنە وەدەست دێنێت و ئێران ئاوەدان دەکاتەوە، بگەرێوە بۆ دەقە پەهلەویەکان : (وێست):لە وەرگێرانی بەهمەن یشت،( فەسلی ٣ -١٤ بەدواوە ل ٢٢١) و پورداود: سۆشیانس .

***

* ل١٢٢ زاراوەی جزیە و سەرانە و باج یا راستتر بلێین "باجی سەر"و دابەشکردنی بەسەرخۆیاندا، واروون دەبێتەوەکە لەسەرەتای داگیرکاری موسڵماناندا نوێنەرانی خەلیفە لەردەشەخاك ( سواد ) بۆ هەر سەرێك مانگانە ٤ دەرهەم جزیەیان دانابوو ، خەڵکی گوندەکانیان دەژماردن و بانگی کوێخای گەورەی گوندیان دەکرد کەگوندی تۆ دەبێ ئەو برە جزیەیە یا باجی سەر یا سەرانەیە بدات، برۆن لەسەر خەڵکی خۆتان دابەشی بکەن. دوایێ

کارگوزاران لەکاتی دیاری کراودا دەهاتن وجزیەیان لـە کوێخایگوند وەردەگـرت.ابـی عبیـد, الاموال, ل ٥٢.

* * *

* ل١٢٣ ناکامی سولەیمانی کوڕی کەسیر کەیەکێك بـوو لـە نوێنـەران و بـانگڕادێرانی عەبباسی, کە (مەقریزی)بەم شێوەیە باسی لێوە دەکات : کاتێ ئەبوجەعفەری مەنـصور بـرای ئەبوئەلعباس یەکەمین خەلیفـەی عەبباسیـەکان پـێش خەلافـەت دەچـێتە لای ئەبوموسـلیمی خوراسانی, روژێك سولەیمان بە ئەبوجەعفەری گوت ئەوەی ئێمە مەبەستمان بوو و دەمانویـست ئەوە بوو کە کاروباری ئێوە رێك بخەین, ئێـستاش سوپاس بۆ خودا کاروبارەکان رێـك وپـێکن, ئەگەر بتانەوێت لەمەودوا کارەکان لەدەستی ئەبوموسلیم دەردێـنین. دەڵـێن موحەمـەد کـوڕی سولەیمان کوڕی کەسیر کەیەکێ لە لایەنگرانی خەداش بوو, زۆری پێ ناخوش بـوو کـە بـاوکی بانگەشەی بە ئەبوموسـلیم سـپاردووە، بۆیـە هەمیـشە بـەدوای پـیلانو نـاژاوە دەگـەڕا دژی ئەبوموسلیم. ئەبوموسلیم کەئەوەی دەزانی کـاتێ کارەکـانی گرتـە دەسـت موحەمـەد کـوڕی سولەیمانی کوشت, سولەیمان چووە لای (کەفیەکان) کە کەسانێك بوون سوێندیان خوارد بوو هیچ شتێك وەرنەگرن ئەگەر پێویست بوو تەنانەت ماڵی خۆشیان ببەخشن بۆ گەیشتنیان بە پاداشتی خودایی, کەئەویش بەهەشتە! لەبەرئەوە پێیان دەگوتن (کەفیە) چونکە بەوەندە گەمە باوەڕیـان دەهات کە لەسـەر لەپی دەسـت دابنـرێ. سـولەیمان لـەلای (کـەفی)یـە ڕۆیـشت کەلایـەنگری عەبباسی بوون, وتی ئێمە خۆمان جۆگەلەیەکمان لێدا یەکێکی تر هات ناوی تێکرد, مەبەستی ئەبوموسلیم بوو،کاتێ ئەبوموسلیم ئەو قسەیەی زانیەوە زۆر تووڕە بـووو ڕقـی هەسـت،لەوناوە ئەبو توراب وعلوانی مرورودی و چەندکەسێکیتر هاتنە لای ئەبوموسلیم و سولەیمانیان تاوانبار کرد کە ڕوژێك هێشویەك ترێی لەدەست بـووە گوتویـە خودایـە روی ئەبوموسـلیم وەکـو ئـەم هێشوە ترێیە ڕەش بکەیو خوێنی بڕێژی, وشاهیدیان دا کـە سـولەیمانی خـەداش میـزی بـە نامەی ئیمام داکردووە, ئەبوموسلیم بەیەکێکی گوت لەوانەی کەلەوێ بـوون: سـولەیمان بگـرەو بیبە خوارەزم, ئەبوموسلیم ویستبێتی هەرکەسێك بکوژێ بەم شـێوەیە دەیکوشـت, سـەرئەنجام سولەیمان کوژرا. بگەڕێوە بۆ وردەکاریـەکانی دەقـی ئەوباسـە لـە کتێبـی ( المتقـی الکـبیر)ی

مقریزی, نوسخەی دەستنووس، کتێبخانەی میللی پاریس, ڤان فلوتن ل.ل۷۹,۸۰. ناوبراو دەڵێت ئەو بەسەرهاتە بەو شێوەیە لە سەرچاوەی تردا نییە.

***

* ل۱۳٦ جێی باسکردنە داخۆ بەرگی ڕەش‌و ئاڵای ڕەش کە دروشمی یارانی ئەبو موسلیم وعەبباسیەکان بوو، لەچییەوە هاتووە؟ هەندێك پێیان وایە ئەمانەلەبەر پرسەوماتەمی نەوەکانی پێغەمبەر کە بە دەستی بەنی ئومەییەکوژران ئەو بەرگ و ئالاّ رەشەیان کردۆتە دروشم‌و رەمزی خۆیان. بەلاّم وێرای ئەوەی کە چیرۆکی تۆڵەو (قەصاص)ی بەنی عەبباس لەدژی ئەمەویەکان‌وکۆمەڵکوژکردنیان هەر لەسەرەتایی دەستپێکردنی خەلاّفەتی سەففاح وئەو پرسەوماتەمەی کە خوراسانییەکان بۆ مەرگی زەیدی کوڕی عەلی و یەحیای کوڕی زەید دوای گرتنی خوراسان ئەنجامیان دا، ئەوە دەردەخات کە عەبباسیەکان‌و بانگەشەکارە سەرەتاییەکانیان بەڕاستی بیری تۆڵەسەندنەوەیان لە مێشکدابووە، لە وەبیرهێنانەوەوی ئەو کارەساتەدا مەبەستی پرسەو ماتەمینیشیان هەبووە، بەڵام ئەوە لە بارەی (خەواریج) ( بۆنمونە گالب الحق یمن : مجمل التواریخ, ل ۳۱۷) ش باسی کردوە، کە ئەوانیش لە راگەیاندنی خۆیان دژی بەنی ئومەیە، بەزۆری ئاڵای ڕەشیان بەرز دەکردەوە، لە کاتێکدا کە وەك دیارە هەزو عیلاقەیەکی ئەوتۆیان بە نەوەکانی پێغەمبەرو کوڕەکانی هاشمەوە نەبووە. راستیەکەی ئەوەیە ئاڵای رەش، ئاڵای پێغەمبەر بووە، ئەو کەسانەی لە شیعەوخەواریج کە دژی بەنی ئومەییە بەرزیان دەکردەوە لە راستیدا دەیانویست سەرنجی موسڵمانان بۆشەڕ رابکێشن، کە حکومەت‌و دەوڵەتی ئەمەوی لە سنوورو چوارچێوەی موسڵمانەتی دەرچوونەو دژیەتیکردنیان وەك ئەوە وایەکە ئاڵای ئیسلام بەرز بکەیتەوە.ئەونەگەرەی کە عەبباسیەکان و شیعەکانی ئەوان ڕەنگی ڕەشیان لە بەرامبەری ڕنگی سپی کە دروشمی ئەمەویەکان بووە بەکار هێنابێ، وەك چۆن (ڤان فلۆتن)یش دەڵێ دروست نییە، چونکە دوای هاتنە سەر کاری عەبباسیەکان بوو کە دوژمنەکانیان لە هەر جێیەك بوون رەنگی سپیان کردە دروشمی خۆیان، ئەو رەنگە هەرتایبەت نەبوو بەبەنی ئومەییە. بۆ زانیاری زیاتر لەو بارەیەوە بگەڕێوە بۆ ڤان فلۆتن ، ل ٦٤-٦٣. سەبارەت بەکۆمەڵکوژی بەنی ئومەییە لەلایەن بەنی عەبباس بگەڕێوە بۆ:

orentalniArchiv ج١٨، ژماره٣، ١٩٥٠ . وتاری macati که لەو بارەیەوە چەند ریوایەتێکی جیاجیای کۆ کردونەتەوە و وەریگرتوون.

***

* ل ١٣٦ (خرفستره)زیندەوەرە زیانمەندەکان پێیان گوتراوە خرفستره.،زیندەوەرانی وەك مار،کیسەڵ، مشك، دوپشك ، مێرو، کولله ، کرم و مێش ئەوانە هەموویان بە (خرفستر)ە دەژمێردرێن، لەبەرئەوەی ئەو گیانلەبەرانەیان بە زیان کار دەزانین،کوشتن و لە ناوبردنی ئەو گیانەوەرانەیان بەکاریکی خێردەژمارد.لەکوشتنیئەوخرفسترانەدا هەموو مەزدیەسنان بەرپرسیار بوون، بەڵام ئەرکی پێشەوایانی ئایینی لەو بارەوە زیاتر بووە.

بەهەرحاڵ رۆژانی تایبەت لە وەرزی هاوین مویەدان و ئەوانی تر بۆ کوشتن ولە ناو بردنیئەو زیندەوەرانەلە ماڵ دەردە چوون. داردەستێکی تایبەت بە کوشتنی ئەو زیندەوەرە زیانمەندانەیان هەڵدەگرت و پێیان دەگوت (خرفسترغن) یان خرفسترگن بە مانای حەشەرە کوژ و ئەوخرفسترانەیان بەوداردەستە لە ناو کێڵگەکان دەکوشت. بۆ زانیاری زیاتر لەو بارەوە بگەڕێوە بۆ( فرهنگ ایران باستان ، پور داوود ،ل ل١٣٨-٣٠١ کە بە درێژی باسی کردووە.

***

* ل١٤٥ بەهەرحاڵ ئەو ئەگەرە بەدووردەزانرێ کە (راوەندیە) بەڕاستی لایەنگیری راستگۆو بێ فرت و فێڵی عەبباسیان بووبن، لەوەیکە نووسەرەکان سەبارەت بە ئەوانیان نووسیوە وا دەر دەکەوێت کە ئەوانە سەر بە گروپی (ئەباحە)بن. تەنانەت هەندێك لەوان بە تەواوەتی وەکو خورەمدینەکان بەوە تاوانبار دەکران کە ژنەکانی خۆیان بە یەکتر دەدەن (ئەوەی دەدرێت بە یەکێك بە مەرجی گەڕاندنەوەی) تەبەری مێژوونووس گێڕانەوەیێکی سەیری لە سەر ئەوان لە مەدائینی گێڕاوەتەوە کەئەوە هەمووی وا نیشان دەدات بانگەشەکردن بە ئیمان هێنان بە خواوەندێتی( مەنصور) بۆ ئەوە بوو کە داوەت کردن و ئیمان هینانەکانی تری خۆیان بەوە بشارنەوە، بەهەر شێوەیێك بێت، ئەگەر مەیلی( ئەباحیەت) لە ناو هەموو راوەندیەکانیشدا نەبووبێت ئەوابێگومان لە نێو هەندیکیان هەبووە. هەندێ نووسینیان وەك نوسینەکانی زەندەقە یا خورەمدینان بووە، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ئەوان خۆیان بە شیعەی (ئالی عەبباس) داناوەو لەڕاستیدا ڕەنگە هەندێ لەوان لایەنگری زەردەشتی بووبن. باوەڕیان وا بووە کە (ئیمامەت) بە

میراته(له باوك بۆكوڕ) نەك بەدەق وەكو ئەوەی شیعەكان دەڵێن‌و نەوەك بە دەست نیشان كـردن هەروەكو ئەهلی‌سونەت دەڵێن.. بەڵام ئەوهەڵسوكەوتەی كە (مەنصور) لەگەڵ ئەوانی كردو ئەو هەوڵەی بۆكوشتنی ئەو كە ئەوان كردیانە سەر وا دیـار دەخـات كـە (ڕاوەندیـە) لەوگێڕانـەوەو وتانـەی خۆییـان راسـتگۆ نەبوونـە و زمـان و دڵیـان وەك یـەكتر نـەبووە ... دوای پەیامبـەر ئیمامەت بۆ عەبباس بوو، ئەبوبەكرو عوسمان سـتەمیان لـێ كـردوە (تبـصره العـوام،ل۱۷۸).

لەبارەی (راوەندیە)وە بگەڕێوە بۆ خانەدانی نۆبەختی عـەبباس ئیقبـال، ل۳٥٦ هـەروەها ڤـان ڤلۆتن، ل۳۸ كە هەندێك توێژەری ڕۆژئاوایی دیكەشی لەوێ ناو هێناوە.

***

* ل۱٥٦ لە ئاڤێستا و هەروەها لە داب و نەریتی زەردەشتی‌دا ئامـاژە بـە سـەرهەڵدانی فریاد رەس كراوە كە درۆو خراپی لـە جیهـان نـاهێڵێ و هـانی ڕاسـتی و چـاكە دەداو سـەری دەخات. مەزدیەسنان لە ڕاستی‌دا چاوەڕوانی سـێ فریـاد رەس یـا سۆشـیانت(سۆشـیانس)یـان كردووە، كە هەر كام لە مەودای هەزار ساڵ دەردەكەون.ئەو هەرسێ بەڵێن دراوەكە لەڕەچەڵەكی زەردەشت دەبن ناویان‌و ناوی دایكەكانیانیش لە ئاڤێستاداهاتووەو شوێنی سـەرهەڵدانی‌یان بـە ڕۆژهەڵاتی ئێران و كەناری روباری هاموون ناوبردوە. بەڵێ بەپێی نووسینەكانی دینكرێت، سـی ساڵ پێش تێپەڕ بوونی دەهەمین هەزارە ((كچێك لە ئاوی هامون))دا خـۆی شوشـتووە دوگیـان دەبـێ‌و یەكـەمین فریـاد رەس كـەناوی هۆشـیدەرە لـەو پەیـدا دەبـێ، سـی سـاڵ مـاوەبۆ (كۆتـایی)هـەزارەی هۆشـیدەر بـە هـەمان شـێوە (هۆشـیدەرماە) دوهـەمین فریـاد رەس لـە كەنیشكێك دێتەسەر دونیا. لە كۆتایی هەزارەی (هۆشیدەر ماە)شدا دیسان بـە هـەمان شـێوە سۆشیانت دوایین ئافەریدەی ئاهورامزدا لەدایك دەبێت. دایكی هەرسێ فریاد رەس لەبنەماڵـەی بەهروزن لە پانزدەساڵی‌دا بار دەگرن ودووگیان دەبن، ئەوسێ فریادرەسە لەتەمەنی سی ساڵی‌دا لەلایەن ئەهورامزداوە بۆ ڕێنوێنیی‌كردنی مرۆڤ هەڵدەبژێردرێن. وەرگیراوە لـە یـشتها، ج۲، ل ل۳۰۱-۳۰۰. پورداوود باسێكی لە بارەی سۆشیانس هەیە كە لە ساڵی ۱۹۳۷لە بـەمبای لـە چاپ دراوە.

***

* ل١٦١ ئەوبەری ڕوبار ( ماوراء النهر) بە گشتی بریتی بووە لەتەواوی ئەوخاکەی کە موسڵمانان لە باکووری ڕوباری ئاموی خستبویانەژێر دەستی خۆیان. سنووری باکوور و ڕۆژهەڵاتی ئەو ناوچەیە کەعارەبەکان دەستیان بەسەرئەوێدا نەگرتبوو، کەواتەسنوری (ماوراء نهر) بەدرێژای ئەوماوەیە پەیوەست بوو بە بارودۆخی سیاسی، بەهەرحاڵ زۆرینەی ئەوناوچەیە لەکۆنەوە بەشێکی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ئێران بووە. هەروەکو ناوچەی سوغد بە لای کەمەوە لە سەردەمی (داریوش)ی هەخامەنشی دا لەژێر دەستی ئێران دا بووە. لە سەردەمی ئەسکەندەر بەدواوە ئەو ناوچەیە ئەگەرچی بەرواڵەت لە ئێران جیا بووە، بەڵام لە ڕووی فەرهەنگی وشارستانیەوە پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵگای ئێرانیدا هەبووە، هەروەکو مانەویەکان کاتێ لەئێران دەرکرانو نائومێد بوون لەو ناوچە پڕ ئاسایش وهێمنەی ئەوێ دا پەنایان گرت.

***

* ل١٦٣ سەبارەت بەشیعری خەڵکی بوخارا لە بارەی خاتون و سەعید وتاری نووسەری ئەم دێرانە لە گۆڤاری یەغما (ژمارەی٧ سال ١١)سەیر بکرێ.

***

* ل١٨٤ لەبارەی پەرەستگای (نەوبەهار) باسێکی زۆر لە کتێبەکان دا هاتووە کەبێ زێدەڕۆیی نییە. ناوی ئەو پەرەستگایە لە دوو واژەی (سانسکریتە)وە هاتووە کە یەکەمی بەمانایی نوێ ودووەمی بەمانایی کەنیسەو دێردێت . (نەوبەهار) کە لە بەڵخ بووە، بە یەکێك لە بتخانە گەورەکانی بوودایی ژمێردراوە و بەپێی دەربڕینی ( دەقیقی) شاعیر، ڕێز و شکۆی لەلای ئەو خەڵکە بەقەد پیرۆزی مەککەی لای موسڵمانان هەبووە. ئەمیر وپاشاکانیئەوهەرێمە سەر پەرەشتیکارانی موڵکە مەوقوفەکانی ئەوپەرستگایەبوون. ئەوسەر پەرەشتیکارانە بەگشتی پێیان دەگوترا (بەرمەك). باس کراوە ئەو پەرەستگەیە چەندین گونبەدی هەبووە کە گونبەدی یەکەمیان پترلە سەد باڵ بووە .

لە دەرەوەی پەرەستگەکەدا سێ سەدو شێست هۆدەو ژوور یان دروست کرد بوون کە خزمەتکاران و کار گوزاریان تیا دانابوون، هەرکام لەو خزمەتکارانە، ساڵێ تەنیا جارێك نۆرەی خزمەتکردنیان دەگەیشتێ، ڕۆژانی تر خەریکی کاری خۆیان دەبوون . بەگەورەی خزمەتکارانی پەرستگەکەشیان دەگوت بەرمەك. بەڕێوەبەروخاوەنداریەتی پەرستگە بە شێوازی میراتی لە

بەرمەکێك بۆ بەرمەکیەکی تردەگوازرایەوە. پاشاکانی خۆراسان و چین و هیند و کابل دەهاتنە ئەوپەرستگایە و زیارەتی بتەکانیان دەکردو دەستی بەرمەکیان ماچ دەکرد .

پەرەستگای ئەوبەهار داهاتو وقوفات و ماڵ و مولکێکی تەرخانکراوی زۆری هەبوو. هەروەها دارایی و پاشەکەوتی گەنجینە و زێڕ و جەواهیراتێکی بێ ژمارەی هەبوو کە هەمووی لە ژێر دەستی بەرمەك دا بوو. لەناوپەرستگەدابتو بووکەڵەی بە زێڕ و گەوهەرو دیبا وئاوریشم رازێنراوە هەبوون، کە ببوونە جێگەی سەرسورمانی زیارەتکارو گەڕیدەکان .

بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ئاوو ئەوسەر چاوانەیکە باسی ئەوبەهاریان تێدا هاتوە . بگەڕێوە بۆ کتێبی( تاریخ برامکە)، پێشەکیەکی درێژی خوالێخۆشبوو ( قەریب گورگانی) ودائرە المعارف اسلام، ج ١ و کتێبی (لویس بوڤا)، وەرگێڕانی (عبدوالحوسین مێیکەدە) و(مسالك الاعصار). بەلاّم سەبارەت بە بەرمەك کە ناوی گشتی خزمەتکارانی پەرەستگای ئەویەهار بووە، بگەڕێوە بۆ زنجیرە وتاری ranica لە نووسینی (هـ. و. بیلی )گۆڤاری BsoAs ، ج ١١ بەشی یەکەم،ل٢، هەروەها دەقی کتێبی بەرمەکیانی بوڤا ل ١٣٣-١٣٢ هەروەها (دائیرە المعارف ئیسلام) :ج١ لەم بارەوە سەیر بکرێ.

***

* ل٢١٣. لە بیرو باوەڕ و ڕێنوێنیەکانی خوڕەمدینەکان دا دەردەکەوێ کە ئەو گروپە بەبەراوردلەگەڵ گروپەکانی دیکە نزیکتر بووە لە ئایینی مەزدەکەو . هەندێ لە بۆچونەکانیشیان لەگەڵ باوەڕی لایەنگرانی( ئبیقور)دا یەك دەگرێتەوە . جیاوازی هەیەکە ناوی خورەم و خورەم دین لە چییەوە وەرگێراوە. ئەوگریمانەیەیکە خورەمی بوون لەبەر ئەوەیە کە گوایە ئەو گروپە بە هۆی لایەنگریکردنیان لە کوفر، کە پێیان وایە مرۆڤ جگە لە خۆشی و چێژ وەرگرتن نابێ پایبەندی هیچ شتێکی تر بێت، لاواز دەبینرێ ، پێ ناچێت ئەوانە تا ئەو ڕادەیە وەك خاوەن نووسینەکان پێیان وایە هێندە لە خۆشی و خۆشگوزەرانیدا زێدەڕۆییان کردبێ .

هەر چۆنێك بێ، وێکچوونێك لەو تاوانبار کردنەی ئەوان بەکوفرو بێ دینی (ئیلحاد) لەگەڵ گروپی(بابیە)دا ، دەبینرێ.

لەم بارەیەوە بگەڕێوە بۆ کتێبی ڤان ڤلۆتێن.Van Vloten ل ٥٠ .

هەروەها (خورەم) ناوی گوندێکیش بووە، نزیك (ئەردەبیل) و خورەمیو خورەمیەکان سەربەئەوێن. وەکو دیارە ئەوئەگەرەیکە ئەوگروپە بە هۆی ناوی ئەو گوندە واتەگوندی خورەمەوە بێ لە ئەگەرەکانیتر ڕاستتر بێت .

* ل٢١٦ پەراوێزی ژمارە/ واژەی( مەرداس )کە لە گۆڤاری( ZDMG )لە کاتی لێکۆڵینەوەکەی روت (ROTH )دا باسکراوە و، (نۆلدکە)ش پەسندی کردووە کە (مەرداس) ناوێکی عەرەبیە . حماسە ملی ایران،ل ٣٢.

***

* ٢١٨ بیزانس، بێزەنتیە،بوزەنتییە هەمان (BYZANTIUM )ە. کە مەبەست رۆمی ڕۆژهەڵاتیە، ئەو واژەیە ئێستا لە فارسی دا بە پەیڕەوی لە فەرەنسیەکان کە( BYZANCE) ی پێ دەڵێن بیزانس دەنووسن. لە بارەی پەیوەندی عەرەب یا بیزەنتیە بگەڕێوە بۆ کتێبی Basiliev کەناوی ( بیزەنتیە و عەرەب)ە ( Byzanceet Les Arabes). لە دوو بەرگداو وتاری کانارد Canard لەژێر ناونیشانی (روابگ بوزنگیە و اعراب) لە دووتوویی کۆمەڵە وتارێکدا کەپێشکەش بە جیڤەرجیولۆی دلاویدا کراوە، بەرگی٢.

* ل ٢٥٣ (ئەبو دلف قاسم کوڕی عیسای ئیدریس کوڕی معقل عەجەلی) سەرەتا لە یارانی محەمەد ئەمین بوو لەگەڵ(عەلی کوڕی عیسای ماهان) بۆشەڕی (تاهیری کوڕی حوسێن )چوو،کاتێ عەلی کوڕی عیسا کوژرا ئەو بۆ هەمەدان گەڕایەوە. تاهر نامەی بۆنووسی و داوای لێکرد کە بەیعەت بە مەئموون بکات، بەڵام ڕازی نەبوو، وتی من بەیعەتیکم لە ئەستۆ دایە کە بۆ هەڵوەشانەوەی ڕێگەیەك نابینم، بەڵام لەسەر جێگەی خۆم دەمێنم ولەگەڵ هیچ کام لەو دوو دەستەیە نابم. تاهر لێی قبوڵ کردو لە کەرەج نیشتەجێ بوو. کاتێ مەئموون هاتە شاری رەی کەسێکی نارده لای و داوای کرد, ڕێزی گرتو دڵی دایەوە و حکومەتی کوردانی پێدا،کە بۆ نەوەکانیشی بە میرات مایەوە. ئەو لە سەردارانی مەئموون و موعتەسەم و لە دلاوەران و جوامێرانی عارەبە، کە خۆی شیعری دەگوت، هەندێك لە شاعیران باسیان کردووە، یەکێ لەوانەی پێیان دا هەڵگوتووە (ئەبو تەمام تائی)یە .

بەڵام ئەحمەدکوڕی ئەبیدەواد , لە گەورەکانی موعتەزیلله بوو، لە سەردەمی مەئموون دا بەرپرسیاری دادوەری بووە و نفوزی لە لای مەئموون و موعتەسەم دانفوزیهەبووە هەر ئەوەش

بووە هۆی ئەوەی کە موعتەزیللە دەست بەسەر هەموو کارێك دابگرن و مەسەلەی( محنـە)واتـە تاقی کردنەوە و هەڵسەنگاندن، ((ئەو تاقیکردنەوەیە بووکە لە سەردەمی مەئموون بە دادوەر و وتار خوێنان دەکرا کە ئایا باوەڕیان بە مەخلوق بوونی قورئان هەیە یا نا)) ڕووداوی بـاوەر بـە خەلقی قورئان هاتە پێش. سەبارەت بە دەمارگیری‌وجوامێری ئەحمەد کوڕی دەواد شـتـگەلێکی زۆرباسکراون. هەوڵەکانی ئەو بۆ رزگار کردنی ئەبودلف قاسم لە دەستی ئەفشین و ڕێگە چارەی ئەو بۆ ڕزگار کردنی محەمەد کوڕی جەهمی بەرمەکی لە زەبری موعتەسەم لەو هەوڵەیە. هێزو نفوزی ئەولەلای مەئموونو موعتەسەم بیّ وێنە بووە.

لەبارەی ئەبودلفو ئەحمـەدو باسـی ئـەوان بگـەڕێوە بـۆ کتێبـە مێژوویـیـە کـانی وەك یەعقوبی، تەبەری، ئیبن خەلەکان و لە بارەی موعتەزیلەکان وتاری نیبێرێگ لە (دائیره المعارف اســلام ،ج٣) و توێژینـــەوەکانی گولدزیهـــەر لــە Muhammedanische stuldin موعتەزیلە دانانی حەسەن جاراللە میسر ١٩٤٧ .

***

ل ٢٥٩ سەبارەت بەدانیشتوانی خەزەر و سەرچاوەی دەنـگ و باسـیان بگـەڕێوە بـۆکتێبی (حدود العالم) وەرگێڕان و شـیّ کردنـەوەی مینۆرێـسکی (ل ٤٦٠-٤٥٠)، هـەروەها (دائـیره المعارف ئیسلام ج٣)، وتاری بارتۆلد. دانیشتوانی خەزەر تورك زمـان بـوون، وا پێدەچـێت لـە ئاسیای ناوەڕاستەوە هاتبن و لە سنووری (باب الابواب)ی تورکستان نیشتەجیّ بووبن. لە ڕووی شارستانی و فەرهەنگیەوە هیچیان لە دوا بەجێنەماوە. لەسەر دەمـی خەلیفەکانـدا بـە هـۆی جیرانـــەتیان لەگـــەڵ موســـڵمانەکانو وڵاتـــی ئیـــسلامیدا بـــەردەوام هێرش‌ودەســـتدرێژیان کردۆتەسەریان. سەبارەت بە مەزهەبو بیروباوەڕیان ئەوەی هەیـە ئەوەیـە کـە لەسـەر بـاوەڕی (شەمەنی) بوونە. سەبارەت بەڕەچەڵەکی دانیشتوانی خەزەر هەندێك گووتویانە کە لـە یـەهود بوونـەو لـەم بـارەوە Dunlop کتێبێکـی هەیـە بەناونیـشانی the History of the Jewishkhazars کـە لـە Gerard chavson لـە گۆڤـاری (ئەنجومـەنی سـلگنتی ئاسیایی JRAs, ج١-٢ ساڵی ١٩٥٦داخستۆیەتیە بەر ڕەخنەو توێژینەوە .

***

* ل٢٨٠. باوەڕ بوون بە (زەرڤان) هەرچۆنێك بێت پـێش سـەردەمی ساسـانیان لـە ئێـران داهەبووە. نەك هەر لە ئاڤێستادا باسی زرڤان هاتووە بەڵکولە سەر چاوە کۆنـەکانی یۆنانیـشدا ئامـاژەی پێکـراوە.( ئێـد مـوس) Edemus ناوێـك خـەڵکی ڕۆدیـس Rhodesکـە لـە قوتابیانی ئەرەستۆ بووە ئاماژەی بە بڵاوبوونەوەی باوەڕی خودای زەمان لە نێوان فارسـەکان دا کردوە, هەندێك ئاماژەی تریش لەبارەی پێشینەی ئەو ئایینە لە ئێرانـدا هـەن کـە لـە کتێبـی Cumont-Bidezکومـون بیـدز ناسـراو بـە Les mages Hellenises کتێبـی زیهنەر ناسراو بە zurvan ئەو سەرچاوەیە کۆکراوەتـەوە و وەرگێـردراوە و گواسـتراوەتەوە . بەهەرحاڵ باوەڕ بە بوونی زەرڤان لەدەرەوەی ساسانی نەهاتووەتە کایەوەو باگڕاونـدو پێـشینەی هەبووە.

لەکۆتایی ئەوسەردەمەدا زیاتر لە بیر و باوەڕەکـانی تـر ڕەواجـی هـەبووە. دەتـوانین بڵـێین سەرەڕای رابردووی بـاوەڕ بـوون بـە زەرڤـان پـێش ساسـانیەکانو بڵاوبونـەوەی لـە سـەردەمی ساسانیەیەوە دەست پێ دەکات و بەکورتیلە سەردەمی ساسانیدا مەزهـەبی زەرڤـان زیـاتر لـە مەزهەبـەکانی تـر لـە نێـو زەردەشـتییەکان دا بـڵاو بـووە، ئەمـە بـاوەڕی کریستێنـسێن بـووە. ZaehnerK زنهێـریش پـشتراستی کردۆتـەوە. (بگـەڕێوە بـۆ christensen ل ١٤٤- Zahner ل ٢٢). بەڵام ریشەی ئاینی زەرڤان چیەو چۆن پەیدا بووە ؟ لەو بارەیـەوە تێڕوانینی توێژەرەوان ئەوەیە کە زەرڤان ئاکام ودەرەنجامی کاریگەری بـاوەڕو مەزهـەبی بـابلی لەسەر ئایینی زەردەشتی بووە. لەڕاستی دا، زەرڤان کە پەروەردگاری زەمانە، بە مەزهـەروجێ بەجێکاری جووڵانەوەی ئاسمانو ئەستیرە کان لێکدراوەتەوە، کەهـەموو شـتێکی لـە خۆگرتـوە وتوانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە. باوەڕ بە چارەنووس کە ئاکامی باوەڕ بە زەرڤانـە لەگـەڵ بیروباوەڕی بابلی و کلدانی لە بواری کاریگەری ئەستێرەکان لەسەرچارەنووسی تاکـدا پەیوەنـدی هەیە. پێ دەچێت کە ئایینی زەرڤان لەکاتێك دا لە نێوان ئێرانیەکان دا هاتە ئاراوە و بڵاوبـۆوە کە بابل خراوەتە پاڵ وڵاتی هەخامەنشی، دواجارکە لەسەردەمی ساسانیدا بـڵاو بوونـەوەی لـە نێو خەڵکیدا زۆرلە سەرە خۆ بووەو هەر لە سەردەمی ساسانیەکان دا بووە کە لە نێو خەڵکیـدا بڵاوبۆتەوەو بۆتە مەزهەبێکی باوەڕپێکراوو گشتگیری خەڵکی. بـۆ توێژینـەوە لـە بیروبـاوەڕی

مەزهەبی بابلیش بگەڕێوە بۆ کتێبی Zorastre دانان ونووسینی دۆشن گیمەن، ل ٩٧-٧٦ کە باسێکی ڕێك ودرێژی لەوبارەیەوە هەیە.

* ل٢٨٨ زاراوەی زەندیق هەندێك بە وشەی ئارامی (صدیق) و هەندێك بەوشەیەکی یونانیان زانیوە. گومانی بە هێز کە ئەمڕۆجێگەی باوەڕی توێژەرانە ئەوەیەکەئەم وشەیە وشەیەکی ئێرانییە.( زەندیك) کەپێدەچی ریشەی پەهلەوی ئەو واژەیەبێت لە سەردەمانی ساسانی دا بە کەسانێك گوتراوە کە بۆدەرك و فامی زانست و وشەکانی ئاڤێستا پەنایان دەبردەبەر شرۆڤە وشەرح و وەرگێڕان. لایەنگرانی مانی و مەزدەکیش گوایە لەبەر ئەو هۆیە لە رۆژگاری ساسانییەکان دابە زەندیك ناودەبران، چونکە ئەهلی رامانوتێروانینی فراوان بوونە. زەندیقەکان لە سەردەمی خەلافەتی عەبباسیدا، هەندێکیان مانەوی بوون و هەندێکی تر خەڵکانی بیر ئازاد و(لائیك)کە لە ڕاستی دا بە هیچ ئایین و باوەڕێك پابەند نەبوون .

بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە زەندیقەکان و دەنگوباسیان و بارودۆخیان بگەڕێوە بۆ کتێبی (تاریخ الالحاد فی الاسلام،عبدالرحمن بدوی) کە جگە لە سەرچاوە جۆراو جۆرەکانو وتاری گەورەکانی ئەو گروپەش باسی لێوەکراوە. هەروەها سەیری وتارێکی نووسەری ئەم کتێبە لەژێر ناونیشانی زەندیقو زەندیقەکان لە گۆڤاری راهنمایی کتێبی ژمارە دوو ساڵی حەوتەم بکە. سەبارەت بە کوڕی موقەفەع وزەندیق بوونی ئەو بگەڕێوە بۆ کتێبی(الرد علی الزندق اللعین ابن المقفع)لە ئیمام قاسم ئیبراهیم.ئەو کتێبەGvidi رۆژهەڵاتناسی ئیتالی بەپێشەکیەکەوە وەریگێڕاوەولەساڵی (١٩٢٧)لە رۆماچاپیکردوە. لەبارەی ژیاننامەی کوڕی موقەففەع ((عەبباس ئیقباڵ)) باسێکی هەیە، ساڵی١٣٠٥ لە بەرلین چاپ کراوە، هەروەها بگەڕێوە بۆ پێشەکی کتێبی (کەلیلەو دەمنە)ی بەهرامشاهی چاپی عەبدئەلعەزیم قەریب کە ئەوبابەتەی باس کردووە .

* * *

* ل٣٠٠ نفوزو کاریگەری تورکەکان بە تایبەت لە دوای کوژرانی متەوەکیل زیاتر بوو، دوای کوشتنی متەوەکیل بە پێی گێڕانەوەی (ئەلفەخری) دەستیان بەسەر وڵاتدا گرتبوو. خەلیفە لە دەستی ئەوان وەکو دیلێك وابوو, ئەگەر بیان ویستبوایە دەیانگۆڕی. نووسیویانە کاتێك (موعتەز)لە ساڵی ( ٢٥٢ك/٨٦٦ز) لە سەر کورسی جێ نشینی دانیشت کەسوکاری،

ئەستێرە ناسیان هێنان و گوتیان سەیر بکەن داخۆتاکەی دەمینێو تاکەی لە سەر کورسی خەلافەت دەبێ، یەکێك لە نوکتەزانان وتی من لەوانە باشتر دەزانم، وتیان تۆ دەڵی چەند ساڵ دەژی وچەند ساڵ فەرمانڕەوایی دەکات؟ وتی تا تورکەکان بیانەوێ. ئەوانەی لەو کۆبونەوەیە ئامادە بوون پێکەنین، (( ئەلفەخری ل٢٢١)). لەبەر ئەوە بووکە بە قسەی مەسعودی، ((موعتەز لەترسی (بوغا)کەفەرماندەیەکی سەربازی تورك بوو شەو ورۆژ ئارامی نەدەگرتو چەکی لە خۆی جیا نەدەکردەوە، دەی گوت هەردەم وەها دەبم تاکو بزانم سەری من بۆ بوغا دەبی یا سەری بوغا بۆ من، هەروەها دەیگوت بەردەوام دەترسم کە بوغا لە ئاسمانەوە بکەوێتە سەرم یالەزەوی بۆ لە ناو بردنی من دەرکەوێ (مروج الژهب ج ٢، ل ٤٢٨).

* ل١٣١ ( کیسانی یە) : بەبەشێك لە شیعەکان و لایەنگرانی محەمەد کوڕی حەنیفە دەگوترا کەموختاریش یەکێك بوو لەلایەنگرانی ئەوان کە بۆتۆڵەی خوێنی حوسێن کوڕی عەلی توانیبوویان زۆر لەوکەسانە بکوژن کەدەستیان هەبوو لە کوشتنی ڕۆلەکانی عەلی کوڕی ئەبوتالیب .

* ل٢٧٧ صابیئە: ناوەندیان شاری حەران(روها) بووە. مەندائیەو حەرانیەشیان پێ‌دەڵێن. لەبارەی ئەوانە مێژوونوسان بۆچوونی جیاوازیان هەیە، هەندێك دەیان بەنەوە سەر ئایینی بابلیو ئاشوری، بەڵام هەندێك بۆ کۆنترین ئایینەکانی بت پەرستی دەیان گێڕنەوە، هەندێك بە ئەستێرە پەرست ناویان دێنن و هەندێکی تریش بەکۆمەڵێکی ئاگرپەرست و مەسیحی ناویان دەبەن. تازەترین هەواڵ لەبارەیان ئەوەیە کە لە خۆیان وەرگیراوە: کۆمەڵێکن بەپێی ڕێنمایەکانی حەزرەتی ئادەم دەجولێنەوە، پێغەمبەریشیان یەحییای کوڕی زەیدە.

***

* ل١٤٦ خورەمدینان: ئەو ناوە لە ناوی گوندێکەوە هاتووە کە دەکەوێتە نزیك ئەردەوێل بە ناوی خوڕەم، ئەوانە لە ناحەزانی دەوڵەتی عەبباسی بوون بە تایبەت دوای کوشتنی ئەبوموسلیمی خوراسانی سەریان هەڵداوە. ناوەندی ڕاپەڕینیان ئازەربایگان بووە و جمۆجۆڵێکی یەکجار زۆریان لەو ناوچانە هەبووە، جاویدانو جێنشینەکەی، بابەکی خورەم دین لەسەرۆکەکانیان بوونەو، باوەڕیان بە دۆنایدۆن هەبووەو بۆ ئەوەی کە لایەنگرانی ئەبوموسلیم بۆ لای خۆیان ڕابکێشن زیاتر جاڕو بانگەشەی ئەوباوەڕەیان کردووە. دژەکانیان بە زەردەشتی و

مەزدەکی تاوانباریان کردوون کە ئەوە لە دەمارگیری بەدەر نییە. لە سەردەمی موعتەسەمی خەلیفەی عەبباسیدا ئەو بزاڤە بە هۆی گرتنی بابەك دوای نزیك بیست ساڵ، بەرگری لەخاك ونیشتمانیان دژی عارەب، دامرکایەوە.

* ل٢٣٦ سمنی:هەروەکو لەکتێبەکانی (ملل ونحل) و ئایینی دا هاتووە ئەوە ناونیشانیکەسانێك بووە کە لە دێر زەمانەوە باوەڕیان بەکۆنینە بوونی جیهانو دۆنایدۆن هەبووە ، لە سەرەتای سەردەمی عەبباسی دا لە شارەکانی بەسراو ڕەنگەبەغداش هەندێك لە زەنادەقەی ئیسلامی چوبێتنە سەر بیرو باوەری ئەو گروپە.

***

* ل٢٩٢ ئەبو هەدیلی عەلاف: (کە لەساڵی٢٢٦ك/٨٤٢ز مردووە)، یەکێکەلە گەورەپیاوان و مرۆڤێکی هۆشمەند بووە و لە سەرکردە ناسراوەکانی گروپی موعتەزیلەی ئیسلام بووەو گۆڕانێکی فیکری بەهێزی لەو گروپە دا کردووە . ماوەیەك مامۆستای مەئموونی خەلیفەی عەبباسی بووە .

* ل٩١ باربەد: خەڵکی شاری مەرو بووە، یەکێك لەبەناوبانگترین ئاوازدانەرو گۆرانی بێژو چەنگژەنانی سەردەمی ساسانی و پاشایەتی خوسرەو پەرویز بووە. بەیەکیلە داهێنەرانی دەزگاکانی مۆسیقی ئێران دەژمێردرێت. ناوبراو بۆ هەر رۆژێکی پادشا هەوایێکی ساز کردبووو لێیدەدا، واتە بە ژمارەی رۆژانی ساڵ واتە٣٦٥ هەوا.

* ل٩١ نەکیسا: یەکێك لە ئاوازدانەرو گۆرانی بێژو چەنگ ژەنانی سەردەمی ساسانی و دەرباری خوسرەو پەرویز بووە.

* ل١٠٨ خوێنی سیاوەش: سیاوەش بە فەرمانی ئەفراسیاب پاشای تورانی کوژرا ، بەڵام تۆڵەی خوێنی لە لایەن کەیخوسرەوی کوری کرایەوە و خوێنی بزر نەبوو، هەر بۆیە ناوی دەر کردووە.(لەشاهنامەیفردۆسیبە درێژیباسکراوە).

* ل٣٦ زەنگییەکان ئەو ڕەشە پێستانەن کەلە کشوەری ئەفریقاوە هاتوون. لە سەدەمی خەلافەتی موعتەمد پانزدەهەمین خەلیفەی عەبباسی لە ناوەندی خەلافەتی عەبباسی ( بەسرا ، واست و بەحرێن )دا سەریان هەڵداوە، ئەو دەزگاییەیان خستە ئەو پەڕی مەترسییەوە، سەرکردەی ناسراویان بەناوی (عەلی کوڕی مەحەمەد، ناسراو بە صاحب زەنج بووە کە لەساڵی

(٢٥٥ك -٨٦٩ز)دا مردووه . ناوبراو مرۆڤێکی زیرەكو چەتوون بووه، دەڵێن بە ڕەچەڵەك ئێرانی بووه، بەنیاز بووه جڵەوی دەسەڵات لە دەستی عەبباسیەکان دەر بهێنێ و کۆیلەکان لە ژێر دەستی ئەربابەکان ڕزگار بکات. بە بۆچوونی هەندێك لە لێکۆڵەران وێك چونێك لەنێوان ئەو ڕاپەڕینەو ڕاپەڕینی کۆیلەکانی ڕۆما داهەیە.

* ل٢٩١ دەیسان ومەرقیوونیەکان: لەبەر ئەوەی سەرۆکی ئەوانە لە کەناری جۆگەی( دیصان) بووه، بۆیە بەو ناوە ناونراون. مەرقوونیەکان لەو باوەڕەدان کە نووروتاریکی دوو ئەسڵی دێرینن ولە ئایینی مەسیحیەوە نزیکن، هەروەها ئەو ئایینە لەمانەویەتیشەو نزیکە و کارتێکردنێکی زۆری هەیە، تەنیا لە ڕووناکی و تاریکی دا ناکۆکیان هەیە. خەت ونووسینی تایبەتی خۆیان هەبووە کە کتێبەکانی ئایینی خۆیان پێ دەنووسین، زۆریان لە خوراسان بوونە.

# منابع کتاب

## الف ـ عربی و فارسی

الآثارالباقیه عن‌القرون الخالیه (کتاب) ابوریحان بیرونی، طبع لیپزیک ۱۹۲۳ به اهتمام زاخائو ـ این کتاب به‌وسیلهٔ آقای اکبر داناسرشت به فارسی نیز ترجمه شده است.

ـ ابواب فی‌الصین و الترک و الهند منتخبة من کتاب (طبایع الحیوان) للطبیب شرف‌الزمان طاهرالمروزی ـ با ترجمهٔ انگلیسی و تعلیقات، به قلم پرفسور مینورسکی. لندن ۱۹۴۲.

ـ احسن‌التقاسیم فی معرفة‌الاقالیم، طبع دخویه. لیدن ۱۸۷٦.

ـ احوال و اشعار ابوعبدالله جعفربن محمّد رودکی سمرقندی. تألیف سعید نفیسی. طهران ۱۳۰۹ ـ ۱۳۱۰ ـ ۱۳۱۹ (۳ جلد).

ـ الاخبار الطّوال، ابی حنیفه احمدبن دواد الدینوری، چاپ مصر، بنفقة‌المکتبة العربیه ـ بغداد. تاریخ طبع ندارد. طبع لیدن کتاب با مقدمه و فهارس و اختلاف قرائات آن در ۱۸۸۸ و ۱۹۱۲ منتشر شده است.

ـ ادب‌الکاتب، تألیف ابی‌بکر محمّدبن یحیی الصّولی از انتشارات المکتبة العربیه ببغداد. طبع قاهره ۱۳۴۱ هجری قمری.

ـ الاغانی (کتاب ـ)، ابوالفرّخ الاصفهانی. طبع دارالکتب المصریّه، ۱۳۴۵ هجری و ۱۳۵۷ هجری. ـ و نیز طبع مصر، سنهٔ ۱۳۲۲ ـ ۱۳۲۳ ه. ق.

ـ الامامة و السیاسة. تألیف الامام الفقیه ابی محمّد عبدالله‌بن مسلم‌بن قتیبة الدینوری. مصر ۱۳۵٦ ـ ۱۳۵۵ (۲ ج).

- الاموال (کتاب -) للامام ابی عبیدالقاسم بن سلام المتوفی سنهٔ ۲۲۴ هجری. به تصحیح و حواشی محمّد حامد الفقی. قاهره ۱۳۵۳.

- اهل الذمّة فی‌الاسلام. تألیف ا. س. ترتون. ترجمه و تعلیق حسن حبشی. طبع دارالکفرالعربی. مصر ۱۹۴۹.

- بابک خرّم‌دین. سعید نفیسی. تهران شهریور ۱۳۳۳.

- بحارالانوار، تألیف مجلسی (محمّد باقر) طبع طهران سنهٔ ۱۳۰۱ - ۱۳۱۲ هـ. ق.

- البدء و التاریخ (کتاب -) تألیف المطهّربن طاهر المقدسی (به اشتباه منسوب به ابی زیداحمدبن سهل‌البلخی شده است). چاپ پاریس. نشر و ترجمهٔ کلمان هوار، پاریس ۱۸۹۹ - ۱۹۱۹ میلادی (٦ جزء).

- برهان قاطع، تألیف محمّدحسین‌بن خلف تبریزی. به اهتمام دکتر محمّد معین، تهران ۱۳۳۰ - ۱۳۳۵ شمسی (۴ جلد).

- بلدان الخلافه الشّرقیه. گی لسترانج. ترجمهٔ بشیر فرنسیس کورکیس عواد. مطبوعات المجمع العلمی العراقی. بغداد ۱۹۵۴.

- بیان‌الادیان، تألیف ابوالمعانی محمّد الحسینی العلوی. به تصحیح عباس اقبال. طهران ۱۳۱۲ شمسی.

- البیان و التبیین. جاحظ. به تحقیق و شرح حسن‌السندوبی، قاهره ۱۹۵۷.

- بیست مقالهٔ قزوینی (دورهٔ کامل) جلد ۱ و ۲. تهران، کتابفروشی ابن‌سینا و کتابفروشی ادب. دی ماه ۱۳۳۲ (چاپ جدید).

- تاریخ ابی‌جعفر محمّدبن جریرالطبری. (الامم و الملوک). طبع لیدن، سنهٔ ۱۸۷٦ - ۱۹۰۱ م. و طبع مصر ۱۹۳۹.

- تاریخ ادبی ایران، تألیف پرفسور ادوارد براون (جلد اوّل) ترجمه و تحشیه و تعلیق علی پاشا صالح. تهران ۱۳۳۳.

- تاریخ اسلام. دکتر علی‌اکبر فیاض. از انتشارات دانشگاه تهران.

- تاریخ التمدّن الاسلامی. جرجی زیدان، مصر، مطبعةالهلال، ۱۹۳۱ - ۱۹۴۷.

- تاریخ الخلفاء، تألیف جلال‌الدین سیوطی. به تحقیق محمّد محیی‌الدین

عبدالحمید، ۱۹۵۲، طبع مصر.
- تاریخ العرب قبل الاسلام. تألیف الدکتور جواد علی. طبع بغداد ۱۹۵۰ - ۱۹۵٦ (۵ جلد).
- تاریخ الفی، نسخهٔ خطّی کتابخانهٔ مجلس، به شمارهٔ ۲۲۲ (رک: فهرست کتابخانهٔ مجلس تألیف مرحوم اعتصامی، ص ۱۲۵).
- تاریخ ایران بعد از اسلام، دکتر عبدالحسین زرین‌کوب، طهران ۱۳۴۳.
- تاریخ بخارا (ترجمه و تلخیص کتاب) ابوبکر نرشخی. به تصحیح مدرّس رضوی تهران ۱۳۱۷.
- تاریخ برامکه. از بهترین منشآت قرن چهارم و پنجم (؟) - با مقدّمه مفصّل تاریخی و ادبی و انتقادی و حواشی و تعلیقات. نگارش میرزا عبدالعظیم‌خان گرکانی. طهران ۱۳۱۳.
- تاریخ بلعمی، ترجمهٔ طبری نسخهٔ خطی متعلّق به کتابخانهٔ مجلس به شمارهٔ ۲۳۱ (رک فهرست اعتصام‌الملک ص ۱۱۹) - و طبع هند ۱۹۱٦ (طبعی بسیار مغلوط). از این کتاب طبع تازه‌ای هم به تصحیح م. بهار منتشر شده است.
- تاریخ بغداد، تألیف ابی‌بکر احمدبن علی الخطیب، طبع مصر ۱۳۴۹ ه. ق.
- تاریخ بیهق، تألیف ابوالحسن علی‌بن زید بیهقی. با تصحیح و تعلیقات (مرحوم) احمد بهمنیار. تهران. مهرماه ۱۳۱۷ شمسی.
- تاریخ بیهقی، تصنیف خواجه ابوالفضل محمّدبن حسین بیهقی دبیر. به اهتمام دکتر غنی و دکتر فیاض. تهران ۱۳۲۴ ه. ش.
- تاریخ سیستان. به تصحیح (مرحوم) ملک‌الشعراء بهار. تهران ۱۳۱۴ شمسی. مؤسسهٔ خاور.
- تاریخ طبرستان. تألیف بهاءالدین محمدبن حسن‌بن اسفندیار کاتب. به تصحیح (مرحوم) عباس اقبال. تهران ۱۳۲۰ ه. ش. (قسم دوم کتاب شامل ملحقّات بر اصل کتاب است).
- تاریخ طبرستان و رویان و مازندران. تألیف سید ظهیرالدین بن سید نصیرالدین

المرعشی. به اهتمام برنهارد دارن، پطرز بورغ ۱۸۵۰.
- تاریخ گزیده. تألیف حمدالله مستوفی (چاپ عکسی) بـه اهـتمام ادوارد بـراون. انتشارات اوقاف گیب ۱۹۱۰ - ۱۹۱۳ مسیحی (۲ جلد)، طهران ۱۳۳۹.
- تبصرةالعوام فی معرفة مقالات الانام. منسوب به سید مـرتضی‌بن داعـی حسـنی رازی. طبع تهران به اهتمام عباس اقبال، سنه، ۱۳۱۳.
- تجارب الامم و تعاقب‌الهمم. تألیف ابوعلی مسکویه. چاپ عکسی اوقاف گیب، ۱۹۰۹، ۱۹۱۳، ۱۹۱۷ (۳ جلد).
- تجارب‌السلف. در تواریخ خلفا و وزرای ایشان. تألیف هـندوشاه‌ابـن سـنجربن عبدالله صاحبی نخجوانی. به تصحیح و اهتمام عباس اقبال. تهران ۱۳۱۳.
- التنبیه و الاشراف. تألیف ابی‌الحسن علی‌بن الحسین المسعودی. المکتبه العصریه ببغداد ۱۹۳۸.
- جوامع‌الحکایات و لوامع‌الروایات. تألیف نورالدین محمّد عـوفی نسـخهٔ خـطّی مجلس به‌شمارهٔ ٦٨١ (رک فهرست اعتصام‌الملک، ص ۴۳۱).
- چهار مقاله (کتاب -) تألیف احمدبن عمربن علی‌النظامی العروضی السمرقندی. به سعی و اهتمام محمدبن عبدالوهاب قزوینی. لیدن ۱۹۰۹ مسیحی.
- حدودالعالم من‌المشرق الی‌المغرب. چاپ عکسی به اهـتمام بـارتولد. لنـینگراد، ۱۹۳۰ - سید جلال طهرانی ۱۳۱۴ طهران، ایضاً طهران، دکتر ستوده.
- حماسهٔ ملّی ایران. تألیف تئودور نـولدکه. تـرجـمهٔ بـزرگ عـلوی از انـتشارات دانشگاه تهران.
- الحیوان (کتاب) جاحظ. به شرح و تحقیق عبدالسّلام مـحمّد هـارون ۱۹۳۸ - ۱۹۴۵ (۷ جزء).
- خاندان نوبختی. عباس اقبال. طهران ۱۳۱۱ هجری شمسی.
- الخوارج فی‌الاسلام. تألیف عمر ابوالنصر. مکتبةالمعارف. بیروت ۱۹۴۹.
- خرده اوستا. جزوی از نامهٔ مینوی اوستا. تفسیر و تألیف پورداود، بمبئی ۱۹۳۱.
- دستور الوزراء. غیاث‌الدین خوندمیر. با تصحیح و مـقدّمه سـعید نـفیسی طـهران

۱۳۱۷ شمسی.
ـ الدعوة الی الاسلام، تألیف سیر. ت. و. ارنولد، تعریب حسن ابراهیم حسن، عبدالمجید عابدین، اسماعیل النحراوی. مصر ۱۹۴۷.
ـ دیوان ابی نواس. به تحقیق و شرح: احمد عبدالمجید الغزّالی، قاهره ۱۹۵۳.
ـ رسائل البلغاء. اختیار و تصنیف محمد کردعلی. الطبعة الرابعه ۱۹۵۴ لجنة التألیف. (کتاب العرب فی الرّدعلی الشعوبیه ابن‌قتیبه، در این چاپ از صفحهٔ ۳۴۴ تا صفحهٔ ۳۷۷ طبع شده است).
ـ رسالة الغفران. ابوالعلاء معری. تحقیق و شرح بنت‌الشّاطی. طبع دارالمعارف بمصر ۱۹۵۰ مسیحی.
ـ روضة الصفا. تألیف میرخواند. بمبئی ۱۲۷۰.
ـ زبدة التّواریخ حافظ ابرو (نورالدّین لطف الله) ـ نسخهٔ خطّی متعلّق به مجلس شورای ملّی به شمارهٔ ۲۵۷ (رک: فهرست مرحوم اعتصامی، ص ۱۴۳).
ـ زهرالآداب و ثمرالالباب. لابی‌اسحق الحصری القیروانی، مفصل و مضبوط و مشروح به قلم الدکتور زکی مبارک. الطبعة‌الثانیه. مصر ۱۹۲۹ ـ ۱۹۳۱ (۴ جزء).
ـ زین‌الاخبار یا تاریخ گردیزی. تألیف ابوسعید عبدالحیّ‌بن الضحّاک بن محمود گردیزی با مقدمهٔ میرزا محمدخان قزوینی. طبع تهران ۱۳۲۷ در اروپا نیز چاپی از این کتاب به اهتمام محمّدناظم به سال ۱۹۲۸ منتشر شده است.
ـ سبک‌شناسی یا تاریخ تطوّر نثر فارسی، تصنیف [مرحوم] محمدتقی بهار، ملک‌الشعراء. چاپ تهران ۱۳۲۱ ـ ۱۳۲۶ (۳ جلد).
ـ سنی ملوک‌الارض و الانبیاء [کتاب تاریخ] تألیف حمزةبن حسن الاصفهانی. برلین. مطبعه کاویانی ۱۳۴۰ هجری.
ـ سیاست‌نامه یا سیرالملوک. تألیف ابوعلی حسن‌بن علی نظام‌الملک به اهتمام سیّد عبدالرحیم خلخالی. تهران ۱۳۱۰ شمسی هجری.
ـ السیرة النبویه. لابن هشام. تحقیق و شرح مصطفی السّقا ـ ابراهیم الابیاری ـ عبدالحفیظ شلبی ۱۹۳۶ (۴ جلد).

- شذرات الذّهب فی‌اخبار من ذهب. ابن عماد الحنبلی. طبع قاهره ۱۳۵۰ - ۱۳۵۱ (۸ جزء).

- شرح نهج‌البلاغه. ابن‌ابی‌الحدید طبع مصر. مطبعة دارالکتب العربیّة‌الکبری (۴ جلد).

- الشّعر و الشّعراء. ابن قتیبه. تحقیق و شرح احمد محمّد شاکر، طبع قاهره ۱۳۶۴ - ۱۳۶۹ (۲ جزء).

- ضحی‌الاسلام، تألیف احمدامین طبع مصر، لجنة‌التّألیف و التّرجمه و النّشر ۱۳۵۱ (جزء اول) ترجمه این کتاب به قلم آقای عباس خلیلی در تهران منتشر شده است. مرداد ۱۳۱۴ شمسی.

- العرب قبل‌الاسلام، جرجی زیدان. مصر ۱۹۰۸ مسیحی.

- العقدالفرید (کتاب) ابن عبدربه. لجنة‌التّألیف و التّرجمة و النّشر قاهره ۱۳۵۹ - ۱۳۷۲ (۷ جزء).

- العقیدة و الشریعه فی‌الاسلام. اجناس جولد تسهیر. نقله الی اللغة العربیّه: محمد یوسف موسی - عبدالعزیز عبدالحق - علی حسن عبدالقادر. قاهره ۱۹۴۶.

عمدة‌الطّالب فی انساب آل ابی‌طالب، تألیف سیّد جمال‌الدین احمدبن علی بن الحسین الداودی الحَسنی، بمبئی ۱۳۱۸.

- عیون اخبارالرضا. ابن بابویه صدوق. طهران ۱۲۷۵.

- عیون‌الاخبار (کتاب)، تألیف ابی‌محمّد عبدالله مسلم‌بن قتیبة‌الدّینوری، قاهره ۱۳۴۳ - ۱۳۴۹ هجری (۴ جلد).

- فارسنامهٔ ابن‌البلخی، به سعی و اهتمام و تصحیح گای لسترانج ورینولد الن نیکلسون. کمبریج ۱۹۲۱. اوقاف گیب.

- فتوح‌البلدان، بلاذری طبع دخویه. بریل ۱۸۶۶ مسیحی.

- فجرالاسلام احمد امین. چاپ دوم. جزء اوّل طبع لجنة‌التّألیف و التّرجمة‌والنّشر ۱۹۲۳ - این کتاب به‌وسیله آقای عباس خلیلی به فارسی ترجمه شده است. تهران دی‌ماه ۱۳۱۶.

ـ الفخری فی‌الآداب السّلطانیه و الدّول الاسلامیه. تألیف محمدبن علی‌بن طباطبا المعروف بابن الطقطقی. طبع مصر ۱۳۴۰.

ـ الفرق بین‌الفرق. ابی منصور بغدادی. مصر ۱۹۴۸ ـ ترجمه‌ای از این کتاب به‌نام تاریخ مذاهب اسلام. به قلم آقای محمدجواد مشکور در تبریز به سال ۱۳۳۳ شمسی منتشر شده است.

ـ فرهنگ ایران باستان. نگارش پورداود. بخش نخست تهران ۱۳۲۶ خورشیدی.

ـ الفصل فی‌الملل و الاهواء والنحل. للامام ابن‌حزم الظاهری الاندلسی و بهامشه الملل و النحل للشهرستانی. مصر ۱۳۴۷ ـ ۱۳۴۸ (۵ جزء).

ـ الفهرست ابن‌الندیم. طبع مصر. المطبعةالرّحمانیه ۱۳۴۸ هجری.

ـ الکامل فی‌التاریخ. طبع نورنبرک. لیدن ۱۸۶۶ تا ۱۸۷۶ (۱۳ جزء) و طبع مصر (۹ جزء).

ـ کتاب البلدان. ابن‌فقیه [ابوبکر احمدبن محمدبن اسحق‌الهمدانی] طبع دخویه، لیدن ۱۸۸۵.

ـ کتاب الخراج، قاضی ابی یوسف، طبع قاهره ۱۳۵۲.

ـ کتاب العبر، ابن‌خلدون، طبع بولاق. سنهٔ ۱۲۸۴ هـ. ق (۷ جلد).

ـ کتاب الوزراء و الکتّاب. ابی‌عبدالله محمّدبن الجهشیاری، چاپ مصر، بنفقة المکتبةالعربیة بغداد ۱۳۵۸.

ـ گاتها، سرودهای... زرتشت. قدیمترین قسمتی است از نامهٔ مینوی اوستا، تألیف و ترجمهٔ پورداود. بمبئی ۱۹۲۷.

ـ گجستک ابالیش. صادق هدایت، بمبئی ۱۳۱۶.

ـ مازیار. مجتبی مینوی و صادق هدایت، چاپ دوم ۱۳۳۳ تهران.

ـ مانی و دین او. دو خطابه از سیدحسن تقی‌زاده، به انضمام متون عربی و فارسی دربارهٔ مانی و مانویّت و آنچه بدین موضوع مربوط است. فراهم آوردهٔ احمد افشار شیرازی نشریهٔ انجمن ایرانشناسی. تهران ۱۳۳۵.

ـ مجمل‌التواریخ و القصص. تألیف سال ۵۲۰ هجری. به تصحیح [مرحوم]

ملک‌الشعراء بهار. طهران سال ۱۳۱۸ شمسی.
- مروج‌الذّهب و معادن‌الجوهر. ابوالحسن علی‌بن الحسین مسعودی، طبع مصر ۱۳۴۶ (۲ جلد) و طبع باربیه دومنار - و پاوه دوکورتی. با ترجمهٔ فرانسوی پاریس ۱۸۶۱ - ۱۸۷۶ (۹ جلد).
- مزدیسنا و تأثیر آن در ادبیّات پارسی. دکتر محمّد معین ۱۳۲۶.
- المسالک و الممالک (کتاب). ابن خرداذبه. طبع لیدن سنهٔ ۱۳۰۶ هجری.
- مسالک الممالک. لابی اسحاق ابراهیم‌بن محمّدالفارسی الاصطخری، طبع فی‌مدینة لیدن. سنهٔ ۱۹۲۸ مسیحی.
- المعارف. ابن قتیبه دینوری مصر ۱۳۰۰ هجری.
- معالم‌القربه فی احکام الحسبه، تألیف محمّدبن محمّدبن احمد القرشی عرف بابن الاخوه. به تصحیح روبن‌لیوی. کیمبریج ۱۹۳۷ (اوقاف گیب).
- معجم‌البلدان، یاقوت حموی. به اهتمام ووستنفلد ۱۸۶۶ - ۱۸۷۱ (۶ جلد با فهارس).
- مفاتیح‌العلوم. ابی‌عبدالله محمّدبن احمدبن یوسف‌الکاتب‌الخوارزمی. طبع مصر. ۱۳۴۲.
- مقاتل الطالبیین و اخبارهم. و بهامشه منتخب فی‌المراثی و الخطب لفخرالدّین احمد النجفی. طهران ۱۳۰۷.
- مقالات الاسلامیین و اختلاف المصلین. تألیف ابی‌الحسن علی‌بن اسمعیل‌الاشعری. به تحقیق محمّد محیی‌الدین عبدالحمید. مصر ۱۹۵۰ - ۱۹۵۴ (۲ جزء).
- مقدمهٔ ابن‌خلدون، طبع پاریس. به اهتمام کاترمر ۱۸۵۸.
- الملل و النحل شهرستانی. طبع لیپزیک. سنهٔ ۱۹۲۳.
- وفیات والاعیان. ابن‌خلکان. طبع قاهره به تحقیق و تعلیق محمد محیی‌الدین عبدالحمید ۱۳۶۷ [۶ جلد].
- یسنا. جزوی از نامهٔ مینوی اوستا، تفسیر و تألیف پورداود، ۱۹۳۸.
- یشت‌ها. (جلد اوّل) قسمتی از کتاب مقدس اوستا، تفسیر و تألیف پورداود، بمبئی ۱۹۲۷ - [جلد دوم] ۱۹۳۱.

## ب ـ زبانهای اروپایی


Bailey Zoroastrian Problems in the Ninth - Century Books Oxford, 1943.

Barthold Turkistan Down to the Mongol invasion. Gibb Memorial series, 1928.

Basiliev Byzanse et les Arabes. (2 vol)

Bidez - cumont Les Mages Helleniés Zoroastre. Ostanés

et Hystaspe d'aprés les traditions Grecque paris 1938 (2 vol,)

Bouvaat Les Barmecides d'aprés les historiens Arabes et Persanes. Paris, 1912.

Boyce The Manichean Hymn cycles in Parthn, Oxford university press, 1956.

Browne (E. G.) A literary History of Persia. Cambridge, 1929. Vol I.

Caetaanti Annalli dell Islam. Millan, 1950.

Christensen (A) L'lran sous les Sassanides. Copenhague, 1936. Kawadh at le communisme maz dakite:

Dermesteter Coup d'oeil sur l'histoire de la perse. paris, 1885.

Dennett (D. C.) Conversion and the poll Tax in early Islam. Harvard university press, 1950.

Duchesne - Guillemin: Zoroastre, paris, 1948.

Dunlop the Histofy of the jewish khazars. princeton University, 1954.

Frye (R.) the History of bukhara, Translated from a persian Abridgement of the arabic original. Massachu sets, 1954.

Gibbon the decline and fall of the Roman Empire (6 vol)

Everyman's library.

*Goldzicher Muhammedanische studien. Halle 1889 - 90 2 vol.*

Herodotus Wih an English Translation By A. D. Godlev

(4 vol) loeb classical Library, 1946.

Herzfeld Altpersische inschriften. Berlin, 1938.

Jackson (W) Zoroastrian studies. New York, 1928.

Jamasp - Asana Shikand - Gumanik vijar. Bombay. 1887.

Labourt: Le Christianisme dans L'Empire perse, Paris 1904.

Le Strange the Lands of the Eastern Caliphate. Cambridge, 1930.

Baghdad during the abbasid caliphate. Oxford. 1924:

Lôkkegaard (F r.) Islamic taxation in the classic period, Copenhage, 1950.

Markwart Wehrot und Arang heraausgegeben von H. H.

Schaeder, Leiden, 1938.

Menasce (J. de.) Skand - Gumanik vicar. Text pazand pahlavi, Transcrit, tradult et commenté Fribourg, 1945.

Minorsky hudud al-Alam translated and explained. Gibb memorial, 1937.

Muir (w) The caliphate.its Rise, Decline and fall edin burgh, 1924.

Nicholson (R A) A literary History of the Arabs. Cambridge, 1930.

Pelliot (p) Les traditions manichéennes au Foukien Leiden, 1925.

Perier (j) Vie d'Al- Hadjdjadj ibn yousof d'après Les sources arabes. Paris, 1904.

Sadighi (Gh) Les mouvements Religieux iraniens au IIe et IIIe siecle de l'Hegire Paris. 1938.

Sharpe History of the Egypt, London, 1858 (2 vol)

Spuler (B) Iran in früh - Islamischer Zeit. Wiesbaden. 1952.

Van Vloten Recherches sur la Domination arabe, le chiitisme et les croyances messianiques sous le kalifat des omayades. Am2sterdam, 1894.

